# پوختەیەك لە بەسەرهاتە گرنگەکانی پێغەمبەر ﷺ

## قبسات من حياة الرسول ﷺ

شێخ احمد محمد عصاف

وەرگێرانی / عبدالله حسن سعید ( خەلەکانی )



چاپی یەکەم

۱٤۳۰ ک - ۲۰۰۹ ز

# پوختەیەك لە بەسەرهاتە گرنگەکانی پێغەمبەر(ﷺ)

# قبسات من حياة الرسول (ﷺ)

## معجزات الرسول (صلى اللّه عليه وسلم)

## قدجاءكم من اللّه نور وكتاب مبين

نوسینی:

الشيخ أحمد محمد عساف

وەرگێڕانی:

عبدالله حسن سعيد/خەلەکانی

چاپی یەکەم

١٤٣٠ك-٢٠٠٩ز

بسم الله الرحمن الرحيم


- ناوی کتێب:قبساة من حياة الرسول
- نوسەر: الشيخ أحمد محمد عساف
- ناوی کتێب بەکوردی: پوختەیەك لەبەسەر هاتە گرنگەکانی پێغەمبەر (ﷺ)
- ناوی وەرگێڕ: عبدالله حسن سعيد
- نۆرەو ساڵی چاپ: چاپی یەکەم /ساڵی ٢٠٠٩
- ژمارەی سپاردن: ١٣٣٨ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێدراوە



- چاپخانە: چاپەمەنی سیما-سلێمانی (٠٧٧٠٢٢٦٨١٨١)
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە

# پێشکەش بێت

١- بەگیانی ئەوانەی کە ژیانیان رۆشەن و روونـاك کردمـەوە بـە بەسـەرهاتە گرنگیەکانی، سەر بەرزی و سەرفیرازی.

٢- بەگیانی ئەوانەی کە ئاسودە و بەختەوەرن بەگێڕانەوەی بەسەرهاتی پێغەمبەرو یارانی.

٣- بەگیانی شیرینی دایکی خۆشەویستم و باوکی کۆچ کردوم کەبوونە هۆی ژیانم.

٤- بەگیانی هەموو شوێنکەوتوانی بەرنامەی خوداو رێبازی پێغەمبەری سەروەرمان.

٥- بەگیانی براو، خوشكو، کوڕو، کچەکانم و، هاوسەری ژیانم.

٦- بەگیانی ئەوانەی کەتەمەنیان بەفیڕۆ نادەن و، هەردەم لەکاردان بۆئامۆژگاری چاکە.

٧- بەگیانی ئەوانەی کە ئەو کتێبە دەخوێننەوەو سودی لێ دەبینن.

وەرگێڕ

٢٠٠٩-٣-٧

خەلەکان

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على سيدنا محمد النبى الامى وعلى اله وصحبه اجمعين. اما بعد، يقول الله سبحانه وتعالى: {ولقد كرمنا بنى ادم}الاسراء/٧٠

خودای بە بەزەیی و بەدەسەڵات گەورەیی و خۆشەویستی و ڕێزی ئادەمیزادەکانی ئێستاو دواییش بەتەواوی بوونەوەر ڕادەگەیەنێ کە ئادەمیزادەکانم بەسەر تەواوی دروست کراوەکانمدا بەرزکردۆتەوەو ڕێزم لێناون. وەهۆکارێکی ئەو ڕێزو خۆشەویستیەش ئەوەیە کە لە خودی خۆیان و نەوەی ئادەمی، پێغەمبەرم بۆ ناردوون، بەمزگێنی دەر بۆ ئەوانەی ڕێبازی ڕاستی وخوداپەرستی بگرنە بەرو بەترسێنەریش بەرامبەر ئەوانەی کە ڕێگای هاوبەش کەران و، کوفر دەگرنەبەر، وە ئەو پێغەمبەرەش ﷺ ڕێبازی هیدایەت وڕۆشەنی ژیانی بۆدیاری کردوون، کەچۆن هەڵسوکەوت وڕەفتاربکەن، لەگەڵ خودا وتەواوی بەرەی ئادەمیزاد ، هەتاڕێگەیان لێتێك نەچێ و بەدبەخت و ماڵ وێران نەبن و، بەو هۆیەشەوە ژیانێکی خۆش بەختی و کامەرانی لەدونیادا بەسەربەرن و، لەدوا ڕۆژیشدا ڕزگاروسەرفیرازبن. بەمەرجێك بەشوێن فەرمان و ئامۆژگاریەکانیانـدابڕۆن. ئینجاتوخودائەوە چەندە نیعمەتێکی خۆشە، وەچ ڕێزوگەورایەتیەکە کەخودابەسەربەندەکانیداڕشتووە، بە ڕاستی گەورەترین نیعمەت و خۆش بەختیە، کەخودای بەدەسەڵات لەناخۆشی هەردوك ژیانی دونیاودواڕۆژ ڕزگاری کردووی و، وەهەر بەو جۆرە تاریکی و شەوەزەنگی دونیاو دوا ڕۆژی بۆ ڕۆشەن و ڕووناك کردوویەوە.

وە دبێ ئێمە زۆرباش بزانین کەخودای گەورە ئادەمیزادی بە چەندین بەهرەو هۆکاری زۆرو جۆرا و جۆری دروست کردوەو بەدیهێناوە، بۆ هەر بەهرەیەکیش کارو فەرمانێکی تایبەتی داناوە لەوژیانی دونیایەدا کە بەرە و چاکە و ڕێنماییدا دەی بات و شارەزای دەکات ، کەچۆن بتوانێ جێنشینایەتی خۆی لەو ژیانی سەر زەویە بەڕێوە بەرێ.

هەر بەهەمان شێوەش چەندین خوخودەی ناشیرین و ناپەسند لەژیانی ئادەمیزاددا هەیە كە ئینسان بەرە و شەڕەنگێزی و فەسادی پاڵ پێوەدەنێ، كەبەڕاستی مایەی ئەوەش بەرەو بەدبەختی وڕیسوایی دەبات، هەر چەندە كە بنەچەو فیترەتی ئینسان بەرەو چاكەو كرداری باشە، بەلاّم ئەوكردارە ناشیرین و خەراپانە ئادەمیزاد لەو ڕێگا ڕاستو تەواوەی بۆی دروست كراوە، وەری دەگێڕێ دەبێتە هۆكار بۆ بەرەو فەسادی و نالەباری‌و، ژیانی ئینسان دەشێوێ نیێو، كۆمەڵگا بەرە و بەدڕەوشتی هەڵدەنێ، وەبەڕاستیش هاوڕێیەتی خەراپكاران‌و تێكەڵی كۆمەڵگای بەدڕەوشت وخەراپ هەردەم بەرەو خەراپە دەت باتو، هەرگیز ناهێڵێ خۆش بەختی ببینی. ئەودووڕێگایەش كەڕێگای شەڕو ڕێگای ئاشتیە هەردەم كێ بەركێیانە بۆ ڕاكێشانی ئادەمیزادەكان بەلای خۆیاندا، بۆیە دەبێ ئێمە زۆر ئاگاداروخۆڕاگربین، بەرامبەر ئەوجەنگە دژوارەی بەرامبەرمان دەكرێت خۆڕاگروپشت ئەستووربین نەهێڵین بەلای فەسادی‌وخەراپەوەرمان بگێڕێ، لەوبارەشەوە پێغەمبەری پێشەوامانﷺ دەفەرموێ: ﴿كل مولود يولد على الفطر ولكن أبواه يهودانه أو ينصرانه أو يمجسانه﴾. واتە: هەرمنداڵێك كەلەدایك دەبێت پاك‌و بێگوناهەو، لەسەر ڕێبازوفیترەتی ئیسلام لەدایك دەبێت، بەلاّم گوناهو تاوانەكەیان لە ئەستۆی دایك‌و باوكیانە كەدەیان كەن بە جولەكە، یان بە گاور، یان ئاگر، پەرست.

بەڕێزان: هیچ گومانی تێدانیە هەركاتێ ئینسان وازی لەبەرگری و پاڵنەرەكانی خێر بهێنێ ئەوا دەكەوێتە دوای هەواو ئارەزوەكانی، دەبێتە هاوەڵ و دۆستی شەیتان و ئەو كاتە ڕێگەی ڕاستی لێدادەخرێ و بەرە و هەڵدێران و بەدبەختی دەڕواتو ڕێگای ڕۆشەن‌و ڕووناكی لێ دەبێتە تاریك‌وشەوە زەنگ، خۆشەویستان: خودای بەسۆز و میهرەبان كە ئادەمیزادی دروست كردووە بە بێهۆ دروستی نەكردووەو بەرەلاّشی نەكردووە بەڵكو بەرنامە و یاسای تەواوی بۆ داناوە، بەتەواوی مانای خۆشەویستی، ڕێزی لە ئادەمیزاد ناوەو، بەسەر هەموو دروستكراوە كانیدا بەرزی كردۆتە وەو، بەتەواوی تێی گەیاندووەو، ئاگاداری

کردۆتـەوە کـە شـەیتان دووژمنێکـی سـەر سـەختی ئێوەیـەو، ئێـوەش بـەدووژمنی خۆتانی بزانن‌و، بەدوای هەڵویٚ ست‌و ڕێبازی نەکەون، وەخـودای بەدەسـەڵات زۆر بـە پەرۆشـەوە مەبەسـتیەتی کـە ئادەمیزادەکـان ڕێگـای سـەربەرزی وسـەرفرازی بگرنەبەر بۆ ئەوەی خۆش بەختی‌وئازادی بۆ هـەردووك دوونیا بەدەست بهێنن ، ئینجا هەر بۆ ئەومەبەستەیە کەخودای بەسۆز و بەزەیی پێغەمبەرانی بە بەرنامـەی تـەواوەوە بۆنـاردوین‌و، ڕێگـەی ڕاسـت و سـەرفیرازیان بـۆ ڕوون و ڕۆشـەن کـردوو ینەوەو، زەنگـی ترسناکیان بـۆ داناوین کە لەو ڕێبازە لابـدەین، ئینجا لەبەر ئەو هۆیانـە هێنـدێك لـە ئادەمیزادەکـان ئـەو ڕێبـاز و ڕێگـە ئـاین پەروەرییـەیان زۆر بەشێوەیەکی چاك، وەکو ئێشك گرێکی ڕاستگۆ و پاك کارەکەی بەڕێوە دەبات‌و هـەموو ڕێگاچەوت‌وچـەوێڵەکانی ئـارەزوو بازی‌وبێـدینی وازلـێ دەهێنێ‌وچـۆن خوداوپێغەمبەری خودا دەیانەوێ ئەوها بەڕێگەی بانگەوازەکەیاندا دەڕۆن.

خوێنەرانی خۆشەویست: دەبێ ئەوەشمان لەیادنەچێت، هەمووئادەمیزادەکان کە دێنە سەر شانۆی ژیانی ئەو جیهانە، هەموویان وەکویەك نین، کە تەواو پابەندی ئاین‌و بەرنامەو بانگەوازی پێغەمبەریان بن، بەڵکو ئادەمیزادەکان دەبن بەسێ کۆمەڵە و دەستەوە:

کۆمـەڵێکیان: زۆر پابەنـدی ئـاین و بەرنامە و بانگـەوازی پێغەمبەرانەو، بـە هـەموو هـەوڵ‌و توانـاو ملکەچـیەوە گوێڕایـەڵ و لەفەرماندایـەو، هـەرگیز بـەلای تـاوان و خەراپـەدا نـاڕوات‌و، بـە تـەواوی مانـا پابەنـدی ئـاین و بەرنامەکەیـەتی و. هـەموو ئارەزوە سەرکەشیەکانی دادەمرکێنێ‌و، پاڵ نەرێکی بەهێز دەبێت بۆ لادانی کـارە خەراپ و شەڕەن گێزەکانی‌و، بەتەواوی مانالـە خزمـەتی مرۆڤایەتیدایـەو، خزمـەت گوزار و بانگەوازکارە.

کۆمـەڵی دووەم: کۆمـەڵێکن پەیوەنـدیان بـە ئاینـەوە هەیـە بـەڵام، هـەتا بڵێـی سسـت‌و لاوازن پابەنـدی تـەواویان بەئاینـەوە، تـەواو نیـەو، بێتوانـان‌و لـەکرداری خەراپـەو نالەباریش خۆپارێزی ناکەن‌و، میانە ڕەوی‌و، مام ناوەندی لەهەردووك ڕێگاوە پەرە پێدەدا، واتە: نەموسڵمانێکی پابەندە، نەلادەرێکی تـەواو بەدبەختـە، بەڵام لەڕاستیدا

ئەوکۆمەڵە زۆر کەمن و، ماندوبەدبەختیشن. چونکە بەدەردی ئەومالە چووە کە چەند ئایەتێکی بەلادیوارە کەی مالیانی هەلواسیوەو، لەلایەکەی تریش چەندوێنەیەکی ڕازاوەی ئافرەتانی هەلوا سیوە، پرسیاریان کرد بۆچی بەو شێوەیەتان کردووە ؟ کە ئایەتی قورئان لەلایەکێ دیوارەکەو، وێنەی ئافرەتیش لەلایەکەی تر؟ لەوەلامیاندا گوتیان: ئەوە ئەومالە دەیانەوێ دونیاو دواڕۆژیان پێکەوە دەست بکەوێ.
کۆمەڵی سێیەم: کۆمەڵێکی زۆر زۆرە کە ئارەزووی ئاین لەمێشك و دلیاندا تەواو کوژاوەتەوەو، هیچ هەست بەوە ناکەی کە ئەو کەسانە سۆزی باوەڕیان تێدا هەبێت، بەلام لایەنی خەراپەو فەسادیان، تەواوسەر کەش و، یاخی بوون. ئینجا ئەو سەرکەشیەیان تەواو پالی پێوە ناون بۆناوکاری سوکایەتی وفەسادی، کەبەڕاستی ئەوەش پالنەرێکی بەهێزە بۆ تەواو لادانی لەو ڕێگا ڕاستەی، کە خودا ئادەمیزادەکانی بۆ دروست کردووە بەو هۆیەوە ئەو بەربەستە بەهێزە دەبڕێ بەرەو کارو کرداری ناڕەوا، کەعەقل و یژدانی مرۆڤ قبولی ناکات، ئەو پەروەردگارەی کەخەلقی کردوەو زانستو زانیاری پێ بەخشیوە ناپناسیێوناى پەرستێ ، بەپێچەوانەی فەرمانەکانی ڕەفتاردەکاتو، تەنانەت شەریك و هاو بەشیشی بۆ بڕیار دەدا، خوێنەری ئازیز: ئەوەش بزانە وەنەبێ کەبێ باوەڕان خودا ناپەرستن، لەسەر شتێك کۆك ویەك دەنگ بن. نا وانیە، تەنانەت بێ باوەڕان لەخودا دەست کردەکانی خۆشیاندا کێشەی جۆراو جۆرو جیاوازیان هەیە. هێندێك لەبێ باوەڕان تەنها بۆ خۆشاردنەوەیان لە خودای ڕاستی، بەردیان کردووە بەخوداو دەیپەرستن، هێندێك ئاژەڵو حەیوانو، هێندێك ئەستێرەکانو، بەچەندین شێوە خودای جیاوازیان هەیەو، لێیان نزیك دەکەونەوەو، قوربانیان بۆدەکەنو، داوای هیوا و ئاواتەکانیان لە لادەکەنو، لێیان دەپاڕێنەوە، بەبێ ئەوەی هیچ قازانجو زەرەریان لێیانەوە پێ بگات، تەنها شەیتان سەری لێ شێواندوونو فووی بە مێشکیاندا کردووەو، گومڕای کردوونو. ڕێگەی ڕاستی لێ وون کردوونو، ڕێگای بەد بەختیو گومڕایی بۆ ڕۆشەنو ڕووناك کردوونەوە، کەئەوەش یەکەم بنکەوخالی زەنگی ترسناکیە کەدەورەی مرۆڤایەتی دەداتو، ئینسانیەت بۆگەنو وێران دەکاتو، مەترسیەکی بەهێز لەناو مرۆڤایەتیدا بلاو دەکاتەوە، کەزەرەربە ئاینو ڕەوشت و کۆمەلایەتی

دەدات. بەوبۆنەوە ئینسان زەرەر مەندو ماڵ ویرانی دنیاو دوا ڕۆژ دەبێت، كە بەڕاستی هەر ئەوانەش زەرەرمەندی تەواون. ئینجا، لەسەر ئەو بنەمایە ئیسلام بەتەواوی مانا هەوڵی داوە كە بۆ چارەسەری هەموو كێشەكان و، بەگرنگیەكی زۆرەوە هەوڵی داوە كەبەرنامە زێڕینەكەی بۆ ئینسان پەخش بڵاوكردۆتەوە بۆ ئەوەی هەموو ئادەمیزادەكان پەیڕەوی لێبكەن و، فەرمانەكانی بە جێگە بگەیەنن، گەورە ترین شتێك كە ئینسان زۆر بەگرنگی بگرێت پابەند بوونمانە بە ئاینەوە، وە بەشوێن كەوتن و، بەجێهێنانی فەرمانەكانی بە جوانترین شێوە، بۆئەوەی نەفس و گیانمان لەژه نگی خەراپەو، پیسی و، بێ باوەڕی بپارێزین و، لاشەو ئەندامەكانیشمان لە كاری نابەجێ و، خەراپەو، تاوان كاری دووربگرین و، ڕق و قین و، دڵ پیسی و، كینەوخۆ پەرستی و، خودپەرستی لەناوناخ ودەرونمان دەربكەین و، دووربخەینەوەو، كۆمەڵگایەكەمان پاك ڕابگرین لەو هەموو نەخۆشی وناخۆشیە تێك دەرانەی كە كۆمەڵگا لەیەك هەڵدەوەشێنی و، بۆگەن و قێزەونی دەكات، ئینجا ئەگەر بەو جۆرە رەفتارمان كرد، تاك و كۆمەڵ ئازاد و سەرفیراز دەبێت و، مرۆڤایەتیش ڕزگار وسەركەوت و، دەبێت لەڕوخان و لەبار چوون، ئەوەش بە هۆی گەورەیی و ڕەوشتە جوان و بنەماكانی ئیسلام دەردەكەوێت، هەر لەسەر ئەو بنەماپاك و بێگەردەبوو، كۆمەڵانی موسڵمانان خۆیان بە خودا فرۆشتووە وەك و خودا خۆی دەفەرموێ: {إِنَّ ٱللَّهَ ٱشْتَرَىٰ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلْجَنَّةَ }التوبة/١١١ .

واتە: بەڕاستی خودای گەورە گیان ومالی لە باوەڕداران كڕیوەو لەبەرامبەری، شەهیدیان بە هەشتیان پێ دەبەخشێ.

بەڵێ بەڕاستی ژیان بەلای ئەو موسڵمانە ڕاستە قینانە وەك و مەیدان و پانتایەك وەهایە كەبیكەنە جێگەی گرەو پێش بڕكێ و، تەواوخۆیان هیلاك دەكەن بۆبردنەوەی پێش بڕكێیەكەو، خەڵاتەكەیان بەرنەوە، وە هەر بەو شێوەیە نمرەو پلەی بەرزو نزمیان لەڕۆژی دوایی بەگوێرەی ڕەفتار و ڕەوشت وتەقوا و خۆپارێزیانە لەو ژیانەدا، وەكو خودا دەفەرموێ :{ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ}الحجرات/١٣

واتە: بەڕاستی گەورە و بەڕێزتان لەلای خودا ئەو کەسانەتانن کە زۆرتر لە خودا ترس و فەرمان بەردارترن وە خوداش باشتر لە هەموان زانا و ئاگادارترە.

ئینجا بەڕاستی هەربە هۆی ئەوپاڵەوان و ئازاو نەبەردانەبوو، ئالای ئیسلام لە بەرزیدا دەشەکایەوەو، بەهۆی شیری بڕندەیان لەوسەر زەویە، سەرکردە و پادشایان دەهاتنە ناو کەمەندی ئیسلامەوە.بەڕاستی باوەڕ کاری لە ڕادەبەدەرو کەم وێنە بەدی دەهێنێت، هەروەك و شاعیر ڕاستی فەرمووە کەدەڵێت:

أ نجبت للدين والدنياقياصرة بالامس كانوا رعاةالشاة والنعم

وجئت بالعلم أميين مادرسوا فأصبحوا سادة الاعراب والعجم

بەو جۆرە کردمە شعر:

مندا ڵێک لە دایک بوو دین و دونیای خرۆشاند

دەستی هەژارانی گرت زۆردارانی هە ڵوە شاند

تالاو بوو لەدەشت و کێوشوانی گاگەڵ و مەڕ بوو

دڵسۆزو خۆشەویست و ڕەوشت بەرزو نەبەردبوو

بەبێ هە وڵ و تێکۆشان خوا کردی بەمامۆستا

علم و زانیاری پێدا و لە تێکۆشـــان نەوەستا

خودا ڕێزی زۆر لێنا کردیە مامۆستای جیهان

بووبەگەورەی ئینس وجن پێشەوای پێغەمبە ران

بەڵێ، ئەو پاڵەوانانەن کەخودا ڕێزی لێناون و، بەباوەڕی ڕاستەقینە باسیان دەکات، کەبەڕاستی جێگەی ڕێزو لێبووردەیین ، ئەوخودایەی کەئەوانەی کردۆتە پێشەنگی ئێمە بۆئەوەی بەشوێن ڕێبازیاندا بڕۆین و چاویان لێبکەین بۆئەوەی ئێمەش خاوەنی ئەو پلەونمرە بەرزانە بین کەبەوان بەخشتراوە.

ئینجا منیش هەرلەبەر ئەومەبەستە بوو بیرم کردەوە کە پەڕاوێك دابنێم لەبارەی ئەو باوەڕدارە جوامێرو، پاڵەوانانەی کە مێژووی ڕاستەقینەیان بۆئێمە درووست کردوو پیشانیان داین بەهۆی گێڕانەوەوڕووداو، بەسەرهاتەکانیان لەگیان خۆبەخت کردنیاندا ، تێکۆشان و، خۆبەکەم گرتنیان لەسەر هاوەڵەکانیان و ڕەوشتە جوان و

بەرزیەکەیان، کەلەئاسمانی بەرزیدالەگەڵ گیانە شیرینەکەیان و باوەڕی ڕاستیان و، ئارامی وداد گەریان و، خۆشەویستی بۆیەك سوتانیان دەدرەوشایەوە، بۆ ئەوەی ئەو هەڵوێست و ئازایی و، لێبوردوەیان، ببێتە ئامۆژگاریەکی پرسەروەری بۆ ئەوەی گەنج و لاوەکانمان ڕێگەی ڕۆشەنیان بۆڕوون بێتەوە و ڕێگای ڕاستی ئەوان بگرنە بەرلەو ژیانەی ئەمڕۆدا، بەتایبەتی لەوکات وزەمانەی کە خێر و چاکەو، ڕەوشت کەم بووەونەماوەو، شەڕوخەراپەو بەدبەختیش بەدەرەوەو بازاڕی گەشاوەو درەوشاوەیە، ئومێدە وارم کەلاوەکان بگەڕێنەوە سەر ئاین و ڕەوشت و، ڕاستە شەقامی بیروباوەڕی ڕاستی و، بیروباوەڕیان بە هێزبکەن و لەهەموو کردارێکی سوکی وسەرشۆڕی دوور بکەونەوەوخۆیان لە خووخودەی خەراپ پاك ڕابگرن ، وە زۆرباشیش تێبگەن کە پێغەمبەروﷺیارە شیرینە بەڕێزەکانی ﷺ چەندە تێکۆشان و، خەباتیان کردووەو هەوڵیانداوە بۆبەرز ڕاگرتنی ئاڵای ئیسلام و، سەربەرزی و پێگەیاندنی ئەو ئاینە بەڕێزە، هەتابە ئەمانەت گەیشتووە بەدەستی ئێمە: بەڵام بەئاخ و بەداخەوە، کە ئێمەش چەندە کەمتەرخەمین و، گوێ نەدەرین بۆتێگەیشتن وحاڵی بوونمان و، بە تەواوی سنورە قەدەغەکراوەکان دەبەزێنین و، شاڵاو بۆ هەموو کارێکی خەراپەو ناڕێك دەبەین، بەبێ ئەوەی گوێ بدەینە هیچ ماف و یاسایەك و، تەنانەت ڕێزو ترس و خۆپارێزیمان لە خوداش نیە !!.

خودایە ئێمە داوات لێدەکەین و، لێت دەپاڕێینەوە سەرکەوتوومان بکەی بۆ ئەو کارانەی کە خێرو چاکەیان تێدایە، وە ڕێنمونی و هیدایەتی گەنج و لاوەکانمان بدەی بۆ ئەوەی بەشوێن ڕێبازو ڕەوشتی پێغەمبەروﷺیارە خۆشەویست و تێکۆشەرەکانیداﷺ بڕۆن، بۆ ئەوەی ئەو ئاین و بەرنامە بەرزو بەڕێزە هەردەم بە بەرزی و، ناوداری و، گەشاوەیی بمێنێتەوە. خوداش سەروەرو پێشەوای یارمەتی دەرانە.

# شتە كەم وێنەكانی پێغەمبەرﷺ : معجزات الرسولﷺ

{قَدۡ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٞ وَكِتَٰبٞ مُّبِينٞ }المائدة/١٥

واتە:خودای پاك و بێوێنە پێغەمبەرە ناوازەكەی حەزرەتی محمدی ﷺتایبەت مەند كردووەبە سوپاس گوزارییەكی زۆرو چەندین نیشانەو شتی گرنگی بەرچاوی لەسەر دەستی ئەوپێغەمبەرەداﷺبەدی هێنانەوەو، بەزۆر گەورە و بەرێزی، لەسەر شێوەی خۆیو تایبەتمەندی و خۆشەویستانی بەرزتروبڵندتر ڕاگرتووە، تەنانەت لە قورئانیشدا زۆر مەدح و سەنای كردوە و، زۆرشتی فێركردوە، كە وانەبایە نەیان دەزانی وە ئەو پێغەمبەرە ﷺتاكەكەسە بوو بۆ بەدیی هێنانی داهێنەری نهێنی پارێزراوەكان، كەچاوی نابینای پێ ڕۆشەن دەبێت و گوێچكەی كەڕی پێ دەكرێتەوەو، دڵی بێ ئاگای پێ بەئاگا دێتەوە، . هەروەك و خوداش لەو بارەیەوە دەفەرموێ:{ قَدۡ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٞ وَكِتَٰبٞ مُّبِينٞ }مائدة/١٥

خودای بەدەسەڵات بەچەندین بەڵگەی دیاروئاشكراو، چەندین بەڵگەی زۆری كەم وێنەی بەدیهێنەر یارمەتی و كۆمەكی پێغەمبەری كرد بۆ بەدیهێنانی پەیامی ڕاستی ، ئینجا شتە كەم وێنەكان (معجزات) بۆئەوانەی كەڕێگرو بەر هەڵست كاربوون لەڕێگاو ڕێبازی پێغەمبەرﷺ بۆ هیدایەت و ڕێنمونیان بەبێ هیچ ڕەوانبێژیی و زمان پاراوییەك كە هەیانبێت وبەبێ بیركردنەوەو تێڕامانیان لە قورئاندا كەپڕیەتی لە ڕەوشت و ڕەفتاری جوان و پڕبایەخ كە هەموو ئادەمیزادێك دەتوانێ لەخودی خۆیدا بەدی بهێنێ وبەهیچ جۆرێكیش ئەوانە بیریان لەوە نەكردۆتەوە و چاوێكیان بە پێشینانی خۆیاندا نەگێڕاوە كەئەوانەی دوژمنایەتی وبەرهەڵستیان لەگەڵ ئەوقورئان و بەرنامەیە كردووە تێشكاون و، بە بەرشەقی ڕۆژگار كەوتوون.هەرگیز هەست وپەیان بە نهێنیە شاراوەكانی ئەوقورئانە نەكردووە، بۆیە هەر بەگوێرەی ئەو باوەڕە لاوازەی خۆیان سەیری شتە مادیو بەر چاویەكانیان كردووە لەدونیای مادەدا، كەئەوەش بەتەنها بۆ گۆڕانكاری ژیانی ئەو بوونەوەرەی بەدی دەكرێ كە ئەو جۆرە گۆڕانكاریانەش لەتوانای بەدی هێنانی هیچ مرۆڤێكی ئاساییدانییەو بەدی ناكرێ، بۆیە بۆبەدی هێنانی ئەو كارەكەم وێنانە بەردەوام بوون و، بەڵێنیان دەدا ئەگەر تۆ ئەو كارە كەم وێنانەمان بەڕاستی بۆبەدی بهێنی ئەوا

ئێمەش باوەڕت پێدەکەین و بەڕاست گۆت دادەنێین لە داوایەکەتدا. بەڵام بە پێچەوانەوە ئێمە بەدرۆزنت دادەنێین و، بەرهەڵستیشت لێ دەکەین. هەر بەو جۆرە بێباوەڕان بەردەوام بوون لەسەر داواکردنی بەدیهێنانی شتەکەم وێنەکان. ئینجا خودای بەتواناو بەدەسەڵات زۆر لەو شتە کەموێنانەی بۆ پێغەمبەری خواﷺ لە بەرچاوی بێ باوەڕانی بەدیهێنا کە لێرە بە دواوە گوێ بیستیان دەبین کەخودا حەز بکات.

## لە ڕاگەیاندن و ئاگاداریەکانی بەرزی پێغەمبەرایەتی (ﷺ)
## من أعلام النبوة (ﷺ)

ڕوداوێکی گرنگ لەهەڵکەندنی چاڵی خەندەق، لەوکاتی هەڵکەندنەدا بەردێکی زۆر گەورە هاتەپێشی چاڵ هەڵکەنەکان بەناوی (كديە) کەبەڕاستی زۆر هیلاك و شپرزەی کردن و هەر چەند هەوڵیاندا بۆ شکانی بێسود بوو، هیچ چارەیەکیان بۆ لە گەڵ نەکرا، پێغەمبەریان ئاگادارکردەوە وەك ڕاوێژپێکردن چونکە تەواوی ڕێگای چاڵهەڵکەندنی لێگرتبون، پیغەمبەر(ﷺ)هات و بەدەستی پیرۆزی چەکوچ (کوینی) بەرز کردەوەو ڕایوەشاندو لەبەردەکەی دا پریشکی گڕی ئاگری لێبەرز بۆوەو بەشێك لەسێ بەشی بەردەکەی شکاندو شەقی کرد فەرموی:( الله اکبر) وڵاتی قەیسەر ڕزگاری بوو، سوێند بەخودا خانو و باڵەخانە بەرزو جوانەکانی وڵاتی قەیسەرو ڕۆمم لەبەرچاوەو دەیان بینم.

بۆ جاری دووەم: کە کوینی ڕاوەشاند بەشێکی تری لەو دوو بەشە شکاندو فەرمووی: ( الله اکبر) وڵاتی کیسرا ڕزگارکرا سوێند بەخودا ئێستا بەچاوی خۆم خانو باڵەخانە سپی و ڕازاوە کانی کیسرا بەچاوی خۆم دەبینم.

بۆجاری سێهەم :کە کوینی ڕاوەشاند بەشی سێهەمەکەشی وردوخاش کردو فەرمووی: (الله اکبر) وڵاتی یەمەن ڕزگار کرا سوێند بەخودا ئێستا دەرگاو دەروازەی سەنعام لەبەر چاوە.

کوڕی(عبدالبر) لەدوای ئەو ڕوداوە فەرمووی: بەڕاستی خودا بەندەکەی خۆی سەرخست و پەیمانی خۆی هێنایە دی، سوپاس بۆ خودای هەموو بوونەوەر (وقد نصرالله عبده وصدق وعده والحمدللهرب العالمين. إبن هشام : ج/٢/ص/٢١٩.

## ئەی عەمیر بۆچی هاتوی؟: ما أ قدمك ياعمير؟

لەدوای کۆتایی جەنگی بەدر:(سەفوانی کوڕی ئومەیەی کوری خەڵەف) بە (عەمیری کوڕی وەهەب)ی وت: کەپیاوێکی زۆر ئازاو چاو نەترس بوو، ئەگەر تۆ بڕۆی محمدم بۆ بکوژی پەیمانت ئەدەمێ هەموو ئەو( وام) وقەرزانەی کە لەسەرتەو پێوەی گیرۆدە و نائارام بوی بۆت ئەدەمەوە، وەسەر پەرەشتی و پارێزگاری خانەوادەکەشت بەتەواوی دەکەم :عەمیریش بەو پەیمانە ڕازی بوو، بارگەو خۆراکی سەفەری باش و تەواوی بۆ ئامادەکراو ڕێگای شاری مەدینەی گرتەبەرو بەبیرێکی ناڕەوا گەیشتە شاری مەدینە، ڕۆیشتە مزگەوتی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە ئامادە باشیەکی باشەوە خۆی توندو چاپوك و تەیار کردبوو، شیری لەشانی شەتەك دابوو چاوەڕوانی دیتنی پێغەمبەری (ﷺ) دەکرد: لەوکاتەدا چاوی بە(عومەری کوڕی خەتاب)ﷺ کەوت پرسیاری پێغەمبەری لێکردو ئەویش لەگەڵیدا ڕۆیشت وبردی بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) پێغەمبەر فەرمووی: ئەی عەمیر بۆ چی هاتوی بۆئێرە؟

عەمیر لەوەڵامدا گوتی: ئێمە هێندێك دیلمان لەلای ئێوەهەیە دەمەوێ بچمە لایان و بیان بینم ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەدی ئەوشیرە چییە پێتە؟ عەمیر گوتی: ڕاست دەفەرمووی: من هیچ پێویستیم بەو شیرە نەبوو، کارێکی ناڕەوایە کەپێمە، بەڵام کەهاتم بۆئێرە بەشانمەوە بوو نەم توانی و لەبیرم چووکەدای بنێم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی عەمیر ڕاستی بڵێ بۆچی هاتووی؟

عەمیر گوتی: تەنها بۆلای دیلەکانمان هاتووم، پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی:ئەی عەمیر چی پەیمانێکت لەگەڵ سەفوانی کوڕی ئومەیە بەستووە لە(حجر) کەجێگەیە کە لە مەککە، عەمیر هاواری کردوو گوتی: من هیچ پەیمانێکم لەگەڵ نەبەستووە؟. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەی عەمیر تۆ پەیمانت لەگەڵ سەفوان بەستووە کەبێیت و من بکوژی و لەبری ئەوەش سەفوان قەرزو وامەکانت بۆ بداتەوەو پارێزگاریو ژیانی خانەوادەکەت بۆ دەستەبەر بکات، ئینجا کاتێعەمیر گوێی لەفەرموودەکەی پێغەمبەر بوو کە ئاگاداری نهێنیەکانی نێوانی سەفوانو ئەو بووەو کەسیش ئاگای لەو بەینو بەستەنەبووە هەر خێرا بەبێ دوودڵی گوتی: (أشهدان لا إله إلا

الله، وأشهدان محمدا رسول الله) بەڕاستی ڕاستت فەرموو: ئەی پێغەمبەری ڕاست گۆ ئینجا پێغەمبەرﷺ بە هاوەڵەکانی فەرموو: (علموا أخاكم القرآن وأطلقوله أسيره) واتە: براکەتان فێری قورئان بکەن و دیلەکانیشی بۆ بەربدەن. ئینجا لەدوای ئەوە عەمیر گەڕایەوە بۆ مەککەو بوو بە بانگ خوازێکی باش بۆ بانگ هێشتنی خەڵکی بۆ ئیسلام، بەو هۆیەوە کۆمەڵە خەڵکێکی زۆر هاتنە ناو کەمەندو بازنەی ئیسلامەوە.إبن هشام/ج-١-ص/٦٦١

## تۆڵەی ستەمکار: جزاء الظالم

دەگێڕنەوەئەبو جەهل کە ناوی عمری کوڕی هشام: ڕۆژێکی وتی: ئەی کۆمەڵانی قورەیش خۆ بۆ خۆتان بەچاوی خۆتان دیتتان کە محمد چی کرد لە ناشیرین کردنی ئاینەکەتان و، جنێودان بە خوایەکانتان و، مایە پوچ و، بەهیچ دانانی هیواو، ئاواتەکانتان و، وتەی ناشیرین بەباوك و باپیرانتان، بەڕاستی من هیچکە هێزو توانای خۆڕاگرتنم نەماوەو، بۆم قبولْ ناکرێ: پەیمان لەگەڵ خودای خۆم دەدەم کەبەیانی لە(حیجر) بۆی دادەنیشم:بەردێکی گەورە هەڵدەگرم هەرکاتێ محمد هاتەلای کەعبە و نوێژی دابەست و چوەکڕنۆش ، ئەوبەردەی بەسەر مێشکی دادەدەم و مێشکی دەپرژێنم، بەلاّم ئێوەش پارێزگاری سەلامەتیم لێبکەن کەلەدوای کوشتنی: هۆزو نەوەی (عبدالمناف) دەست درێژی نەکەنە سەرم: بۆ بەیانی ئەبوجەهل ڕۆیشت بەردێکی گەورەی هەڵگرتەوەو خۆی لەجێگەیك حەشارداو دانیشت وەکو ئەو پیلانەی کە بۆ خۆی دایڕشتبو چاوەڕوانی پێغەمبەری دەکرد: پێغەمبەریشﷺ هەروەك و عادەتی ڕۆژانەی ڕۆیشت بۆلای بەیت بۆ نوێژکردن بێباوەڕانی قوریشیش لەشوێن و خانەی کۆبوونەوەکانیان سەیریان دەکردو چاوەڕوانی ئەوەبوون کەبزانن ئەبوجەهل چی دەکات کاتێ پێغەمبەر ﷺنوێژی دابەست و ڕۆیشتە سەر سوژدەو کڕنۆش ئەبوجەهل ئامادەباشی خۆی پیشان داو بەردە گەورەکەی هەڵگرت و بەرە و لای پێغەمبەر ڕۆیشت کە لێی نزیك بۆوە هەرزۆر بەخێرایی پاشەو پاش بەرەو دواوە گەڕایەوە

ترس و سامێكی زۆری بەروخساریەوە دیاربوو رەنگی گۆڕابوو ئەوبەردەی كەهەڵی گرتبوو بۆدوور فرێیدا، ئەوكۆمەڵە خەڵكانەی كە چاوەڕوانی ئەبوجەهل بوون بزانن چی دەكات كەچاویان بەئەبو جەهل كەوت سەرسام بوون و بەرەو لای ئەبوجەهل رایانكردو گوتیان: ئەی ئەبا حەكەم ئەوەچی بوو؟ گوتی: بەخودا هەر كەویستم ئەو كارەی پیلانم بۆدارشتب و بە ئەنجامی بگەیەنم، كەلێی نزیك بومەوە حوشترێكی زۆر بەهێزو گەورە كە تاك و ئێستا شتی ئەوهام نەدیتوە پەلاماری دام و خەریك بووتێكم بشكێنێ و بم خوات.؟ كاتێ ئەو قسەیان بۆ پێغەمبەر گێڕایەوە فەرمووی: ئەوە جبرائیل بوو ئەگەر زیاتر نزیك بوبایەوە پەلاماری دەداو دەی گرتووتێكی دەشكاند.

## پارچە پارچەكردنی دەسەڵاتی كیسرا: تمزيق ملك كسرى

پێغەمبەری سەروەرمان(ﷺ)چەند نامەیەكی بۆسەركردەو پادشایانی سەردەمی خۆی نووسی وداوای لێكردن كە موسڵمان بن، هێندێكیان موسڵمان بوون، وەك و پادشای نەجاشی. هێندێكیشیان باوەڕی تەواویان بەسەر راستی و دروستی ئیسلام هێناوە و قەناعەتی تەواویان پێی هاتوە بەڵام لەبەر گەل و هۆزەكەی و ، لە دەستچوونی دەسەڵاتی نەیانـدەوێرا باوەڕیان لەناو گەلەكەیاندا ئاشكرا بكەن، وەك و (قەیسەری رۆم) هێندێكیشیان زۆر بەجوانی ورێكی وەڵامی نامەكەیان دایەوە، وەك و (مقەوقیس)پادشای (مصر) چەند كەسێكی كەمیش بەشێوەیەكی زۆر ناشیرین و بێئەدەبانە وەڵامی نامەكەیان دەدایەوە وەك و(ئەبروێز) پادشای (كسری ی فارس)كاتێ كەنامەكەیان بۆ خوێندەوە رقی هەستاو نامەكەی زۆر بە توندوتیژی وەرگرت و پارچە پارچەی كردو گوتی: چۆن محمد بەندەی منەو نامە بۆ من دەنوسێ. لەدوای ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: خودایە دەسەڵاتی پادشایەتی ومالّو دارایی كیسرا پارچە پارچە بكەی هەروەك و چۆن نامەكەی منی پارچەكرد: خودای گەورەو بەدەسەڵات، هەر بەو شێوەیە كوڕەكەی خۆی (شێرۆیەی) بەسەر( ئەبروێزدا) سەرخست و باوكی خۆی كوشت ملك و دەسەڵات و دارایی بە ناشیرینترین شێوە پارچە پارچە بوو هەموو دەسەڵات و تەواوی سامان و دارایی لەدەستی نەما ئەوەش بەدوعا و نزای پێغەمبەری(ﷺ) پارچەپارچەو، تێك شكێندرا.

# خودای بەبەزەیی پێغەمبەریﷺ لە فێڵی دوژمنانی دەپارێزێ

# ماصرف الله عـن رسوله كيد الأعـداء

خێزای ( ئەبولەهەب) کە زۆر ئازاری جەستەو گیان و دەرونی پێغەمبەری دەداو درك‌و داڵی دەخستە سەر ڕێگای پێغەمبەروریگەی ڕۆیشتنی لێدەگرت، کاتێ گوێ بیستی ئەوەبوو کەخودا ئایەتی هەڕەشەی بەرامبەر خۆی و هاوسەرەکەی دابەزاندووە و هێناوەتە خوار. پێغەمبەرﷺ لەگەڵ ئەبوبکر لەلای مزگەوتی بیت دانیشتبوون(ام جميل) هاوسەری ئەبولەهەب بە بەردێکی زۆر گەورەوە بەرە و لای بیت چوو کاتێ حەزرەتی ئەبوبکر رضي الله عنهچاوی پێکەوت دەستی کرد بەگریان، پێغەمبەرﷺ پرسیاری لێکردنەی ئەبوبکر بۆچی دەگریەی، ئەبوبکررضي الله عنه لە وەڵامدا فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ وا(ئوم جەمیل )زۆر بەڕق‌و توڕەییەوەو بە بەردێکی زۆر گەورە بەرەو لای ئێمە دێت پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی ئەبوبکر وازی لێ بهێنە و گوێی مەدەیە چونکە ئەو ئافرەتە من نابینێ کاتێ نزیك بۆوەو گەیشتە لایان بە فەرمانی خودا چاوی بە پێغەمبەرﷺ نەکەوت تەنها ئەبوبەکری چاو پێکەوت کە هەردووکیان لە تەنیشت یەکترەوە دانیشتبون(ام جميل) بە ئەبوبەکری گوت: ئەبوبەکر کوا هاوەڵەکەت لەکوێیە؟هەواڵیان پێداوم کە بەخەراپە باسی کردووم: کەخودا فەرموویەتی: { وَٱمۡرَأَتُهُۥ حَمَّالَةَ ٱلۡحَطَبِ فِي جِيدِهَا حَبۡلٞ مِّن مَّسَدِۭ} المسد/٤-٥ واتە: ئەبولەهەب‌و هاوسەرەکەی کە لەدونیا هەڵگری کۆڵەدارو ئاژاوە و فیتنە گێڕی بوون لە نێوانی ئادەمیزادەکان‌و پێغەمبەرداﷺ، ئازار و سزای دەرونی جەستەیان زۆردەدا وە هەروەها ئەوانە مایەی کۆڵەداری دڕکاوی و ئاژاوەگێڕی تەواوبون بەرامبەر بە پێغەمبەری سەردارونازدار، وە کە لە دونیادا ملوانکەی زێڕو مرواری لەمل وگەردەنی دابووە لەڕۆژی دوایی پەت‌و گوریسی ئاگرینی لەملی دەهاڵێنن، سوێند بەخودا ئەگەر چاوم پێیبکەوێ ئەو بەردەی لەدەمی ئەدەم ئەوەندەی گوت‌و: گەڕایەوە چاوی بەپێغەمبەر ﷺ نەکەوت کەلەوێ دانیشتبوو لەگەڵ حەزرەتی عومەررضي الله عنه. إبن هشام ج١/٣٥

## گوانەكانی وەك و سەردەمی خۆی لێهاتەوە

## عاد الضرع كعهده

(عبدالله ی كوڕی مەسعودﷺ) دەفەرموێ: من منداڵێكی فامیدەبووم شوانی چەند سەر مەڕێكی (عوقبەی كوڕی موعیت) بوم دەم لەوەڕاند. لە كاتێدا پێغەمبەروﷺ ئەبوبەكرم بەلادا هاتن‌و فەرموویان: ئایا هیچ تۆزە شیرێكت لەلانیە بمان دەیە زۆرمان تینووە؟ منیش پێم گوتن بەخودا من چاودێرو لێپرسراو باوەڕ پێكراوی خاوەنی ئەو مەڕانەم ناتوانم هیچ شیرتان بدەمێ. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: باشە كاوڕێیەك یان كویشتیرێكت لە لا نییە بەرانی نەگرتبێ، منیش گوتم: بەڵێ لەلامە بەرخێكم بۆ گرتن‌و بۆم بردنە پێشەوە پێغەمبەرﷺ بەرخەكەی گرت‌و دەستی بە گوانەكانیدا هێنا لەخودا پاڕایەوە بەڵام من نەمدەزانی چی دەفەرموو لێی حاڵی نەدەبووم‌و تێنەدەگەیشتم هەر لەوكاتەدا ئەوبەرخە گوانەكانی پڕبوون لەشیر، ئینجا ئەبوبەكر بەردێكی قوڵی هێنا وشیریان تێدا دۆشی ئەبوبكر ﷺلێی خواردەوە دوای منیش لێیم خواردەوە ئینجا پێغەمبەریش لێی خواردەوە، دوای تێر خواردنەوە پێغەمبەرﷺ بە گوانەكانی فەرموو گچكەبەوە گوانەكانیش گچكەبوونەوە وەك‌وپێشوی لێهاتەوە.

## ئاو لەنێوانی پەنجەكانی هەڵدەقوڵی

## الماء يتفجرمن بين اصابعه

حەزرەتی( جابرﷺ) دەگێڕێتەوە كەبوخاری ڕیوایەتی كردووە دەفەرموێ: جارێك لەگەڵ پێغەمبەردا بووم كاتی نوێژی عەسرهات هیچ ئاومان پێنەمابوو تەنها كەمێك ئاوی پاشماوە و بەكارهات‌و نەبێت پێغەمبەرﷺ داوای ئەو ئاوەكەمەی كردولەناو قاپێك دا بۆیان هێنا چاوم لێی بوو پێغەمبەر بەپەنجەكانی دەستی تێوەردەدا دەیهێناو دەی برد دوایی فەرمووی: لەبەرەكەت‌و پیرۆزی خوداوەیە، وەرن بۆ دەست نوێژ، چاوم لێی بوو لەنێوانی هەموو پەنجەكانی دەستی

پێغەمبەردا ﷺ ئاو دەهاتە خوارو هەڵدەقوڵا یارەکانی پێغەمبەرﷺ دەستیان کرد بە دەستنوێژ هەڵگرتن و ئاو خواردنەوەو شت پڕکردن. لەو کاتەدا بەجابر یان وت: ئەی جابر ئێوە ئەوکاتە چەند کەسبوون؟ جابر وتی: ئەوکاتە (١٤٠٠) هەزارو چوار سەد کەس بووین. رواه البخاري ومسلم برقم/١٨٥٦

## لەشتەکەم وێنەکانی پێغەمبەرﷺ : من معجزات الرسولﷺ

کابرایەك پرسیاری لەهندی کچی ئەبی هالەی کەزر کچی ودایەنی پێغەمبەر بوو کرد گوتی: سەرسوڕهێنەر ترین شتێك کەلە پێغەمبەرت بیستبێت یان دیبێتت چی بووە بۆمان بگێڕەوە؟. ئەویش لەوەڵامدا گوتی: هەمووکارەکانی پێغەمبەر سەرسوڕهێنەرن وە لە هەمووی سەرسورهێنەر تریش کە خۆم دیتومە، من چەند حەیوانێکی کێویم هەبوو کەهۆگرو هاودەمیان بووم ئەو ڕۆژانەی کەلەلایان دەبوم بەهیچ جۆرێك ئەو حەیوانانە هەڵنەدەستان لەشوێنی خۆیان بە بەردەوامی چاویان دەبڕیە پێغەمبەری خودا بە هیچ جۆرێك خێسەی چاویان بەهیچ لایەکدا نەدەگێڕا کاتێ یەکێك لەلایان هەڵدەستا بەتەواوی چاویان تێدەبڕی کە دەڕۆیشت و، پشتی هەڵدەکرد هەموو هەست و نەستیان بەلایدا دەسوڕاند، کە لە بە چاویان دیارنەدەما کلکە سوێیەیان دەکردو، گوێیەکانیان دەلەقاندو، لەیەکیان دەدا بەڕاستی ئەو هەڵوێستەیان منی زۆر سەرسام کردبوو.

## بەزەیی هاتنەوەی پێغەمبەر ﷺ بەگیانداران
## رأفة الرسول بالبهائم

جارێك پێغەمبەری خوداﷺ بەلای ڕاوچیەك دا ڕۆیشت مامزێکی ڕاو کرد بوو بەستبویەوە. مامزەکە هاتە قسەو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوداگوانەکانم پڕ لە شیرن و دوو بێچوی بچوك و برسیم بەجێماوە ڕێگەم پێ بدەن بڕۆم بێچوەکانم شیر بدەم و تێریان بکەمو دوایی دەگەڕێمەوە بۆلات و لەشوێنی خۆی بم بەستنەوە پێغەمبەرﷺ فەرمووی: نێچیری کەسێکی کەدەستە بەرداری خۆشیەکانی دونیابووە،

# گوانەكانی وەك و سەردەمی خۆی لێهاتەوە

# عاد الضرع كعهده

(عبدالله ی کوڕی مەسعود‌رضي الله عنه) دەفەرموێ: من منداڵێکی فامیدەبووم شوانی چەند سەر مەڕێکی (عوقبەی کوڕی موعیت) بوم دەم لەوەڕاند. لە کاتێدا پێغەمبەروﷺ ئەبوبەکرم بەلادا هاتن‌و فەرموویان: ئایا هیچ تۆزە شیرێکت لەلانیە بمان دەیە زۆرمان تینووە؟ منیش پێم گوتن بەخودا من چاودێرو لێپرسراو باوەڕ پێکراوی خاوەنی ئەو مەڕانەم ناتوانم هیچ شیرتان بدەمێ. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: باشە کاوڕێیەك یان کویشتیرێکت لە لا نییە بەرانی نەگرتبێ، منیش گوتم: بەڵێ لەلامە بەرخێکم بۆ گرتن‌و بۆم بردنە پێشەوە پێغەمبەرﷺ بەرخەکەی گرت‌و دەستی بە گوانەکانیدا هێنا لەخودا پاڕایەوە بەڵام من نەمدەزانی چی دەفەرموو لێی حاڵی نەدەبووم‌و تێنەدەگەیشتم هەر لەوکاتەدا ئەوبەرخە گوانەکانی پڕبوون لەشیر، ئینجا ئەبوبەکر بەردێکی قوڵی هێنا وشیریان تێدا دۆشی ئەبوبکر رضي الله عنه لێی خواردەوە دوای منیش لێیم خواردەوە ئینجا پێغەمبەریش لێی خواردەوە، دوای تێر خواردنەوە پێغەمبەرﷺ بە گوانەکانی فەرموو گچکەبەوە گوانەکانیش گچکەبوونەوە وەك‌وپێشوی لێهاتەوە.

# ئاو لەنێوانی پەنجەكانی هەڵدەقوڵی

# الماء يتفجرمن بين اصابعه

حەزرەتی( جابررضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کەبوخاری ڕیوایەتی کردووە دەفەرموێ: جارێك لەگەڵ پێغەمبەردا بووم کاتی نوێژی عەسرهات هیچ ئاومان پێنەمابوَ تەنها کەمێك ئاوی پاشماوە و بەکارهات‌و نەبێت پێغەمبەرﷺ داوای ئەو ئاوەکەمەی کردولەناو قاپێك دا بۆیان هێنا چاوم لێی بوو پێغەمبەر بەپەنجەکانی دەستی تێوەردەدا دەیهێناو دەی برد دوایی فەرمووی: لەبەرەکەت‌و پیرۆزی خوداوەیە، وەرن بۆ دەست نوێژ، چاوم لێی بوو لەنێوانی هەموو پەنجەکانی دەستی

پێغەمبەردا ﷺ ئاو دەهاتە خوارو هەڵدەقوڵا یارەكانی پێغەمبەرﷺ دەستیان كرد بە دەستنوێژ هەڵگرتن و ئاو خواردنەوەو شت پڕكردن. لەو كاتەدا بەجابر یان وت: ئەی جابر ئێوە ئەوكاتە چەند كەسبوون؟ جابر وتی: ئەوكاتە (١٤٠٠) هەزارو چوار سەد كەس بووین. رواه البخاري ومسلم برقم/١٨٥٦

## لەشتەكەم وێنەكانی پێغەمبەرﷺ : من معجزات الرسولﷺ

كابرایەك پرسیاری لەهندی كچی ئەبی هالەی كەزر كچی‌ودایەنی پێغەمبەر بوو كرد گوتی: سەرسوڕهێنەر ترین شتێك كەلە پێغەمبەرت بیستبێت یان دیبێتت چی بووە بۆمان بگێڕەوە؟. ئەویش لەوەڵامدا گوتی: هەمووكارەكانی پێغەمبەر سەرسوڕهێنەرن وە لە هەمووی سەرسورهێنەر تریش كە خۆم دیتومە، من چەند حەیوانێكی كێویم هەبوو كەهۆگرو هاودەمیان بووم ئەو ڕۆژانەی كەلەلایان دەبوم بەهیچ جۆرێك ئەو حەیوانانە هەڵنەدەستان لەشوێنی خۆیان بە بەردەوامی چاویان دەبڕیە پێغەمبەری خودا بە هیچ جۆرێك خێسەی چاویان بەهیچ لایەكدا نەدەگێڕا كاتێ یەكێك لەلایان هەڵدەستا بەتەواوی چاویان تێدەبڕی كە دەڕۆیشت‌و، پشتی هەڵدەكرد هەموو هەست‌و نەستیان بەلایدا دەسوڕاند، كە لە بە چاویان دیارنەدەما كلكە سوێیەیان دەكردو، گوێیەكانیان دەلەقاندو، لەیەكیان دەدا بەڕاستی ئەو هەڵوێستەیان منی زۆر سەرسام كردبوو.

## بەزەیی هاتنەوەی پێغەمبەر ﷺ بەگیانداران
## رأفة الرسول بالبهائم

جارێك پێغەمبەری خوداﷺ بەلای ڕاوچیەك دا ڕۆیشت مامزێكی ڕاو كرد بوو بەستبویەوە. مامزەكە هاتە قسەو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوداگوانەكانم پڕ لە شیرن‌و دوو بێچوی بچوك‌و برسیم بەجێماوە ڕێگەم پێ بدەن بڕۆم بێچوەكانم شیر بدەم‌و تێریان بكەم‌و دوایی دەگەڕێمەوە بۆلات‌و لەشوێنی خۆی بم بەستنەوە پێغەمبەرﷺ فەرمووی: نێچیری كەسێكی كەدەستە بەرداری خۆشیەكانی دونیابووە،

مامزەکە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا پەیمانت پێدەدەم کەمن بۆلات دەگەڕێمەوە پێغەمبەرﷺ پەیمانی لێوەرگرتو بەری داو ڕۆیشت ماوەیەکی زۆری نەبرد مامزە کە گەڕایەوەو شیری گوانەکانی بەتاڵ ببوو پێغەمبەر بانگی ڕاهێشت ئەومامزە خاوەنی کێیە؟ گوتیان: ئیفلانەکەسە پێغەمبەرﷺ داوای پێبەخشینی لێکردوو، پێیان بەخشی پێغەمبەریش بەرەڵای کردو مامزەکە ڕۆیشت ئینجا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەگەر گیان لەبەران دەیان زانی وەك و ئێمە شت دەزانین لەبارەی مردنەوە لەژیانتاندا گیانلەبەرێکی قەڵەوتان نەدەخوارد.

# جێگەی سەرسوڕمانە گورگ قسەدەکات

# عجبا لذئب یتکلم

دەگێڕنەوە کە ئەبا (سوفیانی کوڕی حەرب)و(سەفوانی کوڕی ئومەیەی کوڕی خەڵەف) لەمەکەدەرچون. وەختێك چاویان بەگورگێك کەوت بەدوای مامزێکەوە بوو زۆری نەمابوو گورگەکە سواری پشتی مامزەکە ببێت مامزەکە ڕوویکردە حەرەمی بەیت. گورگە کە خێرا وازی لێ هێناو گەڕایە دواوە (ئەبوو سوفیان) گوتی: ( ماأرض سکنها قوم أفضل من أرض أسکنها ألله إیانا) واتە: هیچ خاکێك نیە خەڵکانێکی لێ نیشتە جێبێ چاکتر بێت لەوخاکەی کەخودا ئێمەی لێ نیشتە جێکردووە؟ ئەی سەفوان سەیرت کرد ئەو گورگە لەو کاتەدا چی کرد، سەرسامترین شت ئەوە بوو کە مامزەکە ڕای کردەحەرەم و، گورگەکەش گەڕایەوە، هاتە قسەوگوتی: لەوەش سەرسام ترین شت ئەوەیە کە(محمدی کوڕی عبدالله ی کوڕی عبدالمتلب) لەمەدینە داواتان لێدەکات بڕۆنە بەهەشت، بەلاّم بۆ خۆتان داوای چونەناو ئاگر دەکەن : (ئەبو سوفیان) گوتی: سوێند (بەلات وعوزا)ئەگەر قسەی ئەوگورگە بۆ خەڵکی مەکە بگێڕمەوە یەك کەس بەدەورەمانەوە نامێنێ و شوێن کەوتەمان چۆڵدەبێ، وەهەر لەو بارەوە باسکراوە کە(ڕافعی کوڕی عەمیرەی کوڕی جابری) شوانی مەڕومالاّت بوو. جارێك گورك کەوتە ناو مەڕەکانیەوە باشترین و گەورەترین مەڕی لەگەڵ خۆیدا برد (ڕافعیش )خۆی ئامادەکردو بەدوای کەوت بۆ ئەوەی لێی وەربگرێتەوە ڕافع گوتی: من سەرم لەوە سوڕماوە کە ئەو گورگە چۆن ئاوا باشترین و گەورە

ترین مەڕی لەگەڵ خۆیدا بردوە هێشتا گورگەکە زۆر دوور نەکەوتبۆوە گوتی: (ڕافع) سەرسامترین شت کە پێویستە سەرسامت بکات ئەوەیە، خودای گەورە ڕزق و خواردەمەنیەکی پێ بەخشیوم بەڵام تۆی ئادەمیزاد بەڕەوای منی نابینی و، بەدوام کەوتووی لێم بستێنیەوە دوایی (ڕافع) گوتی: بەڕاستی سەرسوڕمانە گورك قسەبکات، دووبارە گورگەکە هاتەوە قسەو گوتی: (ڕافع) لەوەش سەرسورهێنەر تر ئەوەیە ئەوەی کەلەلای (توهامە)وە هاتووە داواتان لێدەکات بۆ بەهەشت بڕۆن، بەڵام ئێوە بەرگری لێدەکەن و دەڵێن: تەنها بۆناو ئاگری دەڕۆین. کابرا خێرا ڕۆیشت بۆلای پێغەمبەر ﷺ، پێشی کابرا خودای گەورە بەبۆنەی حەزرەتی جبرائیل پێغەمبەری ﷺ ئاگادارکردەوە لەو هەواڵ و خەبەرەی کە کابرا دەیویسیت ئاگاداری بکاتەوە لەو بەسەرهات و ڕوەداوە، دوای ئەوەی کابرا گەیشتە لای پێغەمبەر ﷺ پێغەمبەر بۆخۆی هەواڵ و ڕوداوەکەی بۆ کابرا گێڕایەوە کابراش هەرخێراباوەڕی هێناو موسڵمان بوو. ئەم چیرۆکە لە ڕێگای زۆر لە هاوەڵە بەڕێزەکانەوە گێڕدراوەتەوە خودایان لێ ڕازی بێت: وەکو ئەبو سەعیدی خودری و، سەلەمەی کوڕی ئەکوەع و، ئیبن ئەبوو وەهەب و، ئەبو هورەیرە. وإمام احمدبرقم/٨٠٤٩-وترمذي و، حاكم.

## مەڕێکی بچوك
## الشاة الصغيرة

لە (جابری کوری عبداللە ﷺ) وە دەگێڕنەوە فەرموویەتی: لەخزمەت پێغەمبەر ﷺ دا ئیشمان دەکرد لەهەڵکەندنی خەندەق، لەماڵەوە مەڕێکی لاوازی بچوکمان هەبوو گۆشتی زۆرپێوە نەبوو، گوتم: بەخوا وا باشە ئەمڕۆ ئەو مەڕەی بۆ پێغەمبەر ﷺ سەربڕم: تۆزێکیش جۆمان هەبوو، بەهاوسەرەکەم گوت بڕۆ ئەوجۆیەش بهاڕەو بیکە بەئاردو بیشێلەو بیکە بەنان، مەڕەکەمان سەربڕی و کردمانەمەڕەگەو ، کەئێوارە داهات دەستیان لەئیش هەڵگرت و پێغەمبەر ویستی بڕواتەوە ماڵ منیش بەدزیەوە ڕۆیشتمە لای پێغەمبەر و ﷺ گوتم: ئەی پێغەمبەری

خوداﷺ من مەرەگەیێکم بۆ دروست کردوی لەگەڵ چەند نانێکی جۆ حەزدەکەم لەگەڵ مندا پێکەوە بڕۆینەوە ماڵ، من وام حەز دەکرد تەنها منو پێغەمبەرﷺبین بۆ ئەوەی بەباشی خواردنەکەبەشمان بکاتوکەس لەگەڵماندا نەیەتەوە بەڵام کاتێ بەپێغەمبەرمﷺوت، فەرمووی: زۆرباشە هەرخێرا بانگی کەسێکی کردو، وتی بانگ ڕابێڵە هەموو ئەو خەڵکە بگەڕێنەوە بابڕۆن بۆماڵی جابر: لەلایەکی ترەوە جابرﷺ لەبەر شەرمەزاری نەی دەزانی چی بکات بۆیە دەی گوت: ئەی خودایە من چیم بەخۆم کرد(إنالله وإناإليه راجعون) پێغەمبەرﷺ ڕووی کردە ماڵمانو هەمووخەڵکەکەش بەدوای پێغەمبەرﷺکەوتن بەرەو ماڵی ئێمە منیش ئەوەندەی کە نانو خواردنمان هەبوو هەموویم هێنا بۆ لای پێغەمبەرو دام نا پێغەمبەرﷺ بسم اللەی کردوو کۆمەڵێك دەستیان کرد بەخواردن ئەو کۆمەڵە تێر دەبوو ئەوان لادەچونو کۆمەڵێکی تر دەهاتن دادەنیشتنو دەستیان دەکرد بەخواردن هەتا ئەوانیش تێر دەبوون، بەوجۆرە هەتا هەموو خەڵکەچاڵ هەڵکەنەکان تێریان خوارد ئەوەش بە بەرەکەتی دوعای پێغەمبەربووﷺ.

## لە بەرەکەتو پیرۆزی پێغەمبەرەﷺ
## من بركة الرسولﷺ

(محمدی کوڕی ئیسحاق) دەگێڕێتەوەکچێکی (بەشیری کوری سەعد)وتی: دایکم بانگی کردم (عومرەی کچی ڕەواحە)چنگێك خورمای دامێو منیش لە کۆشم کردوو پێی وتم: کیژۆڵە ئەو خورمایە بۆ باوکت بەرە، لەدوای ئەوە من ڕۆیشتمو، بەلای پێغەمبەردا تێپەڕیمو خێرا ڕۆیشتم بۆئەوەی زوو بگەمە لای باوکم، پێغەمبەرﷺ لە سەرچاڵ هەڵکەندنەکە بوو، بانگی لێکردم گیژۆڵە وەرە بۆلای ئێرە منیش زۆر تەنگە تاو بووم زووبگەمە لای باوکم، بەڵام پێغەمبەرﷺفەرمووی: کیژۆڵە ئەوەی پێتە بۆم بهێنە بزانم چییە؟ منیش هەموو خورمایەکەم کردە ناو دەستی پێغەمبەر بەڵام خورمایەکە زۆر نەبوو دەستی پێغەمبەری پڕ نەکرد دوایی پێغەمبەرﷺ فەرمووی: قوماشو بەرگێکم بۆ بهێنە ئێمەش بۆمان هێناو ڕایخستو

خورمایەکەی خستەسەر قوماش‌و ڕاخەرەکە، بەجۆرێك خورمایەکە زۆر بوو کە لەسەر ئەو پارچە ڕاخەرە جێگەی نەدەبۆوە پێغەمبەرﷺ پیاوێکی لەلابوو پێی فەرموو: بانگی خەڵکانی چاڵهەڵکەن بکەن با بێن لەباتی خواردنی نیوەڕۆ خورما بخۆن هەمووخەڵکەکە لە دەورەی خورمایەکە کۆبوونەوە دەستیان کرد بەخواردن، هەتا لێیان دەخوارد ئەو خورمایە زیاتر دەبوو هەمووخەڵکی چاڵ هەڵکەنەکان تێر بوون‌و خورمایەکە لەسەر ئەوقوماش‌و ڕاخەرە هەر زۆر دەبوو لەهەرچوار لایەوە لێی دەڕژایەوەو جێگەی نەدەبۆوە.

## ئای لەتۆ ئەبو سوفیان هێشتا کاتی نەهاتووە
## ويلك يا أبا سفيان ماآن لك ذالك

کاتێ پێغەمبەری خوداﷺپەیمانی سەر بەستی‌و دڵنیایی بە (ئەبو سفیانی کوڕی حەرب) دا پێغەمبەرﷺ بەعەباسی مامی فەرموو: هەستە بڕۆ ئەبو سفیان بەرە بۆ لای خەیمەو چادرەکانی خۆت تابەیانی کاتێ ئەبوسفیان ڕۆیشتە لای عەباس ئەبو سفیان پەشیمان بۆوە لەوکارو هەڵوێسەی کەکردویەتی کەخۆی تەسلیم بە پێغەمبەر کردووە لەدڵی خۆیدا گوتی: باشە ئەوە چی کردەوەیەکی ناڕوایە کەمن کردومەو بەدەستی خۆم چیم کردوە بەخۆم؟ ئەگەر ئەمن کۆمەڵە خەڵکێکی زۆری هۆزو نەوەکانم کۆکردبایەوە لەدەورو بەرو کەنانەو بەگژ محمد و هاوڕێکانیدا بچو باینایەوە زۆر باشترو چاکتر بوو بەسەریاندا سەردەکەوتین، پێغەمبەرﷺ لەژێر خەیمەکەی خۆی دا هەستی بەو بیر وخەیاڵا نەی ئەبو سوفیان دەکرد بۆیە بانگی ئەبوسوفیانی کردو پێی فەرموو: ئەبو سوفیان ئەو بیر و خەیاڵە پڕو پوچ و خەراپانە لەدڵت دەربکە دەنا خودا سوك‌و ڕیسوات دەکات ئەبوسفیان هەرخێرا بەعەباسی گوت: ئەی عەباس خێرا بمبە بۆ لای کوڕی براکەت. عەباس گوتی: ئای لەتۆ ئەبو سوفیان هێشتا کاتی ئەوە نەهاتووە کەبت بەم بۆ لای، لە دواییدا کە ئەبوسوفیان ڕۆیشتە لای پێغەمبەرﷺ پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خودا داوای لێبوردنت لێدەکەم کەبەڕاستی بیروخەتەرەیەکی خەراپم بەدڵ‌و بیرداهات ئێستاش بە بیروباوەڕێکی ڕاستیەوە دەڵێم (أشهدأن لاإله إلا الله وأنك رسول الله).

## ئێمە دەستەبەری گاڵتە جاڕانتان لێ دەکەین

## إنا كفيناك المستهزئين

(عەباسی کوڕی عبدالمتلب‌رضي الله عنه) بۆمان باس دەکات و دەفەرموێ: ڕۆژێك لە مزگەوت دانیشتبوم (ئەبوجەهل) هاتە پێشەوەو گوتی: سوێند دەخۆم کاتێ(محمد) بدینم بێتە ئێرە و نوێژ بکات و بچێتە کڕنۆش پێم لەسەر سەر و ئەستۆی دادەنێم. ئەو خەبەرەیان بە پێغەمبەرﷺ گەیاند کەنەڕواتە مزگەوت و ئاگای لەخۆی بێت پێغەمبەرﷺ هەرکە هەواڵەکەی پێدراخێرا زۆربە توڕەییەوە هەستا وبەرە و مزگەوت کەوتەڕێ لەبەر خێرایی و توڕەیی پێڕانەگەیشت بڕواتە لای دەرگاو بەوێدا بڕواتە ژورەوە، هەر خێراخۆی فرێدایە سەر دیوارەکە و ڕۆیشتە مزگەوت و نوێژی دابەست و دەستی بە خوێندنی سوڕەتی (علق) کرد هەتا گەیشتە ئەو ئایەتەی کە باسی ئەبو جەهل دەکات و دەفەرموێ: ﴿كَلَّآ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَيَطۡغَىٰٓ أَن رَّءَاهُ ٱسۡتَغۡنَىٰٓ﴾ : العلق/٦-٧ واتە: لەدوای تەواوکردنی سوڕەتەکە پێغەمبەرﷺڕۆیشتە کڕنۆش، یەکێك لە دانیشتوا ن ڕۆیشت بە ئەبوجەهلی گوت:ئەی ئەباحەکەم، ئەوە محمدە ڕۆیشتە کڕنۆش ئەبوجەهلیش هەرخێرا بەرە و لای محمد ڕۆیشت بەڵام کەلێی نزیك بۆوە هەرخێرا بەرەو دواوە پاشەوپاش کشایەوە بەرە و دواوە پێیان گوت: ئەی ئەباحەکەم ئەتۆ ئەو هەموو هەڕەشەت کرد کەچی دەکەی ئەدی بۆچی واز و گەڕایەوەو کارەکەت بەجێ نەهێنا ؟ئەبوجەهل گوتی:بە خودا کە ڕۆیشتمە پێشەوە چاڵێکی زۆر گەورە لە ئاگر هەبوو کە زیاتر بڕۆیشتبامایە دەکەوتمە ناو ئەو ئاگرە. إبن كثير/ج/١/ص/٤٦٧

## شتێکی کەم وێنە لەکاتی کۆچ کردن دا

## معجزة أثناء الهجرة

لە کاتی کۆچ کردندا پێغەمبەرﷺ لەگەڵ حەزرەتی ئەبوبکردا رضي الله عنه ئارەزویان بوو لە جێگەیەکدا پشو بدەن و بحەسێنەوە. برسیان بوو دەیانویست خواردنو، ئازوخەیەك پەیدا بکەن بۆ خواردنیان، بارگەیان لەلای دایکی مەعبەدی خست کە بەڕاستی(ام مەعبەد) لەنا خۆشترین بژێوی ژیان و هەژاریدا دەیگوزەراند، چونکە

ساڵێکی وشكو بێبارانو بێ گیاو تەڕی و سەوزایی بوو گیاندارەکانیان برسی وبێ خۆراك بوون و گوانی ئاژەڵەکانیان گەورە و بێشیر بوو بەڵام پێغەمبەر و ئەبوبەکر بە ناچاری ڕوویان لەماڵی دایکی مەعبەدکرد داوایان لێ کرد کە هەر شتێکیان هەیە لەگۆشت، لەخواردن، لەنان، لەخورما، لەشیر، یا هەر جۆرە خواردنێك هەیانە پێیان بفرۆشن، بەڵام ئوم مەعبەد گوتی: سوێند بە خودا ئەگەر هەر شتێکمان لە لابوایە بەبێ فرۆشتن ئێوەمان بێبەش نەدەکرد: لەو کاتەدا پێغەمبەرﷺ چاوی بە کویشتیرێکی لاوازی لەڕ و لاواز و بێهێز کەوت کەلەگەڵ مێگەل بڕببوو، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەو کویشتیرە شیری تێدایە؟دایکی مەعبەد گوتی: بەخودا ئەوە زۆرلاوازو لەڕەو هیچ شیری تێدانییە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: باشە تۆ ڕێگەمان پێدەدەی ئەو کویشتیرە لەڕو لاوازە بدۆشین؟ دایکی مەعبەدگوتی: بەخودا هێشتا ئەو کویشتیرە بەرانی نەدیتوە و شیری تێدانییە ئەگەر شیریشی تێدابوایە بەخودا من بۆخۆم بۆم دەدۆشین؟ پێغەمبەرﷺ دەستی پیرۆزی بە سەر پشتی کویشتیرەکەدا هێناوناوی خودای برد و دەستی بە گوانەکانی داهێنا شیر وەكو پلوسك بەگوانەکانیدا دەهاتە خوار پێغەمبەرﷺ داوای قاپێکی گەورەی کرد بۆیان هێناو لەبەر بەهێزی هاتنە خوارەوەی شیر لە گوانەکانی دەنگ و خوڕەی شیرەکە دەهات، دایکی مەعبەد هاتە پێشەوەو دەستی کرد بە خواردنەوەی شیر هەتا تێربوو ئەوانەی کەلەوێش ئامادەبوون هەموویان خواردیانەوەو تێربوون، لەدوای هەموویان پێغەمبەریش ﷺ دەستی بەخواردنەوە کرد هەتا تێربوو. بەوجۆرە پێغەمبەری خوداﷺبووبە بەرەکەت و میهرەبانی بۆ ئەو دەڤەرە و بەسەریاندا ڕژا، بارانیان بۆ باری و گیاو گوڵ سەوزبوو ئاو ژیانەوە و گوانی گیان دارەکانیان پڕبوونەوە لەشیر. هەزاران سەلاتو سەلام بۆ گیانی پاکی پێغەمبەری سەربەرزی ئیسلامبێت. إبن هشام/ج/١/ص/٤٨٨–المشكاة برقم–٥٩٤٣–وحاكم–٩–١٠٩وصححه.

## کۆتەرە دارێك بوو بەشیر
## جزل من حطب إنقلب إلى سيف

(عەکاشەی کوڕی میحسەنی کوڕی حەسانی ئەسەدی ﷺ) لە ڕۆژی بەدردا بە شیرێك شەڕی دەکردو دەجەنگا، بەڵام لە ناوەندی شەڕ و پێکدادانی جەنگاوەران شیرەکەی شکاو پەڕی، هەر خێرا خۆی گەیاندە پێغەمبەری خوداو ﷺ داوای شیری لێکرد لەو کاتەشدا پێغەمبەر ﷺ هیچ شتێکی لە لا نەبوو تەنها کۆلکەدارێکی ڕەقی لەلابوو پێغەمبەریش ﷺ کۆلکەدارەکەی دایەدەستی عەکاشەو فەرمووی: بەودارە بجەنگە و شەڕبکە ئەی عەکاشە، کاتێ عەکاشە دارەکەی وەرگرت، دەفەرموێ: بەخودا کەدارەکەم وەرگرت لەناو دەستمدا لەرزەیەکی بەهێزی لێهات و کەسەیرم کرد ئەودارە ببوو بەشیرێکی بڕندەی بەهێزو درێژو لەسپیان دەدرەوشایەوە، عەکاشە شەڕی پێکرد هەتا موسڵمانان سەرکەوتن. لەدواییدا ئەو شیرەیان ناولێنا شیری یارمەتی دەر (ألعون) وە ئەو شیرەی بۆماوەیەکی زۆر دوورو درێژ لەلای مایەوەو چەندین جەنگو شەڕی خوێناوی لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ئەنجام داوەو ماوەتەوە. إبن هشام/ج/١/٦٣٧.

## تۆ ئەو کویشتیرەت ژەهراوی کردووە
## انت سممت هذه الشاة

پێغەمبەری خودا ﷺ لەدوای جەنگی قەڵای خەیبەرورزگاری کردنی.زەینەبەی کچی حارس مەڕێکی کوڵاو ئامادەکراوی ژەهراوی کردوو بۆ پێغەمبەرو ﷺ یارەکانی برد. پێغەمبەر ﷺ پاروویەکی ئامادەکرد و خواردی و هێندێك لە یارەکانیشی لێیان خوارد، دوا یی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دەست هەڵگرن و ئەو خواردنە مەخۆن؟ هەموویان لە خوار دنەکە کشانەوە دواوەو، پێغەمبەر ﷺ بە دوای زەینەبەی کچی حارسی داناردکە خێرا بێتو ئامادەبێت؟ کەگەیشتو ئامادەبوو پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێکرد و فەرمووی: تۆ ئەو کویشتیرەت ژەهراوی کردوە، پێم بڵێ لەبەر

چی؟ زەینەبە گوتی:کێ هەواڵی پێگەیاندی کە ئەو کویشتیرە دەرماندا و کراوە؟ پێغەمبەر فەرمووی: ئەو قۆڵبەندەی کە لەدەستم دایە هەواڵی ژەهراویەکەی پێدام، زەینەبە گوتی:بەڵێ من ژەهراویم کردووە، بۆئەوەی ڕاستی پێغەمبەرایەتی تۆم بۆ دەربکەوێ، گوتم: ئەگەر تۆبەڕاستی پێغەمبەر بیت ئەو ژەهراویە هیچ ئازارو زەرەرت پێناگەیەنێ: وەئەگەر پێغەمبەریش ﷺ نەبیت ئەوە ئێمە لەدەستت ئازادو ڕزگارمان دەبێت: پێغەمبەر ﷺ لەبەر ڕاست گۆیی گوتەی زەینەبە ئازادی کردوو لێی خۆش بوو.إبن هشام /ج/ ٢/ ص/ ٣٣٨

## بازنەی کیسری: سواری کسری

کاتێ پێغەمبەری خوداﷺ کۆچی کرد بۆ مەدینە حەزرەتی ئەبوبەکر لەگەڵیدا هاوڕێی ڕێگای بوو، سوڕاقەی کوڕی مالك لەخۆشی دووسەدحوشتری خەڵات و دیاری بۆ ئەو کەسەی ڕێگەیان دیاری بکات و یان بیان گرێت، بەدوایاندا دەگەڕا بە هەموو لایەکدا هەتا لە جێگەیەك چاوی پێکەوتن و بەرەو لایان ڕۆیشت بەهەست و بیرێکی خەراپەوە کە نزیك بۆوە پێغەمبەرﷺیەکەمین فەرموودەی بە سوراقەی فەرموو: لەوکاتی بێدەسەلاتی و بێهێزی و نەدارییەدا فەرمووی: سوراقە بەلاتەوە چۆنە کە بازنەی کسری لەبەربکەیت: سوڕاقە بەسەر سوڕمانێکەوە گوتی: (کسرای کوڕی هەرمز) بەڕاستی ئەو وتەیە بێجگە لە خودا هیچ کەسێ نەیدەزانی کە لە گیانی سوراقە دابەدی بکرێت سوراقەیەکی بێباوەڕ و پێغەمبەرێکی دەرکراو لە وڵات و نیشتمانی و بێ پەناو پشتیوان لە هیچ کەس و دەوڵەتێکەوە، داوای سەر کەوتنێك دەکات بەسەر گەورەتین ئیمپرا تۆری کسرای فارس؟!!دیارە پێغەمبەری خوداﷺ ئەو وتەیەی لەخۆیەوە نەووتوە، بەڵکو باوەڕی بەدەسەلات و بە تواناو هێزێکی بێپایان هەبووەبۆی لەکاردایە، کە خودای بەدیهێنەرە و ئەو پێغەمبەرش ﷺ بەڕاستی بە دڵنیاییەوە جێگەی متمانەو باوەڕی بووە.

ئینجا ئەو فەرموودەی پێغەمبەری خوداﷺلەکاتی فەرمانڕەوایی حەزرەتی عومەری کوڕی خەتاب ﷺ هاتەدی، کاتێ دەستکەوتی سەرکەوتنی جەنگی فارس هات و لە نێوانی موسڵماناندا دابەش کرا حەزرەتی عومەر ﷺفەرموودەکەی پێغەمبەری خودای ﷺ کەوتەوە یاد کە پەیمان و بەڵێنی بە سوراقەدا بوو، حەزرەتی عومەرﷺ باسی تاقمە

بازنە کانی کیسرای کرد و بۆیان هێناو دایانە دەستی، ئینجا بانگی ڕاهێشت ئایاسوراقەی کوڕی مالك لەکوێیە؟ لە ناو ئەو جەماوەرەدا هەیە؟ وەلامیان دایەوە بەڵێ سوراقە هەستایە سەرپێ گوتی: ئەی پێشەوای موسلمانان لێرە ئامادەم حەزرەتی عومەر رضي الله عنه فەرمووی: وەرە پێش، ئینجا بازنەکانی بەسوراقە بەخشیوپێی گوت: هەستە لەبەریان بکەو سەرکەوە سەر ئەو مینبەرە و دەستەکانت بەرزبکەوە بۆ ئاسمانو بڵێ:

بەڵێ بەڕاستی ئەی پێغەمبەری خوداﷺ ڕاستت فەرموو.رواه البخاري/٤/٢٤٥–ومسلم/٩/٢٠٠–واحمد

# مزگێنی پێغەمبەری خوداﷺ بۆ یارەکانی

# بشارة الرسولﷺلصحابته

خەبابی کوڕی ئەرەت رضي الله عنه یەکێك بوو لەو یارانەی کە بە ئاگرو داخکردن ئازار و سزا دەدرا ڕۆژێك پێغەمبەرﷺلەبن سێبەری کەعبە عەبایەکەی ڕاخستبو دانیشت بوو پالی دابۆوە، خەباب رضي الله عنههاتە خزمەتی پێغەمبەری خوداوﷺوتی: ئەی نێردراوی خودا بۆچی دوعا و نزامان بۆ ناکەی لەو ئازارو سزایانەی بێباوەڕان ڕزگارمان بێت ؟ پێغەمبەرﷺ هەستاو دانیشت و ڕوخساری سور هەڵگەڕابوو فەرموی: ئەی خەباب ئەوە تۆ دەڵێی چی پێشینانی ئێوە بەشانەی ئاسن ئازاریان ئەدانو هەموو گۆشتەکانیان دا دەڕنیو لێیان دەکردنەوە تەنها ئێسك و دەماریان ئەمایەوە بەلام ، ئەو هەمووئازارو سزایەیان نەبووە مایەی هەڵگەڕانو پەشیمان بوونەوەیان لە بەرنامەو ئاینەکەیان ! مشاریان لەسەر سەریان دادەناو دەیان کردن بەدووکەوتەوە بەو هەموو ئازارانەشیان لەئاین هەڵنەدەگەڕانەوەو لایان نەدەداو نافەرمانی خودایان نەدەکرد سوێند بەخودا خودای بەدەسەلات ئەو دەورە و کاتە ئەسوڕێنێ بەجۆرێك ئادەمیزاد بەتەنهاوتاقە سوار لە(سەنعا)ی یەمەنەوە دێت بۆ حەزەرمەوت) لەخودا نەبێ لە کەسی تر ناترسێ.

# شتێکی کەموێنەی پێغەمبەری خودا ﷺ لە پێشی پێغەمبەرایەتی
# معجزة قبل النبوة ﷺ

پێغەمبەری خودا ﷺ لە پێشی هاتنی پەیامی پێغەمبەرایەتی بەردەوام لەگەڵ ئەبو تالیبی مامی دەگەڕا وەك و سێبەر بەدەورەیدا (عەباسی ﷺ مامی پێغەمبەر ﷺ داوای لە ئەبوتالیبی برای کرد کە هێندێك باسی هەڵسوکەوت و ڕەفتاری پێغەمبەری ﷺ بەمندالّی بۆ بکات: ئەویش وتی: کە محمد دەچێتەسەر سفرەی خواردن ناوی خودا دەهێنێ کەتێری خوارد (الحمدلله) سوپاسی خودا دەکات، کە ئەو سەردەمە هیچیان ئەو ڕەفتارو ڕەوشتەیان نەبوو. شەوێکی زۆر گەرما داوامان لێکرد وەك و دابونەریتی عەرەب کە جلەکانی دابنێ هەستمان پێکرد زۆری پێناخۆش بوو بەلاّم، نەیدەویست نافەرمانی ئێمە بکات، بۆیە بەمامی فەرموو: مامە ئێوە سەیری من مەکەن چونکە دروست نیە کەس سەیری کەس بکات، دوایی ڕاکشاو نوست. ئەبوتالیب گوتی: سوێند بەخودا لە نێوانی من و ئەودا بەرگ و پۆشاکێکی زۆر نەرم و شل هەبوو کە لە ئاوریشم نەرم تربوو بۆنی لەبۆنی مسك خۆشتر بوو نەم دەزانی ئەو بەرگ و پۆشاکە لەکوێوە هاتوەوکێ بۆی هێناوە؟.

# ئەبو تەلحە و کولێرەیەکی جۆ
# ابوطلحة واقراص الشعير

(ئەنەسی کوڕی مالك ﷺ) دەفەرموێ: (ئەبو تەلحە ﷺ)ی ئەنساری بەهاوسەرەکەی گوت : کەناوی(ام سولەیم) بوو: گوێم لەدەنگی پێغمبەری خودا ﷺ بوو زۆر بێ هێز بوو وادیار بوو زۆری برسی بووبێت :هیچ خواردنێك لەماڵمان شك دەبەی بۆ پێغەمبەر؟ (ام سولەیم) وتی: بەڵێ کولێرەیەکی جۆمان هەیە، هێنایە دەرو لەناو سەرپۆشێکی ئالاّندو لەژێر پۆشاکەکەیدا شاردیەوەو، منی بۆ لای پێغەمبەری ﷺ نارد، کەڕۆیشتمە مزگەوت پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ کۆمەڵێکی زۆری لەیارەکانی لەدەورەی دانیشتبوون، منیش ڕاوەستام و دەنگم نەکرد: پێغەمبەر ﷺ بۆخۆی

فەرمووی: (ئەنەس ) (ئەبو تەلحە) تۆی ناردووە بۆلامان: منیش گوتم بەڵێ: فەرمووی: بۆخواردنە؟ وتم: بەڵێ، پێغەمبەرﷺ بەو هەموو خەڵكەی كە لە دەورەی بوون فەرمووی: هەستن بابڕۆین، هەموو هەستان و بەرەو ماڵی (ئەبو تەلحە) ڕۆیشتن. منیش خێرا لەپێشەوە ڕام كرد بەرەو ماڵی (ئەبوتەلحە)و هەواڵی پێغەمبەرو جەماوەرەكەم پێدا: (ئەبو تەلحە) بەخێزانەكەی ڕاگەیاند: (ئوم سولەیم) بەرپرستی شەرمەزاری بۆخۆمان وا پێغەمبەرﷺ هات و جەماوەرێكی زۆری هێناوە لەگەڵدایە ئێمەش تەنها ئەو كولێرە جۆیەمان هەیە چی بكەین؟ (ئوم سولەیم) گوتی: پیاوەكە خەجاڵەتی ناوێت خوداو پێغەمبەری خوداﷺ باشتر دەزانن لە ئێمە (ئەبو تەلحە) خێرا بۆ پێشوازی پێغەمبەری خوداﷺڕۆیشتە پێشەوەو پێشوازی لێكردن. هەتا هەموویان ڕۆیشتنە ماڵەوە، پێغەمبەرﷺفەرمووی: ئەی ( ئوم سولەیم) چیتان هەیە ئامادەی بكەو بۆمان بهێنن: ئەویش كە تەنها كولێرەیەكی جۆیان هەبوو ئامادەی كردوو لەناو دەفرێكی گەورەو گەرمی داناو بەسەر یەكیدا تێكیدا. قاپەكە پڕبوو پێغەمبەرﷺسەیری دەكردوو فەرمووی (١٠) دەنەفەر، دەنەفەر با بێنە پێشەوە ئەوانە تێریان دەخواردو دەڕۆیشتن و(١٠) دە نەفەری تر دەهاتە پێش، هەتا هەموویان بەتەواوی تێریان خوارد، كە كۆی خەڵكەكە (٧٠) حەفتا نەفەربوون... متفق علیه.

# ئەو چاوانە ناشیرین و تێكبچن
# شاهت الوجوه

دەگێڕنەوە( فاتمەی كچی پێغەمبەر) ڕۆژێك ڕۆیشتە لای پێغەمبەرﷺ بە گریانەوە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: كچی خۆشەویستم بۆچی دەگریەی؟ گوتی: ئەی بابەگیان چۆن نەگریەم ئەو هەموو جەماوەرەی قوڕەیش لەلای كەعبە ڕاوەستاون سوێندو پەیمان بۆ یەك دەخۆن بەلات و، عوزاو، مەناتیان، كە هەركات تۆ بدینن شاڵاو پەلامارت بۆ بهێنن و بە هەموویان بەیەك دەست بت كوژن و لەناوت بەرن: پێغەمبەرﷺ زۆر بەهێمنی و بێشڵەژان وتی: ئەی فاتمە بڕۆ ئاوی دەستنوێژم بۆ

بهێنە پێغەمبەرﷺدەستنوێژی هەڵگرت و بەرەو مزگەوت کەوتەڕێ، کە بێباوەڕان چاویان بە پێغەمبەرکەوت هەموو بەجارێك وتیان: ئەوا محمد هات، کە نزیکبۆوە، پێغەمبەرﷺچنگێك خۆڵی هەڵگرتەوەو بەرەو ڕویانی فڕێداو فەرمووی:( شاهت الوجوه ) واتە: ئەو چاوانە ناشیرین و تێك بچن، ئەو هەموو سوێندخۆرانە سەریان ڕادەوەشاند و ملیان بۆ زەوی شۆڕکردەوە و کەسێکیان تێدا نەبوو بتوانێ بەرامبەر بە پێغەمبەرﷺ سەر بەرز بکاتەوە: وە هەر کەسێکیان ئەو خۆڵەی بەرچاوی کەوت، لە ڕۆژی بەدردا بەکافری کوژرا.

## شتێکی کەم وێنەی نەدیتراوی دابونەریت

## معجزات خاریقة للعادة

لەوکاتەی کەپێغەمبەری خوداﷺ بەدەستی پیرۆزی ئیشارەی کرد بۆمانگ و، بووبەدووکەرتەوە و خەڵکی( مەککە) بەچاوی خۆیان چاویان پێکەوت کەدوو ڕووناکی زۆرگەورە شەوق و ڕووناکیان دەدایەوە، وەتین و گەرمای ئەو دوو ڕووناکیە لە نێوانیاندا هەست دەکرا، کە بەڕاستی ئینسانی عاقڵی سەرسام دەکرد، بەڵام (ئەبوجەهل) لەبەر گێلی و نەفامی و گەوجەیی گوتی: ئەوە جادویەکی زۆر گەورە بوو: پێغەمبەرﷺ بە ئامادەبووانی فەرمووی: هەواڵ بدەنە دەوروبەرتان و بزانن ئەوە ڕاستەقینەیە یان جادووە.

ئەوەش لەو ڕاستیانەیە کە هەواڵی مانگ شەقبوونیان لە دەوروبەری مەکەوە پێدەگەیشت: کە بەڕاستی ئەوەش لەشتە کەم وێنەحەق و ڕاستە نەدیتراوەکانی پێغەمبەری خوداﷺبوو: وە هەر لەوڕاستی وحەقیقەتانەیە کەکابرایەکی دەشتەکی تەنها پرسیاری ئەو شتە گەورە سەرسوڕهێنەرە هەرگیز نەدیتراوەی کرد، باوەڕی هێناو موسڵمان بوو: وە ئەو شتەکەم وێنەیە بووە مایەی ڕێنمونی.

پێغەمبەر ﷺفەرمانی بەچەند دارێك دا، دارەکان بەفەرمانی خودا ڕوویان لە پێغەمبەر کردوو سەلامیان لێکردوو، لە بەردەستی ڕاوەستان و دانیان بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر و، تاك و تەنهایی خودا هێنا :، وە هەر بە تەنها ئامارژە بۆ کردنێکی پێغەمبەرﷺدارەکان ڕۆیشتنەوە جێگەی خۆیان.

وە هەر لەو شتە بێوێنە سەرسوڕهێنەرانەی پێغەمبەری خوداﷺ بوو کە(٣٦٠)سێ سەدو شەست بت لەدەوروبەری بەیت داندرا بوو قاچەکانیان بە قوڕقوشمی بەهێز لەبەر دوو شاخە بەهێزەکانی دەورەی کەعبە قائیم کرابوو بەهیچ جۆرێ جوڵەیان نەدەکرد، کاتی ساڵ ڕۆژی ڕزگاری مەککەو بیت الحرام: پێغەمبەرﷺ تەنها بەدارعەسایەك کە بەدەستیەوە بوو ئاماژەی بۆ بتەکان دەکردوو ئەوبتە بەهێزە قائیم کراوانە بەرەوڕوو بە پشتدا دەکەوتن، بەگوێرەی دەست لێڕاوە شاندنەکە.

وە هەر لەکارە بێوێنەکانی پێغەمبەری خوداﷺ بوو لە ڕۆژی ئوحود، کە قەتادەﷺی هاوڕێی پێغەمبەرﷺچاوەکانی پێکاو بەسەر پێلوەکانی دا هاتنەخوار، پێغەمبەر ﷺ بەدەستی پیرۆزی چاوەکانی کردەوە جێگەی خۆیو، زۆرباشترچاوەکانی لەپێشوی بەهێزترو باشتر دەیبینی. وە هەر لەو شتە بێوێنانەی پێغەمبەری خوداﷺلەڕوداوی خەیبەر، کەحەزرەتی (عەلیﷺ) چاوەکانی دێشاو سور هەڵگەڕابوو بە هیچ جۆرێك توانای دیتنی نەبوو پێغەمبەر ﷺبەتەنها یەك تف لێکردنی چاك بۆوە. وە هەر بەهەمان شێوە لە ڕۆژی چاڵ هەڵکەندنی خەندەق کوڕی (حەکەم )قاچی شکا پێغەمبەرﷺ تفی لێداو چاك بۆوەو یەکتری گرتەوەو ئازاری نەما.

## خودا لەخەڵك دەت پارێزێ

## والله يعصمك من الناس

لە دوای ڕزگارکردنی شاری مەککە پێغەمبەرﷺ بەلای (فوڵاڵەی کوڕی عەمیری کوڕی مەلومی لەیسی)دا ڕۆیشت کە هەردەم ئارەزوی شەڕو جنێو فرۆشتن بوو بە پێغەمبەرﷺلەو کاتەدا پێغەمبەرﷺفەرمووی: ها (فوڵاڵە) ئێستا لەدڵی خۆتدا چیت گوت: ئەویش لەوەڵامدا گوتی: هیچم نەوتووە، زیکرو یادی خودا دەکەم ، پێغەمبەرﷺ پێکەنیو فەرمووی: (استغفرالله) دەستی لەسەر سینگی( فوڵاڵە) داناو، (فوڵاڵە)گوتی: سوێند بەخودا هێشتا پێغەمبەرﷺدەستی لەسەر سینگم هەڵنەگرتبوو: خۆشەویستی پێغەمبەرﷺکەوتە دڵمەوە بە جۆرێك کە هیچ کەسێکم لەو سەر زەویە لە پێغەمبەرﷺخۆشتر نەدەویست. إبن هشام/ج/٢/ص/٤١٧.

# باوەڕى ڕاستەقینە : الإيمان

**خوداى گەورە دەفەرموێ:** { إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا۟ وَجَٰهَدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ } الحجرات/١٥. **واتە: بەڕاستى باوەڕدارەكان تەنها ئەوانەن كە باوەڕیان بە تەنهایى خودا و ڕاستى پێغەمبەرى خودا هێناوەو، لەدوایشدا هیچ گومان و دودڵیان بۆ دروست نەبووە لە باوەڕە كە یان وە بە گیان و ماڵ و سامانیان خەبات و تێكۆشانیان لە ڕێگەى خوداداكردوە، وە هەر ئەو كەسانەشن كەڕاست گۆوڕاستن لەباوەڕەكەیاندا كە بەڕاستى هەر ئەوانەن باوەڕداران.**

**باوەڕ: بە واتاى باوەڕێكى ڕاستى كرداریاش‌و جوان، بەندەى باوەڕدار بەوانە دەگوترێ كە كردارى باش‌و چاكە ئەنجام ئەدەن و باوەڕێكى پتەو دامەزراوى وایان هەبێت كەباوەڕى بە پەروەردگارێكى تاك و تەنهاى واهەبێت كە خاوەنى هەموو هێزێكى هێز و گەورەیى‌و ڕەوشتە بەهاجوان و پاكەكانە: وە دورە لە هەموو كەموكوڕە ناتەواویەكان، وە هەر بەو شێوە تام‌و چێژى باوەڕ هەموو كات‌و ساتێك لەدڵ و دەرونى دابێت‌و بەو چێژە باوەڕەوە ڕوبكاتە خوداى پەروەردگار و بە تەواوى دڵسۆزى فەرمان بەردارى فەرمانەكانى خودابێت‌و هەردەم و بەردەوام و ڕاست گۆیانە باوەڕى وابێت كە خودا چاودێر و لە كەمیندایەو بە تەواوى لێى بترسێ‌و خۆپارێزى و خوداپەرستى بكات.**

**باوەڕ: زۆركارى نادیارو نهێنى سەرسوڕهێنەر بەدى دەهێنێ: چونكە ئەگەر سەیرى یارە شیرینەكان بكەین هەر لەسەر ئەو ڕێبازە بوون توانیان دڵ و دەرونیان بەباوەڕى تەواو ئاوەدان بكەنەوەو بەئاشتى‌و هێمنى تام‌و لەزەتى بیروباوەڕ بچێژن، وەهەر ئەو باوەڕە بەهێزە بوو كە كارى تێكردبوون و دەیانتوانى گیان وماڵ‌و سەروەتیان لەو پێناوەدا بەخت بكەن‌و، هەوڵ بدەن بڕۆنە مەیدانى جەنگ و تێكۆشانەوە. وە هەر بەو باوەڕە بەهێزەوە بووكە توانیان هەموو ڕێگایەكى خوارو خێچ و دڕكاوى و بەردەلان ببڕن و لێى تێپەڕن و گوزەر بكەن‌و بەرە و ئاسۆ سەر بكەون.هەرئەوباوەڕەش بووكەباوەڕدارى ڕاستەقینە بە فەرمانەكانى خودا پشت ئەستورو بەهیوابن و هەرگیز توشى دوودڵى و نائومێدى نەبنەوە و دڵ ئارام**

و ئاسودە ژیانیان بەرێوبەرن‌و، لە هەموو كارو فەرمانەكانیدا زۆر بەهەند و گرنگ و پێویستی سەرشانی وەری بگرن باكارەكەش زۆر گرنگ و بەردەوام بێت. وە هەر بەو جۆرە باوەڕدار بەرەو ڕووی هەموو ئازار و ناخۆشیەكان دەبێتەوە با زۆریش گەورە بن بەبێ هیلاك و ماندوبوون و، بە هەموو ڕوح و گیانی لەپێناو سەركەوتن و پێشكەوتنی ئاینەكەی تێدە كۆشێ بەهەر شێوەیەك بێت‌و هەر شتێكیش بێتە ڕێگەی سارد و سست نابێتەوە و بەرگری لە هەموو پێشهاتێكی چاوەڕوان كراو دەبێتەوە، هەموو بە سەرهات و ڕوداوەكانیشی بەلاوە سادە و بێنرخ دەبن، هەرچەندەش گەورە و بەهێزبن‌و، ترس و تۆقان و كاری سەخت نای ترسێنێ و ساردی ناكاتەوەو، پشت ئەستورو بە هیوا دەبێت بە باوەڕەكەی بە ڕەوڕوی هەموو كارێكی سەخت دەبێتەوەو، بەرەو پێشەوە هەنگاو دەنێت.دەبێ ئێمەش زۆرباش بزانین ئەگەر ڕێنمونیە كانی خوداوﷻ پێغەمبەری خوداﷺزۆر بەهەند وەرنەگرین مانای وایە ئێمە هیچ سوودمان لەباوەڕە كەمان نەدیتووە. بۆیە ئەگەر خۆشی و شادی و بەختەوەری بە هۆی باوەڕە كەمانەوە بچێژین وگیان و ڕوحمان بە شاهەنشاهی پەروەردگاری بونەوەر بناسێنین‌و لە سەربەرنامەی خوداوڕێبازی پێغەمبەری سەروەرمان بڕۆین.ئەوە بەڕاستی لە دوا ڕۆژدا لەگەڵ پێغەمبەراو، ڕاستگۆیان‌و شەهیدان‌و پیاوچاكان دا دەبیت كە ئەوەش بەڕاستی بنەوان و سەرچاوەی باشترین هاوڕێ و هاوسەرییە. پێغەمبەری سەروەرو سەربەرزمان دەفەرموێ: ﴿عن انس قال: قال:رسو ل اللة ثلاث منكن فيه وجد حلاوة الإيمان أن يكون الله ورسوله أحب إليه مما سواهما.وإذاأحب المرء لايحبه إلا لله وأن يكره أن يعود للكفركما يحب أن يقذف في النار﴾. رواه البخاري ، ومسلم، وترمذي، والنسائي.

واتە: سێ شت هەن هەركەسێك ئەوسێ شتەی تێدابێت بەڕاستی شیرینی باوەڕی چێشتوە، یەكەم خودا و پێغەمبەری لە هەموو شتێك لەشتەكانی خۆشتر بوێت، هەر كاتێ كەسێكت خۆشویست تەنها لە پێناوی خوداداخۆشت بوێت وە لە دوای ئەوەی كە باوەڕت هێناوە و هاتویە ناو كەمەندی ئیسلامەوە، زۆرت پێناخۆش بێت بڕۆیەوە سەر بێباوەڕی‌و كافربوون، بە ئەندازەی ئەوەی كەپێت ناخۆشە فڕێ بدرێیتە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

## باوەڕو ئازایەتی- إیمان وبطولة

(ئەنەسی کوڕی نەزر) کەمامی (ئەنەسی کوڕی مالك) بوو بەلای کۆمەڵێك خەڵکدا تێپەڕی کە گێژو سەراسیمە بوون بە هەواڵی نەمانی پێغەمبەرﷺلەجەنگی ئوحوددا شیرو چەکیان فڕێدابوو: ئەنەس پێی گوتن: ئەوەچیە بۆوا سەرگەردانو بەبێ چەك دانیشتوون؟ ئەوانیش زۆر بە بێزارییەوە گوتیان: ئەی تازە چی بکەین کەپێغەمبەر ﷺکوژراوەو نەماوە: ئەنەس گوتی : براکانم هەستن خۆ ئەگەر محمدیش کوژرابی ، خۆپەروەردگار( اللە) ماوەو زیندووە، وە ئەگەر ئەو قسە ڕاست بێت لەدوای پێغەمبەرﷺ ژیانتان بۆ چییە ؟ ئێوەش بجەنگنو شەڕ بکەن هەر وەكو پێغەمبەرﷺ شەڕی دەکردو دەجەنگا، ئێوەش لەو ڕێگایەوە بمرن کە حەزرەتی محمدﷺ لەسەری مرد. لەدواییدا (ئەنەس )گوتی: خودایە من پەنا دەگرم لەو شتەی کە ئەو موسڵمانانە کردوویانە. وە من خۆم جیاواز دەکەمەوە لەو موسڵمانانەی کە کردوویانە یان ئەو بێباوەڕانەکردوویانە لەدوای ئەوە (ئەنەس) چاوی بە(سەعدی کوڕی موعاز) کەوت ، گوتی: ئەی (موعاز) بەڕاستی من ئێستا بۆنی بە هەشت دەکەم کە لە لای شاخی ئوحودەوە بۆ لام دێت بەو جۆرە (ئەنەس )ڕۆیشتە مەیدانی جەنگەوەوو شەڕی کرد هەتا شەهید بوو.؟ بەڵام ئێمە هیچ، کەسمان ئەنەسمان نەناسیەوە ئەوەندەی تیرو شیرو رمب پێکەوتبوو ژماردمان(٨٩) هەشتاو نۆ شوێنە برینی پێوە بوو کاتێ خوشکەکەی هات بەهۆی خاڵێك کە بەلاشەیەوە بوو ناسیەوە.

## باوەڕی ڕاستی
## الأیمان الصادق

لە جەنگی بەنی (موستەلەق) (عبداللەی کوڕی ئوبەیەی کوڕی سەلول) سەرۆك و گەورەی دوو ڕووەکانی مەدینە گوتی: هەروەك و خودا لەسەر زوبانی ئەو دووڕوە دەفەرموێ :يَقُولُونَ لَئِن رَّجَعْنَآ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ ٱلْأَعَزُّ مِنْهَا ٱلْأَذَلَّ ۚ وَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَٰكِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ ) المنافقون/٨ . واتە: دووڕووەکان دەڵێن سوێند بەخودا ئەگەر لەو شەڕ و جەنگەی (بەنی موستەلەق)ە گەڕاینەوە بۆ

مەدینەو ڕزگارمان بوو دەبێ پیاوە ئازاو بەڕێزەكانی مەدینە كە مەبەستی دووڕو و منافقەكان بوو كە بۆ خۆیانن، دەبێ هەژار و ڕوت و ڕیسوایەكان دەربكەین، ئەوەش مەبەستی پێغەمبەروﷺ موسڵمانەكان بوو.

كاتێ كوڕەكەی بەوەی زانی كەباوكی چی گوتووە: خۆی لەو تاوانە گەورەیە بە دوور كردو، ڕۆیشت بۆلای پێغەمبەر و ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ سوێند بە خودا تۆ سەروەر و گەورە و بەڕیزی: باوكم سوك و زەلیل و بێنرخە ئەگەر بەڕێزت حەز دەكەیت باوكم لەمەدینە دەردەكەین بەڵام كاتێ (كوڕی عبداللەی كوڕی سەلول) سەرۆكی دووڕوەكان بە ناوی (عبداللەﷺ) كاتێ كە خەبەری ئەوەیزانی كە پێغەمبەرﷺدەیەوێت باوكی بكوژێ ڕۆیشتە لای پێغەمبەر و ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ بیستومە كە باوكم دەكوژی، بەڵام پێم خۆشە ئەوكارە بەمن بسپێری بابۆخۆم بیكوژم.سوێند بەخودا بە تەنها فەرمانم پێ بدە خۆم دەی كوژم: لەگەڵ ئەوەشدا كە زۆر ڕێز لە باوكم دەگرم، چونكە لەوە دەترسێم كە یەكێكی تر بیكوژێت، لەدواییدا من نەتوانم بەرامبەری ئەو كەسە خۆم ڕابگرم و، داوای تۆڵە بكەمەوە و بەو هۆیەوە موسڵمانێك بكوژم و بەو هۆیەوە برۆمە دۆزەخ، وە ئەنسارەكانی مەدینە زۆرباش دەزانن كە من چەندە ڕێز و چاكەكاری و حورمەتی باوكم لەلایە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: تۆ هەر بەو جۆرە داوای خێروچاكەت بۆباوكت هەبێ و نابێ تۆبیری كوشتنت بەرامبەر بە باوكت هەبێت، دووبارە فەرمووی: تۆ هەتا پێت دەكرێ لەكاری چاكەدا بەرامبەر بەباوكت درێغی مەكە ئینجاكاتێ پێغەمبەرﷺموسڵمانان لەو جەنگە گەڕانەوە بۆ مەدینە: (عبداللەﷺ) لەسەر دەرگای دەروازەی مەدینە ڕاوەستا هەتا باوكی هات شیری لێراكێشاو سوێندی لە باوكی خوارد تۆ نابێ بچیە ناو شاری مەدینەوە، هەتا نەڵێی پێغەمبە روﷺ موسڵمانەكان گەورە و سەربەرز و بەڕێزن‌و، ئێمەش زەلیل‌و سوك‌و ڕیسواین، ڕێتان پێنادەم ئەویش بە ناچاری وای گوت و: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی چونە ژوری پێدا، دوای ئەوە كە پێغەمبەرﷺ هات فەرمانی پێدا كەبڕواتە ناو شار ئینجا ڕێگەی پێداو پێشی چۆڵكردو ڕۆیشتە ژورەوە.

# باوەڕ كرداری لەڕادە بەدەر دروست دەكات

# الإيمان يصنع المعجزات

(زنیرە)ی ڕۆمی كارەكەرێك بوو لە لای حەزرەتی (عومەرﷺ) ئەو عومەرە پێشی ئەوەی باوەڕ بهێنێت ئینسانێكی دڵ ڕەق هەرچی میهرەبانی هەبێت لەدڵی دانەبوو: وە بەرامبەر ئەو ئافرەتە كارەكەرە شزۆر بێبەزیی بوو، لەبەر ئەزیەت و ئازار و لێدانی ئەو كارەكەرە چاوەكانی لەدەستدا، بێباوەڕانی قوڕەیش پێیاندەوت بە ڕاستی ، لات و، عوزا : قین و ڕقیان لەو كارەكەرە هەستاوە و چاویان كوێر كردووە، (زنیرە)ی خوێن شیرین و ڕوح سوك وتی: بەخودا شتی وانیە چونكە لات و عوزا تەنانەت كەس لەشوێن كەوتەكانی خۆشیان ناناسن:بەڵام خودای گەورە و بەدەسەڵات، بە توانایە كە چاوەكانم بۆ بگێڕێتەوە، خودای گەورە و بە دەسەڵات، داوایەكەی زنیرەی وەرگرت و چاوەكانی چاك كردەوە. بەڵام ئەم جارە بێباوەڕانی قوڕەیش وەكو پیشەی خەراپی هەموو جارەكانی تر بەجۆرێكی تر دەهاتنە وتە و دەیان وت: ئەوە جادوی محمد بووە ، حەزرەتی ئەبوبەكر ڕۆیشتە لای عومەر (زنیرە)ی لێكڕی.بەڵام ئەوجارەش بێ باوەڕان بەوە نەوەستان و وتیان: بەخوا ئەگەر (زنیرە)خێری تێدا بوایە هەرگیز پێشی ئێمە نەدەكەوت: ئینجا لەبەر ڕێز و گەورەیی ئەو كارەكەرە خودای بەبەزەیی لەباتی (زنیرە) وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێ:{ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَوۡ كَانَ خَيۡرٗا مَّا سَبَقُونَآ إِلَيۡهِ } الاحقاف/١١.

واتە: بێباوەڕەكان سەبارەت بەو كەسانەی ئیمان و باوەڕیان بە خودا و قوڕئان هێنابوو پێیان دەوتن، ئەگەر ئەو شتەی كەمحمد بۆی هاتووە شتێكی باش و چاكبوایە ئەو هەژارو نەدارانە پێشی ئێمە نەدەكەوتن.

# بێباوەڕو، باوەڕدار - كفر و إيمان

حەزرەتی (ئەبوبکرﷺ) ئینسانێکی میهرەبان و، نەرم و، هێدی و، دڵناسك بوو: زۆر لە خودا دەترسا، بە جۆرە ترسانێك کە دەیوت ئەگەر قاچێکم ببەمە ناو بە هەشتەوە زۆر لەسزای خودا دەترسێم کە قاچەکەی ترم نەبەمە ناو بەهەشت و بمکەنە دەرەوەو خودا بمباتە ناو دۆزەخەوە.

حەزرەتی (ئەبوبکرﷺ) لەگەڵ ئەو هەموو دڵسۆزی و باوەڕە بەهێزە و لە سەرە خۆییەی پیاوێکی بەهێز و بەتواناو بەدەسەلات بووە لە بەرامبەر حەق و مافدا، بە هیچ جۆرێك لۆمەی لۆمەکاران کاری تێنەکردوەو هیچ دەسەلاتدار و زۆردارێکیش نەی توانیوەکاری تێبکاتو لە خشتەی بەرێ و، هەستی سۆزی مەردی و پیاوەتی لە هیچ مەیدانێکدا لەیادو بیری نەچۆتەوە.

دەگێڕنەوە: ڕۆژێکیان دەڕواتە ناوکۆڕێك لە کۆڕ و سیمیناری جولەکەکان، یەکێك لە گەورە پیاوانی جولەکە بەناوی (مینخاص) لەو کۆڕ و سیمیانارەدا بوو، (ئەبوبکرﷺ) ڕاستەوخۆ داوای لێکرد کە باوەڕ بهێنێ و پێی وت: ئەی (مینخاص) ئەتۆ زۆر باش دەزانی کە حەزرەتی (محمدﷺ)ڕەسولو نێردراوی خودایەوخودا بە حەق و ڕاستی ناردویەتیو، ئێوەش لەناو (تەوراتو، ئینجیل)دا دیتوتانە و خوێندوتانەوە و حەقو ڕاستی محمدتان بۆ دەر کەوتووە. لە وەڵامدا مینخاص گوتی: چۆن خودایەکی هەژارداوا لە خودایەکی هەژاری بەندەی خۆی دەکات کە بیپەرستن و قەرزی پێبدەن، کە بۆ خۆی دەفەرموێ: {مَّن ذَا ٱلَّذِى يُقۡرِضُ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنًا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥ وَلَهُۥٓ أَجۡرٌ كَرِيمٌ }الحديد/١١ واتە: ئایا ئەو کەسە کێیە کەوام و قەرزی باش دەدات بەخوداو ماڵ و سامانی دەبەخشێ لە پێناوی بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خودا، وە خوداش باشترین پاداشتی بێسنووری بە چەند قات دەداتەوە وە پاداشتی زۆر بەنرخ و بەڕێزیشی بۆ ئامادەکردووە.

ئینجا: مینخاص گوتی: خودای ئێوە هەژارە و، ئێمە دەوڵەمەندین، هەرگیز فەرمان بەرداری بۆ خودای هەژار و نەدار ناکەین:حەزرەتی (ئەبوبەکرﷺ) بەو قسەیە توڕە

بوو ڕقی هەستاو دار دەستەکەی بەدەستی گرت و بەرەو ڕوی مینخاسی بەرز کردەوە، کاتێ مینخاس بۆی دەرکەوت و زانی کە (ئەبوبکرﷺ) لێیدەدا هەلات و ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەرو ﷺشکایەتی لە حەزرەتی ئەبوبکرﷺکرد کە هیچ شتێکمان لەبەیندا نەبوو تەنها لەبەر جولەکایەتیم لێم توڕەبوە و بە ئارەزوییری لەلێدانی من کردۆتەوە و لێی دام، بەلام بۆڕاست گۆیی حەزرەتی ئەبوبکرﷺ خودای بە بەزەی و بەدەسەلات قورئانی بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ دابەزاندو، ناڕەوایەکانی جولەکەکەی ئاشکراکردو، پەیمانی ئازار و سزایەکی توندی بۆدیاری کردکە خودا دەفەرموێ: { لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ ۘ سَنَكْتُبُ مَا قَالُوا۟ وَقَتْلَهُمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَنَقُولُ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ}آل عمران/١٨١-١٨٢. واتە: خودا گوفتار و قسەی ئەو جولەکەو یەهودیانەی بیست کە گوتیان: خودا هەژار و نەدارە و، ئێمە دەوڵەمەند و زەنگینین. خودا فەرمووی: بەڕاستی ئێمە ئەو گوفتار و کردارانەیان تۆمار دەکەین و لەسەریان دەنوسین، وە هەروەها کوشتنی پێغەمبەرانیش کە بەناحەق و ناڕەوا کوشتویانن تۆمار دەکەینو، لە دوا ڕۆژدا تۆڵەیان لێدەستێنینەوەو، پێیان دەڵێین: بچێژن سزا و ئازاری ئاگری دۆزەخ. وە ئەو سزایەش تۆڵەی ئەو کردەوە نالەبارانەی خۆتانە دێتەوە پێشتانو خودا بەهیچ جۆرێك ستەم لەکەس ناکات.

## هاوڕێ دەبن لە بەهەشت - ترافقوا في الجنة

لە جەنگی (ئوحود) هاوڕێی بەڕێزی (پێغەمبەریﷺ) خودا دایکی (خولاد) ئامادەی ئەو جەنگە بوو، کە هەر لەو جەنگەشدا هاوسەرەکەی (عەمری کوڕی جەموح) و کوڕەکەی (خولاد)و برایەکەی دایکی خولاد (عبدالله)ﷺشەهید ببون: دایکی خولادوەكو شێرە ژنێکی ئازاو بەغیرەت تەرمی شەهیدەکانی لە حوشترەکەی خۆی بارکرد، بۆ ئەوەی بیان باتەوە بۆ مەدینە و هەر لەوێش بەخاکیان بسپێرێ، ئینجا هەرکاتێ حوشترەکەی ڕووی بەرە و کێوی (ئوحود) دەکرد حوشترەکەی زۆر

بەخێرایی و چاپوكی دەڕۆیشت، بەڵام كە بەرەو مەدینە ڕووی دەكردەوە ئەو حوشترە قاچی دەچەقاندو نەدەڕۆیشت یان زۆر بە سستیوبێ هێزی دەڕۆیشت، كەئەوەش ئاماژە بۆكردنێك بوو، بۆئەوەی كە ئەو تەرمانەش وەكو تەرمی هاوڕێو براكانی تر نەبەنەوە بۆ مەدینەو هەر لەوێ لەلای سێبەری كێوی (ئوحود) بیان شارنەوەو بەخاكیان بسپێرن (پێغەمبەرﷺ) هەر لەوێ مایەوە هەتا هەمویان بەخاك سپاردن‌و، بە دەستی پیرۆزی خۆی دەی شاردنەوەو، گڵی بەسەردا دەكردن، لە دوای شاردنەوەیان( پێغەمبەرﷺبەدایكی خولادی وت: ئەی هیند ئەوانە هەموویان هاوڕێی یەكترن لە بەهەشتدا (عەمری كوڕی جەموح و، خولادی كوڕت‌و، عبداللەی براكەترضي الله عنهدایكی خولاد گوتی: ئەی پێغەمبەری ﷺخودا داواش بۆ من بكە كە لەگەڵ ئەواندابم لە بەهەشتدا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: تۆش لەگەڵیان دەبیت لە بەهەشتدا.

## پیاوێكی ئەهلی بەهە شتێ

## رجل من أهل الجنة

دەگێڕنەوە: ڕۆژێك (پێغەمبەری خوداﷺ) لەگەڵ هاوڕێكانی دانیشتبوو فەرمووی: ئێستا پیاوێكی بەهەشتی ئەلێرەوە دەردەكەوێ، هەر لەو كاتەدا پیاوێكی ئەنساری لەو شوێنەی كە (پێغەمبەرﷺ)فەرمووی: بەدەركەوت، كەڕیشی ئاوی دەستنوێژی لێدەتكایەوە پێڵاوە كانیشی بەدەستی چەپیەوە گرتبوو. نوێژی كرد و گەڕایەوە. بۆ ڕۆژی دوایی بەهەمانشێوە (پێغەمبەرﷺ) ئەو فەرموودەی دووبارە كردەوە كە ئێستا پیاوێكی بەهەشتێ لێرەوە دێتە ژوور، ئێمەش چاومان بڕیبووە ئەو جێگایە بەڵام كاتێ كە هاتە ژوور هەمان ئەو پیاوەی دوێنێ بوو كە هاتەژوور. بۆ ڕۆژی سێهەمیش (پێغەمبەری خوداﷺ) هەر لە هەمان شوێنەو لە هەمانكاتدا ئەو فەرموودەی وتەوە، ئێمەش كە سەیرمان كرد هەر هەمان پیاوەی یەكەم ڕۆژو، دووەم ڕۆژە بوو كە هاتەژوور، ئینجا لەدوای ئەوەی كە(پێغەمبەرﷺ) ڕۆیشت، (عبداللەی كوڕی عومەرضي الله عنه) دەفەرموێ: بەدوای كابرادا ڕۆیشتم هەتا گەیشتەماڵەوە، منیش لەدەرگام داو فەرمووی: لێكردم و چومەژوورەوە و پێموت:برام من

لە باوكم توڕەبووم و سوێندم خواردوە كە هەتا سێ ڕۆژی تر نەڕۆمەوە بۆ ماڵەوە ئەگەر بەڕێزت بتوانیٚ ئەو سێ ڕۆژە میوانداریم لیٚ بكەی‌و جێگەم بكەیەوە لەلای خۆت بمێنمەوە زۆر حەزدەكەم: كابراش زۆربەدڵ خۆشیەوە گوتی: منیش بە پێخۆش حاڵیەوە حەزدەكەم. (عبداللەی كوڕی عومەرﷺ) دەفەرمویٚ: سیٚ شەو لەلای ئەو پیاوە مامەوە و چاودێریم لێدەكرد كە بزانم چی كردەوەیەكی وا دەكات كە (پێغەمبەر ﷺ ئاوای پیٚ بفەرمویٚ: بەڵام هەرچەندی كەمن سەیرم دەكردو لێی وورد دەبومەوە هیچ شتێكی سەرسوڕهێنەرم بەچاو لەو كابرایە نەدەدیت، تەنانەت شەوانەش بۆ شەونوێژ زۆر كەم هەڵدەستا، بەڵام كە لەسەر جێگەی خەوی بەخەبەر دەهات زیكرو یادی خودای دەكرد، هەتا بۆ نوێژی بەیانی هەڵدەستا، وە گوفتار و كرداری چاكەی دەكرد و باسی هیچ شتێكی بەخەراپە نەدەكرد، بەڵام لەهەمانكاتدا كردەوەكانیم زۆر بە زۆری نەدەهاتە بەرچاو بەو شێوەیەی كە (پێغەمبەرﷺ) ئەو هەموو ڕێزو پاداشتی بەهەشتەی بۆ دیاری بكات‌و مزگێنی بەهەشتی پیٚ بدات (عبداللەﷺ) فەرمووی: لەدوای تێپەڕینی ئەوسیٚ شەوە بەكابرام گوت: براكەم بەڕاستی من هیچ ناكۆكی‌و توڕە بوونم لەگەڵ باوكم نەبووەو ڕووی نەداوە بەڵام، من لەوە سەرسام بووم كە پێغەمبەری خوداﷺ سیٚ رۆژ لەسەر یەك بەرامبەر بە بەڕێزت ئەوهای فەرمووە: منیش بۆ ئەوەی كە بزانم كردەوەكانی تۆ چییە فێری ببم و بیانكەم، بەڵام لەو چەن ڕۆژەداكردارێكی وام لە تۆبەرچاو نەكەوت كەببێتە جێگەی خۆشحاڵیم و بە ئەنجام بگەیەنم: بەڵام ئێستا تۆ پێم بڵیٚ بەچی ئەو پلە گەورەیەت بەدەست هێناوەكە (پێغەمبەر ﷺ) ئەوهات پیٚ بفەرمویٚ: كابراش گوتی: بەخودا چۆن منت دیتووە هەر بەهەمانشێوە ئەو هام كە چۆنت دیتوم، تەنها ئەوەم هەیە هەرگیز ئێرەیی‌و (حەسود)ی بەكەسەوە نابەم هەرچی كە خودا پێی بەخشیوەوپێی داوە، وە خیانەت و فێڵ و خەراپەش بۆ كەس بەڕەوا نابینم، (عبداللەﷺ) فەرمووی: بەڕاستی زۆرباش دیارە هەر ئەو ڕەوشت‌و ڕەفتارانەتە كەپێی گەیشتووی.

# خۆشەویستی نیشتمان لەباوەڕەوەیە

# حب الوطن من الأیمان

(سەفوانی کوڕی ئومەیە) گەورەی هۆزی (جمع) لەدوای مردنی (ئومەیەی کوڕی خەلەف)ی باوکی هەروەکو لەژیانی باوکیشی داگەورەوپێشەوای قوڕەیش و، سەرکردەو پێشەوای قومارباز و گاڵتەجاڕەکانی سەردەمی نەزانی و نەفامی بوو، ئافرەتێکی کچی گەورە پیاوانی عەرەبی هەڵبژارد و دیاری کرد: ئینجا کاتێ کە (پێغەمبەری خوداﷺ) بەرنامەی پەیامی پێغەمبەرایەتی پێڕاگەیەندرا، بانگهێشتنی موسڵمان بوون و باوەڕی بەرنامەی ئیسلامی بە خەڵك ڕاگەیاند، ئەوکاتە (پێغەمبەرﷺ)و باوەڕداران و، بێباوەڕان کەوتنە کێشەوملـ ملانێیەکی زۆر گەورە، کە بەڕاستی لە مێژودا وێنەو شێوەی زۆرکەم بوو، کە یەکێکی سەرسەخت و هەڵسوڕێنەری ئەو ململانێیە (سەفوانی کوڕی ئومەیە) بوو کە(عەمیری کوری وەهەب)ی کردبووە هەڵسوڕێنەری ئەو بەربەرەکانی و گێژاو شەڕکردنە لەگەڵ پێغەمبەرﷺ) ویارەکانی، وە پیلانێکی وای ڕێکخستبوو کە بۆی بکرێ پێغەمبەر ﷺ بکوژێت، پێغەمبەری خوداشﷺ فەرمانی خوێنی سەفوانی بە هەدەر دانا بوو بۆ هەر کەسێك کە بتوانێ بیکوژێ: ڕۆژێك لەدوایی ئازادکردنی مەککە (عەمیر) هاتەلای پێغەمبەر ووتی : ئەی پێغەمبەری خودا سەفوانی کوڕی ئومەیە) کە زۆر ئازار و سزای تۆی داوە، بەڵام خۆت دەزانی سەفوان سەرکردەو گەورەی هۆزەکەیەتی، ئێستا لەترسی تۆ بەرەو دەریا هەڵاتووە، بڕوات بەرەو (یەمەن) ئایا تۆ وەکو خەڵکانی تر ئەمانەتیت پێ بەخشیوە؟ کە لە خۆی دڵنیابێت: پێغەمبەر لە وەڵامدا فەرمووی: با لە خۆی دڵنیا بێت (عەمیر) وتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ شتێکم پێ ببەخشە بۆئەوەی سەفوان دڵنیابێت لە پەیمانەکەت پێغەمبەرﷺ بۆ دڵنیای ئەو مێزەر و سەرپۆشەی دایەکەپێی هاتبووە ناو مەککەوە ، ئینجاعەمیر بەدوای سەفواندا بەرەولای(جدە)بەرێکەوت لەو کاتەدا سەفوان چاوەڕێی کەشتی دەکرد بۆ پەڕینەوە بەرەو (یەمەن) کەلەوێ ژیانێکی نوێ بەسەر بەرێ ، لەدوای ئەو سەرشۆڕی و، تێشکان و، بەزینەی بێباوەڕان کەتوشیان هات لەگەڵ ئازادکردنی

مەككەدا ئەو كاتەی كەعەمیر گەیشتە لای سەفوان خەریكی سواری كەشتی بوو، عەمیر هاواری لێكردوو گوتی:سەفوان دایكو باوكمت بە فیدا بێت بۆخاتری خودا بگەڕێوە مەڕۆ:من لەلای پێغەمبەرەوەﷺ هاتومو پەیمانی دڵنیایم بۆ هێناوی، سەفوان گوتی: لاچۆ عەمیر لێم نزیك مەبەوەو قسەم لەگەڵدا مەكە: عەمیر گوتی: ئەی سەفوان بەڕاستی گەورەترین و، بەهێزترینو، بە بەزەییترینو، بەخشێنەرترینو، لەسەرەخۆترینو، باشترین ئادەمیزاد لە هەموو جیهاندا كوڕی برای مامتە (محمد) گەورەیی ئەوگەورەیی تۆیە، پیاوەتی ئەو، پیاوەتی تۆیە، خاوەن داریەتی ئەو، خاوەن داریەتی تۆیە:بەڵام سەفوان گوتی:تو خودا عەمیر لێمگەڕێ ئەو ڕێگەی گرتومە دەڕۆمو، هەگیز ناگەڕێمەوە: عەمیر گوتی: سەفوان بگەڕێوەو لەگەڵم دا وەرەوە بۆ مەككە كە نیشتمانی خۆتو باوكو باپیرتە، لەوێ لەدایك بووی و لە باشترینو گەورەترین هۆزی مەككەیو سەرۆكی ئەو هۆزەشی: سەفوان دڵی نەرم بوو بۆ گەڕانەوەو گوتی: عەمیر بەخودا زۆر دەترسێم لە گەڕانەوەكەم بۆ مەككە بمكوژن:عەمیر گوتی: سەفوان ئەوەی كە تۆ بیری لێدەكەیەوە بە پێچەوانەی بیری ئەو پێغەمبەرەﷺئازیزوسەروەرەیە كەبەڕاستی بەخشێنەرودڵنەرموبەبەزەیی ترە:سەفوان ئەمجارلە كەشتیەكەی دابەزیولەگەڵ عەمیربەرەومەككە گەڕانەوەوڕۆیشتنە لای پێغەمبەرﷺكە لە پێغەمبەر نزیكبوونەوە سەفوان هاواری كردو و گوتی: ئەی محمد بە خودا عەمیر منی گێڕاوەتەوە دەنا نەدەگەڕامەوە گوتویەتی:كە ئەتۆ بەڵێنی دڵنیایت پێداومو داوات لێكردووم بگەڕێمەوە، ئینجا ئەگەر حەز دەكەی دەمێنمەوە، یان تەنها ماوەی دوو مانگم بۆ دیاری بكە، ئینجا دەڕۆمو هەرگیز ناگەڕێمەوە: پێغەمبەرﷺ زۆربە ئارامیو لەسەرە خۆییەوە بەڕێزو حورمەتەوە فەرمووی:(عەمیر) ڕاستی وتووە دابەزەو بمێنەوەو مەڕۆئەی باوكی ئومەیە، سەفوان گوتی:بەخودانابەزم هەتا كاتم بۆدیاری نەكەی، پێغەمبەرﷺ) فەرمووی:ماوەی(٤)چوارمانگ مۆڵەت.دوایی سەفوان لەگەڵ پێغەمبەر داڕۆیشت بۆ(حونەین) موسڵمانان لەحونەیندا سەركەوتنێكی تەواویان بەدەست هێناو پێغەمبەرﷺبەدەستكەوتێكی زۆرەوە

گەڕایەوەو، سەفوانیشی هەر لەگەڵدا بوو، وە لەسەر بێباوەڕیەکەشی هەر بەردەوام بوو. پێغەمبەرﷺو یارەکانی لەمدۆڵو شیوانەدا دەستکەوت و بەشێکی زۆری شەڕیان بەدەست هێنا، سەفوانیش چاوی تەواوی لەو دەستکەوت و بەشەزۆرەی کە لە بێباوەڕان بەجێمابوو هەر سەیری دەکردوو سەری سوڕما بوو کە ئەو دۆڵو شیوەی پڕ کرد بوو، پێغەمبەریشﷺچاوی بڕیبووە سەفوان کەچۆن بەو هەموو دەستکەوت و سامانە سەرسامبووە: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سەفوان وا دیارە ئەو دەستکەوتانە سەرسامی کردووی؟ سەفوان گوتی: بەڵێ بەڕاستی وایە: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: سەفوان ئەو هەموو دەستکەوتو سامانە با بۆ تۆ بێت !! سەفوان لەو کاتەدا بە تەواوی سەرسامی‌و، بێئارامی ڕووی تێکردوو وتی: بەڕاستی هیچ گیانێکی وا پاکوخاوێنم هەتاکو ئێستا هەرگیز لە هیچ کەسێکم بەدی نەکردووە و نەم دیتوە، دیارە ئەو جۆرە گیانانە تەنها گیانی پێغەمبەرانە ﷺ: بۆیە بەبێ ڕاوەستان گوتی: (اشهدأن لاإله إلاالله، وأشهدان محمدا عبده و رسوله) ئینجا سەفوان بووبە موسڵمانێکی تێکۆشەری بێوێنە هەتا لە ژیاندا بوو بە موسڵمانی ژیانی بردەسەر، هەتا خودای بە بەزەیی بردیەوە بۆ ژێر باڵی سۆزو بەزەیی خۆی.

## باوەڕ بەخودا

## الإيمان بالله

کاتێ پێغەمبەروﷺ یارە شیرینەکەی ئەبوبکرؓکۆچیان کرد بەرەو مەدینە لە ڕێگا چونە ئەشکەوتی (سەور) کافرەکان بەشوێنیان کەوتن و جێگەی پێیان هەڵگرتن بەرەو ئەشکەوتی(سەور) بەڵام خودا، پێغەمبەر و یارە بەڕێزەکەی لە بێ باوەڕان پاراستو شاردنیەوە: فەرمانی بە جاڵجاڵۆکە کرد کە دەرگای ئەشکەوتەکە بتەنن و کۆتر لەسەر دەرگای ئەشکەوتەکە هێلانەی کردوو هێلکەی تێداکردو، هەر لە هەمانکاتیشدا لەسەر هێلکەکان کورک بوو هەڵنیشت کە بێباوەڕەکان ئەو ڕوداوەیان بەچاو دیت وتیان: نابێ هیچ کەسێك چووبێتە ناو ئەو ئەشکەوتەوە چونکە دەرگای ئەشکەوتەکە تەندراوە بە جاڵجاڵۆکەو تەونەکەی نەشکاوەو،

خەرانە بووەو، کۆترەکەش لەسەر هێلکە هەڵنەستاوە. بەڵام حەزرەتی ئەبوبکر ﷛ لەناو ئەشکەوتەکە، کە چاوی بە بێباوەڕان کەوت لەسەر دەرگای ئەشکەوتەکە ڕاوەستاون زۆر ترساو بە ترسەوە دەیفەرموو:بە خودا ئەگەر سەیری بەری پێی خۆیان بکردبایە دەیان دیتین پێغەمبەر ﷺزانی کەئەبوبکر ﷛ زۆر دەترسێ فەرمووی: ئەی ئەبابەکر دڵتەنگ مەبە ئێمە خودامان لەگەڵدایە بیروهۆشی تۆ چۆنە بەرامبەر بە دوو کەس کە خودا سێهەمەکەیان بێت ؟!

## خودای پەروەردگاری عومەر ﷛دەزانێ

## رب عمر﷛ يعلم

دەگێڕنەوە حەزرەتی(عومەر﷛) لەسەردەمی دەسەڵات و فەرمانڕەواییدا فەرمانی دەرکرد کە نابێ‌و ناڕەوایە کە شیر ئاوی تێبکرێت بۆ فرۆشتن. شەوێك لە دەوروبەری مەدینەدا حەزرەتی (عومەر﷛) بۆ هەواڵ‌و ئاگاداری دانیشتوانی بە کۆڵانەکانی مەدینەدا دەگەڕا لەماڵێکەوە گوێی لە ئافرەتێك بوو کەدەیوت: کچەکەم بڕۆ ئەوەندە ئاوە لەشیرەکە بکە بازۆربێت بۆفرۆشتنی واخەریکە ڕۆژدەبێتەوە: کچەکەی وتی: دایەگیان چۆن ئاو بکەمە ناوشیرەکەوە ئەدی گوێت لە فەرمانەکەی حەزرەتی(عومەر﷛) فەرمانڕەوای موسلمانان نەبووەکە ئاو کردنە ناو شیرەوە بەکارێکی خەراپ و ناڕەوای داناوە: دایکەکە گوتی: ڕۆڵەکەم ئەدی هەموو خەڵك نابینی ئاوی تێدەکەن، ئەتۆش ئاوی تێبکە خۆبەوشەوە (عومەر﷛)پێمان نازانێ و ئاگای لێنیە؟ کچەکە گوتی: دایەگیان خۆئەگەر (عومەریش﷛) ئاگای لێنەبێ خودای (عومەر﷛) ئاگای لێیەوپێی دەزانی! بەڕاستی هەر شتێ کە نەهی لێکرابێ‌و بەناڕەوا بژمێردرێ من کاری وا ناڕەوا ناکەم. قسەی ئەو کچەکاری کردە سەر حەزرەتی (عومەر﷛) و سەرسامی کرد. بۆیە بۆ بەیانی حەزرەتی (عومەر ﷛) ئەو قسەیەی بۆ (عاسم)ی کوڕی باس کرد، کوڕم بڕۆ بۆ فلانە گەڕەکەی شار، لە فلانە کۆڵانەو، دەرگای خانوی ژمارە ئەوەندە پرسیاری ئەو کچە بکە بزانە کێیە و کچی کێیەو بەدڵتە؟ (عاسمی کوڕی حەزرەتی عومەر﷛) بەگوێرەی قسەی باوکی ڕۆیشت و پرسیاری لێکرد کە لە هۆز و نەوەی هیلالە، ئینجا حەزرەتی

عومەر‌ﷺ) فەرمووی: (عاسم‌ﷺ) برۆ بیخوازە ئومێد دەكرێ كەنەوەیەكی وای لێ بكەوێتەوە كە لە وڵاتدا دەنگی بداتەوە (عاسمی كوڕی عومەر‌ﷺ) ڕۆیشت داخوازی كردو مارەی بڕی، لەدواییدا كچێكیان بوو، لەدوای گەورە بوون عبدالعزیزی كوڕی مەڕوان) مارەی بڕی و ئەویش (عومەری كوڕی عبدالعزیز ﷺ)ی لێ لەدایك بوو كە لە جیهاندا دەنگی ئازایی و دادگەریدایەوە.

## بەڕاستی خودا باوكت دەپارێزێ - إن الله مانع أبيك

لەدوای ساڵی ناخۆشیو ماتەمینەوە ڕوداوی ناخۆش ڕوویدا، ئەو ساڵەی كە (ئەبی تالب)ی مامی پێغەمبەر و خەدیجە خاتونی هاوسەر و خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) كۆچیان كرد. ئەو ساڵە بەساڵی ماتەم ناوی دەركرد، بێباوەڕانیش زیاتر كەوتنە ئازاری لاشەو دەرونی پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژێكیان لەكاتێكدا كە پێغەمبەر (ﷺ) بەرە و ماڵەوەی دەگەڕا یەوە بێباوەڕان تۆز و خاكوخۆڵیان بەسەرسەری پێغەمبەر(ﷺ)دا دەكرد كە گەیشتەوە ماڵەوەش هەموو سەر و ڕووخساری لە تۆز و خۆڵ دابوو یەكێك لەكچەكانی كە بەوجۆرە چاوی بەباوكی كەوت لێی ڕۆیشتە پێشەوەودەستی كرد بەگریانو سەرو ڕووخساری باوكی دەسڕیەوە ئەو پێغەمبەرەی(ﷺ) كەبەڕاستی خودای گەورە تەواوی دڵنەرمیو ئارامیو، بەزەیی پێبەخشی بوو بە جۆرێك كە لە ناو تەواوی بەرەی ئادەمیزاد دا بەدی نەدەكرا و وێنەی نەبوو كە خۆڕاگری هەموو ئازار و سزایەكی كۆمەڵگای نەزانی دەكرد و لە سەرباری ئەو هەموو ئازارانەدا بەدڵنیاییەوە دەیفەرموو: كچم مەگریە خودا باوكت لە ئازارو خەراپەی ئەو بێباوەڕانە دەپارێزێ.

## هاوسێیەتی تۆم ناوێ

## جوارك رد عليك

لەدوای ئەوەی كە(عومەری كوڕی خەتاب‌ﷺ) موسڵمان بوو دەفەرموێ: ڕۆیشتم بۆلای (ئەبو جەهلی كوڕی هوشام)ی خاڵم كە پیاوێكی باش بوو، لە دەرگام دا وەتی: كێیە؟ منیش وەڵامم دایەوە منم (عومەری كوڕی خەتاب‌ﷺ) موسڵمان بوومو باوەڕم هێناوە، گوتی: شتی وامەكە، كاتێ چومە ژوور هەموو دەرگاكانی دواوەیان لێداخستم گوتم: ئەوە چیەو؟ بۆچی وا موسڵمانان ئاوالێیان دەدرێ،

بەلام من موسلمان بووم و هیچ كەس لێم نادەن؟، یەكێك بەمنی گوت: حەز دەكەی موسلمانبوونی خۆت بلاوبێتەوە و خەلك بزانن گوتم:بەلێ زۆرم حەز لێیە، گوتی: برۆ لە كەعبە لەلای (حیجر) كاتێ جەماوەر كۆبوونەوەو دانیشتن تۆ بەنهێنیو لە سەرەخۆ بە فلانە كەسە بلێ شتێكت پێ دەلێم لە بەینی منو خۆت دابێت، كەئەمن موسلمان بووم!! ئەو پیاوەش ناتوانێ نهێنی بشارێتەوە: عومەریش فەرمووی: چاوەڕوانیم كرد هەتا خەلك كۆبۆوەو، بەنهێنی چومە لایو پێم گوت :كارێكەو لە نێوانی خۆمو خۆت دابێت پێت دەلێم: كە ئەمن موسلمان بووم بەلام بەكەس مەلێ بانەزانن: پێی گوتم: بەڕاستی تۆ موسلمان بووی؟ گوتم بەلێ: ئەو كابرایە كەزانی بە تەواوی موسلمان بووم بە هەموو هێزی هاواری كردو گوتی: بەلێ بەڕاستی كوڕی خەتاب موسلمان بووە خێراكەن وەرن بۆلام، خەلكێكی زۆری لە لا كۆبۆوەو، دەستیان كردبە لێدانیوئەویش دەستی دەوەشاندەوەو لێی دەدانەوە، خالم گوتی: ئەوەچیە بەو شێوە كۆبونەوە، گوتیان: (عومەر) شێت بووەو موسلمان بووە: (ئەبوجەهلی كوڕی هوشام) ڕۆیشتە لای حجرو بە ئیشارەی دەست و ئەنگوچكی باسكی گوتی:لێی گەڕێن من كوڕی خوشكم بەكرێ گرتووەو بە تاقیم كردۆتەوە، بۆیە ئێوە لەبەر چاوم لای بەن چونكە حەز ناكەم هیچ موسلمانێك لەبەر چاوی من لێی بدات، منیش دەزانم كەباوەڕی هێناوەو لەسەر ئەوە لێی دەدەن (عومەر) دەفەرموێ: ئەوە چیە ئێوە توشتان بووە، ئینجا ڕۆیشتمەلای خالم و گوتم: ئەی خالە من بەهیچ جۆرێك هاوسێی تۆم ناوێ بۆ خۆت. بەو شێوەیە هەر لێدانو هەر لێدان هەتا خودای گەورە ئەم دینە سەربەرزو سەر فیراز دەكات.

## لێم گەڕێن خودا دەم پارێزێ - دعونی فإن الله سیمنعنی

ڕۆژێكیان یارەكانی(پێغەمبەر ﷺ)لە جێگەیەك كۆبونەوە و دەیانگوت: بەڕاستی دانیشتوانی قوڕەیشی بە هیچ جۆرێك نایانەوێ بە ئاشكرا گوێ لەو قورئانە بگرن، چی كەسێكی ئازاو بە توانا هەیە بچێتە لایان و بەدەنگ قورئان بخوێنێ هەتا گوێیان لێبێت (عبداللەی كوڕی مەسعود)فەرمووی: من دەڕۆم و قورئانیان بۆ دەخوێنمەوە، یارەكان گوتیان: تۆ مەڕۆ چونكە زۆر لە تۆ دەترسین شتێكت لێبكەن

و لێتبدەن، وامان پێ باشە یەکێکی تر بڕوات قورئانیان بۆ بخوێنێ کەخاوەنی هێزو دەسەڵات بێتو جەماوەری لە پشتەوە بێت کە دەستدرێژیان بۆ کرد یارمەتی بدەن و نەهێڵن لێی بدەن، بەڵام تۆ هەژاریت و کەسیشت نیە یارمەتیت بدات، عبداللهﷺ) فەرمووی: لێم گەڕێن هەر بۆ خۆم دەڕۆم و قورئانیان بۆ دەخوێنم چونکە بەڕاستی خودا پارێزگاریم لێدەکات: بۆ بەیانی (عبداللەی کوڕی مەسعودﷺ)ڕۆیشتە بەیتو، چووە لای مەقامی حەزرەتی ئیبراهیم لە کاتی چێشتەنگاو، کاتێ قورەیشیەکان هەموویان لەنادی و چایخانەکانیان کۆبوونەوە عبداللەی کوڕی مەسعودﷺ) هەستایە سەر پێ و بە دەنگێکی بەرز دەستی کرد بە قورئان خوێندنو فەرمووی {بسم الله الرحمن الرحيم:ٱلرَّحۡمَٰنُ .عَلَّمَ ٱلۡقُرۡءَانَ .خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ .عَلَّمَهُ ٱلۡبَيَانَ }الرحمن ١ ٤ واتە: بە ناوی خودای بەخشندەو میهرەبان. ئەو خوایە بەسۆز و میهرەبانە بەندەکانی فێری خوێندنەوەی قورئان و تێگەیشتنیانی لە قورئان کردووە. هەر بە تەنها ئەو خودایە ئادەمی زادەکانیشی دروست کردووە. وە هەر ئەویش ئادەمیزادەکانی فێری گوفتار و زانین کردووە.

ئینجا کافرەکانی قورەیش کەلەو شوێنە کۆبونەوە کە گوێیان لەو دەنگە بوو هەموویان سەرسام بوون و گوێیان لێگرت و گوتیان: باشە کوڕی(ام عبد)چی دەڵێ؟ هێندێکیان گوتیان: ئەوشتە دەخوێنێتەوە کە بۆ ( محمد(ﷺ) هاتۆتە خوار: ئینجا هەموویان لێی ڕاستبوونەوەو دەستیان کرد بەلێدانی، بەڵام (عبداللهﷺ) لە قورئان خوێندنی خۆی نەکەوت هەتا ئەوەندەی کە خودا حەز بکات خوێندی، دوایی بە دەمو چاوی خوێناویو شەکەتوماندوی ئازاری لاشەی گەڕایەوە لای هاوڕێکانی، هاوڕێکانی بە غەم و پەژارەیەکی زۆرەوە گوتیان: ئەوە بوو کە ئێمە لەتۆ دەترساین قورئان بخوێنی: (عبداللهﷺ) فەرمووی: بە خودا بێباوەڕان هەرچەندە بەهێز و قەبارەیان زۆر بێ، لەلای من هیچ نمودێك وبەرچاویان نییەو، کەمترین شتن، وە ئەگەر ئێوە حەز بکەن بەیانیش بەهەمانشێوەو لەهەمانشوێندا قورئانی تر دەخوێنم؟ بەڵام یارەکان بەتکایەکی زۆرەوە داوایان لێ کرد کە نەڕوات و قورئان نەخوێنێ چونکە ئەمڕۆ ئەوەندەت قورئان بۆ خوێندون کەدڵیان بتەزێو، پێیانناخۆش بێت.

# بەردەوامی وخۆڕاگری پێغەمبەر(ﷺ)لەراگەیاندن دا
# ثبات الرسول ( ﷺ ) فی دعوته

کاتێ تەمەنی ژیانی(ئەبوتالیب)ی مامی پێغەمبەر لە هەشتا ساڵی تێپەڕی کرد، وای بەخەیاڵ و بیری داهات و ترسی لێپەیدا بوو کە لە دوای مردنی کێشەی بە بەریەکداچون لە نێوانی قوڕەیشیەکان و محمد پەیدا دەبێت و ڕوو دەدات، وەترس و نائارامی دوا ڕۆژی زۆری کەوتە دڵەوە بە تایبەتی لەو کاتەی کە حەزرەتی عومەر و، حەزرەتی حەمزەی عبد المتلب (ﷺ)باوەڕیان هێنا و موسڵمان بوون بۆیە پیاوە لێهاتو ناودارەکانی قوڕەیش ڕۆیشتنە لای ئەبوتالیبو وتیان: ئەی ئەبوتالیب تۆ بۆ خۆت لە ئێمەی و زۆر باشیش دەزانی ئەو ترسەی لە نێوانی ئێمە و برازاکەت محمددا هەیە: ڕێگە چارەیەك بۆ ئەویشو ئێمەش دابنێ کە نە ئێمەش و نە ئەویش پەلە قاژەی یەکتری نەکەینو، هیچمان ناو ناتۆرەی خەراپ بەرامبەری یەکتریو، پڕوپاگەندەو پیلان بۆ یەکتری دانەنێین: ئینجا بۆ ئەو مەبەستە بانگهێشتی پێغەمبەر(ﷺ) کراو جەماوەرێکی زۆری خەڵکان ئامادەی ئەو کۆبونەوەیە بوون ، کاتێ هۆو دەرەنجامی کۆبوونەوە جەماوەریەکە دیاری کراو، بە خەڵکان ڕاگەیەندراو، ئاشکرا کراو، لە یەکتری تێگەیشتن، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: تەنها یەك وشە لەمن وەربگرن ئێوە دەبنە خاوەن و سەرکردەی هەموو عەرەب و، عەجەم و، وڵاتەکەتان و، قەرزار باری ئێوەش دەبین: ئەبوجەهل هاتەوتەو گوتی: بەڵێ من لەجیاتی هەموویان دەڵێم، لەباتی وشەیەك بادە و شەش بێتو هەموو ڕازین: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئێوە بڵێن (لاإله إلا الله) و لەوپەرست تراوانەی کە بەغەیری خودا دەیانپەرستن واز بهێننو، دوور بکەونەوە لێیانو دەربچن. هێندێك لەناو ئاپۆرەی جەماوەر دەنگیان بڵند کردوو گوتیان: بەخودا ئەو پیاوە شتێکی زۆر و قورسی لەسەر ئێوە دانەناوە کە ئێوە نەتوانن پێی هەڵبستنو توانای کردنیتان نەبێت، شتێکی زۆرکەمی پێبەخشین، بە ئەندازەی شتێکی کەم کە بۆ خۆشتان چاوەڕێی زۆر لەوە گەورەترتان دەکرد، بەڵام بێ باوەڕان هیچ گوێیان پێنەداو جێگاکەیان چۆڵکردوو ئەو شوێنەیان بەجێهێشت.

# ئەی ساریە كێوەكە
# یاسارية الجبل

حەزرەتی عومەر(رضي الله عنه) لەڕۆژی هەینی لەمەدینە وتاری دەخوێندەوە: لە وتارەكەیدا فەرمووی: ئەی ساریەی كوڕی حەسن كێوەكە ، كێوەكە. خۆشتێكی دیاریو ئاشكرایە هەر كەسێك گورگ بكاتە شوانی مێگەلی حەیوان خراپەو ستەمی كردووە. هێندێك لە ئادەمیزادەكان لەكاتی گوێ لێبوونی ئەو فەرموودەیەدا چاویان ئەبلەق بوو سەیری یەكتریان دەكردو نەیان دەزانی مەبەستی پێشەوای موسڵمانان لەو فەرمودەیەدا چیە؟ بۆیە كاتێ حەزرەتی عومەر(رضي الله عنه) لەوتارەكەی بۆوەو نوێژیان كرد، حەزرەتی عەلی(رضي الله عنه) ڕۆیشتە لای حەزرەتی عومەر و فەرمووی: ئەی پێشەوای باوەڕداران ئەو فەرمودەیە چی بوو فەرمووت؟ حەزرەتی عومەر(رضي الله عنه) فەرمووی: گوێتان لێبوو؟ حەزرەتی عەلی فەرمووی: بەڵێ منیش‌و هەموو ئەوانەی ئامادەی نوێژی هەینی بوون گوێیان لێ بوو: حەزرەتی عومەر (رضي الله عنه) فەرمووی: لەو كاتەدا چاوم پێكەوت‌و كەوتە دڵیشمەوە كەبێباوەڕان لە جەنگدا شكاون و برایانی باوەڕدارانمان كەوتوونە دوایان‌وڕاویان دەنێن وە ئەو كۆمەڵە باوەڕدارەی كە لەسەر كێوەكە تەماسیان گرتووەو لە كەمیندا ماونەوە و هێندێكیش دێن‌و دەڕۆن ئەگەر لەجێگەی خۆیان جێگیر بن ئەوا بێباوەڕان بە تەواوی تێشكاون‌و دۆڕاون بەڵام كە لە كێوەكە بێنە خوارو نەمێنن ئەوا تێ دەشكێن‌و دەدۆڕێن: بەڵام كە سەیرم كرد موسڵمانان خەریكی دابەزین بوون لەكێوەكەو بێ باوەڕانیش لەلایەكی ترەوە سەردەكەوتن ئەگەر سەر بكەوتبانایە سەر كێوەكە، موسڵمانان دەدۆڕان، بۆیە هاوارم كرد بۆسەرۆكی سوپا كەناوی ساریە بوو وتم:ساریە كێوەكە، كێوەكە. ئینجالەدوای یەك مانگ لەو ڕوداوە هەواڵدەرێك مزگێنی بۆ مەدینە هێنا لە ناو كۆمەڵی یارەكاندا ئەو هەواڵ نێرە باسی ئەو دەنگەی كرد كە لەو ڕۆژ و سەعاتەدا عومەر(رضي الله عنه) هاواری كردووە و ئەوان گوێیان لێی بووە لە كاتێكدا كەویستیان كێوەكە چۆڵبكەن و بێنە خوار دەنگەكەش شێوە دەنگی حەزرەتی عومەر بووە كە فەرمووی: ئەی ساریەی كوڕی حەسن كێوەكە، كێوەكە. باوەڕدارانیش هەر خێرا ڕۆیشتنەوە و گەڕانەوە سەر كێوەكە و ڕزگاریان بوو بەسەر دووژمندا سەركەوتن.

## هەرکەس فەرمان بەرداری خوابکات، هەمووشتێك فەرمان بەرداری ئەو دەکەن

## من أطاع الله أطاعه کل شيء

کاتێ کەوڵاتی (میصر)ئازاد کرا خەڵکەکەی ڕۆیشتن بۆ پێشوازی عەمری کوڕی عاص لەکاتی چونە ناوڕۆژێکی مانگی نوێی عەجەمی، وتیان: ئەی پێشەوا ئێمە لە ڕۆژێکی ساڵیادی ئەو مانگەدا ئاوی دەریای نیل شوێنەوار و تەقالیدێکی وای لە لایەن ئێمەوە بۆ هەیە بەبێ ئەنجامدانی ئەوکارە ئاوی دەریای نیل ناڕوات. عەمری کوڕی عاص فەرموی: ئەو تەقالیدە چی ڕەوشتێکە بۆتان داهێناوە، ئەوانیش وتیان: لە ساڵیادی هەموو پانزەی ئەومانگە دەچین کچێکی جوان و شۆخ و شەنگ دیاری دەکەین‌و باوكو دایكی ڕازیدەکەین‌و بەخشڵی زێڕو زیو و بەرگو پۆشاکی جوان دەیڕازێنینەوەو دەیبەین فڕێی دەدەینە ناودەریای نیلەوە بۆ ئەوەی دەریای نیل بەچاکی‌و ڕێكوپێکی بڕوات‌و نەبێتە هۆی مەترسی لەسەر دانیشتوانی. حەزرەتی عەمری کوڕی عاصیش پێیانی فەرموو: ئەو شتانەی کە ئێوە کردووتانە بە هیچ جۆرێك لە ئیسلامدا جێگەی نابێتەوە، بە ڕاستی دینی سەر بەرزی ئیسلام هات و ئەو ڕێچکە پوچ و خوڕافیانەی لە ناو بردو نەیهێشتن کە لە پێشودا هەبوون، ئەو ڕۆژە هەموو جەماوەری خەڵکە کە بەجارێك ڕۆیشتنە سەر دەریای نیل و زۆر بە دیقەتەوە چاودێری دەریای نیل یان دەکرد بەڵام هیچ هەڵچون و هاتنی دەریای نیل دیاری نەدا هەموو خەڵکەکە هەستیان بە سەر سامی‌و شپرزەیی ناخۆشی لەبەر نەبوونی ئەو هۆیەوە دەکرد. کاتێ عەمری کوڕی عاص ﷺ چاوی بەو دیاردەیە کەوت نامەیەکی بۆحەزرەتی عومەر ﷺنوسی لەو بارەیەوە ئەو ڕووداوەی تێگەیاند: حەزرەتی عومەرﷺ لە وەڵامی نامەکەیدا فەرمووی: بەڕاستی ئیسلام ئەو ڕوداو بەسەرهاتە خوڕافیانەی پێشوی تورو فڕێداوە حەزرەتی عومەر کارتێکی (بتاقە) لەناو نامەیەك دانا کە تێیدا نوسیبووی ئەی عەمر من ئەو کارتەم بۆ ناردی کەلەناو نامەکەم دایە فڕێی بدە ناو دەریای نیل!! کاتێ نامەی حەزرەتی عومەرﷺ گەیشتە دەستی عەمرو نامەکەی خوێندەوە و کارتەکەی دەرهێنا لێی نوسرابوو لەبەندەی خوداوە عومەری کوڕی خەتاب

پێشەوای موسڵمانان بۆ دەریای نیلی میصر، ئەی نیل ئەگەر تۆ بە فەرمانی خۆت دەڕۆی ئەوە هیچ پێویستیمان بە تۆ نیە و مەڕۆ و نامانەوێی ! وە ئەگەر بە فەرمانی خوداش دێیو دەڕۆی ئەوە لەخودای بەهێزو بە توانا داوا دەکەین بە چاکی بڕۆی. عەمریش کارتە کەی فڕێدایە ناودەریای نیلەوە بە ڕۆژێك لە پێشی هاتنی جەژنی خاچ ( صلیب) بەفەرمانی خودا بەماوەی یەك شەو (١٦) شانزە زیراع بەرز بۆوە و خودای بە دەسەلأت ئەوداب و نەریتەی خەڵكی میصری كۆتایی پێهێناو جارێكی تر هەتا ئێستاش ڕووی نەداوەتەوە.

# چاوێنیو مەرایی، هاویەشیو شرکە - الریاء شرك

دەگێرنەوە پێغەمبەری خوداﷺ لەوەلأمی (شەدادی کوڕی ئەوس) کاتێ پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد کە ئایا ڕوخساری پێغەمبەرﷺ بۆچی ئەوەندە بە پەژارە و ماتەمینە ئەویش فەرمووی: لەوە دەترسێم گەل و نەتەوەکەم هەڵبگەڕێنەوە و شەریك و هاوبەش بۆ خودا بڕیار بدەن بەهۆی ئارەزوبازی و، کەمتەرخەمیان لە ئاینەکەیان کە بەڕاستی شیرك وونو نادیارە؟ شەداد گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺبۆ لەدوای تۆ گەلو شوێنکەوتوانت دەڕۆنەوە سەر کوفر و هاوبەشی بۆ خودا بڕیار دەدەن؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی شەداد گەل و شوێنکەوتوانم، ڕۆژو، بتو، بەرد و، دارناپەرستن، بەلأم بەهۆی کردەوەکانیان ڕیای و چاوێنی دەکەن، شەداد گوتی: بۆچی ئەی پێغەمبەری خودا ڕوپامایيو، مەرایی هاوبەش پەیدا کردنە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵێ ئادەمیزاد ڕۆژ دەکاتەوە بە ڕۆژووە و ، چاوی بە ئارەزوویەك لە ئارەزوەکانی دونیا دەکەوێ ئەویش زۆری ئارەزو دەکاتو ڕۆژوەکەی دەشکێنێ بۆیە خوداش دەفەرموێ:{وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِاللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ}یوسف/١٠٦ واتە: بەڕاستی زۆربەی زۆری خەڵکی باوەر بەو خودایە تاك و تەنهایە ناهێننو شەریكو هاوەڵیشی بۆ بڕیاردەدەن، پێغەمبەریش ﷺگەلەکەی بۆ ئەوە ئاگادارکردۆتەوە دەفەرموێ: ئەی ئادەمیزادەکان لە خودابترسن و خۆپارێز بن لەهاوبەش پەیداکردن چونکە بەڕاستی ئەو هاوبەشی پەیداکردنە زۆربێ چرپە و هەستە وە زۆر لە دەنگی ڕۆیشتنی مێروله بێ چرپەو هەست ترە.

# بۆیە گریام چونکە تەنها یەك گیانم هەبوو
# بكیت حیث لیس لی إلانفس واحدة

لە جەنگێك لەگەڵ ڕۆمەکاندا (عبداللەی کوڕی حوزافەﷺ)ی سەهمی هاوڕێی پێغەمبەری خودا بەدیل دەگیرێت بەدەستی ڕۆمەکان یاخیبووەکانی ڕۆم پێی دەڵێن عبدالله ببە بە گاور دەنا لە مەنجەڵی مسی گەرمکراوی گەورەت دەهاوین، ئەویش لەوەڵامدا دەفەرموێ: من بە هیچ جۆرێك نابم بەگاور. دەڕۆن مەنجەڵی گەورەی لەمس دروست کراو دەهێنن و پڕی لە ڕۆنی زەیت دەکەن ودەیکوڵێنن بەجۆرێك پڕیشکی گەرمی فڕێدەدا. لەبەرچاوی عبدالله دیلێکی موسڵمان دەهێنن و پێی دەڵێن: ببە بە گاور؟ دەنا لە ناو ئەو مەنجەڵە ڕۆنی قرچاوەت دەهاوین، ئەویش نابێتە گاور و فڕێیدەدەنە ناو مەنجەڵەکەوە و هەر بەزوترین کات گۆشتەکەی دادەماڵێت و ئێسکەکانی بەدەردەکەوێت و گیانی دەردەچێت. ئینجا ڕوو لە عبدالله دەکەن و پێی دەڵێن: ببە بە گاور، ئەگینا شوێن و چارەنوسی تۆش وەکو چارەنوسی ئەو کەسانەیە، عبدالله ﷺ گوتی: هەرگیز من شتی واناکەم و نابم بەگاور، فەرمانیان دەرکردکە عبداللەش فڕێ بدەنە ناوئەومەنجەڵەوە، کە (عبداللەﷺ) نزیك خرایەوە لە مەنجەڵەکە (عبدالله) دەستی کرد بە گریان، بە جارێك هاواریان کردووتیان: وا عبدالله دەگریا بیگێڕنەوە پەشیمانبۆتەوە؟! عبدالله ﷺ هاتە گوفتار فەرمووی: وا مەزانن کە دەگریەم پەشیمانبووبمەوە: نا نەخێر وا نییە، ئەمن بۆیە دەگریەم و هاوار دەکەم، لەبەر ئەوەم نیە کە فڕێم دەدەنە ناو ئەو مەنجەڵە گەرمی ڕۆن زەیتەو دەمکوژن بترسێم، نا لەبەر ئەوەم نییە تەنها لەبەر ئەوە دەگریەم کەمن یەك گیانم هەیە کەلە پێناوی خودا دەیبەخشم: حەز و ئارەزوم دەکرد کە بە ئەندازەی ئەوموانەی کە بەلاشەمەوەیە گیانم هەبایەو، ئێوەش ئەو توانا دەسەلاتەتان بەسەر گیانی مندا هەبوایە، منیش بە پێخۆش حاڵیەوە هەموو گیانە کانم ببە خشیبایە: گاورەکان بەوتەی عبدالله سەرسام و حەیران بوون، بۆیە ئارەزومەیلیان دەکرد کە لەبەر ئازایی و چاپوك و چاو نەترسیەی، ویستیان عبدالله نەکوژن و بەرەڵای بکەن، پادشای ڕۆم بانگی عبداللەی کرد گوتی

عبدالله من پێشنیارێکی بچوکم هەیە بۆ تۆ دەمەوێ ئازادت بکەم تەنها سەرم ماچ بکە ئازادت دەکەم و دەتبەخشم عبداللهﷺ فەرمووی: شتی واناکەم دوایی پادشا گوتی: ببە بەگاور کچەکەی خۆمت لێمارە دەبڕم و هەرچی موڵك و پارە و هێز و دەسەلاتمە لەگەڵت دەکەمە دووبەش؟ عبدالله ﷺ فەرمووی: ئەوەش ناکەم!! پادشا گوتی: سەرم ماچ بکە خۆت و هەشتا گیراوی موسڵمانان ئازاد دەکەم: ئینجا عبدالله ﷺفەرمووی: ئەو شەرتە دەکەم و بە ئەنجامی دەگەیەنم، سەری ماچ کردو خۆی و هەشتا موسڵمانی ئازاد کرد و گەڕاینەوە.

## بەڕاستی واز لەئاینم ناهێنم

## إنني لاأدع ديني

سەعدی کوڕی ئەبی وە قاصﷺکاتێ باوەڕی هێناو موسڵمان بوو دایکی زۆری پێناخۆش بوو، بە موسڵمان بوونەکەی ناڕازی بوو، چونکە دایکی لەهاوبەش پەیداکەران بوو، زۆریش لەسەر ڕێبازە پوچەکەی دڵسۆز و بەردەوام بوو: سەعد بەرامبەر بە دایکیشی بەڕادەیەکی زۆر و تەواو خزمەت گوزار و بەئەمەك و دڵسۆز و نەرم و میهرەبان بوو: بۆیە دایکیشی لەبەر ئەو هەموو دڵسۆزیەی بۆی زۆر جەختی لەسەر دەکرد و پێی دەوت ئەی سەعدپێم بڵێ ئەو ئاینە تازە چیە داتانهێناوە؟ وازی لێ بێنە و هەتا زووە پەشیمان ببەوە: سوێند بە خوداکەمان هەتا پەشیمان نەبیەوە لەو ئاینە نەنان دەخۆمو نە ئاو یان پەشیمان دەبیەوە یان لە برسان و تینوان دەمرم و تۆش بە مردنی من خەجاڵەت و شەرمەزار دەبی؟ سەعد گوتی: دایەگیان ئەوها ڕەفتار مەکە سوێند بە خودا من لەو ئاینە پەشیمان نابمەوە! دایکی سەعد شەو ڕۆژێك هیچی نەخوارد بۆ بەیانی دایکی تەواو بێهێز بوو ڕەنگی گۆڕاو زەردهەڵگەڕا لەبەر دڵنەرمی و سۆزی سەعد بۆ دایکی زۆری لەگەڵ کرد کەنان بخوات بەڵام بێسود بوو بۆیە بەدایکی وت: ئەی دایە خواردن بخۆ سوێند بە خودا ئەگەر لەباتی یەك گیان هەزار گیانت تێدا بێت لەبەر چاوم یەك بەیەك ئەو گیانانە بێنەدەرێ دڵنیاو ئاسودە بە من تامی ئەو ئیمانەم

چێشتوەو پەشیمان نابمەوە؟! ئینجا كاتێ دایكی سەعد دڵنیابوو لەوەی كە سەعد پاشگەز نابێتەوە لە ئاینەكەی دەستی كرد بە خواردن و خواردنەوە.خودای گەورە و بە بەزەیش لەو بارەوە ئەو ئایەتەی ناردە خوارەوە كە دەفەرموێ:{وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشۡرِكَ بِي مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٞ فَلَا تُطِعۡهُمَاۖ وَصَاحِبۡهُمَا فِي ٱلدُّنۡيَا مَعۡرُوفٗاۖ وَٱتَّبِعۡ سَبِيلَ مَنۡ أَنَابَ إِلَيَّۚ ثُمَّ إِلَيَّ مَرۡجِعُكُمۡ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ} لقمان/١٥ واتە: ئەگەر دایك و باوكت هەوڵیاندا لەگەڵت بەبێ هیچ بەڵگەو زانیاریەك بۆ ئەوەی شەریك و هاوەڵ بۆ خودا بڕیار بدەی، ئەوە لەو داوایەیان بەقسەیان مەكە. بەڵام هەردەم هاوڕێ‌و دۆست و خزمەت گوزاریان ببە بۆ كاری چاكە، وەڕێگای ئەو كەسانە بگرە كە بۆ لای من گەڕاونەوە، چونكە باش بزانە لە دوا رۆژدا هیچ ڕێگەیەك نیە تەنها گەڕانەوە بۆ لای من نەبێ. وە ئەو كاتە ئاگادارتان دەكەمەوە بەهەر كردەوەو ڕەفتارێك كەكردووتانە.

## بەڕاستی من لە دراوسێی كەسێكم زۆر لە تۆ بەڕێزترە

## إنی لفی جوار من هو أعزمنك

دەگێڕنەوە عوسمانی كوڕی مەزعون‌ ﷺ پیاوی بەڕێزو خاوەنی كەسایەتیەكی گەورە ڕۆژێك بە جێگەیەكدا دەڕۆیشت گەیشتە لای كۆمەڵێك لە قوڕەیشیەكان كە گوێیان لە لەبیدی شاعیر گرتبوو شعری بۆیان دەخوێندەوە دەیوت: هەر كەسێ لەو جیهانەدا پەیوەندی لەگەڵ خودادا بپچڕێنێ ئەوا ئەو ئینسانە بێسودە و هیچ كەڵكی نیە، عوسمانیش كە گوێی لەو پارچە شعرە بوو سوێندی خوارد و گوتی: واللەی ڕاستی گووت. لەبید لە كۆتایی شعرەكەی گوتی: هەموو خۆشیەكیش گومانی تێدا نیە كۆتایی دێت‌و دەبڕێتەوە. بەڵام ئەمجارە عوسمان ﷺفەرمووی: بەخودا درۆدەكەی چونكە نیعمەت و خۆشی بەهەشت هەرگیز كۆتایی نایاو نابڕێتەوە: لەبید بە دەنگێكی زۆر ناڕازی‌و تاسانەوە بەو كۆمەڵ‌و جەماوەرەی دەورەی خۆی گوت: ئەوە چی گاڵتەجاڕی و كارێكە كە هاوڕێیەكی كوڕەكەتان ئازارم بداو سوكایەتیم پێبكات، چۆن ئێوەڕازی دەبن: ئەو پیاوە كەی هاتۆتە ناو

کوڕەکەمان، کابرایەك لەناو کوڕەکە هەستاو زۆر قسەی ناشیرینی بەعوسمان گوتو زللە و شەقازلەیەکیشی لە ڕووخساری ڕاکێشا لە پێشی چاوی وەلید کە لەو شوێنە زۆر نزیك بوو وەلید گوتی: سوێند بەخودا کوڕی برام، چاوەکانت زۆر لەوە گەورەترو بەڕیز تربوو لەوەی کەزللەکەی بەرکەوت، عوسمان ﷺفەرمووی: بەڕاستی ئێوە بەرامبەری ئەو زللەیەی کەلێم دراوە زۆر هەژار و نەزانن، سوێند بەخودا چاوەکەی ترم زۆر هەژارتر بوو بەرامبەر بەو چاوەی کە زللەکەی بەرکەوتووە، بەڕاستی بزانە کەمن دراوسێی کەسێکم کە زۆر لە تۆ گەورە و بەڕێز ترە.

# باوەڕی ڕاستی

# ألإيمان الصادق

حەزرەتی ئەبوبەکرﷺ هاوڕێی گیانی بەگیانی و دڵسۆز و بە ئەمەکی پێغەمبەری خودا ﷺ کاتیّ خودای گەورە پەیامی پێغەمبەرایەتی پێڕاگەیاند کۆمەڵێك لە پیاوانی قوڕەیش چونە لای ئەبوبکر و پێیان گوت: ئەی ئەبابکر بەڕاستی هاوڕێیەکەت شێت بووە، ئەبوبکر ﷺ فەرمووی: بۆچی چی بووە و چی ڕویداوە؟ گوتیان: وا لەمزگەوتە و قسان دەکات: ئەبوبەکر هەستاو بەرە و لای پێغەمبەرﷺ ڕۆیشتو لەدەرگای داو پێغەمبەرﷺ هاتە دەرەوە کە بەیەکگەیشتن ئەبوبکرﷺ فەرمووی: ئەی باوکی قاسم ئەوە چی هەواڵێکە لەلایەن تۆوە پێم گەیشتوە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: چیت بیستوە ئەبوبکر؟ فەرمووی: پێیانگوتم: کە تۆ داوای یەك خودا پەرستی دەکەیتو دەڵێی تەنها یەك خودا هەیە و بۆ خۆشت بانگەشەی ئەوە دەکەی کە پێغەمبەرو نێردراوی خودای: پێغەمبەرﷺ فەرمووی بەڵیّ: ئەبوبکر بەڕاستی خودا ناردومی بۆ ناو تەواوی بەرەی ئادەمیزادەکان بە مزگێنی دەرو ترسێنەر وەکردومی بەهۆی ڕاگەیاندنی بەرنامەی حەزرەتی ئیبراهیمعليه السلام، حەزرەتی ئەبوبکرﷺ فەرمووی: سوێند بەخودا ڕاست دەکەی چونکە هەرگیز درۆم لێنە دیتوی وە بەڕاستیش تۆ شایانی هەڵگرتنی ئەو پەیامەی، چونکە بەڕاستی تۆ زۆر بەرزو گەورەو، سەر ڕاستو، دڵپاکو، بە جێهێنەری سیلەی ڕەحمو،

بەزەیی و، جوان ڕەفتارە كردارە كانت، دەستت بێنە بۆ ئەوەی پەیمانت لەگەڵدا بدەم: پێغەمبەر دەستی بۆ لای ئەبوبەكر درێژ كرد پەیمانی لەگەڵدا بەست بەباوەڕێكی پتەوڕاستەوە:لەوبارەوە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: هەر كەسێك كەداوای باوەڕبوونم لێكرد بێت؟ تۆزێك ڕاماوەو بیرێكی تەواوی كردۆتەوە تەنها ئەبوبكر نەبێت! ڕاستەو خۆ باوەڕی هێناوەو موسڵمان بووە.

## پرسیار لە كردارو ڕەفتاری ئادەمیزاد مەكە

## لاتسأل عن أعمال الناس

جارێك پێغەمبەرﷺلەگەڵ تەرمی كابرایەك ڕۆیشت بۆ گۆڕستان كاتێ تەرمەكەیان دانا حەزرەتی عومەرﷺ فەرمووی: یا ڕەسول الله ئەو كابرایە داوێنپیس و گوناهبارە نوێژی لەسەر مەكە: پێغەمبەریشﷺ ڕووی لەجەماوەرەكە كردو فەرمووی: هیچ كەس لەئێوە ئەو كابرایەی دیوە لەسەركردنی كارو فەرمانی ئیسلامی، یەكێك لەئامادەبووانی كۆڕی بە خاك سپاردنی ئەو پیاوە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا من دیتومە شەوێك پاسەوانی لەڕێگای بەرنامەكەو پارێزگاری كرنی ئاین بووە؟ ئەمجارە پێغەمبەر ﷺنوێژی لەسەر كردو، لەناو گۆڕیان هاویشت وخۆڵیان بەسەرداكرد، پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشتە سەر گۆڕەكەی و فەرمووی: وا هاوڕێیانت وا گومان دەبەن كەتۆ جێگاو دانیشتوی ناو ئاگر و دۆزەخی بەڵام من شاهیدی و گەواهی دەدەم كە تۆ دانیشتوی ناو بەهەشتی؟ دوایی پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی عومەر تۆ پرسیار لە كرداری خەڵكی مەكە؟ بەڵام پرسیار لەخوو ڕەوشت و سروشت و نەژادی بكە.

## مارەییەكەی ئیسلام بوون و باوەڕە - مهرها الإسلام

(ئەبوتەلحە)ی ئەنساریﷺ پیاوێكی دیارو بەناو شۆرەت بوو: لە پێشی موسڵمان بوونی و كاتی بێباوەڕیدا داوای هاوسەرگیری لەدایكی (سولەیم) كرد، دایكی (سولەیم) لەوەڵامی (ئەبوتەلحە)دا گوتی: سوێند بەخودا (ئەبوتەلحە) تۆ پیاوێكی مەردو دیارو بەرچاوی، شایانی هەموو شتێكی و، هەرگیز نەدەبوو داوایەكەی تۆ

وەرنەگیرێ و، گوێی پێنەدرێ بەڵام، لەبەر ئەوەی کە تۆ بێباوەڕیو، منیش باوەڕدارم، هاوسەرگیری باوەڕدار لەبێباوەڕ نابێتو دروست نیە؟ بۆیە مەرجت بۆ دەدەنێم ئەگەر باوەڕ بهێنیو موسڵمان ببی، ئەو کاتە ڕازیمو مارەییەکەشم تەنها موسڵمانبونەکەتەو داوای هیچ شتی ترم نییە (ئەبوتەلحە)ش باوەڕی هێناو موسڵمانبوو، دایکی (سولەیم)یش بەتەنها موسڵمانبوونەکەی کردە مارەیی هاوسەرگیریەکەی. پێشەوا (سابت) دە فەرموێ: هیچ ئافرەتێکم نەبیستوە کە بەڕێز ترو. بە نرخ ترین مارەیی هەبێت لە دایکی(سولەیم) نەبێت کە تەنها بە موسڵمان بونەکەی بوونە هاوسەری یەکتری (ئەبوتەلحە)ﷺیەکێك بوو لە مەدینەیەکانو بەرێز و خۆشەویستترین هاوڕێی پێغەمبەری خودا بوو.

## سوێند بەخودا من لەسەر ئاینی محمدمﷺ

## والله إنی علی دین محمدﷺ

دەگێڕنەوە (غەزیەی کچی جابری کوڕی حەکیم) لەنەوەی قوڕەیش‌و هۆزی عامری بوو: هەرلەگەڵ بە دەرکەوتن و سەرهەڵدانی گەیاندنی پەیامی پێغەمبەرایەتیدا کە لەناو کەشوهەوایەکی زۆر ناخۆش و ئاڵۆز و دووڕ و بێباوەڕیدا بەناوی دایکی شەریك) ناوی دەرکردبوو موسڵمان بوو، ئەوئافرەتە لەگەڵ هاوسەرەکەی بەناوی عەسکری دوسی)ناوی دەرکرد بو، لە(مەککە) ژیانیان دەبردە سەر، هەر لەگەڵ ئاشکرا بوونی پەیامی پێغەمبەرایەتیدا پێشەواوپێشنگی هەموو ئافرەتانی مەکەبوو. بۆ وەڵامدانەوەو بە دەنگەوە هاتنی پێشەوای مرۆڤایەتی: ئەو ئافرەتە هەر بۆ خۆی ژیان و چیرۆکی بەسەرهاتی خۆی لەناوەندی خزمو کەس و هاوەڵانیدا باس دەکاتو دەگێڕێتەوەو دەڵێت: ڕۆژێك خزمو کەسی هاوسەرەکەم هاتنە لامو گوتیان: ئێمە وا هەست دەکەین کە تۆ لەسەر ئاینی محمدی؟ منیش لە وەڵامدا وتم: بەڵێ بەڕاستی لەسەر ئاینی ئەوم! پێیانگوتم: بەخودا دەبێ ئازار و سزایەکی ئەوەندە بەهێزو تینت بدەین کە بە تەواوی ئاینی محمدت لە یاد بچێتەوە، بۆ ئازار و سزادانم لە پێشەوە نان و هەنگوینێکی زۆریان دەرخواردامو،

نەیان هێشت ئاو بخۆمەوە، دوایی بردیانم سواری حوشترێكی چڵێسی شەڕەنگێزی زۆر خەراپیان كردم، لە ڕۆژگارێكی زۆر گەرم و بەتیندا، هەتاكو لای نیوەڕۆ، ئینجا لە حوشترەكە لە بیابانی چۆڵ‌و وشكو گەرما دایان بەزاندم و ڕۆیشتن و منیان بەجێهێشت‌و، خۆیان لێمشاردەوە بەو جۆرە سێ ڕۆژ بەم هەموو ئازار و ناخۆشیانە بردمە سەر، هۆش و چا وگوێم سست‌و بەرەو نەمان دەڕۆیشتن، لە ڕوژی سێهەم پێیان وتم: ئاینی محمد واز لێبێنەو پەشیمان ببەوە، منیش لەبەر ئەوەی ئەندامەكانی هەستم زۆرلاواز ببون زۆربەكەمی‌و پچڕ پچڕی حاڵی دەبووم و تێدەگەیشتم: بۆ وەڵامەكەشیان كە توانای دەنگم زۆر لاواز ببوو، بە پەنجەی دەستم ئاماژەم بۆ دەكردن‌و، بەرەو ئاسمان هەڵمدەبڕی و تاك و تەنهایی خودام پێدەگوتن، سوێند بەخودا ئەو بێباوەڕانە كە هەرگیز بەزەییان پێمدا نەدەهاتەوە، بەڵكو هەردەم لەسەر ئازارو سزاكانیان بەردەوام بوون‌و، منیش بە تەواوی ماندو شەكەت بووم. بەخودا لەو كاتی شەكەت‌و ماندو بوونەدا هەستم كرد شتێكی شلك‌و ئاوی سارد و فێنك كەوتە سەر سینگم منیش هەڵم گرت‌و قومێك ئاوی باشم لێخواردەوە، دوایی لێیان وەرگرتمەوە و لێیان ساندم، كاتێ سەیرم كرد ئەو شتەی كەلێیان وەرگرتبومەوە لە بۆشایی سەماو زەمین هەڵواسرا بوو: بەڵام بەداخەوە توانای پێگەیشتنیم نەبوو، ئینجا لەدوای ماوەیەك هەر ئەو شتە شلەم لێ نزیككرایەوەو، قومێك ئاوی تری باشم لێخواردەوەو، دوایی بەرز كرایەوە، ئینجا بۆ جاری سێیەمیش بۆم نزیككرایەوە و لێم خواردەوە، هەتا تێر ئاو بووم و، زیادەكەشم بەسەر ڕوخسار و پۆشاكەكانمدا كردو هەموو گیانم تەڕبوو، لەو كاتەداخزم‌و كەسەكەم دەر كەوتن و سەیریان كردم‌و وتیان:ئەی دوژمنی خودا ئەوئاوەت لە كوێ بوو؟ منیش گوتم: دوژمنانی خودا ئەوانەی بێجگە لەمنن، كە پێچەوانەی ئاینی منن. وە كەباسی ئەو ئاوەش دەكەن لەكوێ بوو ئەوە بەڕاستی لەلایەنی خودای پەروەردگارمەوەیە، كەخودای بە بەزەیی لە كاتی پێویستیدا بەهانای شوێنكەوتوانیەوە دێت: بەڵام، خزم و كەسانی بێباوەڕم خێراپایان كردە سەركوندەو مەشكەكانیان، وەیان زانی ئاوەكەی ئەوانەو من

هیناومە، بەڵام كوندەو مەشكەكانیان هەروەكو خۆیان دەركیان بەسترا بوو نەكرا بۆوە: ئینجا بە سەرسوڕمانێكەوە بۆلام گەڕانەوە گوتیان: شاهیدی دەدەین كە پەروەر دگاری تۆ پەروەردگاری ئێمە و هەموو بونەوەرە!! بەڕاستی ئەو خودایەی كە لەو شوێنە چۆڵ و بیابانە گەرم و وشكەدا خۆراك و ئاوی پێبەخشیوی، بەڕاستی هەر ئەو پەروەردگارەیە كە دەستور و یاسای ئیسلامی داناوەو بەرنامەی بۆ داڕشتوە، ئینجا لە دوای ئەو هەموو توندوتیژی و ئازاردانەدا، بەدژی ئەو موسڵمانە بۆیاندەركەوت كە بەڕاستی تەنها ڕێگاو ڕێبازەكەی ئەویان ڕاستەو ، ئی ئەوانیش پوچ‌و بێكەڵكە بۆیە هەموویان پەشیمان بوونەوەوموسڵمان بوون‌و، كۆچیان كرد بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ.

## جوانی پەیمان لە باوەڕەوە - حسن العهد من الإیمان

خودای گەورە پەڵپ‌و بیانوگرتنی وەرگرتوە لەو كەسانەی كە نەیانتوانیوە لەبەر پیری و پەككەوتەیان كۆچ بكەن بۆمەدینە، بەڵام لەسەر ئەو وەرگرتن‌و قەبوڵ كرد نە شەوە پیاوێكی نەخۆشی پیر لەهۆزی (لەیس) بەناوی (حەی كوڕی حەمزە)ی جەعەدی بەبیرو باوەڕی توندو چەسپاوی وای لەخۆرا دەبینی كەبەڕاستی بەهێزو توانایە بۆیە دەیفەرموو: من توانای كۆچ كردنم هەیە و هیچ بەڵگەو بیانوی مانەوەو خۆڕاگرتنم لەمەكەدا نیە: وەبەڕاستی من لەگەڵ ئەو كۆمەڵەی كەخودا بەنەخۆش‌و لاوازی داناون‌و جودای كردونەوە نیم‌و ، وەمن هیچ فێڵ‌و پیلانێكم بەدی نەدەكرد بۆكۆچ نەكردنم. چونكە ئەوەندەشم سەروەت‌و سامان هەبو كەزۆر لە مەدینەش زیاتر بڕۆم، بۆیە بڕیاری كۆچ كردنمدا كە لەو شەوە زیاتر لەمەككەدا نەمێنمەوە، بۆیە فەرمانی بە خانەوادەكەیدا بەو نەخۆشیەوە لەسەر تەختە و كەژاوەیەك هەڵی بگرن‌و بیگەیەننە مەدینە: بەڵام دەستی قەدەر ئەو توانایەی پێنەبەخشی‌و لەڕێگادا نەخۆشیەكەی زۆری تێن بۆ هێناو مردن بەرۆكی پێگرتوە، ئینجا هەر بۆ خۆی بەهۆی باوەڕە پتەوەكەی كەدەستی نەدەگەیشتە دەستی پێغەمبەرە شیرینەكەی تەنها بۆخۆی دەستی ڕاستەی لەسەر دەستی چەپی دادەنا بۆئاماژە بەپەیمان نوێ كردنەوە: ئینجا بەزوبانی بێهێزی هاواری دەكردوو

دەیووت ئەوە پەیمان دانو نوێکردنەوەیە لەگەڵ خودادا.! هەر بەو جۆرە دەستەکانی لەسەر یەك دادەنا و دەیوت ئەوەش پەیمان دانە بە پێغەمبەرە بەڕێزەکەی خودادا: هەر لە دوبارەکردنەوەی پەیمانەکانیدا بوو تا گیانی دەرچوو: کاتێ هەواڵی لەمەککە دەرچونیو مردنی لە ڕێگابلاّ و بۆوە و خەبەر گەیشتە یارەکانی پێغەمبەر زۆر دڵتەنگ و خەمبار بوون، ئاواتیان دەخواست کە ئەو پیاوە ئازاو بە غیرەتە بگەیشتبایە مەدینە و گەشتی کۆچەکەی تەواو بکردبایە؟ بەلاّم خودای بە بەزەیی ئەو ئایەتەی دەربارەی ئەوانەی کۆچ دەکەنو ناگەنە مەنزڵ و جێگای خۆیان دەفەرموێ: { وَمَن يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يَجِدْ فِي ٱلْأَرْضِ مُرَٰغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةً ۚ وَمَن يَخْرُجْ مِنۢ بَيْتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ يُدْرِكْهُ ٱلْمَوْتُ فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا} النساء/١٠٠ واتە: هەر کەسێك لە پێناوی ڕەزابوونی خودا دا کۆچ بکات: ئەوە بەڕاستی سەر بەرزیو بەختەوەریەکی زۆری بۆ خۆی بەدەست هێناوەو، دووژمن و ناحەزانیشی سەر شۆڕو ڕیسوا کردووە. وەخێرو بەرەکەتێکی زۆر ڕووی تێدەکات. وە هەر کەسێکیش ماڵ و حاڵو جێگەی خۆی بە جێبهێڵێت و لە پێناوی ڕەزابوونی خوداو پێغەمبەرەکەیدا کۆچ بکاتو، لەدوای ئەوەگیانی دەرچێتو بمرێت ئەوە پاداشتو تۆڵەی تەنها لە لای پەروەردگارە، بەڕاستی خوداش لێخۆش بوو میهرەبانە.

## بەڕاستی خودا لەباتی تۆ سپاردەو ڕاستی پارێزیت دەگەیەنێ
## إن الله سيؤدي عـنك أمانتك

دەگێڕنەوە یەکێك لە عەبد و بەندەکان: شوانی ئاژەڵی یەکێك لە جولەکەکان دەبێت لە خەیبەر: ڕۆژێك چاوی لێدەبێت دانیشتوانی خەیبەرزۆر مشەوەشو ئاڵۆز دیارنو چەك و سلاحیان لەخۆیان بەستوە و ئامادەباشی خۆیان دەکرد، بۆیە پرسیاری لێکردنو گوتی: چی ڕویداوەو، نیازتان چییەو چیدەکەن؟ ئەوانیش وەلاّمیان دایەوە گوتیان: دەمانەوێ شەڕ لەگەڵ ئەو کەسەی کە داوای پێغەمبەرایەتی دەکات بکەین: ئەو بەندەیە بەبیستنی ناوی پێغەمبەرﷺ زۆر دڵخۆشو شادمان

بوو: ڕۆژێك خۆی ئامادەکرد و بە هەموو ئاژەڵ و حەیوانەکانەوە ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەرو ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا: تۆچی دەڵێیو بانگەشەی چیدەکەیت؟ وە ئەوەی کە تۆ بانگی بۆ دەکەی چییە؟ پێغەمبەر ﷺفەرمووی: براکەم من بانگ هێشتنی ئادەمیزادەکان دەکەم بۆ سەر ڕێبازی ئیسلام: کە شاهیدی بدەن و دانبنێن کە هیچ خودایەك نیە پەرستیشی بۆ بکرێ تەنها زاتی الله نەبێ وە شاهیدی بداو دان بەوە دابنێ کە منیش پێغەمبەرو ڕەوانکراوی خودام. ئەو بەندەیە گوتی: ئەگەر من شاهیدی بدەمو دان بنێم بە تەنهایی خوداو ڕاستی ڕەوانەکراوی پێغەمبەر چیم بۆ هەیە؟ پێغەمبەر ﷺفەرمووی: ئەگەر لەسەر ئەو باوەڕە بمری بە هەشتت بۆ هەیەو دەڕۆیە بەهەشت ئەو بەندەیە باوەڕی هێناو موسڵمان بوو. ئینجا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا ئەو ئاژەڵ و حەیوانانە لەلای من سپاردەیە چیان لێ بکەم؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هەر لە لای خۆتەوە بە بەرد و چەو ڕاماڵیان بکەولێیان خوڕە خودای گەورە لەباتی تۆپارێزگاری دەکا و سپاردەکەت دەگەیەنێتەوە بە خاوەنەکەی ئەو بەندەیەش بە فەرمانی پێغەمبەری کردو: ئاژەڵەکان ڕۆیشتنەوە بۆ لای خاوەنەکەیان.

## بە مۆڵەت و ڕێپێدانی خودا وەریگرە - أخذ برخصة الله

دەگێڕنەوە موسەیلەمەی درۆزن دووپیاوی لەموسڵمانان ئامادەکرد و: بەیەکیانی گوت: دەزانی کەمن پێغەمبەری خودام؟ موسڵمانەکە گوتی: نا درۆدەکەی بەڵکو محمد ﷺ پێغەمبەری خودایە. موسەیلەمە ئەو کابرایەی گرت و کوشتی. ئینجا ڕووی لەموسڵمانەکەی ترکردو هەمان پرسیاری پێشوی لێکردو، گوتی :من پێغەمبەری خودام. بەڵام ئەو موسڵمانە لەوەڵامیدا گوتی: بەڵێ ئەتۆش‌و محمدیش هەردوکتان پێغەمبەری خودان: موسەیلەمە ڕێگای بەو کابرایە داو ئازادیان کرد و ڕۆیشت هەواڵ گەیشتە پێغەمبەری خودا ئەویش فەرمووی: یەکەمیان بەڕاستیو دڵنیاییەوە دانی بەخۆیدا گرتو سوربوو لەسەر کارەکەی. بەڵام دووەمیان بەئاسان کردنو ڕێنمونیو ڕێپیشاندانی خودا ڕێگەی گرتو ڕۆیشت هیچ خەراپە و تاوانی لەسەر نیە.

# متمانەو پشت بەستن بەخودا
# الثقة بالله

لەئەنەسی کوڕی مالیکەوەﷺ دەگێڕنەوە فەرمویەتی: لەگەڵ کۆمەڵێکدا چوینە سەردانی گەنجێکی ئەنساری نەخۆش بوو: بەڕاستی نەخۆشیەکەی زۆر گران‌و قورس بوو، خەریکی گیان دەرچوون بوو ئێمەش بەجێمان نەهێشت‌و لەلای ماینەوە هەتا گیانی دەرچوو. هێندێك لەوانەی کە سەردانی نەخۆشەکەمان کرد روویان کردە ئافرەتێکی پیر، کە لە لای سەری نەخۆشەکەوە دانیشتبوو، پرسیاریان لێکردو، گوتیان: خوشکم تۆش بە فەرمانی خودا ڕازیبەو مل کەچی فەرمانەکانی ببە؟ پیرە ژنە کە گوتی: بۆچی کوڕەکەم مرد گوتیان: بەڵێ مرد. پیرەژنەکە باوەڕی نەدەکردو، گوتی تو خودا ئێوە بە ڕاستیتانە کە کوڕەکەم مردووە؟ گوتمان بەڵێ، بە ڕاستیمانەو مردووە. ئافرەتەکە دەستی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە گوتی: خودایە تۆ زۆرباش دەزانی من باوەڕم بە تۆ هێناو، بۆلای پێغەمبەرەکەت کۆچم کردو، ئاواتەخواز بووم کە لە هەموو ئازار و ناخۆشیەك یارمەتیم بدەی: خودایە ئەو کارەساتە زۆر گەورەیە و ئەمڕۆ ناتوانم خۆمی بۆ ڕابگرم؟ ئینجا ئەو پیرەژنە ئەو پەڕۆیەی کەدەم و چاوی ئەو گەنجەمان پێداپۆشی بوو دەستی بۆ بردوو لەسەر دەم و ڕوخساری هەڵی گرت سەیرمان کرد هەناسەی دەهات و ژیانی تێدا مابوو نەمردبوو، هەر لەوکاتەدا ئەو گەنجە هەستاو دانیشت‌و داوای خواردنی کردو ئێمەش خواردنمان لەگەڵدا خوارد.

## بەشی ئارامی: الصبر

(يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱصْبِرُوا۟ وَصَابِرُوا۟ وَرَابِطُوا۟ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ) ال عمران/٢٠٠

واتە: ئەی ئەوانەی کەباوەڕتان هێناوە بە ئارام و خۆڕاگربن و، بەرامبەری دووژمنان نەبەزن و لەسەنگەردا ڕانەکەن‌و، هەوڵ بدەن هەموو دەم لەکۆشش دابن‌و، لەخودا بترسێن‌و، خۆپارێزی بکەن بە ئومێدی ئەوەی کەسەر بەرزو سەر فیراز بن.

باوەڕ بناغەو بنەمای بەهێزی ویست و خواستە لەلای ئادەمیزادو، ئارامیو دڵنیای دەڕوێنێ لە دڵیانداو ئاسودەیی بەگیان دەبەخشێو، پارێزگاری لەدڵەڕاوکەو نەخۆشی دەکات ، کە بەهۆی ترسانو تاسانو شپرزەییەوە توشی دەبێت. کەبەڕاستی ئەوەش شوێنەوارو کاریگەریەکی تەواوی دەبێت بۆ سەرکێشان لە گیانەوە بۆ لاشەو، توشبوونی بە جۆرەها نەخۆشی و ئازاری وەها کە هیلاکیو لەناوچونی گیانو ژیانی تێدایە: خودای بەبەزەیش بۆ دیاری و بەیانکردنی ئەو شتانە کە دەفەرموێ: ئەو کارە ئاشکراو دیاریانە زۆرجار نهێنی و پەنهانیەکانی دەگۆڕدرێ، وەبەراستیش ویستو خواستی خوداش بەچاکە دەگەڕێ، هەرچەند کە بۆ خۆشت وا هەست بکەی لەو کارەتدا هیچ چاکەی لێبەدی ناکەی بەڵام هەر چاکەیە بۆت، هەروەکو خودا دەفەرموێ: {كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡقِتَالُ وَهُوَ كُرۡهٞ لَّكُمۡۖ وَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ شَرّٞ لَّكُمۡۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ} البقره/٢١٦ واتە: بەڕاستی جەنگتان لەسەر واجب کراوە لەگەڵ بێباوەڕان: بۆ بەرگری لە خۆتان و ئاینو نیشتمانتان: بەڵام دیارە زۆرتان پێناخۆشەو، لەسەر لاشەتان قورس و گرانە ، بەڵام بۆی هەیە کە شتێکتان پێناخۆش بێت بە پێچەوانەوە خێرو پاداشت لەوەدا بێت. وە بۆشی هەیە شتێك حەزبکەن و ئارەزوتان لێی بێت، کەچی بە پێچەوانەوە هیچ خێرو چاکەی بۆتان تێدا نەبێتوشەڕوئاژاوەبێ بۆتان. وەبەڕاستی هەر خودا بۆ خۆی باش دەزانێ چ شتێك باشە بۆتان، یان خەراپە، ئێوە نایزانن.

بەو جۆرە خودای بە توانا داوا لە باوەڕداران دەکات لە هەڵسوکەوتیاندا مامناوەندی و میانەڕەوی بنو لە کاتی سود گەیاندنیانو زەرەر کردنیاندا ئارامی و سەبر بەکار بهێننو، هەتا باش بۆیان دەربکەوێ کە بەڕاستی لە دوای ناخۆشیان خۆشیو، دەروی چاکە لێکردنەوە هەیە، وەکو خودا دەفەرموێ:
{فَإِنَّ مَعَ ٱلۡعُسۡرِ يُسۡرًا. إِنَّ مَعَ ٱلۡعُسۡرِ يُسۡرٗا }: الشرح /٥-٦. واتە: بەڕاستی لەگەڵ ناخۆشیو تەنگانەدا خۆشیو ئاسودەیی دێت. بەڵێ بەڕاستی بەدڵنیاییەوە لەگەڵ ناخۆشیدا خۆشیو ئاسودەیی دێت.

ئارامی لە جوانی و پوختەو پاڵاوتەی ئادەمیزادەو جیاوازو تەنیای دەکاتەوە لە فریشتەو، ئاژەڵان خودای بەدەسەڵات ئاژەڵی دروستکردووە بەچڵێس و ئارەزو بازی بە بێهۆش و ژێری دابین و کپکردنی هەوەس و ئارەزوی.

وە فریشتەشی دروست کردووە بە هۆش و بیری تەواو بە بێ هێزی نەفس و ئارەزو لادانیان لە بەجێهێنانی فەرمانی خودا.بەڵام ئادەمیزاد دروستکراوە و کۆکراوەتەوە لە نێوانی هەست و هۆش و ئارەزودا: ئینجا هەر کەسێك هەست و ژیری بەسەر ئارەزوە کانیدا بەکارهێناو بەڕێوەی برد ئەوە بەڕاستی نەفس و گیانی کپ و دابین کردوە لەسەر ئارەزوەکانی:ئەوە وەکو پادشا لەسەر زەوی دەڕوات. هەر کەسێکیش بەپێ چەوانەوە کاربکات ئەوە بەڕاستی جەڵەوی گیانی خۆی وەکو ئاژەڵ بەرەڵا کردووە بۆ هەواو ئارەزوەکانی بەڵکو زۆر لەئاژەڵیش کەمترە وەکو خودا دەفەرموێ: { وَٱلَّذِينَ صَبَرُواْ ٱبۡتِغَآءَ وَجۡهِ رَبِّهِمۡ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُواْ مِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ سِرًّا وَعَلَانِيَةً وَيَدۡرَءُونَ بِٱلۡحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عُقۡبَى ٱلدَّارِ. جَنَّٰتُ عَدۡنٍ يَدۡخُلُونَهَا وَمَن صَلَحَ مِنۡ ءَابَآئِهِمۡ وَأَزۡوَٰجِهِمۡ وَذُرِّيَّٰتِهِمۡۖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَدۡخُلُونَ عَلَيۡهِم مِّن كُلِّ بَابٍ. سَلَٰمٌ عَلَيۡكُم بِمَا صَبَرۡتُمۡۚ فَنِعۡمَ عُقۡبَى ٱلدَّارِ } :الرعد/٢٢-٢٤

واتە: ئەوانەی سەبرو ئارام دەگرن لە پێناوی ڕەزابوونی خوداو، نوێژەکانیان بەباشی بە ئەنجام دەگەیەنن‌و، وە ئەو سەروەت و سامانەی کە خودا پێی داون بە ئاشکراو پەنهانی لەپێناوی ڕەزابونی خودا دەیبەخشن‌و، بەکردار و ڕەفتاری چاك‌وپاك خەراپەو نارەوایی دوور دەخەنەوە، ئەوە بەڕاستی دوا ڕۆژی ئەوانە پڕ لەخۆشی و شادمانیەو، خۆشی دوا ڕۆژو ، سەرچاوەی باخ‌و باخاتەکانی بەهەشتی (عەدنیان) بۆ هەیەو، دەڕۆنە ناوی لەگەڵ هەموو ئەوانەی کە چاك و پاکن لە باب‌و باپیر و هاوسەر و خۆشەویست و خانەوادەیان ، وە فریشتەکانی خوداش لەهەموو ڕێگاو دەروازەیەکەوە دەچنە لایان‌و سەردانیان لێدەکەن‌و پێیان دەڵێن، خۆشی‌و ئاشتی‌و سەلامەتیتان لێبێ، بەهۆی ئەو دەستکەوتەتان بەوجێگە خۆشە، کەبەرهەمی سەبرو ئارامی‌و خۆڕاگری خۆتانە بەسەر گاڵتەجاری پێکردنتان لە دوونیا، بەڕاستی جێگەیەکی خۆش‌و باشتان بە دەستهێناوە.

ئارام گرتن چەند جۆری هەیە: ئارام گرتنی ئادەمیزاد لەسەر بەجێهێنانی گوێڕایەڵی و کرداری پێویست (واجب). وە ئارامگرتنی ئادەمیزاد لەسەر ئەو خۆشی و حەز لێکردنە چلێس‌و ئارەزووەکانی و لەگەڵ ئەو خۆشی و تامداریانەی ناڕەواو حەڕا من. وە ئارام گرتنی ئادەمیزاد لەسەر ئەو کارەسات و ڕوداوە ناخۆشیانەی ژیان‌و قایل و دڵنیابوون بە چارەنوس سازانەی خودا بەتێگەیاندن و دڵنیاییەوە. وە ئارام گرتن لەسەر تێکۆشان لەڕێبازی خوداو ڕاستی. ئیسلام داوا لە ئادەمیزاد دەکات بە هەموو کات‌و بوارەکانی بۆ ئارامی و خۆڕاگری چونکە ئیسلام تاقی کردنەوەیە بەگوێرەی توانا‌وخۆڕاگری و ئارام گرتنی: خودا لەو باوەڕدارە ئارام گرانەمان بگێڕێ کە ڕزگار و ئازادبوون لە خۆشەویستی ئەم دونیای تێداچووە وێران بوو کۆتا هاتووە و، خۆیان بەخت کردوە و ئارامیان گرتووە لەسەر ناخۆشیەکان و هەموو کۆڵ و بارێکی گران‌و قورسیان هەڵگرتوە لە پێناوی سەرکەوتنی ئەم ئاینە.

## ئازاری قورەیشیەکان بۆ پێغەمبەر
## إذاء قريش لرسول الله

لە عبداللەی کوڕی مەسعودەوە‌ﷺ دەگێڕنەوە: دەفەرموێ: جارێك پێغەمبەری خودا ﷺلەلای بەیت نوێژی دەکرد، ئەبوجەهل‌و هاوڕێکانی دانیشتبوون، ئەبوجەهل گوتی: کێتان دەچێتە سەر گوێچکی ماڵی فلأن کەس ، ورگ و ڕیخۆڵی ئاژەڵی سەربڕاوی لێیە کە دوێنێ فڕێیانداوە بۆم بهێنێ، کە محمد سەری خستەسەر زەوی بۆ کڕنۆش، لەسەرمل‌و سەری دابنێ؟ خەرابترین ئادەمیزاد ڕۆیشت و ورگ و ڕیخۆڵەکەی هێناو لەکاتی کڕنۆش، لەسەرشان و ملیی پێغەمبەریان دانا. لەو کاتەدا پیاوە بەشان و شکۆیەکانی قورەیش کە لەیانە و چایخانەکەیان دانیشتبوون بۆ گاڵتەجاڕی هەموویان دەستیانکردە پێکەنین بە جۆرێك هەموویان بەلادا دەکەوتن، منیش بەلایانەوە ڕاوەستابووم و سەیرم دەکرد و نەمتوانی لەسەر شانی لایبدەم، پێغەمبەریش نەیدەتوانی سەری بەرز بکاتەوە، هەتا یەکێك بەناوی

(جوەیرە) ڕۆیشتو خەبەری بە(فاتمە)دا ئەویش خێرا هات و ورگ و ڕیخۆڵەكەی لەسەری لاداو، زۆر بە ئازایانە ڕوی لە گەورە پیاوانی قورەیش كردو و زۆری قسەی ناشیرین پێگوتن. لە دوای ئەوەی كە پێغەمبەر لە نوێژەكەی بۆوە بە دەنگی بەرز سێ جار نزا و دوعای لێكردن، چونكە پێغەمبەرﷺ هەموو كاتێك لە دوعا و پرسیارەكانیدا بەسێ جار دووبارەی دەكردەوە، پێی گوتن :یاخودا قورەیشیەكان هەر بۆ خۆتان بەخۆتان بن: كە گوێیان لە دوعایەكەی پێغەمبەرﷺ بوو زۆر ترسانو وازیان لەپێكەنین و گاڵتەكردن هێناو: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: خودایە ئەبوجەهلی كوڕی هوشام و، عەقبەی كوڕی ڕەبیعە و، شەیبەی كوڕی ڕەبیعەو، وەلیدی كوڕی عەقبەو، ئومەیەی كوڕی خەڵەف و، عەقبەی كوڕی ئەبی معیت: هەر خۆیان بە خۆیان بن. عبداللەی كوڕی مەسعود ﷺدەفەرموێ: سوێند بەو كەسەی كە محمدی بەڕاستی ناردوە، ئەمن لەژیانی خۆم چاوم بە تەرمی هەموویان كەوتووە لەڕۆژی (بەدر)دا كوژرا بوون و لە دوایشدا هەموویان فڕێدرانە ناو چاڵی بەدرەوە، كە بیرێكی قوڵی كۆن بوو.

## ئارام گرتنی پێغەمبەرﷺ لەسەر ناخۆشی لەڕێگای بانگەوازەكەی

## صبر الرسولﷺ على المكاره في سبيل دعوته

دەگێڕنەوە لەدوای مردنی ئەبوتالیبی مامی پێغەمبەر ﷺسزاو ئازاری بێباوەڕان بەرامبەر بە پێغەمبەر ﷺچەندین جار زۆرترو بەهێز تربوو. بۆیە بە ناچاری بۆ ئەوەی كە شوێنێكی بە ئارامتر و دوور لە دەستدرێژی بێباوەڕان بدۆزێتەوە كۆچی كرد بۆ (تائیف) كەشارێك بوو لە ڕۆژهەلاتی مەككە: بەو هیوایەی لەوێ لەناو هۆزی (سەقیف) كۆمەك و یارمەتی بدرێو لەو سزاو ئازارانە بپارێزرێ. بەلام بە داخەوە ئەو گەل و هۆزەی (سەقیف) بە تەواوی سەرپێچیان كرد و بەبانگەوازەكەی ڕازی نەبوونو بەرپەرچیان دایەوە بۆ ماوەی (١٠)دە ڕۆژ لە ناویاندا مایەوەو بەسەر ماڵەكانیاندا دەگەڕا لە پێناوی ڕەزای خودا ئامۆژگاری دەكردن و هیلاك و ماندوبوونی زۆری لە پێناوی بانگەوازەكەیدا دەدیت، بەلام ئەو

کۆمەڵی خەڵکە بە هیچ جۆرێك قبوڵی بانگەوازەکەیان نەبوو. زۆریشیان ئازار و سزا دەدا و، میوانداریشیان قبوڵ نەکرد، ئینجا پێغەمبەرﷺ کە بە تەواوی بۆی دەرکەوت کە گوێ بە بانگەوازەکەی نادەن و ئازاریشیان بۆی زۆرتر دەبێت، ویستی لەوێش کۆچ بکات‌و بڕوات، بەتکایەکەوە پێیگوتن: من لە ناوتان دەڕۆم بەڵام هەر چەند کە ئێوە بانگەوازەکەی منتان وەرنەگرت ئاواتەخوازم لێتان بێدەنگبن و باسم مەکەن: پێغەمبەرﷺ لەوە دەترسا کە باسی میوانداری لێوەر نەگرتنی بکەن و دانیشتوانی مەککە پێی بزاننەوە ئەوا زیاتر ئازاری دەدەن‌و دەڵێن: لە هیچ شوێنێك جێگەی نابێتەوە، بەڵام ئەو داوایەشی هەر بێسود بوو: هەرچی منداڵ‌و، گێل‌و، نەفام‌و، نەزان‌و، ڕەوشت نزمەکانیان هەیە لێیا کۆ کردەوە و هەڵمەتی دڕندانەیان بردە سەری و لەناو خۆیان گرت و هەریەك لە لایەکەوە بەردیان لێدەداو قسەی ناشیرینیان پێدەگوت. لەو گەشت و سەفەرەشیدا بە تەنها زەیدی کوڕی حارسەی لەگەڵدا بوو ئەویش زۆر هەوڵی دەدا کە بەرگری و پارێزگاری لە پێغەمبەر ﷺبکات: بەڵام هەرچی هەوڵیدا و خەریك بوو نەیتوانی لەگەڵ ئەو گەلە نەفام و نەزانەدا هیچ بە دەست بهێنێ و تەنانەت بۆ خۆشی لە لێدان و بەردبارانی ئەو نەفامانە بێبەش نەبوو، سەری زەیدﷺ بریندار بوو، قاچەکانی پێغەمبەرﷺ خەڵتانی خوێنبوو خوێنی لێدە چۆڕایەوە سەر زەوی، ئەو نەفامانە هەتا ئارەزویان لێبو و هیلاك بوون، بە دوایان کەوتن و ڕاویان نان، لە دوایی گەڕانەوە: ئینجا کاتێك پێغەمبەرﷺ دڵنیا بوو کە کەسیان بە دواوە نەماوە لە دوای پێنج کیلۆ مەتر ڕاکردن، ویستی پشویەك بدات: دانیشت و پاڵی دایەوە و بە گریانەوە دەستی بەرزکرد بۆ ئاسمان‌و هاوار و نزای بۆ لای خودا بەزکردەوە فەرمووی: (اللهم إليك أشكوا ضعف قوتي وقلة حيلتي و هواني على الناس يا ارحم الراحمين.انت رب المستضعفين وانت ربي، إلى من تكلني إلى بعيد يتهجمني أو إلى عدو ملكته أمري، إن لم يكن بك على غضبي فلا ابالي ولكن عافيتك اوسع لي، اعوذ بنور وجهك الذي اشرقت له الظلمات وصلح عليه امرالدنيا والآخرة من انتنزل بي غضبك او تحل على سخطك لك العتبى حتى ترضى ولاحول ولاقوة إلا بك)

ئینجا لەو كاتەدا سۆزو بەزەیی و میهرەبانی لە عوتبە و شەیبەی كوڕی ڕەبیعە جولاّو بەندەیەكی مەسیحیان بەناوی (عەداس) هەبوو بانگیان كرد و چەند هێشوە ترێیەكیان بۆ پێغەمبەر نارد، كاتێ پێغەمبەرﷺ دەستی بۆ هێشوە ترێیەكە برد فەرمووی: (بسم الله) ئینجا دەسیتی كرد بەخواردن (عەداس) سەیری پێغەمبەری دەكردو و لێیەوە دەڕوانی و پێی گوت: ئەو قسەیە چیبوو كردت، چونكە خەڵكی ئەو شارە شتی وا ناڵێن؟ پێغەمبەر ﷺفەرمووی: ئەی عەداس ئەتۆ خەڵكی چی شارێكیو ئاینت چییە؟ عەداس گوتی: من خەڵكی نەینەوام و مەسیحیم: پێغەمبەر ﷺفەرمووی: تۆ خەڵكی شار و ئاوەدانی یونسی كوڕی مەتای پیاوباشی. عەداس گوتی: یونسی كوڕی مەتاعليه السلام چیتە و چۆنی دەناسی؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەو برامە و پێغەمبەرە و منیش پێغەمبەرم. عەداس خۆی بەسەر دەست و قاچی پێغەمبەردا داو ماچی كرد: كوڕانی ڕەبیعە كە چاویان بەو دیمەنە كەوت، سەیری یەكتریان كردو، گوتیان: بەڕاستی ئەو پیاوە بەندە و نۆكەرەكەشمانی تێكداو خەراپی كرد. كاتێ عەداس گەڕایەوە كوڕانی ڕەبیعە پێیانگوت: ئەی عەداس لەناو بچی و بەڵات لێبدا ئەوە چی بوو ڕوویدا؟ عەداس گوتی: بە خودا لەسەر هەموو ڕووی ئەم زەویە پیاوێكی باش و چاكی وەك و ئەو پیاوەی تێدا نییە!! لە دوای ئەوە پێغەمبەرﷺ گەڕایەوە بەرەو مەكە لەگەڵ زەیدی كوڕی حارسەرضي الله عنه.

## ئارامیو باوەڕ: صبر وإیمان

لە كاتی ڕوداوی شەڕی قادسیە لە نێوانی عەرەب و فارسەكاندا ئافرەتی شۆڕە سوار و، شۆخ و شەنگی باوەڕداری بەهێز خاتونە (خەنسا) ڕۆیشتە بەرەكانی جەنگ بۆ چارەسەر و یارمەتی و هاوكاریكردنی زامدار و برینداره‌كان. بەڕاستی ئەو خانمە شۆخ و شەنگە كارەسات و مەینەتی زۆری بەسەردا هاتووەو لە هەموو تاقیكردنەوە و ئەزمونەكانیدا سەركەوتنی بە دەستهێناوە بەپلەی نایاب. ئەو ئافرەتە بەڕێزە بەخۆی و چوار كوڕیەوە كەوتەڕێ بۆ بەرەكانی جەنگ: پێشی

ڕۆیشتنی کوڕەکانی بانگ کردن‌و کۆی کردنەوەو، ئامۆژگاریەکی باشی کردن‌و پێیوتن: ڕۆڵەکانم ئێوە بەحەز و ئارەزوی خۆتان باوەڕتان هێناوە و موسڵمان بوون: وە هەر بەمەیل و ئارەزوی خۆتان کۆچتان کردووە، سوێند بەو خودایەی کە هیچ خودایەك نیە تەنها بۆ خۆی نەبێت، ئێوە هەمووتان کوڕی یەك پیاون، هەروەك‌و کوڕی یەك ئافرەتیشن، باوکتان ناپاك‌ودەست بڕ نەبوو، وەخاڵتان بەدڕەوشت و خەراپەکار نەبوو، وە هۆز و بنەماڵەیان عەیبدار و ناتەواو نەبوون وە نەژاد و ڕەچەڵەکیان خۆڕا گرونەگۆڕ بوون: هەروەکو ئێوەش دەزانن ئەوەی کە خودا بۆ باوەڕدارانی ئامادە کردووە لە پاداشت و دەستکەوتی زۆر لەشەڕ و جەنگی بێباوەڕاندا: وەزۆر باشیش تێبگەن‌و بزانن کە شوێن و خانوی مانەوەتان زۆر باشتر و چاك ترە لە شوێن و خانوی خەراپ و وێران، هەر وەك و خودا دەفەرموێ: {يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱصۡبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ } :آلعمران/٢٠٠ واتەی ئەو ئایەتەمان لە پێشەوە کرد.

ئەگەر خوداحەز بکات ئێوە بەیانیتان کردەوە بە سەلامەتی و بە بێوەی، خۆتان ئامادە بکەن بۆجەنگی دوژمنتان بە ڕۆشەنی و چاو کراوەیی و، چاپوك و ئازابن و منیش لە خودا داوا دەکەم سەر بەرزو سەرکەوتوو بن، ئینجا کاتێ ئاشی شەڕ دەستی بە گەڕان کرد ئەو کوڕانە زۆر بەئازایی‌و چاپوکی دەستیان بە شەڕکرد و دەستی چاکیان دەوەشاند: بەڵام دەستی قەدەر وایکرد هەر چوار کوڕەکەی لەو جەنگەدا شهید بوون. کاتێ (خەنسا) هەواڵی شەهید بوونی کوڕەکانی پێگەیشت، هیچ هاوارو بێزاریەکی دەرنەبڕی‌و، تەنها بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد گوتی: سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە بە شەهیدبوونی کوڕەکانم پایە بەرز و شکۆداری کرم، لەخودای گەورەش دەخوازم کەخودای بە بەزەیی و بەدەسەڵات لەڕۆژی پاداشتی، بە میهرەبانی خۆی لەگەڵ کوڕەکانم کۆمان بکاتەوە.

# ئارامگرتن لەسەر سەختی و دژواری

# الصبر على الشدائد

دەگێڕنەوە لە فاتمەی شۆخ و شەنگ و خانمی ڕوخسار جەوانی كچی پێغەمبەری خودا: فەرمویەتی: ڕۆژێك پێغەمبەری ﷺخودا هاتە لامان و فەرمووی: كوان كوڕەكانم لەكوێن؟ واتە حەسەن و حوسێن، منیش گوتم: بە خوا ئەی پێغەمبەری خودا كە لە خەو هەستاین هیچ خواردنێكمان لەماڵدا نەبوو كە بیچێژین و تامی بكەین، ئەو قسەیە بە ناشكوری ناڵێم بەڵام دەمەوێ ڕاستیەكەی بە تۆ بڵێم، لەبەر برسیەتی و نەبوونی نەوەك و منداڵەكان داوای خواردن بكەن، حەزرەتی عەلی پێی گوتم: هەستە منداڵەكان لێرە لابە نەوەكو برسیان بێت و داوای خواردنت لێبكەن و بە سەرتدا بگریەن و ئازارت پێبگەیەنن، منیش بردمنە لای ماڵی جولەكەكەمان: پێغەمبەریش ﷺ بەرە و لایان دەڕوات، چاوی پێیان دەكەوێت لە ناوزەویەكی فروزاوی واتە: گیایی نەرمدا یاری دەكەنو قاپێك خورمای پاشماوەیان لەلایە، پێغەمبەر ﷺدەفەرموێ: ئەی عەلی هەستە ئەو منداڵانە بەرەوە بۆ ماڵێ هەتا گەرما بەتەواوی تینی بۆنەهێناون؟ حەزرەتی عەلیﷺ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا بەڕاستی كە بەیانیمان كردەوە هیچ خواردنێكمان لەماڵدا نەبوو، ئێستا بەڕیزت لێرە دابنیشێ هەتا دەڕۆم چەند دانە خورمایەك بۆ فاتمە پەیدا دەكەم و دەیهێنمەوە، پێغەمبەر ﷺ دانیشتو، حەزرەتی عەلیش ڕۆیشتە ماڵی جولەكەیەك و بەكرێ دۆلكەی ئاوی بیری بۆ هەڵدەكێشان هەر دۆلكەیەك بە دەنكێك خورما. هەتا ئەندازەیەك خورمای كۆكردەوە ئینجا لەدواییدا خورما یەكە یان هەڵگرتو بەرە و ماڵ گەڕانەوە: بەڵێ بەڕاستی حەزرەتی فاتمە زۆربە ئارامیەوە لەسەر ئەو ژیانە سەخت و دژوارەدا خۆی ڕادەگرت، وە زۆر بە ڕەزامەندی و دڵنیاییەوە پێشوازی لێدە كردو، زۆریش سوپاسگوزار و شوكرانەبژێر بوو: لەسەر ئەو بارودۆخەی ژیان سەختیە.

# سکاڵاو ناڕەزاییت تەنها بۆلای خودا بکە

# شكواك لا تشكوها إلا لله

دەگێڕنەوە: کوڕی برای ئەحنەفی کوڕی قەیس هات بۆلای ئەحنەف سکاڵای ماتەمینی کەبەسەری داهاتبوو باس دەکرد: بەڵام ئەحنەف ڕوی لێوەردەگێڕا و گوێی لێنەدەگرت: کوڕی برایەکەشی چەندینجار سکاڵای بۆ لا دەبردوو، ئەحنەفیش وەك و پیشەی هەموو کاتەکانی هیچ گوێی پێنەدەدا: کاتێ ئەحنەف زانی کە برازاکەی وازی لێناهێنێ و هەردەم سکاڵای بۆ لای دەکات و دووبارەی دەکاتەوە: پێی گوت: ئەی برازاکەم گوێم لێبگرە و ئامۆژگاریت دەکەم، کاتێك مەینەتی و کارەساتێکت توش هات، سکاڵا بۆ ئەو کەسە ببە کە توانای یارمەتی و لە ناوبردن و نەهێشتنی مەینەتیەکانتی هەیە؟ سکاڵا بۆ لای ئادەمیزادە دروست کراوەکان مەبە!! چونکە ئادەمیزادەکان دوو جۆرن: یان دۆستو هاوەڵتن، کەبە مەینەتی و کارەساتەکانت دڵتەنگ و خەمبار دەبن. یان دووژمن و ناحەزتن و بە مەینەتی و کارساتەکانت خۆشنود و شادمان دەبن. ئینجا ئەحنەف گوتی: کوڕەزای خۆشەویستم سەیری ئەو چاوەم بکە سوێند بە خودا چل ساڵی ڕێکە هیچ دۆڵو کێوم پێی نەدیتوە و نابینێ، بەڵام بەخودا هەتا ئێستا نەمهێشتووە هیچ کەسێك لەخزم و کەس و، تەنانەت هاوسەرەکەشم پێم بزانێت !.

# ئارامی باوەڕدار

# صبر المؤمن

دەگێڕنەوە عوروەی کوڕی زوبەیر ﷺ توشی نەخۆشیەکی ترسناکی قاچی بوو لە دوای نەبوونی هیچ چارەسەریەك، پزیشکەکان ویستیان قاچی ببڕنەوە لەبەر مەترسیو پارێزگاری گرتنەوەی هەموو گیانی: ئینجا پزیشکەکان ئەو کاتە پێویستیان بەدەرمانێکی سڕکاری (بەنج) هەبوو کە هۆشی لای خۆی نەمێنێ و چەند کەسێکیشی لەلابێت ، بۆ ئەوەی لەکاتی نەشتەرگەریەکە بیگرن و هۆشی

لای خۆی نەبێت چونكە نەشتەر گەریەكەی سەخت و دژوارە و بڕینەوەی قاچیەتی: بەڵام عوروەی باوەڕ بەهێزو پتەو بەزوبانێكی شیرین‌و بەئارام هاتە گوفتار و گوتی: بۆ ئەو كارە نەشتەرگەریەی كە پێویستان بەكەسانی تر هەیە: من لەو كەسانە بێنیازتان دەكەم و هیچ پێویستیتان بەكەس نابێت لەدوای ئەوە عوروە نوێژی دابەست و لەگەڵ خودای بە بەزەیی كەوتە یادو زیكری خوداو پەیوەندی لەگەڵ خودادا بەست‌و هۆشی لەژیاندا نەماو لەكاتی تەحیاتدا پزیشكەكان ئامادەباشی دەستبەكاربوونی نەشتەرگەری قاچ بڕینەوەی بوون و، عوروەش جێگیرو وەستاو هیچ جوڵەی نەدەكردو ئاوڕی نەدەدایەوە، هەتا نەشتەرگەریەكە گەیشتە سەر ئێسقان‌و مشاریان بەكارهێناو ڕۆنی زەیتی كوڵاویان بۆ جێگەی مشارەكە بەكارهێناو قاچیان بڕیەوە: ئەم هەموو كارەیان بۆ قاچ بڕینەوەی عوروە بەكارهێنا تۆز قاڵێك عوروە خۆی نەشڵەژاندو ڕووی گرژ نەكردو هاواری لێوە بەرز نەبۆوە لە دوای تەواوبوونی نەشتەرگەری و قاچ بڕینەوەی، كابرایەك هاتەلای عوروە و داوای ئارامی و سێبوری و دڵدانەوەی بۆ عوروە دەكرد عوروەش زۆر بە باوەڕێكی پتەو وتی: براكەم خودا جەزات بداتەوە كە داوای سێبوری قاچم دەكەیت سوپاس بۆ خودا وا لە ئازاری قاچم ڕزگارم بووەو ئەسپەردە كراو تەواو بوو. كابرا وتی: عوروە سەرەڕای بڕینەوەی قاچت، داوای ئارامی و سێبوری كوڕەكەت لێدەكەم كوڕەكەت لە تەویلەی وڵاغ كەوت و كەوتەبەر لوشكەی وڵاغەكانی گیانی دەرچوە؟ عوروە گوتی: ئەی خودای بە بەزەیی‌و دلۆڤان ئەگەر بە هۆی قاچمەوە توشی سزات كردم كە هەرگیز پێی نەڕۆیشتوم بۆكاری خەراپە ئەوا سوپاس بۆتۆ خودایە وا ئێستا ساغی‌و تەندروستیت پێبەخشیم: وە ئەگەر كوڕێكیشت لێوەرگرتمەوە؟ سوپاس بۆ تۆ خودایە وامن و كوڕێكیشمت هێشتۆتەوە و ماوینەوە.

# ئارامگرتن كلیلی دەرگای خۆشیه

# الصبر مفتاح الفرج

دەگێڕنەوە كاتێ باوكی سەلەمە ویستی لە مەككەوە كۆچ بكات بۆ مەدینە حوشترێكی بۆ هاوسەرەكەی خێزانی، واتە: دایكی سەلەمە ئامادە كردو هاو سەرەكەی سواری حوشترەكە كرد و سەلەمەی مندالّو جوانكیلەی لەپێشی خۆی لەباوەشی داینا ودەستیان كرد بەڕۆیشتن، ئەبو سەلەمە حوشترەكەی ڕادەكێشا: كاتێ پیاوانی هۆزی موغیرە خزمو كەسی ئوم سەلەمە چاویان بەو دیدارەكەوت خێرا بەرەو لایان ڕۆیشتنو ڕێگایان پێگرتو پێیان گوت: بۆ خۆت ئازادی و ڕێگەت پێدەدەین بڕۆی بۆ هەر شوێنێك كە ئارەزوت لێیە: بەلاّم ئوم سەلەمە ئیخۆمانە و لە دەسەلاّتی خۆمان دایەو ڕێگای ئەویت پێنادەین، ئوم سەلەمە فەرمووی: هەوساری حوشترەكەیان بە تۆبزی لە دەستی باوكی سەلەمەیان دەرهێناو بردیانم: ئینجا لەلایەكی تریشەوە هۆز و نەوەی (عبدالأسد)یش كە لە هۆزی ئەبو سەلەمە بوون توڕەبوون و، كۆمەڵێك لە پیاوەكانیان هاتن و گوتیان: سوێند بە خودا هەروەك و ئێوە هاوسەرەكەی ئەبو سەلەمەتان لێستاندەوە ئێمەش ناهێڵین كچەكەی ئەبو سەلەمە لەلای دایكی بێتو لێتان دەستێنینەوە ئەوانیش بە تۆبزی كچەكەیان لێوەرگرتەوە و لەگەڵ خۆیاندا بردیان و منیان بەتەنها بەجێهێشت: لە دوای ئەوە هۆزی بەنی موغیرەش منیان لەكونجێكی ماڵەكە بەند كردو هاوسەرەكەشم بەرەو مەدینە بە تەنها ڕێگەی گرتە بەرو ڕۆیشت: ئێمە هەموومان لە یەكتری جودا بوینەوە و پەرتەوازە بووین. ئوم سەلەمە لە دوای ئەوكارەساتە هەموو ڕۆژێك لەسپێدەی بەرەبەیانەوە لەماڵ دەردەچو دەڕۆیشت بۆ شوێنێك بەناوی (ئەبتەح) لەمەككەدا دەگریاو چاوی دەڕوانی بەو شاخ و كێوانەوە: یان بەدەمدا لەسەر دەم دەكەوت و دەستی دەكرد بە گریان هەتا ئێوارە. ئەوە كارو پیشەی ئەو ئافرەتە بوو هەتا نزیكەی یەك ساڵ بەو جۆرەی بردە سەر. هەتا یەكێك لە كوڕە مامەكانی دڵی پێسوتاو بەزەیی پێدا هاتەوە، ڕۆیشتە لای خزم و كەسەكانی و پێیگوتن: بۆچی ئەو بەدبەخت و بێدەسەلاّتەتان لە مندالّ و

هاوسەرەکەیتان جودا کردۆتەوە بەردەوام دەگریا و دەناڵێنێ، بۆ ڕێگەی ڕۆیشتنی پێنادەن بابڕوات: ئینجا خزم و کەسەکانیشیان بە قسەیان کردوو: ئەوانیش بە دایکی سەلەمەیان گوت: مادام تۆ ئەو پیاوەت لە بیرنەچۆتەوە و حەز دەکەی بڕۆی بۆ لای هەستە بڕۆ بۆ لای هاوسەرەکەت: ئینجا هۆزی عبدل ئەسەدیش منداڵەکەیان بۆ گێڕایەوەو، ئوم سەلەمە بەخۆی و منداڵەکەی لەدوای یەك ساڵ کۆچی کرد و بەرە و مەدینە کەوتە ڕێگا ئەو ئافرەتە بەرێزە لە دوای شەهیدکردنی هاوسەرەکەی خودای بە بەزەیی پاداشتی دایەوە کە پێغەمبەری خودا مارەی بڕی و بوو بە دایکی هەموو باوەڕداران.

## شەڕکردن و تێکۆشان : الجهاد

## بەهەشت لە ژێر سێبەری شیردایە : ألجنة تحت ظلال السيوف

خودای گەورەدە فەرمویێ: {وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ :} ال عمران /١٦٩ واتە: هەرگیز گومانتان وا نەڕوات کە ئەوانەی لە پێناوی خودا دەکوژرێن و شەهید دەبن بڵێن ئەوانە مردوون: نا ئەوانە نامرن، ئەوانە زیندوون و لەلای پەروەردگار و بەدیهێنەریان ڕزق و ڕۆزی هەمەجۆرە دەخۆن.

شەڕکردن لە پێناوی سەربەرزی و کارکردندا گەورەترین کارە لەلای خودای بەدەسەڵات. وە خودای بەهێز و دەسەڵاتیش نرخ و ڕێزێکی زۆر گەورە و بێپایانی بۆ تێکۆشەران و لە خودا ترسان و جەنگاوەرانی دیاری کردووە پەیمانی خەڵات و پاداشتی زۆر و فراوانی بۆ دیاری و نیشان کردوون لە بەهەشتدا، کە تەنها پانی و فراوانیەکەی بە ئەندازەی ئاسمان و زەمینە: لەو بەهەشتەدا هەرچی کە چاو نەیدیتوەو گوێ نەیبیستوەو بەهەست و بیری هیچ کەسێکیش دانەهاتوە تێیدا هەیە.

کۆی موسڵمانان لە تەواوی مێژو چەرخێکدا کۆکن لەسەر ئەوەی کە تێکۆشان و جیهاد فەرمانێکی تایبەتی پرۆژەی یاسایی تەواوی خودای بە دەسەڵاتە و دەستورو یاسای تەواوی بۆ دیاری کردوە و لەسەر باوەڕدارانی بە پێویست گێڕاوە بۆبە ختەوە ری و کامەرانی و پلەو پایەی شان و ڕێزیان و چاکە و بەخشندەیی.

## تێكۆشانو جیهاد چەند جۆری هەیە:

یەكەم: تێكۆشان بەماڵ.

دووەم: تێكۆشان بەزوبان.

سێهەم: تێكۆشان بەگیان.

تێكۆشان بەماڵ: لەگرنگترین بنەمای دروستكردنی بناغەی دەستوری جەنگە، بەبێ ماڵ خەرج كردن ئاڵۆزی و دووركەوتنەوە بۆ سەركەوتنو، زاڵبوون بەسەر دووژمناندا دروست دەبێ، پیلانەكانی دارشتنی شەڕ دوا دەكەوێت: چونكە ماڵ ژمارەی جەنگاوەران و كەرەسەی چەكی جەنگی پێ بەدی دێت.

وە تێكۆشانیش بە زوبان: بۆ پارێزگاری موسڵمانان لە ژیان و بەرژەوەندیەكانیان و ئابرویان بۆ پێكهاتنو ئاشت بوونەوەو، خۆشگوزەرانی ژیانیان و بۆ نەهێشتن و لادانیان لە خەراپە و ناڕێكیان، ڕونكردنەوەی ڕێبازی بەختەوەری و سەرفرازیانەو، دوور كەوتنەوە یانە لەخۆ فرۆشی و داماوی و دەستبەسەری.

ئەوە فەرمانێكە خوداو پێغەمبەری خودا پێیان ڕازیە: هەروەك و پێغەمبەر لەو بارەوە دەفەرموێ:( من رد عن عرض اخيه، ردالله عن وجهه الناريوم القيامة).

واتە: هەر كەسێك كارێكی خەراپە لەبراكەی دوور بخاتەوە خودای گەورە لە ڕۆژی دواییدا ئاگری دۆزەخی لە ڕوخساری دوور دەخاتەوە.

تێكۆشانیش بەگیان: شەر كردنە بۆ لەناو بردنی زۆردار و ستەمكارانو، بۆ لابردنی كۆسپ و ڕێگرتن، بۆ پارێزگاری لە بیروباوەڕی ئاین و. شەڕ و تێكۆشان لەگەڵ بێباوەڕان كارێكی مەزنو پیرۆزە بۆ ئامانج و مەبەستێكی مەرد و بەناو بانگو دیاری.

تێكۆشان لەڕێگەی خودا: ئارامگری و خۆڕاگریە. چونكە بەڕاستی هەر كاتێ حەقو ڕاستی سەریهەڵداو سەركەوتبوو: حەتمەن كۆمەڵێك لەخەڵكانی ستەمكار و بێباوەڕ و ڕەوشت نزم، یان كۆمەڵێكی لە ڕێلادەر بەرەنگار و بەرامبەری ئەو لایەنی حەق و ڕاستیە دەوەستنەوە و بەر بەرەكانی ئەو ڕاستیە دەكەن و، ناهێڵن لە لایەنی یارمەتی دەرانیشیانەوە یارمەتیان بدرێت: ستەمكاران لایەنی حەق و

ڕاستی بە خەراپە و ناڕەوا دەدەنە قەڵەم و، پشتگیری و کۆمەکی تاوانباران دەکەن و ڕو لەڕێبازی ڕاستان وەردەگێڕن و بەربەرەکانیان دەوەستنەوە، وە هەموو توانا و دەسەلات و هێزیٚ کیان بەکار دەخەن بۆ گەیشتن بە ئامانج و هەدەفە گلاو مەبەستە ناڕەوایەکەیان بە شێوەیەکی وون و نادیار ستەم و ناڕەواکانیان دەشارنەوە و لە ژێرەوە کاری بۆ دەکەن.

وە دەبیٚ بزانین کە بانگەشەی بانگەوازی ڕاستی ڕێبازی محمد خۆبەخت کردنی دەوێت و بە هەموو مانای هێز و تواناوە: با هاوکاران و هەڵگرانیشی کەم بن دەبیٚ خۆبەخت کارانە بەرەو ئامانج و سەرکەوتنی ڕێگا بگرین و بیر لە هیچ سزا و ئازارو ماندووبون و هیلاکی نەکەنەوە، بەو جۆرە دەگەنە باوەڕی بانگەوازی ڕاست و ڕاستە قینەی تەواو کە خودا خۆی بەڕێوەبەر و پارێزگارە و هەڵگرانی ڕێز و پلەو پایە بەرزن: بانگەوازی باوەڕی ڕاستی کە لە پێشەوە کۆمەڵێکی کەمباوەڕیان پێهێنا بەلام خاوەنی هێزێکی تایبەتی و باوەڕێکی پتەوبوون کە دەتواندرا بەو باوەڕەوە بەرام بەری هەموو هێزێکی بەهێز بوەستنەوە و خۆڕاگربن: وە لە ڕێبازی بەدەست هێنانی ئامانجەکەیاندا هەمووئازاروسزاو، لێدانو، ناخۆشیەکیان بەلاوە سوک و بیٚ بایەخ بوو، وە بەرامبەری ئازارەکانیشیان کە خۆڕاگری و توانایان بەکاردێنا، بەرامبەریشیان دەوەستانەوە و جەنگیان لەگەڵدا دەکردن و هەستیان بەمردن و لەناوچون نەدە کردەوە، چونکە زۆرباش دەیانزانی کە ئەو ژیانی دونیایە ژیانێکی کاتی و گاڵتە و کەلوپەلێکی فریودەرە، تەنها ژیانی دوا ڕۆژە کە جێگای مانەوەو ژیانی ڕاستەقینەیە، نەکۆچ و، نەڕەو و، نە نەمانی بەسەردا دێت و بەردەوام و هەتا هەتایەیە، بۆیە دەیان توانی وەلامی ڕاستەقینەی بانگەوازەکەی خودا و پێغەمبەریان بەدڵسۆزی و باشی دەدایەوە و بانگەوازی جیهادو تێکۆشانیان بە سەربەرزی و گەورەیی و ژیانێکی نویٚ دەزانی، لە دوای زەلیلی و بێدەسەلاتی. شەهیدیشیان بە سەرکەوتنێکی گەورە و مەزن دەزانی لە ژیانی دونیایاندا بۆ کۆچ کردن لەدونیای سوک و بێنرخیدا بۆ دونیای بەختەوەری و ژیانی بەردەوام و بێکۆتایی. بۆیە هەردەم داوایان لە پێغەمبەر دەکرد کە داوای

شەهیدیان لەلایەن خوداوە بۆبكات بۆ ئەو ژیانەی كە هەردەم زیند و دەبن و ڕۆزیان پێدەدرێ. بەڕاستی پێویستی سەرشانی هەموو موسڵمانێكە بە گیان‌ودڵ، بەماڵ و سامان، بە قسە و گوفتار ، تێبكۆشێ بۆ بەرزبونەوەی وشەی (الله)و ئاین‌و بەرنامە بەڕێزەكەی هەروەك و چۆن كاتی خۆی یار و یاوەر و پیاوە بەڕێزەكانی پێشوو یارە شیرینەكانی پێغەمبەری خودا هەوڵیانداو ئەو ئاینەیان بە بەختكردنی گیان‌و ماڵ‌وزوبانیان، سەر بەرز و سەر فراز كرد بەسەر كردەو پێشەوای مرۆڤایەتی حەزرەتی محمد پێغەمبەری خودا.

## ئەو بەهەشتەی كە پانیەكەی بە ئەندازەی ئاسمان و زەمینە

## جنة عـرضها السموات والأرض

دەگێڕنەوە پێغەمبەری ﷺخودا لەهێندێك لە جەنگەكانیدا بەیارەكانی دەفەرموو: هەستن بڕۆن بۆ بەهەشتێك كە پانی و فراوانیەكەی بە ئەندازەی ئاسمان و زەمینە. (عەمیری حومامی ئەنساری) ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا بۆ بەهەشتێك كە پانیەكەی بە ئەندازەی ئاسمان و زەمینە؟! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ؟ عەمیر گوتی: بەخ، بەخ، واتە: ئای لەو خۆشیە، ئای لەو خۆشیە. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی عەمیر چی هۆیەك بوو گوتت: بەخ، بەخ : عەمیر گوتی: سوێند بە خودا ئەی پێغەمبەری خوداﷺ تەنها مەبەستم ئەوە بوو كە من بڕۆمە ئەو بەهەشتە و بە نسیبم بێت: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: عەمیر بە ڕاستی تۆ دانیشتوی بەهەشتی و دەڕۆیە ناوی؟. لەو كاتەدا عەمیر چەند دانە خورمایەكی لە ناو جانتایەكەی دەرهێنا بوو بەدەستیەوە بوو دەیخوارد: بە ئیمانە پڕ باوەڕیەكەی گوتی: بە خودا هەتا ئەوەندە خورمایە دەخۆم بژیەم بە ڕاستی ژیانێكی زۆر درێژ خایەن و دوورە بۆیە هەر خێرا خورمایەكەی ناو دەستی، فڕێداو. ڕۆیشتە ناو جەرگەی شەڕەوە، دەستی كرد بە شەڕكردن لەگەڵ دوژمندا هەتا شەهید بوو خودا ڕێز و مهرەبانی لەگەڵدا بكات.

# ئارام بگرن خانەوادەی ئال یاسیر بەڕاستی جێگەتان بەهەشتە
# صبرا آل یاسیر فإن موعدكم الجنة

هۆزی قوڕەیش تەواوی دەسەلأت و تواناو، سەربەخۆیی و، نوێنەرایەتی خۆیان: بۆ بە جێگەیانـدنی سـزاو، ئـازاردانی ئـەو باوەڕدارانـەی كـە باوەڕیـان بـە بانگەوازەكـەی پێغەمبـەرﷺ هێنـابوو: دابـووە دەسـتی ئەبوجـەهلی بەدرەوشـت وخـوین ڕێـژ. هـەروەك و بـیلالی حەبەشـی دەبـردە نـاو بـەردە گـەرم و گـەورەكانی مەككە بۆ ئازاردان و سزای بەهێز و دوور لـە ڕەوشتی مرۆڤایەتی. هـەر بەهـەمان شێوەو دەستور: خانەوادەی ئال یاسیری كەسێكەس بوون لەماڵێكی ڕۆشەن بیرو خوداناس (یاسرو، سومەییەو، عـەممار) ﷺ هـەموویانی پێكـەوە دەبـردە هـەورازی مەككە و ئازاری دەدان، بەلأم چۆن ئازارێك. سومەییە یەكەمین: شەهیدی ئیسلام و خانەوادەكەی بـوو: بـاوەڕدارێكی خـۆڕاگرو بەتوانا، هـەركاتێ ئەبوجەهلی نەفرین لێكـرا و سـومەییەی دەبـردە نـاو چـەو و، لم و، بەردەگـەورەكانی پشتی مەككـە ، جل و بـەرگی لەبـەردا دەكردنـەوەو زۆربـە دڵ ڕەقـی و ، بێویـژدان و، نابوتانـە، بـە لێدانێكی بە ئازار و بێبەزییانە فڕێیدەدانە سەر ئەو چەو و بـەردە گـەورە گەرمانـە ، سـومەییەش زۆر بە توانـای ئیمانی و خۆڕاگریـەوە لەسـەر ئەو هەموو ئازارانە، بە تەنها دەیووت (أحد، أحد) ئینجا هەر كاتێكیش ئەبوجەهل ئەو وشـەیەی لـەدەمی سومەییە دووبارە دەبیستەوە ئەوەندەی تریش ڕق و قینی هەڵدەستا و، بەشێوەی جـۆرا و جـۆری جیـاواز ئـازاری بـەتینتری دەدان. كاتێـك دەچـوو ئـازار و سـزای یاسری هاوسەری سومەییەی دەدا، بۆ ئەوەی ئەو ئازارو سزایە كاریگەر تربێت لەسـەر هاوسـەرەكەی و خانـەوادەی و ئـەو خۆشەویـستیانەی كـە بـۆ یـەكتریان هەیە.كاریـان تێبكات بۆپەشیمان بوونـەوەیان لەئاینەكەیان ، بـەلأم هەرچەندە كە هونەری لێدان و ئازارەكانی ئەبوجەهل دەگۆڕا بەلای ئەو خانـەوادەوە، بێسود بـوو بۆ پەشیمان بوونەوەیان. ئەمجارە ئەبوجەهل سزاو ئازار و لێدانی دەگواسـتەوە بـۆ كـوڕە تاقانەكـەی سـومەییە كـەبتوانێ بـەهۆی ئـەو جگـەر گۆشـەیەیەوە كاریـان تێبكات و پەشیمانیان بكاتەوە: بەلأم هەرچی كەدەی كردو بەكاری دەهێنا بێسوود

بوو. ساتەكانی ئازارو سزا بەكات و سات بەهێزتر و ناخۆشتر تێدەپەڕی: وە ئەو هەموو گڕو بڵێسەی گەرمی ئەو چەوو بەردانە كە هەموو گیانی سومەییە و خانەوادەكەی شێواند بوو، هیچ كایگەری و شوێنەوارێكی ئەوتۆی لەسەر باوەڕی سومەییەو خانەوادەكەی نەبوو. هەردەمو بەردەوام بەیادی(أحد، أحد) كاتیان بەڕێ دەكردو لەدەمی یەكتریان دووبارە دەكردەوەو ، دڵو جەستەی دووژمنانیان دەتەزاند و ئەبوجەهلیان هێنابوە لەرزە: كە ئەو هەموو لێدان و سزا و ئازارانە كاریگەریان لەسەر دروست نەبووە و، بە دووبارەبوونەوەی دووەم و سێیەم و، دەیەم و، سەدەم، وەلامیان تەنهاو تەنها (الله أحد، الله أحد)بووە: كەئەبوجەهل ئارەزوی گوێبیستی لەو خانەوادە ئەوە بوو، كە ئاینە سەربەرزەكی خوداو پێغەمبەر بەسوك و نابوت و لەكەدار باس بكەنو، بەهۆی سزا و ئازاریان لە ڕێباز و بانگەوازەكەی پێغەمبەر پەشیمان ببنەوەو، واز لە ئاینەكەی بهێنن وگوێڕایەڵی ئەبوجەهل بكەنو، (بت و سەنەم)ە بێگیانو بێسودەكان بپەرستن: بەلام ئەو خانەوادە هەردەم هەتا ئازاریان زۆرتر دەبوو:ئەبوجەهلو بتەكانیان بەسوك و ڕیسواتر ناوزەد دەكرد.

حەزرەتی ئەبوبەكر: كەئەو ڕووداوەی چاو پێكەوت: زۆری هەوڵدا كە خانەوادەی (ئال یاسر) بە هەر شێوە و توانایەكەوە بێت لە ئەبوجەهلیان بكڕێتەوە، بەلام بە داخەوە لەبەر ئەوەی كە ئەبوجەهل زۆر سەركەشو یاخی بوو هیچ هەوڵ و هۆیەكی ڕزگاری كردنیانی لێبەدی نەكراو، هەموو پیلانی كڕینەوەكانیانی پوچەڵ كرانەوە: ئەبوجەهل سوێندی بەلاتو بتەكانی خۆیان خوارد كە دەبێ هەتا مردن و لەناوچون بەو ئازارانەوە گیان لە دەست بدەن؟ ڕۆژێك لە كاتی سەر قاڵبوونی ئەبوجەهل بەسزا و ئازاردانی ئەو خانەوادە ئارام گرە ، پێغەمبەریﷺ سەروەرمان بەلایاندا تێپەڕی، زۆر بە پەرۆشیەوە فەرمووی: ئارامبگرن ئەی خانەوادەی یاسر جێگەتان بەهەشتە. منیش دەڵێم هەزار خۆزگەمان بەخۆتان بكات ئەی خانەوادە بەڕێزەكەی یاسر. خودایە تۆش لە خانەوادەی یاسر خۆش بیت، كە بەڕاستی ئازایی و خۆنەویستی و نەبەردیان نواند. هەر لەوكاتانەی كە ئەبوجەهل ئازار و

سزای سومەیەی دەدا و بەمردن و لە ناوچوون دەی ترساند، بەڵام سومەیەی خۆڕاگر وەڵامی گاڵتەجاڕی ئەبوجەهلی زۆربە حەماسی دایەوە و پێیگوت: ئەی دوژمنی خودا ئەتۆ بەقین و داخی خۆتەوە بمرە، ئێمە پێغەمبەری ﷺخودا پەیمانی بەهەشتی پێداوین، بۆیە بەڕاستی مردنمان زۆر لەلا خۆشتر و پیرۆزتره لەوەی كە سەیری ڕوخساری ناشیرینی تۆ بكەین: ئەبو جەهل ئاگری تورەیی لە چاوانی هەستاو زۆر بەڕق و تورەییەوە بەرەو لای سومەییە ڕۆیشت و، بەبێ ئاگاو، هەستو هۆشی ڕمی بەندەكەی كە لە لای بوو ڕاكێشا و لەسەری دڵی سومەیەی داو خستیە سەرخاك و، سومەییەش بەدەمی پێكەنین و دڵی ئاسودە و خۆش نودیەوە، شادەو ئیمانی هێنایەوەو گیانی پیرۆزی بەرە و لای پەروەردگاری پیرۆزی بەرز بۆوە.كە ئەو ژنە شۆڕە سوارە یەكەمین ئافرەت بوو لە ئیسلامدا شەهیدبوو. خودای بە بەزەیش ئێمەش بە شەهیدی بگێڕێتەوە بۆ لای خۆی.

## ئەی پێغەمبەری خوداﷺچۆنت ئارەزو لێیە وابكە لەگەڵت داین
## إمض يارسول الله ﷺكماأردت فنحن معك

(سەعدی كوڕی مەعان) ﷺ یەكێك بوو لە قوتابیە بەڕێزەكانی پێغەمبەری خودا: لەدوای گوێبیستی وتەكەی (مەسعەبی كوڕی عەمیر)ﷺ باسی باوەڕە پتەوو ڕاستەكەی خۆی بۆخزموكەسوكارەكەی باس دەكرد ، كەچۆن باوەڕی هێناوەو؟ لەبەرچی موسڵمان بووە؟ گوتی: بە ڕاستی گوێم بۆ وتەكانی (مەسعەب) ڕاگرتبوو، وتەكانی زۆرباشو ڕێك بوون و، شایستەی گوێ لێگرتن بوونو، هەموو وتەكانیشی لە پێناو بەرژەوەندی و بەختەوەری ئینسانەكاندا بوون، بۆیە باوەڕم بەتاكو تەنهایی خوداو، پەروەردگاری ئەو بونەوەرە هێنا و، شاهیدیشم بە پێغەمبەرایەتی محمدی كوڕی عبدالله ﷺهێناوە، لە دواییدا گوتی: هەموو كارو فەرمانێكی ژنان و پیاوانی هۆزەكەم لە من حەرام و ناڕەوا بێت هەتا ئێوەش باوەڕنەهێنن. بەڵێ سەعد ئەو كەسە بوو كە هەڵوێستێكی زۆر مەردانەی هەبوو، كاتێ كەپێغەمبەر ﷺداوای لە موسڵمانان كرد كە ئامادەباشی خۆیان دەربڕن ، بۆ

یەكـەم :جـار بـۆ بەرامبـەری ڕوبەڕوبوونـەوەی دووژمنـانی بێبـاوەڕ بـۆ جـەنگ بـە شێوەیەكی ئاشكراو دیاری كە یەكەم: ڕوبەڕوبوونەوەی جەنگی گەورەی بەدر بوو، كـە لـەو ڕۆژەدا سـەعد مانـای تـەواوی خۆشەویـستی و دڵسۆزی خـۆی بەرامبـەر سەركردەی پێشەوای مرۆڤایەتی بسەلمێنێ و، لەو جیهانەشدا ئاشكرای بكات: فەرموی: ئەی پێغەمبەری خودا ئێمە باوەڕمان بە تۆ هێنـاوەو، تۆمان بەڕاست و، بەرنامەكەشـتمان بـە تێـرو تـەواو و بـاش زانیـوە و، دانمسان بەحـەق و ڕاسـتیتدا هێنـاوە و، پـەیمان و بەڵێنیـشمان بەتۆكمـە و تـەواو پێـداوی: ئـەتۆش هـەر چۆن مەیلو ئارەزوت لێیە بیكە و كارەكانت بەجێ بێنەو سارد مەبەوە و، ئێمـە لەگەڵت داین. سوێند بەو كەسـەی كە تـۆی بـە ڕاسـت ناردووە ئەگـەر وانیشان بدەی تـۆ لەسـەر دەریایەكی و خـۆتی تێبهاوی ئێمەش لـە دواتین‌و خۆمـان دوا ناخـەین و، خۆمانی تێدەهاوین، وە بە هیچ شێوەیەك دڵتەنگ و ناخۆشی دەرنابڕین كە بەیانی بەرامبـەر دوژمن ڕامـان بگـری و بەیەكدا بـدەین زۆر بـاش بزانـە ئێمـە لە مەیـدانی دوژمندا بە ئارام‌و خۆڕاگر دەبین و، هێـرش و پەلاماریان بـۆ سـەر دەكـەین: خـودا یارمەتیمان بدات كاری ئازایی و نەبەردی وامان لێدەبینی كە دڵت پێخۆش بێـت و چاوت پێی ڕووناك بێتەوە. ئەتۆش ڕامەوەستەو بڕۆ بە ئومێد و هیوای سەركەوتن و، پشت بەخودا.

## كێ ئەو شیرەم بە ڕاست‌و داد پەروەری لێوەردەگرێ
## من يأخذ هذاالسيف بحقه

لە مەیدانی شەڕی ئوحودەوە پێغەمبەر ﷺشیرێكی دەست دایەو فەرمووی:كێ ئەو شیرەم بـە حـەق‌و مـافی خـۆی لێـوەر دەگـرێ؟ جەماوەرەكە لـەو فـەرموودەی پێغەمبـەرە سـەریان سووڕما كەئەو هەمووخۆشەویستیەیان بۆ پێغەمبـەر هەیـەو، ئەویشس چـی دەفـەرموێ: كـە وەك و ئێمـە جێگـەی متمانـەی نـەبین بۆیـە هـەموویان كەوتنـە بیرو فكرێكـی قولْ ، بۆ بەجێهێنانی ئەو پێویستیە گەورەیە. كە پێغەمبـەر دیاری دەكات و بەپێویستی دادەنێت: پێغەمبەرﷺ ئەو فەرموودەی دووبـارەكردەوە: ئینجـا لـەناو جەماوەرەكـەدا (ئەبودووجانـە) كـە نـاوی (سمـاكی كـوڕی خوڕاشـە) بووهاتـە وەڵام و گـوتی: ئـەی پێغەمبـەری خـودا من

ئامادەم و حەقی ئەو شیرە چییە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: حەق و مافی ئەو شیرە ئەوەیە لە دوژمنانی ئیسلام و بێباوەڕانی بدەی هەتا دەچەمێتەوە و خواردەبێت: (ئەبودوجانە) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا من بە هەموو مافێکەوە وەری دەگرم، پێغەمبەریش ﷺشیرەکەی پێبەخشی، ( ئەبو دوجانە)ﷺ هەر کە شیرەکەی وەرگرت بە غارو خێرا بەرە و مەیدانی جەنگ کەوتەڕێ و، پەڕۆیەکی سووری لە دەست و قۆڵی بەست و، هاواری دەکردو و دەیگوت:

أنا الذی عاهد نی خلیلی ونحن بالسفح لدی النخیل

أن لا أقوم الدهرفی الكیول أضرب بسیف الله والرسول

من کەسێکی ئازاو بە جەرگ‌و پاکم لە شەڕیم یان لە ئاشتی زۆر بێباکم خۆشەویستم پەیمان‌و وەعدەی داوە لە بن ڕازو لە باخی پڕ هەواوە پشو نادەم ڕاناوەستم لەژیانم کۆشش دەکەم تێدەکۆشم دەتوانم بە شیری خوا شەڕدەکەم من سەروەرم بەختەوەرم بە شەهیدی لەسەر ڕێگای پێغەمبەرم.

واتە: من ئەو کەسەم کە خۆشەویستم پەیمانی پێداوم کە بەڕاستی لە قەدپاڵی کێو شاخین و، لە ناودار خورماین و، ئەمن هەمیشە لە کاتی تێهەڵچون‌و لێقەومان ڕاناوەستم‌و، ترسنۆك نیم: لەسەر زەوی بەرزو بڵندیش بە شیری تیژی خوداو پێغەمبەر، لێدەدەم و شەڕ دەکەم. بەو جۆرە ئەو پیاوە ئازاو بە غیرەتە لە مەیدانی جەنگ دەگەڕاو دەسوڕا و هەر کەسێکی لە بێباوەڕان بدیبایە پەلاماری دەدا و شاڵاوی دەبردە سەر، هەتا نەی کوشتبا وازی لێنەدەهێنا: بەو جۆرە (ئەبودوجانە)ﷺ دڵسۆزی خۆی نواندو ڕەزابونی خودا و پێغەمبەری بەدەستهێنا.

## فریشتە شوشتیان - غسلته الملائكة

(حەنزەلەی کوڕی عامر) ﷺئەو هاوڕێ بەڕێزەیە کە فریشتەکان شوشتیان: لە جەنگی ئوحود دا لەگەڵ (ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب )دەگەنە بەرامبەری یەکتری حەنزەلە لای سەرەوەی لێدەگری‌ودەیەویست بیکوژێ بەڵام (شەدادی کوڕی ئەوس) کەپێیان دەگوت کوڕی گەل(إبن شعب) چاوی پێدەکەوێ واخەریکە ئەبوسفیان دەکوژرێ هەر خێرا پەلاماری حەنزەلە دەداو دەیکوژێ و شەهیدی دەکات: پێغەمبەر فەرموی: بەڕاستی هاوڕێکەتانم دیت فریشتە دەیانشوشت.

پرسیار لە خزم و کەسانی بکەن بزانین بۆچی وایە؟ ڕۆیشتن و پرسیاریان لە هاوسەرەکەی کرد کە ناوی (حەسیلەی کچی ئوبەییەی کوڕی سەلول) بوو کەبۆچی حەنزەلە لە دوای شەهیدی فریشتە شوشتویانە، ئەویش لە وەڵامدا وتی:من لەلای حەنزەلە یەکەم: شەوی شەکرا و بوکێنیمان بوو لەشی گران و پیس بوو، کە گوێی لە دەنگی تەپڵ و بانگی شەڕ بوو هەر خێرا هەستا و ڕاپەڕی و چەکی لە خۆیداو پێڕانەگەیشت خۆی بشوات بەرە و تەپڵو بانگەوازی شەڕ کەوتەڕێ: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەوە لەبەر ئەوە فریشتەکانی خودا شوشتویانە و دەیان شوشت.

## ئەگەر بتوتبا بە ناوی خودا، فریشتەکان بەرزیان دەکردیەوە لوقلت بسم الله لرفعتك الملائكه

ئیمامی بەیهەقیﷺ لە جابیرەوە دەگێڕێتەوە: کاتێ پێغەمبەری ﷺ ئیسلام لەگەڵ کۆمەڵێك لەیارەکانی ئەنسار ، کەیەکیان (ئەبو تەلحەی)ﷺ ئەنساری بوو ڕۆیشتن و سەردەکەوتنە سەر کێوێك: کۆمەڵێکی بێباوەڕانیان بە دواوە بوو کاری زۆر نامەردی و سوکایەتیان بە پێغەمبەرﷺدەکرد: پێغەمبەر ﷺفەرمووی: ئەوە پیاوێکی ئازاتان تێدانیە بۆ ئەو بێباوەڕانە؟. (تەلحەی کوڕی عبیداللە)ﷺ فەرمووی: بەڵێ ئەمن یا رسول اللە.ﷺ ئینجا دووبارە پێغەمبەرﷺ فەرمووی: کێی کەش لە خۆی ڕادەبینێ و توانای هەیە؟ پیاوێکی ئەنساری گوتی: من ئەی پێغەمبەری خودا لەگەڵیدا دەجەنگم: ئەو دوانە لەگەڵ ئەو بێباوەڕە جەنگان هەتا کوشتیان: بێباوەڕەکانی تر لە دوایان نەبوونەوە و، هەر بە سوکایەتیو خەراپە ناوی پێغەمبەریان دەبرد: پێغەمبەریش ﷺهەردوو بارەی دەکردەوە و دەیفەرموو: ئەوە پیاوێکی ئازای واتان تێدا نیە بۆ ئەوانە؟ دیسان ئەبو (تەلحە )گوتی: ئەمن ئەی پێغەمبەری خودا: پێغەمبەر ﷺفەرمووی: هەر ئەتۆ ئەی تەلحە: ئەبوتەلحە خۆی زۆر بە ملکەچ و زەلیل نیشاندەدا: ئینجا یەکێکی تر لە هاوڕێیانی ئەنسار دەڕواتە مەیدانو شەڕدەکات، هەتا شەهید دەبێت و دەکوژرێ: بەو جۆرە هەتا پێنج لە هاوڕێیانی پێغەمبەر شەهید دەکرێن و دەکوژرێن: لە دوای ئەم ڕوداوە

دڵتەزێنـە ئـەبو تەلحـە خـۆی ئامـادەکرد و بـەرەو ڕووی ئـەو بێباوەڕانـە بـووەوەو مەیدانی لێگرتن و شەڕێکی مەردانەی لەگەڵ داکردن و ، بە پشتیوانی خودای گەورە چەند کەسی لێکوشتن و، برینـداری کـردن. بـەڵام ئەبو تەلحـە ، لـەو شـەڕە بەسـەر چەسـپاوەدا سـەری پەنجەیـەکی پێکـا و، پێـشەوا حەسـەن دەفـەرموێ: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ئەگەر ئەبو تەلحە گوتبای ( بسم الله) فریشتەکان بەرە و هـەوای ئاسمان بەرزیان دەکردەوە و ، جەماوەریش سەیریان دەکرد. بەو شێوە ئەبو تەلحە بەگۆجی مایەوە کە ئەوەش نیشانەی بەرزی و دیاری بوو بۆ ئازایەتی و، جوانمێری و، تێکۆشانی لە ژیـانی دوونیـا: هـەر بەو شـێوەیەش دەمێنێتـەوە هەتا ڕۆژی بە یەکگەیشتنەوەی ڕۆژی گەورەی دوا ڕۆژ.

## ئەی بەندەکەم داوام لێبکە پێت دەبەخشم
## یاعبدی سلنی أعطیك

پێشەوا جابرﷺ دەفەرموێ: پێغەمبەرﷺ سەیری کردم و فەرمووی: ئەی جابر بۆچی وا بە کەساس و، غەمباریت دەبینم؟ جابر گوتی:ئەی پێغەمبەری خودا چۆن غەمبار نەبم ! باوکم شەهیدو کوژراوەو، خانەوادەیەکی زۆری بەجێهێشتوە و وام(قرض)ێکی زۆری لەسەرە. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی جابر دڵتەنگ و خەمبار مەبە؟ هەواڵێکی خۆش و مزگێنیت پێبدەم؟ خودای گەورە قسەی لەگەڵ هەر کەسێکدا کردبێت، لە نێوانیاندا چەندین پەردەی تاریکی هەبووە. بەڵام خودا بەبێ پەردە لەگەڵ باوکتدا قسەی کردووەو، پێی فەرمووە: ئەی بەندەکەم داوام لێبکە هەرچی داوا بکەی لێت ناشارمەوەو پێت دەبەخشم. باوکیشت گوتویەتی: ئەی خودایە داوات لێدەکەم بمگێڕیەوە بۆ دونیا بۆ ئەوەی لە پێناوی تۆدا دووبارە بکوژرێمەوە! خوداش لە وەڵامی ئەو داوایەیدا فەرموویەتی ئەمن لە پێشودا فەرموودەی خۆم تەواو کردوە: ك ەدەفەرموێ: (إنهم إليها لايرجعون) ئینجاباوکت گوتی: ئەی خودایە ئەو هەواڵەم بەخەڵکانی دوای خۆم بگەیەنە خودای بە بەزەیش ئەو ئایەتەی نارد کە دەفەرموێ: { وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ

عِندَ رَبِّهِمۡ يُرۡزَقُونَ :} ال عمران/١٦٩واتەی ئەو ئایەتەشمان لە پێشەوە کردووە. باوکی جابر حەوت کوڕی هەبوو بەڵام جابری کرد بووە لێپرسراوی هەموو برایەکانی و، پێیگوتبوو: کوڕم من نامەوێ تۆ لەباتی خۆم هەڵبژێرم بۆ ڕۆیشتن لەگەڵ پێغەمبەری خودا بۆ جەنگ: بەڵکو بۆ خۆم دەڕۆم بۆ جەنگ بە هیوای ئەوە کەخودا شەهیدیم بە نسیب دەبێت و بە شەهیدی دەگەم.

## پیاوی وا هەیە لە باوەڕداران ڕاست گۆیەلەگەڵ بەڵێنەکەی بە خودا
## من المؤمنين رجال صدقوا ما عاهدو الله عـليه

هەر کاتێك پێغەمبەریﷺ خودا بڕۆیشتبایە بۆ جەنگ جەماوەرێکی زۆری بێژوماری لەگەڵدا دەردەچوو بە جۆرێکی وەها کە لەو ڕێگایانەی کە پێدا دەڕۆیشتن دەبوایە لە یەکتری دابڕان و جیابوونەوە هەبایە دەنا لە ڕێگاکەدا جێگەیان نەدەبوو: ئینجار کارو ڕەوشتی دووڕوەکان ئەوە بوو هەر لە ڕێگا جیاواز دەبوونەوە و دەگەڕانەوە دواوە موسڵمانەکانیان بەجێدەهێشت: ئەوانیش دەبوونە دوو بەشەوە: ئەوەی کە ترس و سامی جەنگی بدیت بایە خێرا بەلایەکدا دەگەڕایەوە و، تەنها موسڵمانە ڕاستەقینەکان دەمانەوە.

لە جەنگی (حونەین)دا ئەبوبەکری صدیق ﷺکە چاوی بە ئاپۆرە و زۆری سوپای موسڵمانان کەوت فەرمووی: ئەمڕۆ ئێمە بەهۆی زۆری سوپاوە سەربەرز و سەرکەوتوو دەبین، بەڵام کاتێ ئاشی شەڕ هەڵگیرسا و ترس‌و سامی شەڕ و توند و تیژی بەیەکدادان بەتین و سەختبۆوە: زۆربەی ئەوانەی کە بە دوای پێغەمبەردا بۆ مەیدانی جەنگ هاتبوون بە هیوای ماڵ و سامانی تاڵانی، هەڵاتن و ڕایانکردو خۆیان شاردەوە: ئەوانەش کۆمەڵێك بوون، کە لە کۆت و زنجیر و دیلی دانیشتوی مەککەیەکان ڕزگاریان ببوو. وە هێندێکیش لە گەجەر و گوجەرو، کۆچەر و دەوارنشینەکان بوون. وە ئەو کۆمەڵە موسڵمانەی لە دەوری پێغەمبەرﷺ کۆببونەوە و پارێزگاریان لە پێغەمبەرﷺ دەکرد، ئەوانیش بە هۆی گەرم‌و تینی شەڕەکەو

گەڕانەوەی ئەو هەموو دووڕوانەو، ئەو گەجەرو گوجەرانە هورەیان ڕوخابوو، نیازی تێشکان‌و هەلاتنیان هەبوو. ئینجا لەو کاتی سەغڵەتی و دژواریەدا زۆر نزیکبوو بازنەی گەمارۆدانی شەڕ بەسەر باوەڕداراندا بشکێتەوە. پێغەمبەر بە دەنگێکی زۆر بەرزەوە بانگ‌و هاواری لە جەنگاوەرانی ئەنسار کردوو ئەوانیش لە ناوجەرگەی مەیدانی شەڕدا وتیان: لە خزمەتتداین و ڕاوەستاوین و ئێمە لەگەڵتداین. ئینجا جەنگاوەرانی ئەنسار زۆر بە ئازایی و مەردانە ڕۆیشتنەوە ناو مەیدانی جەنگ‌و، شوێنی خۆیان بە توندتر گرتەوە، بە بێ ترس دەستیان کردەوە بەشەڕ. هەتا خودای بەدەسەلات سەرکەوتنی کردەبەشی پێغەمبەر و ئەو موسڵمانە ڕاستەقینانە. ئینجا لە دوای کۆتایی جەنگ‌و کۆکردنەوەی تالانی جەنگ. پێغەمبەرﷺ دانیشتبوو ماڵە تالانیەکەی دابەش دەکرد. بەلام هیچ لەو ماڵە تالانیەی نەدایە شەڕکارانی ئەنسار کە تەنها ئەوانیش شەڕەکەیان کردو و سەرکەوتنیان بەدەستهێنا. بەڵکو هەموو ماڵە تالانیەکەی دابە ئەو کەسانەی کە هەر لەگەڵ هەڵگیرسانی شەڕدا هەلاتبوون. چونکە پێغەمبەرﷺ زۆرباش دەیزانی ئەوانەی کە لەگەڵ پێغەمبەردا هاتبوون بۆ شەڕ لە پێناوی برسیەتی و هەژاری هاتبوون و بۆ دەسکەوتی شەڕ هاتبوون: نەك لە پێناوی هەدەف و بیرو ئامانجی بێباوەڕیدا. لە دواییدا پێغەمبەرﷺ فەرموودەیەکی شیرین و بەپێزی بۆ ئەنسارەکان خوێندەوە و، فەرمووی: ئەی کۆمەڵی ئەنسار ئێوە بەوە ڕازی نابن. کە ئەو جەماوەرە بە حوشتر و مەڕو کویشتیر بگەڕێنەوە بۆ ماڵەکانیان‌و، ئێوەش لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺبگەڕێنەوە؟ سوێند بەو کەسەی کە گیانی محمدی بەدەستە ئەگەر لەبەر کۆچ کردن نەبوایە ئەمن یەکێك دەبووم لە ئەنسار!! وە ئەگەر هەموو ئادەمیزادەکان یەك ڕێگەو دۆڵیان بگرتبایە: وە بەتەنها ئەنساریش یەك ڕێگەی بگرتبایە ئەمن ڕێگەی ئەنسارم دەگرت‌و لەگەڵ ئەواندا دەبووم. خودایە بەزەیی بەئەنسار و ڕۆڵە و نەوەی ئەنسار بکە. ئەنساریەکانیش هەموو بەجارێك دەستیان کرد بەگریان‌و گوتیان: ئێمە بە پێغەمبەری ﷺ خودا ڕازین‌و، کامەران‌و شادمانین بە هەبوونی و نەبوونیش.

## پاڵەوانی، لەجەنگدا : بطولة في الجهاد

دەگێڕنەوە عەوفی کوڕی حارسی کوڕی ڕوفاعەﷺ هاوڕێی پایەبەرزی گەورە پیاوانی وڵات بوو. بەڵام هەتا بڵێی ئادەمیزادێکی سادە و دەستکورت و هەژار. بەڵام هەتا بڵێی بەخشێنەر و سەخی بوو، کاتێ گەیشتە جەماوەری هاوڕێیانی لەسەرچاوەی بەدر: عەوف ڕووی لەپێغەمبەرﷺ کردوو فەرمووی: ئەی پێغەمبەری پێشەوا خودا بەچی کردەوەیەکی بەندەکانی سەرسامو خۆشحاڵەو پێدەکەنێ؟ پێغەمبەرﷺ لە وەڵامیدا فەرمووی: کاتێ بەندەی خۆی بەسەر ڕووتیو بێبەرگی و هەژاری ببینێ لەپێناوی ئەودا لەگەڵ بێباوەڕان دەجەنگێ و شەڕ دەکات. عەوف هەر خێرا زرێیەکەی لەبەردا بوو داینا و بەرەو مەیدانی جەنگ ڕۆیشت و دەستی کرد بەشەڕکردن هەتا شەهید بوو.

## خودا بە دوو باڵەوە لە بەهەشت پاداشتی دەداتەوە
## أثابه الله بجناحين في الجنة

جەعفەری کوڕی ئەبوتالیبﷺ لەدوای شەهید بوونی زەیدی کوڕی حارسە ﷺلە جەنگی (مؤتە)دا لێپرسراویەتی جەنگی کەوتە دەست، ئاڵاو بەیداخی هەڵگرت و، لە پێناوی خودادا جەنگا بە جۆرێکی ئازا و مەردانە، زۆر بە کۆڵنەدەرانە کە هیوایەتی شەهیدی بوو لەو ڕێبازە شیرینەوە، کە زۆر بە بەختەوەری و ئاواتەوە چاوەڕوانی دەکرد، چونکە بەڕاستی ئەو بەخشیش و دەستکەوتەی کە لە شەهیدیدا دەستی دەکەوێ لە هیچ شوێنو ڕێبازێکی تردا بەدی ناکرێ. ئینجا بە بۆنەی چاپوکو چالاکیەکەی دوژمنان هێرشیان بۆ بردوو هەر چوار دەورەیان گرتو، ڕێگەی جوڵانەوەی وڵاغەکەی لێگیرا و تواناى ڕاپەڕینو سوڕانەوەی نەما. بۆیە لە وڵاغەکەی دابەزیو، بە هەر چوار لای خۆی دەسوڕایەوە و شەڕی دەکرد. لەو کاتەدا یەکێك لەسەر بازەکانی ڕۆمی هەوڵیدا کە سواری وڵاغەکەی بێت بۆیە جەعفەر شیرێکی لەملی وڵاغەکەدا و سەری بڕی بۆ ئەوەی نەکەوێتە بەر دەستی دووژمنی. جەعفەر زۆر بە مەردانە شەڕی دەکردو و ئەو شیعرانەی دەخوێندەوە.

یاحبذ الجنة واقترابها طيبة وبارد شرابها

والروم روم قددناعذابها كافرة بعيدة أنسابها

كاتێ ڕۆمەكان چاویان بەئازایەتی و نەبەردی جەعفەر كەوت كە لەو كاتی هێرش‌و تێهەڵچونە دەورە گیراوەی جەعفەر زۆر بە چاپوك و ئازایانە هەنگاوی دەناوشەڕی دەكرد، وەك و سوپایەكی بەهێز پەلاماری ئەو هێزە گەورەیەی دەدا بۆ شكاندن و نەهێشتنی گەمارۆ و ئابلوقەی ئەو سوپایە. لەو بارو دۆخەدا بوو دوژمنان فرسەتیان لێدیت‌و دەستی ڕاستەیان پەڕاند. جەعفەر بەدەستی چەپەی ئاڵاكەی هەڵگرتەوەو بەرزی كردەوە. بەڵام بەداخەوە دەستی چەپەشیان پێكاو پەڕاندیان. لەو بارودۆخە دڵتەزێن و كارەساتە نەی هێشت ئاڵاكەی پێغەمبەرﷺ بكەوێتە سەر زەوی باوەشی لێگرت‌و، بە باسك و بازوی ئاڵاكەی بەرز كردەوە، بەو شێوەیە هەتا هێزو توانای تێدا نەماو، لەوكاتەداپیاوێكی ڕۆمی فرسەتی بینی شاڵاوی بردە سەر و شیرێكی لێداو كردی بە دوو لەت و شەهیدیان كرد، هەزاران میهرەبانی خودای لەسەر بێت.لەدوای شەهید بوونەكەش، ئاڵایەكە لەنێوانی سینگی‌و هەردووك شانیدا چەقی بوو. كاتێ پێغەمبەرﷺهەواڵی شەهیدبوونی جەعفەری پێگەیشت فەرمووی: خودای گەورە پادا شتی جەعفەری لە باتی دوودەست بە دووباڵ داتەوە كە لە بەهەشتدا بۆ هەر شوێنێك بیەوێ پێی بفڕێت، بۆیە هەر لەو كاتەوە بە جەعفەریان دەوت: باڵداری فڕۆكەوان.

## تێكۆشانی ئافرەت: جيهاد المرأة

دەگێڕنەوە پێغەمبەری خوداﷺ: جەنگ و تێكۆشانی بە چەند ئافرەتێكی ئەنساری دەكرد: كە یەكێك لەوانە (دایكی سولەیمی كچی مەلحان) بوو لەناو جەنگاوەراندا ئاویان دەگێڕا و بریندارەكانیان تیمار دەكرد.بەڵام ئەم دایكی سولەیمە لە جەنگی ئوحوددا لەگەڵ جنگاوەران دەجەنگا و خەنجەرێكی بەدەستەوە بوو شەڕی پێدەكرد لەو كاتەدا كە بە خەنجەرەكەی شاڵاوی دەبرد، لە ناو جەنگەی شەڕدا چاوی بە پێغەمبەری خودا كەوت. پێغەمبەرﷺ كە سەیری كرد دایكی سولەیم

خەنجەرێكی بە دەستەوەیە فەرمووی: دایكی سولەیم ئەو خەنجەرە چییە؟ ئەویش گوتی:ئەی پێغەمبەری خودا بەو خەنجەرە ورگی بێباوەڕانی پێدەدڕم: پێغەمبەرﷺ بەو وتەیە پێكەنی: ئینجا دایكی سولەیم گوتی: ئەی ڕەسولی خودا ئەو ئازادی كراوانەی كە تێشكاون ، بیانكوژم ؟پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی دایكی سولەیم ئەوانە خودا لەشەڕ و خەراپە بە دووری كردوون‌و پاراستوونی مەیانكوژە.

## ئازایەتی وپاڵەوانی باوەڕ: بطولة وإيمان

دەگێڕنەوە موسەیلەمەی درۆزن پیاوێكی لە هاوەڵانی پێغەمبەر بەدیلگرت بە ناوی (حەبیبی كوڕی زەید) ﷺ پێیگوت: ئەی حەبیب داندەنێی بەوەی كە ئەمن پێغەمبەری خودام؟ لە وەڵامدا حەبیب گوتی: هیچ گوێم لەو وتەیە نیەو، نای بیستم!! ئەمجار موسەیلەمە گوتی: ئەدی شاهیدی دەدەی كە محمد پێغەمبەر و نێردراوی خودایە؟ حەبیب گوتی: بەڵێ محمد پێغەمبەری خودایە. موسەیلەی درۆزن فەرمانی دەركرد ئەو كابرایە بكوژن و لە ناوی بەرن: پیاوەكانی موسەیلەمە لاشەی حەبیبیان پارچە پارچە لێدە كردەوە: لە كاتی لێكردنەوەی هەر پارچەیەكیشدا ئەو پرسیارەیان لێدووبارە دەكردەوە و. حەبیبیش هەمان وەڵامی پێشوی دەدانەوە و دەیفەرموو: گوێم لێی نیەو نایبیستم. وەڵامی دووەمیشی بە بەڵێ دەدایەوە و دەیگوت:محمد پێغەمبەری خودایە. هەتا گیانی لەدەستدا و شەهید بوو.

خەلیفەی یەكەم: حەزرەتی ئەبوبەكرﷺ: كاتێ ویستی سوپا ئامادە بكات بۆ جەنگی موسەیلەمەی درۆزن: بە سەركردایەتی (خالیدی كوڕی وەلید)ﷺ دایكی حەبیب كە بەدایكی عەمار بەنابانگ بوو ناوی (نەسیبەی كچی كەعب)ی ئەنساری بوو داوای لەحەزرەتی ئەبوبەكر كرد كە ڕێگەی پێبدابێتە جەنگاوەرێك و بڕواتە مەیدانی جەنگی موسەیلەمەی درۆزن: ئەبوبەكر ﷺ ڕێگەی بەو ئافرەتە شۆڕە سوارەدا كە بڕواتە مەیدانی جەنگ. ئینجا كاتێ سوپا بەڕێكەوت و گەیشتنە مەیدانی جەنگ و شەڕ گەرم بوو. ئەو ئافرەتە ئازا و بەجەرگە لە ناو مەیدانی شەڕدا كە زۆرباش دەجەنگا: بەڵام هەر چاویشی دەگێڕا بۆ ئەوەی چاوی بە

موسەیلەمە بکەویّ و پەلاماری بۆ بەریّت: لە کاتیّکدا لە دوورەوە بەدی دەکات، هیّرش و شالاّو دەباتە سەری: بەلاّم کۆمەڵێکی پاریّزگارانی موسەیلەمە هیّرشی دەبەنە سەری‌و، دەستیّکی نوسەیبە دەپیّکیّ و دەپەڕیّت بەلاّم: نوسیبەی ئازاوبەغیرەت ئەوکارەی شکستی پیّنەهیّنا و ڕانەوەستا و ساردنەبۆوە: لە هیّرش بردندا بەلك و بۆ جاری دووەم: خۆی ئامادە کردەوە و هیّرش و پەلاماریّکی مەردانەی بردەوە سەر موسەیلەمەی درۆزن کە لەو کاتەشدا سەیری کرد (عبداللە ی کوڕی زەید) وەك و ئەو هیّرشی مەردانە دەکاتە سەر موسیلەمە. ئەمجار ئەو دوو شیّرە نەبەردانە بە یەکەوەیەك دەگرن و پەلامارەکە یان پیّکەوە بە هاوکاری دەکەنە سەری بۆ کوشتن‌و نەمانی ئەو دووژمنە درۆزنە. دایکی عەمار بیّجگە لەوەی کە دەستیّکی پەڕی بوو لە (١١)یانزە جیّگەشەوە بەبریندار‌ی سەختی تیرو، شیرو، ڕمب پیّکابوو:لەگەڵ ئەوهەمووبرین‌وئازارانەدا لەمەیدانی جەنگ مایەوەو مەیدانی چۆڵ نەکردهەتاشەڕکۆتایی پیّهات.کاتیّ کە گەڕایەوە بۆ مەدینەش لەبەر کاریگەری برینەکانی هەر لەژیّر چاودیّری پزیشکیدا بوو بۆ چارەسەری: حەزرەتی ئەبوبەکر لەبەر ڕیّزو گەورەییی ئەو ئافرەتە بەڕیّزە زۆر کات دەڕۆیشتە لای‌و سەردانی دەکرد.

## سەعدی کوڕی ڕەبیع ووەسیەت نامەکەی

## سعد بن ربیع ووصیتە

لە دوای کۆتایی جەنگی ئوحود: پیّغەمبەرﷺ فەرمووی: کیّ هەیە بتوانیّ بچیّ هەواڵی سەعدم بۆ بهیّنیّ چی بەسەر هاتووە، زیندوە یان مردووە؟ پیاویّکی ئەنساری گوتی: ئەمن دەچم ئەی پیّغەمبەری خودا هەواڵی تەواوت بۆ دەهیّنم. کاتیّ کابرا ڕۆیشت گەڕا سعدی لە ناو کوژراوەکاندا دۆزیەوە، برینداریّکی سەختەو، خەریکی گیانەلاّیە: پیّیگوت: ئەی سەعد پیّغەمبەری خودا ﷺ منی ناردووە هەواڵی تۆی پیّڕابگەیەنم: سەعد گوتی: سەلامی من بە پیّغەمبەرﷺ بگەیەنە و پیّیّ بفەرموو: سەعدی کوڕی ڕەبیع لە ڕیزی مردووەکانە و دەیوت: خودای بە بەزەیی پاداشت و جەزامان بداتەوە بە جوانترین پاداشت: کە پیّغەمبەر

بەرامبەر بە نەتەوەكەی دەیداتەوە: وە دووبارە، سەلامی منیش بە تەواوی موسڵمانان ڕابگەیەنە و پێیان بڵێ، بە ڕاستی هیچ بیانویەكتان نیەو، نابێت لەلای خودا كە لە پێغەمبەر و ڕێبازەكەی دوور بكەونەوە و، كەنارگیری لێبكەن: بە شێوەیەك كە بێباوەڕان و هاوبەشی پەیداكەران بتوانن بگەنە پێغەمبەر و ئازاری پێبگەیەنن، ئێوەش چاوپۆشی و پشتی تێبكەن. لە دوای ئەوە سەعدی كوڕی ڕەبیع‌ چاوەكانی لەیەك ناو بە شەهیدی سەری نایەوە. داوا لە خودا دەكەین كە بەمیهرەبانی خۆی لەویش و لە ئێمەش ببوریێ و، بەتایبەتی سەعدبە میهرەبانی خودا بگات.

## لە ڕۆژی ئوحود بۆ هەر لایەك ئاوڕمدایەوە بە بەرچاوم شەڕی دەكرد

## ما إلتفتت يمينا و شيمالا يوم أحد إلا ورأيتها تقاتل

دایكی سەعدی كچی سەعدی كوڕی ڕەبیع )دەفەرموێ: ڕۆیشتمە لای (نوسەیبەی كچی كەعب) دایكی عەممارپێم گوت:پورێ ڕوداوێكی خۆتم پێ بڵێ؟ ئەویش فەرمووی: ڕۆژی شەڕی ئوحود لە سپێدەی بەیانیەوە كوندەیەك ئاوم پێبوو، لەماڵ ڕۆیشتمە دەرو چووم بۆ لای پێغەمبەرﷺكەلەناو هاوڕێكانیدابوو، بەڕاستی نیشانەی سەربەرزی و، ئازایەتی و سەركەوتنی موسڵمانان بوو، چاوم لە جەنگاوەران دەگێڕا بزانم چیدەكەن و چۆن هەڵمەت دەبەن، بەڵام زۆر بەداخەوە لەبەر زۆری و هێرشی بێ ئەندازەی دووژمنان خۆیان پێنەگیراوشكستیان هێناوكشانەوە دواوە منیش كوندەی ئاوەكەم دانا و شیرم دەست دایەو بەشەڕكردنەوە ڕۆیشتمەلای پێغەمبەریﷺ خوداو، بەرگریم لەپێغەمبەر دەكردو خۆم هەڵدەدایە بەر ئەو شیرو ڕمبەی كەبۆپێغەمبەرﷺ دەهاویشترا: بەشێوەیەك واملێهات هەموولاشەم بوو بەبرینی شیرو ، تیرو، ڕمب، ئازاری زۆرم لەلاشەیدا هەبوو تەنانەت برینێكی گەورەو قوڵم لەسەرشانی هەبوو: دایكی سەعد دەفەرموێ: سەیرم كرد بەڕاستی برینەكەی گەورەو قوڵبوو، پێمگوت :ئەو برینە دەزانی كێ لێیدای؟ دایكی عەمار گوتی :بەڵێ، پیاوێكی زلەی زەبەلاحی زۆر ناشیرین، خودا داماو ڕیسوای بكات. كاتێ جەنگاوەرانمان بەرەو دواوە گەڕانەوەو تێشكان و پێغەمبەریان بەجێهێشت. ئەو كەتە زلە ناشیرینە لەناو مەیدانی شەڕدا

هاواری دەكردوو دەیگوت: محمدم پیشان بدەن بەخوا ئەگەر ڕزگاریشی ببیٚ ناهێڵم ئەمڕۆ لە دەستم دەربچیٚ و بەسەلامەتی بگەڕێتەوە دواوە. ئینجا لەو كاتەدا من و مسعبی كوڕی عەمیر و كۆمەڵە جەنگاوەرێك ﷺ كەخۆیان ڕاگرتبوو لەمەیدان ولەگەڵ پێغەمبەر ﷺ شەڕیان دەكرد مابوونەوەو پێغەمبەریان بەجیٚ نەهێشتبوو: شالاٚو هێرشمان بردە سەر ئەو زلە زەبەلاحەو ئەویش ئەو گورزە كاریگەرەی لێدام، هەر چەند كەمنیش زۆر بەهێزەوە لێم دەداو بەریدەكەوت: بەلاٚم چونكە دوو زریٚی پیٚ بوو زۆر كاری تێنەدەكرد. بۆیە پێغەمبەریش ﷺ بەرامبەر ئەو ئافرەتە شۆڕە سوارەی مەیدانی جەنگ شاهیدی بۆ دەداو دەفەرمویٚ: لەو كاتی جەنگەدا بۆ هەر لایەك دەسوڕام چاوم بە دایكی عەممار دەكەوت زۆر بەهێزەوە شەڕی دەكرد.

## بەڕاستی گەیشتیە تۆڵەی خۆت ئەی دایكی عەممار

## لقد نلت قصاصك یا أم عمارة

ئەو ڕوداوو بەسەرهاتەی كە دایكی عەممار باسی كرد گوتی: لە شەڕی ئوحود شانم پێكاو بەسەختی بریندار بوو، بە دەستی كابرایەكی زلەی درێژ وەك و دار خورما هەڵچو بوو، دوایی لەبەر چاوم بزربوو چاوم پێی نەكەوتەوە. شانم زۆر دێشاو خوێنی زۆری لەبەر دەڕۆیشت و نەدەوەستا: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بڕۆ برینەكەت تیمار بكە و بیبەستەوە، كاتیٚ لام كردەوە دایكم بۆ لای منەوە دەهات، چەند پەڕۆیەكی بۆ بریندارانی جەنگی ئوحودی ئامادە كرد بوو، هەر لەویٚ برینەكەی منیشی تیمار كردوو بەستیەوە، كەسەرم هەڵبڕی پێغەمبەر ﷺ لە بەرامبەرم ڕاوەستا بوو سەیری دەكردم. دوایی دایكم گوتی: هەستە كچەكەم بڕۆوە شەڕ بكە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی دایكی عەممار دەتوانی شەڕ بكەی یان نا؟ لەو وتەو گوفتوگۆیانەدا بوون ئەوكابرا زلە درێژە بەغار بۆ لایان دەهات، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەو زەلامە لە كچەكەی تۆیداو شانی بریندار كرد: ئەویش دەفەرمویٚ: منیش هەر خێرا هەڵمەتم بردە سەری و لە هەردوو قاچەكانیمدا و، چۆكی داداو كەوتە سەر زەوی: ئینجا سەرم هەڵبڕی بۆ لای پێغەمبەر ﷺ چاوم پێكەوت بە جۆرێك پێدەكەنی كە ددانەكانی بەدەر كەوتبوون و فەرمووی: ئەی دایكی عەمار بە ڕاستی تۆڵەی خۆتكردەوە.

# بە گەلێکەوەدێم بۆلات ، ئارەزوی مردن دەکەن

# وجئتك بقوم يحبون الموت

خەلیفـەی یەکـەمی موسـڵمانان (ئەبوبـەکری صـدیق)ﷺ لـە دوای جـەنگی هەڵگـەڕاوەکان لـە (یەمامـە) (خالیـدی کـوڕی وەلیـد)ﷺ ی نـارد بـۆ (عێـراق) و نامەیەکی بۆ (هورمون)ی پێدا نارد، داوای لێکردبوو خۆی بەدەستەوە بدات و، ئیتر والسلام.

لە ناوەڕۆکی نامەکەدا هاتبوو: لە دوای سەلام، باوەڕبهێنەو موسڵمان ببە؟ سەر فیراز و ئاسودە دەبیت. یان پەیمان و بەڵێنی گیانی خۆت و گەلەکەت بکە بۆ پاراستنی سەر و گیان و ماڵ ، بەدان پێداهێنان بە هێندێك دیاریکردنی سەرانەی ماڵ، ئەگەر وانەکەی ئەوە هەرچیەکت بەسەر هات گلەیی و گازندە تەنها لەخۆت بکەو، کەس بەتاوان بار مەگرە، چونکە بەڕاستی گەلێکت بۆ لا دەهێنم هەروەك و چۆن ئارەزووی ژیان دەکەن، هەر بەهەمان شێوە مردنیان لە ڕێبازی خودا زۆر پێخۆش تربێت لەژیان، بەلام (هورمز) زۆر کەوتەخۆ هەڵکێشان و لە خۆبایی بوون و وەلامی نامەی خالیدی نەدایەوە، بە بیرو هەستی خۆی کەوتە پیلان و ساختە و، فێڵ کـردن، بۆخـۆش کردنـی مەیـدانی شـەڕ: پـیلان و ساختەچـیەتی لەدڵیـدا شـاردەوەو دەیویـست سـاختەکاریەکانی خـۆی بەنهێنی بەدیبهێنێ. بـەلام خالیـد بەهیچ جۆرێك وەلامی ساختەکاریەکانی هورموزی نەدایەوە. ئایا هۆی چی بوو خالیـد داوای موبـارەزەو بـەرەو ڕوبـوونی نـەکردەوە؟ بەدڵنیاییـەوە ئەگـەر خالیـد داوای بکردبا ئەوەتەواو شەڕو کوشتار ڕویدەداو ئەو هەموو خۆ بەگەورەزانی و خۆ هەڵکێشی و جوامێریەی لەدڵیدا نەدەشاردەوە و پەنهانی نەدەکرد: دەبوایە هێـزی سـوار چاکی و ئازایـەتی بەناپاکی و خیانـەت ئەنجامدرابایـە، ئەو کاتـەش هـەمو شتێك کۆتـایی پێدەهات و مـردن و لەناوچـونی خالیـدی پاڵـەوانیش زامـن و دەسـتەبەری کۆتـایی جـەنگ و یـەکلایی کردنـەوەی کێـشەی نـاکۆکی شـەڕ و نائارامیەو، بە پێچەوانەشەوە تێشکان و هەلاتن شایستە و دەستەبەری گونجاوە بۆتێکڕژان و بەرامبەری دوو سوپا. هورموز لە دوای ڕاوەستانی چەند چرکەیەك لە

نێوانی دوو سەركردە و جەنگاوەری فارس، بانگی كرد كوا خالید لە كوێیە؟ خالیدی كوڕی وەلید وەكو تیر لە ولاغەكەی دابەزی و لە لای هورمزیان ئامادەبوو، دوولێدانی كوشتێنەری دەست پێشخەری كردە سەر هورموزیانو، دوو سوارچاكی بەهێز دەورەی خالید یان گرت و خەریكبوون بیكوژن. بەلام لێدانی خالید پێشكەوتو تر و جەرگبرتر بوو كە گیانی هورموزی دەرهێنا، لە دوای چەند چركەیەك لەومەیانی وتو وێژەدا چەتەو جەندرمەكانی هورموز پەلاماری خالیدیان داو شەڕ گەرم بوو لە نێوانیان. بەلام بەهیچ جۆرێك توانای خۆڕاگرتنو هەڵمەت و پەلاماری پاڵەوانی جوامێر و بەجەرگ نەبوون و هەلاتن و پشتیان تێكرد: خالیدی پاڵەوانیشﷺ بەشیرو تیر ڕاوەشان بەدوایان كەوتوڕاوی دەنان هەتا بە تەواوی تەم و تاریكایی لابردو ڕەواندییەوە و سەركەوتن و سەرفیرازی هاتەدی.

## من لە پێناوی عومەر شەڕ ناكەم: إنی لا أقاتل لأجل عمر

(خالیدی كوڕی وەلید)ﷺبۆ بەجێهێنانی فەرمانی حەزرەتی (ئەبوبكر)ی ڕاستگۆ سەری دانەواند و چووە ژێرباری فەرمانەكەی، هەر چەند كە زۆر قورس و گرانبوو بۆ لە شكركێشی كردن بەرەو( شام) بە ئامادەبوونی(٤٠) چل هەزار جەنگاوەر بۆ بەربەرەكانی كردنی سوپای ڕۆم. حەزرەتی (خالید)ﷺ لە دوای ڕۆیشتنو گەیشتنە مەبەست لە گۆڕەپانو مەیدانی جەنگی(یرموك) هەموو سەركردەی سوپاو بەڕێوە بەرانی كۆكردەوە، وتارێكی زۆر پەسندو گونجاوی بۆ خوێندنەوە: كە ئەوەش بەشێكە لەناوەڕۆكی وتارەكەی: خۆشەویستان ئەمڕۆ ڕۆژێكە لەڕۆژەكانی خودا، پێویستی سەرشانی هەموو تاكە كەسێكمانە، كە خۆ بەگەورەزان و خۆهەڵكێش و لە خۆی بایی نەبێت و، زوڵم و ستەم بەكار نەهێنێ و، بە ئەمەك و دڵسۆزانە بجەنگێ و خودا لەخۆتان ڕازیبكەن، بەهۆی تێكۆشان و كردارتانەوە، چونكە ئەم ڕۆژە دوا ڕۆژی لە دوایە؟ لە وتەكانیدا زۆرشتی پەسندكراوی و ڕوژاند و، لەلایەن ئامادەبوانەوە پەسندكراو، پێشوازی لێكرا. ئینجا لە دوای ئەوە هەردووك سوپای ئیسلام و، ڕۆم بەیەكگەیشتن و سوار چاكو ئازایەكان پێشبڕكێ و هەڵمەت و

شالاویان دەبرد. بەو جۆرە ئاگری شەڕ گڕی سەندو تاویدا. لەو كاتی هێرش و شالاوی بەیەكدادانەدا، نوێنەرێك لەلای خەلیفەوە نامەیەكی شاراوەی لە جەنگاوەرانی پێ بوو مەبەستی گەیشتنبوو بە (خالید)ی سەركردە، جەنگاوەران زۆر مەبەستیان بوو بزانن ئەو نوێنەرە لەو كاتی تێكهەڵچونەدا خالیدی بۆ چییە؟ بۆیە زۆر پرسیاریان لێدەكرد ئەویش وەڵامی دەدانەوە كە تەنها چاكە و خۆش بەختیو ، سەركەوتنیانی دەوێت. ئینجا كاتێ بە خالید گەیشت نامەكەیدا بە دەستی خالید: حەزرەتی خالید سەیری كرد لە نامەكەدا نوسراوە: هەواڵ، هەواڵ، هەواڵ، زۆر خێرا و نهێنی، جێنشینی یەكەم (خلیفە) ئەبوبەكری صدیق كۆچی دوایی كرد: جێنشینایەتی فەرمانڕەوایی گواستراپەوە بۆ(عومەری كوڕی خەتاب)ﷺ ئەو فەرمانە تازەیەش لەلایەن خەلیفەی دووەم (عومەری كوڕی خەتاب)ﷺەوە دەر چووە بە گەیشتنی نامە، (خالیدی كوڕی وەلید)ﷺ لە سەركردەی سوپا نامێنێو، (ئەبو عوبەیدەی كوڕی جەڕاح)ﷺ دەبێتە فەرماندەی گشتی سوپا. ئینجا با سەیری دڵسۆزی و خوداپەرستی ئازا و بەئەمەك بكەین، كە ئایا چۆن هەڵسوكەوتو ڕەفتار دەكات؟ كە ئێمە بیری لێدەكەینەوە تەزومان پێدا دێت: بەڵام ئەو پاڵەوانە فەرمانڕەوایە كە سەیری بارودۆخەكەی دەكرد لەو كاتی گەرمی شەڕە و شالاو بردنە: بۆیە زۆر بە مەردی و ئازایی و، خۆنەویستی بەبێ هەڵچونو تووڕەیی، دەستپێشخەری نەكردو و نامەكەی شاردەوە و، باسی هیچی نەكرد نەك خودا نەخواستە ئەو هەواڵە ببێتە هۆی تێكشكانو دۆڕانی موسڵمانان. بۆیە بەردەوام بوو لە جەنگ و نەبەردیداو ، هەردەم هورەی سەربازانی بەرز دەكردەوە و، لە لاوازی و، تێشكان دووری دەخستنەوە، بەڕاستی خالید كارێكی ئەنجامدا لەگەڵ هاوڕێكانیدا، هەرگیز وێنەی نەبوو، لە دوای ئەو هەواڵە لە باتی شێرێك بە دوو شێر شەڕی دەكرد و دەجەنگا هەتا خودای گەورە سەركەوتنی بە دەستهێنا. ئینجا لە دوای سەركەوتن سەركردەی پاڵەوان (خالیدی كوڕی وەلید)ﷺ بەرەو لای (ئەبو عوبەیدەی كوڕی جەڕاح)ﷺ ڕۆیشت و سوپاس و ڕێزلێنانێكی دڵسۆزانە و فەرمانبەرداری سەربازانەی بەرامبەر بە ئەبو عوبەیدە

نواندو نامەی جێنشینی موسڵمانان (عومەری كوڕی خەتاب)ﷺی پێشكەش كردو، وەكو سەربازێكی دڵسۆز لە جەنگدا مایەوە لەژێر فەرمانی فەرمانڕەوای سوپای تازەدا بەبێ ئەوەی كە هیچ دوو دڵی و دڵساردیەك ڕوبدات. هێندێك لە ئادەمیزادەكان پێیانوت: ئەی خالید، عومەر ستەمی لە تۆ كردووە ئەتۆش بەو شێوەیە دڵسۆزی بەرانبەر مەنوێنە و كارەكانت بە دڵسۆزی و تەواوی ئەنجام مەدە: حەزرەتی خالیدﷺفەرمووی: براكانم من لەپێناوی عومەر شەڕ ناكەم بەڵكو لەپێناوی خودای عومەر شەڕ دەكەم بۆیە بەدڵسۆزی كارەكانم ڕادەپەڕێنم: ئینجا كاتێ ئەو هەواڵە بەڕاست و دروستی وەك و خۆی گەیشتە عومەر: ئەویش زۆر بە متمانەو دڵسۆزییەوە خالیدی گێڕایەوە سەر فەرماندەو لێپرسراوی سوپا و فەرمووی: خودای بە بەزەیی سۆزی خۆی بەسەر ئەبوبەكردا برێژێ بەڕاستی ئەو پیاوی لێهاتوو دڵسۆزی زۆر لەمن باشتر ناسیووە.

## ئەی پیاوەكان بۆكوێ دەڕۆن؟: أیها الرجال، أین تذهبون؟

كاتێ چەند پیاوێكی سوار چاكی سوپای ئیسلامی لە جەنگی (یرموك) دواكەوتن: كە لەناویاندا (ئەبوسوفیان) هەبوو، ڕۆیشتن بۆ لای ئافرەتانی موسڵمانان كە لە دوای ڕیزی پیاوانەوە بوون (هیند)ی هاوسەری ئەبوسوفیانیان لەناودا بوو.ئافرەتەكان وایان هەست كرد كە ئەو پیاوانە لە مەیدانی جەنگەوەڕایان كردووە: بۆیە بەدەنگێكی زۆر بەرزەوە هاواریان كردوو گوتیان: ئەی پیاوەكان بۆ كوێ دەڕۆن ئێوە هەڵدێن؟ خۆتان لە ڕیزی جەنگاوەرانی خودا دەشارنەوە: بە ڕاستی خودا چاودێرو ئاگادارە بەسەر هەموو كار و فەرمان و ڕوداوێك، بڕۆن بۆ لای سەربازە جەنگاوەرەكانتان و لە خودا بترسێن: هیندی هاوسەری ئەبوو سوفیان كە چاوی بە هاوسەرەكەی كەوت هەر خێرا كۆڵەگەو ستونی ڕەشماڵ و چادرەكەی دەرهێنا و پەلاماری هاوسەرەكەیدا و ستونەكەی بەسەری ولاغەكەیدادا وتی: ئەی كوڕی ناو دۆڵ و شاخ و بەردەلان بگەڕێوە بۆ ناو هاوڕێ و جەنگاوەرانت و شەڕ بكە و گیانی خۆت لە پێناوی ڕەزابوونی خودادا ببەخشە بۆ ئەوەی خودای بە بەزەیی ئەو خۆبەخت كردنەت بۆ بكاتە تاوان پۆشی

تاوانەکانی ڕابردوو پێشوت، یادی ئەو کاتانەی کە خەڵکانت لە دژی پێغەمبەر هاندەدا بکەوە، یارمەتی بێباوەڕانت دەدا بە دژی پێغەمبەر: ئینجا لەو کاتەدا ئەبوسوفیان وتەکانی هێند زۆر کاریگەر بوو بەلایەوە بۆیە: زۆر بەمەردانە سەری ولاغەکەی بەرەو مەیدانی جەنگ بادایەوەو گەڕایەوە ناو ئاپۆرەی جەنگاوەران و دەستی کرد بەشەڕ کردن و، بەڵاو ئازارێکی زۆری بەسەر دووژمناندا هێنا کە بەڕاستی شێوە و وێنەی زۆر کەمبوو.

## ئەگەر بڕۆیە ئەو پەڕی دنیاو بن هەوران لەدوات نابینەوە

## لوسرت إلى برك الغماد لسرنا

پێغەمبەری خوداﷺ لە پێشی تێکڕژانی جەنگی (بەدر) ڕاوێژی لەگەڵ هاوەڵە بەڕێزەکانیدا کرد لە بارەی ئەو جەنگەوە حەزرەتی( ئەبوبەکر)ﷺلەلایەنی خۆیەوە هەستایە سەرپێ و فەرمووی: زۆرباشە ئەی پێغەمبەری خودا ، هەرچی تۆ بفەرمووی: دوای ئەو (عومەر) ﷺهەستاو فەرمووی: زۆرباش و گونجاوە ئەی ڕەسولی خودا، دوای(میقدادی کوڕی عەمر)ﷺ هەستاو فەرمووی:ئەی پێغەمبەری خودا بڕۆ بە فەرمان و پشتیوانی خودا ئێمە لە دواتین و لەگەڵتداین: والله ئێمە وەك و گەل و نەوەی ئیسرائیلیان ناکەین کە بە پێغەمبەرەکە یان گوت: تۆ بڕۆ لەگەڵ خودایەکەت شەڕبکەو ئێمەش لێرە دادەنیشین: بەڵام ئێمە دەڵێین، ئەتۆ بڕۆ لەگەڵ خودایەکەت بجەنگەو، ئێمەش لەگەڵت داین، سوێند بەو کەسەی کە تۆی بەڕاست ناردوە ئەگەر بڕۆی بۆ ئەوپەڕی دونیاو بن هەوران ئێمە لەگەڵتداین و جیاواز نابینەوە، ئینجا پێغەمبەریﷺخوداودعاونزای خێری بۆکردن‌و، ڕووی کردە هەموو یارەکانی و فەرمووی: بڕۆن لەسەر خێر و بەرەکەت و پشتیوانی خودا. لەو کاتەشدا ئەو ئایەتە هاتەخوار کە خودا دەفەرموێ:{وَٱذۡكُرُوٓاْ إِذۡ أَنتُمۡ قَلِيلٞ مُّسۡتَضۡعَفُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ تَخَافُونَ أَن يَتَخَطَّفَكُمُ ٱلنَّاسُ فَـَٔاوَىٰكُمۡ وَأَيَّدَكُم بِنَصۡرِهِۦ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ }:الانفال/٢٦ . واتە: ئێوە بیری ئەو کاتە بکەنەوە کە کۆمەڵێکی کەمی لاوازی بێهێز بوون لەوە دەترسان کە خەڵك بتانگرن و

بتانكوژن: بەڵام خودای بە توانا شوێنی باش‌و دڵنیایی بۆدیاری كردن و، لەو شوێنە حەوانەوە و، بەهێزی كردن و بەسەر دووژمنانیدا سەریخستن‌و، ڕزق و ڕۆزی باش و پاكی پێدان. بۆ ئەوەی هەردەم شوكر و سوپاسی بكەن.

## ئازایی و پاڵەوانیەتی ئەبو دوجانە - بطولة أبی دجانة

لە دوای گەڕانەوە و كۆچی كۆتایی پێغەمبەریﷺ خودا بۆ لای پەروەردگاری مەزن: (ئەبودوجانە)ﷺ لەكاتی فەرمان ڕەوایی جێنشینی حەزرەتی (ئەبوبەكر)ی ڕاستگۆ: سەربازێكی فەرمانبەرداری گوێ لەمست، لە ناو سوپایەكی گەورەدا، ڕۆیشت بۆ بەرامبەری سوپایەكی گەورەی هەڵگەڕاوەكان. كە لە لایەن (موسەیلەمی) درۆزنی خۆ بە پێغەمبەرزان كۆكرابوونەوە. (ئەبودوجانە)ﷺ هەروەك و پەیمانی بە پێغەمبەر دابوو لە كاتی ژیان و دەسەڵاتی پێغەمبەر دا: دەجەنگا و شەڕی دەكرد، بەهەمانشێوەش لە دوای نەمانی پێغەمبەریشدا، ﷺ ئامادەباش و توانای شەڕی هەبوو دەیكرد و لە پەیمانەكەی خۆی پاشگەز نەبۆوە كە لە كاتی پێغەمبەردا بەستبووی: بۆیە لەگەڵ هەڵگەڕاوەكانیشدا لە(یەمامە) شەڕی دەكرد و دەجەنگا. بیری لەوە نەدەكردەوە كە لەسەردەمی پێغەمبەردا سەركردە و لێپرسرا و بووەو، ئێستاش سەربازێكی بچوكی ناو سوپایەكی گەورەیە. لە كاتێكدا كە موسڵمانان گیریان خواردبوو بە دەستی قەڵایەكەوە كە لە ناو باخێكدا بوو هەڵگەڕاوان شەڕیان تێدا دەكردو، هیچ ڕێگایەك نەبوو تێیدا بڕۆنە ناو قەڵایەكەوە. بۆیە ئەبودوجانە داوای لە هاوڕێیانی كرد كە پیلانێك پێكبهێنن‌و هەڵی بگرن‌و فڕێی بدەنە ناو قەڵایەكەوە بۆ ئەوەی لەودیوی قەڵایەكەوە بتوانێ خۆی بگەیەنێتە دەرگا و بیكاتەوە: بەڵام، هاوڕێیانی ئەو كارەیان زۆر بەكارێكی پڕ مەترسی و سەخت و گران باس كردو و زۆریش بە زەحمەت بوو چونكە فڕێدەدرێتە ناو ئاپۆرەی بێباوەڕان‌و بەتەنیا هیچی پێناكرێ. بەڵام ئەبودوجانە زۆر بەتوندی هاتە جۆش و لەسەر داوایەكەی زۆر سووربوو: بۆیە هاوڕێیانی هەڵیانگرت و لەناو جەنگەی شەڕدا فڕێیاندایە ناو قەڵایەكەوەو بەهۆی هەڵدانەكەوە قاچێكی شكا!!

بەڵام ئەو قاچشكانە كاری تێنەكردو و بەشیرەكەیەوە بە تەنها لەگەڵ هەڵگەڕاوان شەڕی دەكردو، بەشەڕكردنەوە بەرە و لای دەرگایەكەوە دەڕۆیشت هەتا گەیشتە لای دەرگا و كردیەوە. باوەڕدارانیش فرسەتیان وەرگرت و شاڵاویان بۆ لای دەرگا بردوو ڕۆیشتنە ژوورەوە و شەڕ زیاتر گەرمبوو :هەڵگەڕاوان كە بۆیان دەركەوت كە ئەبوودوجانە بووە مایەی هاتنە ژوورەوەی باوەڕداران و، قاچێكیشی شكاوە و تینی تێدا نەماوە و لە كاركەوتوەو، هەر لە مەیدانی شەڕیش ماوەتەوە. هەڵگەڕاوان هەڵمەتێكی گەلەكۆمیان لە هەموو لایەكەوە بردە سەر و شەهیدیان كرد. لە كۆتایشدا باوەڕداران سەركەوتن و ئازادیان بە دەستهێنا.

## بە پشتیوانی خودا ، ناگەڕێمەوەدواوە: لن تعود بإذن الله

(ئەبودوجانە)ﷺ یەكێك بوو لە وپاڵەوانە ئازایانەی كە لە جەنگی (بەدر)دا شوێنەواری دیار و بەرچاوی هەبوو: ئەو جەنگە لە ساڵی(٧)حەوتی كۆچی مانگی محرم بە سەركردایەتی وئامادەبوونی پێغەمبەری ﷺخودا بوو. (ئەبودوجانە) ﷺلە پێشەوەی جەنگاوەران دەهات و دەچوو شاڵاوی دەبرد، ئینجا بە هۆی ئەو نەبەردی و ئازایەتی و توانایی خۆی كەدەینواند و ڕەنگی دەدایەوە لەگەڵ هاوڕێ بەڕێزەكانیدا، كە بە ڕاستی قەڵای سەخت و زۆردارانیان دەردەهێنا، نەبەردی ئەمجاریان لە لای قەڵای (سموان) بوو كە ئاخر هیوایەتی جولەكە و گاورەكان بوو: كە دەیانزانی ئەو قەڵایەیان لە دەستبچێ ئاخر و كۆتایی و دوایی گاورەكانە، بۆیە ئەوانیش زۆر بە دڵسۆزانە ئامادەباشی خۆیان كردبوو شەڕیان دەكرد لەو قەڵایەدا، خۆبەختكار و، شەڕێكی بەهێز و بێوێنە ڕویدا. تەنانەت پێغەمبەر لە لای قەڵاكەوە بۆ خۆشی شەڕی دەكرد. جولەكەیەك بەناوی (عزولا) لەناو قەڵایەكە هاتەدەرو، هاواری دەكرد، بایەكێكی ئازام بۆ بێتە مەیدان و بەرامبەرم (حوبابی كوڕی مەنزەر) كە گوێی لێبوو بۆی ڕۆیشتە مەیدانو شیرێكی بۆ ڕاوەشاند نیوەی قوڵی پەڕاند. ئەمجار جولەكەیەكی تر لە ناو قەڵا هاتەدەر و، ئەویش داوای بەرامبەری كرد و، جەنگاوەرێكی موسڵمان بۆی ڕۆیشتە مەیدان: بەڵام، جولەكەكە موسڵمانەكەی شەهید كرد، دوایی ویستی بڕواتەوە بۆ ناو قەڵا: (ئەبودوجانە)ﷺ

بۆ لای ڕۆیشت و هاواری لێکرد و، گوتی: خودا حەز بکات ناهێڵم بەسەلامەتی بگەڕێیەوە؟ خێرا شیرێکی بۆ ڕاوەشاند و گوتی: بیگرە، بیگرە لە لایەن (ئەبودوجانە)ﷺ وە: بەو جۆرە ئەو بەڕێزە جولەکەکەی کوشت. ئینجا شەڕ بەردەوام بوو هەتا بەجۆرێك جولەکە و گاورەکانی قەڵای (سموان) ورەیان ڕوخاو توانای شەڕکردنیان نەماو (ئەبودوجانە) ڕۆیشتە ناو قەڵایەکە و دەستی بەسەردا گرت و، (ئەبو دوجانە)ش ﷺدروشم و ناونیشانی شەڕی بە (الله‌اكبر) لەگەڵ هاوڕێیانیدا دەگوتەوە.

## ئەگەر سزا دابەزیبا تەنها عومەر ڕزگاری دەبوو

## لو نزل العذاب لما نجا منه غير عمر

ڕۆژی بەدر (٧٠) حەفتا دیلیان هێنا بۆ لای پێغەمبەر کە یەکێك لەوانە (عباس)ی مامی پێغەمبەر و عەقیل)ی کوڕی ئەبی تالیبی تێدابووﷺ: پێغەمبەرﷺڕاوێژی لەگەڵ ئەبوبەکر و یارەکانی داکرد لەبارەی دیلەکانەوە چیان لێبکەن( ئەبوبەکر فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا خزم و کەسەکانت پێش بڕکێیان کردووە و، هیوادارم کە خودا تۆبە و پەشیمانیان لێوەر بگرێ. ئەتۆش قوربانی ڕزگاریانەیان لێوەربگرە، بەو هۆیەوە هاوڕێکانیشت بەهێزو تینتر دەبن. بەڵام، حەزرەتی (عومەر)ﷺ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا ئەوانە بەدرۆیان خستیەوەو لە نیشتمانی خۆت دەریان کردی :ئێستا تۆش بیانهێنە پێشەوە و لە مل و ئەستۆیان بدە چونکە ئەوانە گەل و نەتەوەی کوفرن و بێباوەڕن خودا لەو خزم و کەسانەی بێنیازکردووی: واعەلی لە شوێنی عەقیلەو، حەمزەش لە جێگەی عەباس، بالەملیان بدەین؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بە ڕاستی خودا دڵی هێندێك لە ئادەمیزادەکان نەرم دەکات، کە لە شیر نەرم تر بێت و، هێندێکیش لەبەرد ڕەق تریان دەکات: ئەی (ئەبوبکر) شێوەی نەرمی تۆوەكو (حەزرەتی ئیبراهیم)ەعليه السلام کەخودا لەسەر زوبانی ئەو دەفەرموێ: ﴿ رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ ۖ فَمَن تَبِعَنِى فَإِنَّهُۥ مِنِّى ۖ وَمَنْ عَصَانِى فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾:ابراهيم/٣٦ واتە: ئەی پەروەردگارم بەڕاستی ئەو

بتانەخەڵکانێکی زۆریان بەد بەختو گومڕاکردووە ئینجاهەرکەسێك بە شوێن مندابکەوێ‌ووازلەو بتانە بهێنێ، ئەوە شوێن کەوتەوپەیڕەوی منە.وە ئەو کەسانەش کەلێم دوور دەکەوێتەوەو یاخی دەبێت ئەوە خودایە بۆ خۆت لێخۆش بوو میهرەبانی.

وەشێوەی تۆش ئەی (عومەر)وەکو حەزرەتی نوح وایەکەخودا لەسەر زوبانی ئەو دەفەرموێ:وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى ٱلْأَرْضِ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ دَيَّارًا)نوح/٢٦واتە:حەزرەتی نوح ﷺنزاو دوعای لەکافرو بێ بڕوایان کردوو فەرمووی:

یاڕەبی ئەی پەروەردگارم تۆوی بێ باوەڕان لەم سەر زەمینەدا نەهێڵی، پێغەمبەری خودا ﷺلەو ڕاوێژ کردنەدا پێشنیارو بۆچونی حەزرەتی ئەبوبکر)ی پەسند کردو ، قوربانی ڕزگارکاری (فیدیە)ی لێوەرگرتن: بەڵام لەدواییدا خوداپشت گیری بۆچون‌وپێشنیارەکەی (عومەر)ی کردو ئایەتی ناردەخوارەوە فەرمووی: {مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلْءَاخِرَةَ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ}:الانفال/٦٧واتە: بۆ هیچ پێغەمبەرێك نەبووە لە کاتی کەم دەستی و بێهێزیدا دیل لەلای خۆی ڕابگرێ و بیهێڵێتەوە، هەتا بەتوانا و بە دەسەڵات دەبێت. ئایا ئێوە کەلوپەل‌و سەروەت‌و سامانی دونیاتان دەوێت؟ لە کاتێکدا کە خودا سەرفیرازی‌و خۆش بەختی دواڕۆژی لە ئێوە دەوێت. بەڕاستی خودا بە دەسەڵات‌و بەتوانا و دانایە.

لە دوای هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە حەزرەتی (عومەر) ﷺڕۆیشتەلای پێغەمبەری خوداو ئەبوبکر: کە سەیری کردن هەردووکیان دەگریان: حەزرەتی (عومەر) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا پێم بڵێ بۆچی دەگریەن؟ ئەگەر گریانم بێت منیش دەگریەم و، ئەگەر گریانم نەیات خۆم بەگریان دەهێنم: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی (عومەر) بۆ هاوڕێکانت بگریەلەسەر ئەوەی کەئێمە قوربانی و فیدیەمان لەدیلەکان وەرگرت: بەڕاستی سزاو ئازاری بچوك بۆمن نیشان دراوە بەهۆی ئەوتێك چون‌و جیاوازیانەی کەوتە نێوانمانەوە: ئەگەر سزا دابەزیبا کەسمان لەو سزایە ڕزگاری نەدەبوو تەنها تۆ نەبێ ئەی عومەر.

# خودایە لەگەڵ خاوەنی چارشێوکۆم بکەیتەوە

# اللهم احشرني مع صاحب النقب

(مەسلەمەی کوڕی عبدالله)ﷺ سەرکردەی ئازا و بەوەفا تەلار و سوپاشکێنی بێباوەڕان: جارێکیان بە سوپایەکی بەهێزەوە گەمارۆی تەلار و قەڵایەکی دوژمنانی لەوڵاتی سوریادا بوو: تیر ئەندازانێکی زۆری لە دەورەی ئەو تەلارە کۆ کردبۆوە و پیلانی ڕۆیشتنە ناو تەلارەکەیان دادەڕشت، بەڵام لەکونی تەلارەکانەوە کە بەسەر جەنگاوەرانیەوەی دەڕوانی، تیر ئەندازی باشیان لەدەورەی کونەکان کۆکردبۆوە موسڵمانانی جەنگاوەر نەیان دەتوانی هێرش بکەنە سەر تەلارەکەو، لێی نزیك بکەونەوە. بەڵام لەپڕێکدا، کابرایەکی لاوازی باریکی ڕوخساردا پۆشراو، بەغارهات و لە وڵاغەکەی دابەزیو، بەرەولای دەرگای تەلارەکە ڕۆیشتو، هیچ گوێی بەتیر و ڕمب نەداو، خۆی گەیاندە دەرگاکە و ڕۆیشتە ژوری تەلارەکە و دەرگای تەلاری کردەوە و موسڵمانان هێرشیان بۆکردوو، ڕۆیشتنە ناو تەلار و ئازادیان کرد. لە دوای ئازادکردنیو، کۆتایی شەڕ (مەسلەمە )ﷺداوای ئەو کەسەی کرد کە بە چوار شێوێکەوە زۆر بە ئازاییو مەردانە ڕۆیشتە ناو تەلارەکەو، بووە هۆی ڕزگاری و سەرکەوتنی موسڵمانان. بەڵام هیچ کەس بەدەنگی بانگەوازەکەیەوە نەچوو: بۆیە (مەسلەمە)ﷺکەوتە هەڕەشە و گەڤ لێکردن و پەیماندان، کەدەبێ ئەو کابرایە هەر بێت بەهەر نرخێك بێت: ئینجا پیاوێك لە کاتێکی نادیار بەرە و لای ڕەشماڵی پێشەوا و سەرکردە ڕۆیشتو، گوتی: بەڕێزم من خاوەنی ئەو پێشەنگ و سەرهەنگە دەزانم کێیە؟ وە دەتوانم پێت بڵێم! بەڵام ، بەچەند مەرج.

پێشەوا فەرمووی: ئەومەرجانە چین ؟

کابرا گوتی: داوای ناوەکەیم لێنەکەی.

وە نابێ ناوی لە دیوانی سەرکردایەتیدا تۆمار بکەی.

وەنابێ بە هیچ جۆر دیاری و پاداشتی بۆ دیاری بکەی.

سەرکردەش بەڵێن و پەیمانی پێدا کەڕازیە بە مەرجەکان.

ئەمجار کابرا گوتی: ئەوکەسە من بووم.! لەدوای ئەوە کابرا هەستاوبن ڕەشماڵەکەی بە جێهێشت و ڕۆیشتە دەرەوە. فەرمان بەری سەرکردەش لەبەر بێ ئەزموونی و نەزانی سەربازەکە سەری سوڕما. لە دوای ئەوە (مەسلەمە) لەدوای هەموو نزاو پاڕانەوەیەکی دەیگوت: (اللهم احشرني مع صاحب النقب) واتە: خودایە لەگەڵ خاوەنی چاوپۆشدا کۆمبکەیەوە.

## کەسێك بەڕاستی خودابناسێ، خوداش بەڕاستی دەیناسێ
## من صدق الله صد قه

(مەسعەبی کوڕی عەمیر)ﷺهەڵگری ئالای ئیسلام لە ڕۆژی (ئوحود)دا کاتێ موسڵمانان گەیشتن‌و ئامادەبوون، (مەسعەب)ی خۆڕاگرو چەسپاوئامادەبوو.بەلام لەکاتی شەڕو پێکداداندا (کوڕی قەمیئە)ی گەنجێکی بێباوەڕی فارسەکان بوو ڕووی کردە (موسعەب)و شیرێکی لەدەستی ڕاستیداو، تەواو پێکاو، هاواری کردو و گوتی:( وما محمد إلارسول قد خلت من قبله الرسول) نەیهێشت ئالاکە بکەوێتە سەر زەوی هەر خێرا زۆر بە دڵسۆزانە بە دەستی چەپی بەرزی کردەوە. (قەمیئە)ی بێباوەڕ لەولێدانەیدافرسەتی لێدیتەوەو، دووبارە هێرشی کردەوە سەر و لە دەستی چەپە شیداو ئەویشی پێکا. ئەو پیاوە بەرزو بەڕێزو دڵسۆزی ئیسلامە نەی هێشت ئالای ئیسلام بێناز بکەوێ‌و بێڕێزی پێبکرێ، بۆیە هەر خێرا بە هەردوو قۆڵە بڕاوەکەیەوە ئالایەکەی بە سنگیەوە توند نوساند و لە باوەشی گرت و دەیفەرموو: (ومامحمد إلا رسول قد خلت من قبله الرسول) ئینجا ئەو (قەمیئە) کەزانی مەسعەب دەستەکانی لە کارکەوتوەو هیچ هێزیان تێدا نەماوە بۆ سێهەم جار: هێرشی کردەوە سەرو، شیرێکی تری لێداو بە تەواوی جەستەی پێکاو کەوتە سەر زەوی‌و، گیانی لەدەست داو، ئالایەکەش بەبێ ناز کەوتەسەر زەوی. (خەبابی کوڕی ئەڕەت) دەفەرموێ: هیچ شتێك نەبوو بکرێ بە پۆشاك و کفنی تەنها پارچە کالایەکی وێنەڕەش و سپی نەبێت: لەبەر بچوکی کە بەسەریماندا ئەدا

قاچەکانی بەدەر دەکەوتو، ئەگەر بەقاچیمان دائەدا سەری بە دەردەکەوت، هەتا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: لای سەری پێدا بپۆشن‌و قاچەکانیشی بە ڕووەکێك کەناوی (ئەزخەر)ە بۆنێکی خۆشی لێدێت، دای بپۆشن. لە دواییدا پێغەمبەری خوداﷺ لەسەر لاشەکەی (موسعەب) ڕاوەستاو باسی چاکخوازی و بێگوناهی و پاکی موسعەبی کردو فەرمووی: بەڕاستی ژیان و زیندەگی بەباشی و، وەفاو پەیمانی تەواو، بەڕێز بردە سەرو فەرمووی: {مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَـٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ ۖ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُۥ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ ۖ وَمَا بَدَّلُوا۟ تَبْدِيلًا}الاحزاب/٢٣ واتە: لە موسڵمانان پیاوی وا بەڕێزو ئازا هەیە ئەو پەیمانەی کە لەگەڵ خوادا بەستویەتی بەڕاست و ڕەوان پابەندی پەیمانەکەی بوو، لێی لانەداو بەڕاستی بردیە سەر لەسەر پەیمانەکەی مرد. وەهەشیانە چاوەڕوانی بەجێگەیاندنی پەیمانەکەی دەکات و، هەرگیز گۆڕان و لادان ڕووی تێ ناکا.

ئینجا لە دوای ئەو پێغەمبەرﷺ ڕووی لە خەڵکەکە کردو فەرمووی: خۆشەویستان ئێوە سەردانی ئەو بەڕێزانە بکەن و بڕۆنە لایان‌و سەلامیان پێبگەیەنن. سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە هەر لە ئێستاوە هەتا ڕۆژی دوایی هەر موسڵمانێك بڕواتە سەر گۆڕەکەیان و سەلامیان لێبکات ئەوان وەڵامیان دەدەنەوە .

## منداڵ و خانەوادەکەتم بە بارمتە لەلا دابنێن

## أرهنوني أبنائكم

یەکێك لەو دەم پیس‌و جنێوفرۆشانەی کە زۆر ئازاری پێغەمەریان دەدا (کەعبی کوڕی ئەشرەف) بوو: تەنانەت قوڕەیشیەکانیش لەسەر ئەو دەم پیسیەو دەم شڕیەی زۆر سەر زەنشتیان دەکرد بەڵام، بێسود بوو: پێغەمبەرﷺ بەهاوڕێکانی فەرموو: کێتان دەتوانن دەمکوتی ئەوکەعبی کوڕی ئەشرەفە بکەن، کەبەڕاستی بە جنێوە دەمشڕیەکانی بە خوداو پێغەمبەری خودا، زۆرم ئازار پێدەگەیەنێ: (محمدی کوڕی مەسلەمە)ﷺی ئەنساری گوتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ ئەو ڕێزو گەورەییەی بە من ببەخشە و، ئەگەر ئارەزو مەیلت لێیە دەیکوژم؟

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: پێم خۆشە بیکوژە.دواییی محمد گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا ڕێگەم پێدەدەی قسەیەكی لەگەڵدا بكەم: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی محمد بڕۆ چیت هەیە بیڵێ. ئەمجار لە دواییدا (محمدی كوڕی مەسلەمە) ﷺ و، چەند كەسێكیش لە ئەنسار، كەیەكیان باوكی (نائیلە)ی برای شیری (كەعبی كوڕی ئەشرەف) بوو، (محمدی كوڕی مەسلەمە) گوتی: ئەی كەعب ئەو پیاوە كە مەبەستی پێغەمبەر بوو داوای خێر و سەدەقەیەكی زۆری لیكردووین و، ئێمەش پێمان هەڵناستێ و. توانامان نییە بیدەین؟ بۆیە هاتووینە لای بەڕێزت كەشتێكمان پێبدەی، (كەعب)گوتی: بەخودا منیش ئەوەم بەئاوات دەخواست. (محمدی كوڕی مەسلەمە) گوتی:ئەی كەعب ئێمە شوێنی پێغەمبەر كەوتین و، ئێستاش حەز ناكەین لەو نیوە ڕێگایە وازی لێبهێنین، هەتا بە تەواوی مەبەستیمان بۆ دەردەكەوێ و، بزانین بەرەوكوێمان دەباو، بەچی دەگەین: ئیستاش ئێمە بۆ ئەو داواكارییەی محمد پێویستیمان بەبارێك ، یان دووبار، خورما هەیە كە بۆی ببەین. كەعب گوتی: لە بارمتەی ئەوەی كەمن دەتان دەمێ شتێكم لەلا دابنێن: ئەوانیش گوتیان: ئێمە بۆیە هاتوینە لات كە هیچمان نیە چیت لەلا دابنێین؟ كەعب گوتی: هاوسەرو خێزانەكانتانم لە لا دابنێن؟ گوتیان:ئەی كەعب تۆ جوان ترین گەنج و لاوی ناو هۆزی عەرەبی، چۆن ڕەوایە هاوسەرەكانمان دابنێین شتی وانابێ؟ كەعب گوتی:مادام منداڵ و كوڕەكانتانم لەلا بەبارمتەدابنێن؟ گوتیان: كەعب ئەوەش شتێكی ناڕەواو نەگونجاوە نابێت؟ دوایی گوتیان: چەك و سیلاحەكانمان بەبارمتە دادەنێین: كەعب ئەمجارڕازی بوو: (محمدی كوڕی مەسلەمە)ﷺ بەڵێنیدا كە شەو بەجێی بهێنێ و ، چەكەكان بەدەستی كەعب بگەیەنێ: بۆ شەو محمد و هاوڕێكانی ڕۆیشتنەوە ماڵی كەعب و، بانگیان كرد بۆ دەرەوە: هاوسەرەكەی گوتی: كەعب بەو ناوەختە بۆ كوێ دەڕۆی ؟ كەعب گوتی: لەگەڵ باوكی نائیلەی برام و، محمدی كوڕی مەسلەمە كارێكم هەیەو دەردەچم: محمدی كوڕی مەسلەمە ئامادەباشی خۆی كردوو بە هاوڕێكانی گوت: كاتێ كەعب گەیشتە لامان، من توكی سەری دەگرم و، بۆنی پێوەدەكەم و ئێوەش لەلای پشتی ملی بدەن و بیكوژن: بەو جۆرە پیلانەكەیان سەری گرت و، كەعبیان كوشت و، پێغەمبەریان لە ئازاری كەعب ڕزگار كرد.

# پێش برکێیان دەکردبۆ شەهیدی
# تنافس في الشهادة

**باوك و كوڕ، تیروپشكیان دەكرد بۆ ڕۆیشتنی بەرەكانی جەنگ (سەعد) ﷺ لەگەڵ (خەیسەمە) ﷺی باوكی كە پێویست بوو تەنها یەكیان بڕوا بۆ بەرەكانی جەنگی (بەدر) هەریەك لەو باوك‌وكوڕە، دەیوت من دەڕۆم بۆ بەربەرەكانی جەنگ، بۆیە ڕێكنەكەوتن گوتیان: دەبێ تیرو پشك بكەین بزانین كامەمان دەڕوات:لەدوای تیرو پشك كوڕەكەی دەرچو بڕواتە مەیدانی جەنگ. باوكەكەی (خەیسەمە) زۆر داوای لە كوڕەكەی كرد: كە ڕێگای پێبدات لەمافی خۆی دابەزێت‌و، نەڕوات‌و باوكی لە جێگەی ئەو بڕوات. بەڵام كوڕەكەی پێیگوت: ئەی بابە بەخودا هەر شتێكت دەوێت ئامادەم بە گوێرەی حەزی خۆت لەگەڵت بكەم، بەڵام بەخودا بابە ئەوە شەڕەو ئامانجەكەی بەدەست كەوتنی بەهە شتە، بە هیچ جۆرێ من لەو كارە دەستبەرداری نابم‌و ڕازی نابم. لەدوای ڕۆیشتنی سەعد بۆ بەر بەرەكانی جەنگ لە دوای هەڵگیرسانی شەڕو، مەردانە جەنگان، سەعد لەوجەنگی (بەدر)ە شەهید بوو. ئینجا بۆ ساڵی داهاتو جەنگی (ئوحود) هاتە پێشەوە و (خەیسەمە)ﷺ هەر كە هەواڵەكەی بیست، ڕۆیشتە لای پێغەمبەر و گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا، بەخودا ئەم شەو لە خەونمدا چاوم بە سەعدی كوڕم كەوت، زۆر بەجوانی‌و دڵخۆشیەوە لەناو نازو نیعمەتی بەهەشت دابوو.پێی گوتم:ئەی بابە بەڕاستی ئەو پەیمان و بەڵێنەی كەخودا پێیدابووم كەیشتمێیەو پێی بەخشیم. ئەتۆش خێراكەو وەرە با لەو شوێنە خۆشە پێكەوە هاوڕێ بین. ئینجا ئەی پێغەمبەری ﷺخودا من واهاتوم بۆلای بەڕێزت، بەخوا تامەزرۆی شەهیدیەو، ئاواتە خوازم بەدیدەنی كوڕەكەم و، گەیشتن بەدیداری پەر وەردگاری مەزن دەكەم.داوام بۆ بكە كە خودا شەهیدی بكاتە هیوا و بەشم: پێغە مبەریش دوعای بۆ كردو ڕۆیشتە ناو مەیدانی جەنگی ئوحودەوەو، لە دوای شەڕێكی شێرانە شەهیدبوو.**

## لە پێناوی خودا برامە، نا لە پێناوی بێباوەڕی
## إنه أخي في الله ولا أخوة في كفر

باوكی عزیز یەكێك بوو لەهاوبەش پەیداكەرانی قورەیش، لەگەڵ بێباوەڕانی قورەیش هاتبوە مەیدانی جەنگی (بەدر)بۆ شەڕكردن لەگەڵ پێغەمبەرو یارانی: برایەكی بەناوی (موسعەبی كوڕی عەمیر)لەناو سوپای موسڵماناندا بوو هەڵگری ئاڵای موسڵمانان بوو: بەپێچەوانەی ئەویش باوكی عزیز ئەو ڕۆژە لەو جەنگەدا هەڵگری ئاڵای بێباوەڕی بوو: ئینجا لەو جەنگەدا بەدیل گیرا، كاتێ موسعەب چاوی پێكەوت بەو كەسەی كە بەدیلگرتبوی پێیگوت: هەر بە ئاڵایەكەی خۆی دەستی ببەستەوە، بەڕاستی ئەوەدایكی خاوەنی سەروەت و سامانی زۆرە، باوكی عزیز گوتی:ئەی براكەم توخودا ئەوەیە پاداشتی برایەكەت؟ موسعەبیش دەفەرموێ: ئەو كەسە برامە كە بۆ خودا بگونجێو بڕوادار بێت. دەنا هیچ برایەكم لە كوفرو بێباوەڕیدا نیە؟ لەدواییدا دایكی عەزیز بۆ ئازاد كردنی كوڕەكەی (٤٠٠٠) چوار هەزار درهەمی بەخشی، كە ئەوەش زۆرترینی بەخشیش بوو لەناو دیلەكانی بەدردا.

## پێش بڕكێ لە پێناو خودا نەوەك لەبەرماڵ
## التنافس باالله وليس بالمال

پێغەمبەری ﷺخودا (ئەبا عوبەیدەی كوڕی جەڕاح)ﷺی ڕەوانەی وڵاتی بەحرەینی كرد: بۆ ئەوەی باجو سەرانەی ئەو وڵاتە بهێنێتەوە: لە گەڕانەوەیدا سەروەتو سامانێكی زۆری هێنایەوە، كاتێ كۆمەڵی ئەنصار هەواڵی گەڕانەوەی ئەبا عوبەیدەیان زانی كە بە ماڵێكی زۆرەوە گەڕاوەتەوە و، تەنانەت نوێژی بەیانیشی لەگەڵ پێغەمبەرﷺ بە ئەنجام گەیاندووە: كاتێ پێغەمبەرﷺلە نوێژی بەیانی گەڕایەوە بەرە و ماڵ سەیری كرد كۆمەڵی ئەنصار هەموویان لەنزیكی ماڵی پێغەمبەر كۆبوونەوە. پێغەمبەر كە چاوی پێیانكەوت فەرموی: دیارە زانیوتانە كە (ئەبا عوبەیدە)بە باجو دەست كەوتێكی باشەوە گەڕاوەتەوە ئەوانیش گوتیان: بەڵێ زانیومانە، ئینجا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: خۆشیو شادمانی بۆ ئەو هیواو ئارەزوانەی كە هەتانە، بەڕێزان سیوێند بەخودا من لە هەژاری و نەداریتان

ناترسێم: بەڵکو لەوە لێتان دەترسێم کە نیعمەت و خۆشی ژیان بەسەرتاندا بڕژێ و، وەك‌و پێشینانی ئێوە کە نیعمەت و خۆشیان بەسەردا ڕژا بەو هۆیەوە هەموویان گۆڕان‌و، هیواو ئاواتیان بووە پێشبڕکێی پەیدا کردنی سەروەت و زۆرکردنی سامانی دونیاو، پێشێل کاری فەرمانەکانی خودایان کردو، بەو هۆیەشەوە بەرەو نەمان‌و لەناو چوون؟ بۆیە لەبەر ئەو هۆیانە دەترسێم کە ئێوەش وەکو ئەوان بفەوتێن‌و لەناو بچن.

## باوکی خەیسەمەو تێکۆشان و شەڕی - أبو خيثمة وجهاده

لەکاتی خۆئامادەبون و ڕۆیشتن بۆجەنگی (تەبوك) پیاوێك بەناوی (باوکی خەیسەمە) بۆ ڕۆیشتن لەگەڵ پێغەمبەرو ﷺ یارانی بۆ مەیدانی جەنگ دواکەوت: ئەو کابرایە لەو ڕۆژە گەرماو بەتینەدا گەڕایەوە بۆ ماڵەوە بۆ لای دوو هاوسەرە بەڕێزەکەی کە لەناو باخێکی پڕ لە جۆرەها میوەی جۆرا و جۆرو نایاب، دوو کەپری بۆ هاوسەرەکانی کرد بوو، کە بەڕاستی دڵ حەیرانی فێنکی‌و خۆشیەکەی دەبوو: دەورەی کە پرەکانی ئاو پرژێن کرابوون و. خێزانەکانیشی خۆیان ئاڵ‌و والاو ڕازاندبۆوەو، خواردنی خۆش‌و بەلەزەتیان ئامادە کردبوو، چاوەڕێی هاوسەرەکەیان دەکرد بێتەوەو، پێشوازی لێبکەن، کاتێ (باوکی خەیسەمە) گەیشتە ماڵەوەو، پێشوازیان لێکردو، خەیسەمە هەموو ناخۆشی گەرماو، ئازاری دڵی لەبیر چۆوە: بەلام دوایی (باوکی خەیسەمە) بیری پێغەمبەرو هاوڕێیانی کردەوەو گوتی: چۆن من لەناو ئەو هەموو نازو نیعمەت و خۆشی و، ئاوی سازگارو، فێنکیەدا بگوزەرێنم و، پێغەمبەری خوداش لەناو گەرمی و ناخۆشی و هیلاکیدا بێ: بۆیە باوکی خەیسەمە ﷺسوێندی خوارد کەمن نابێ بێمە ژێر ئەو کەپرە دڵ فرێن‌و، ئاوە سازگارو ساردەو، لەلای ئەو هاوسەرە جوان‌و شۆخ‌و شەنگانەم، ژیان نابەمەسەر، بەخوا دەبێ منیش بڕۆم، ئەو ڕێگا دوور و سەخت‌و گەرمیە ببڕم هەتا دەگەمە خزمەتی پێغەمبەر: هەر خێرا خواردن‌و تفاقیان بۆ ئامادە کردوو، شیر و تیری لەخۆی بەست‌و، سواری حوشترەکەی بوو کەوتە ڕێگا، هەتا لە (تەبوك) بە پێغەمبەر و یارانی گەیشت .

## ئەی پەروەردگارم بەڕاستی من ئێوارەلێی قایل‌وڕازی بووم
## اللهم إنی أمسیت راضیا عنه

(عبدالله ی کوڕی مەسعود)ﷺ دەفەرموێ: لەگەڵ پێغەمبەری خودا بۆ (تبوك) دەر چوین و ڕۆیشتین. لەدوای گەیشتنمان بۆ (تبوك) شەوێك لەنیوەی شەو هەستام چاوم بەگڕو بڵێسەی ئاگر لە کەنارێکی سوپاوە کەوت: منیش خێرا بەرەو لای ئاگرەکە ڕۆیشتم بزانم چییە؟ بەڵام کەڕۆیشتم‌و نزیك بوومەوە سەیرم کرد پێغەمبەرو، ئەبوبکرو، عومەر، زۆر لەپێشی مندا گەیشتبوونە لای ئاگرەکەو کۆنترۆڵیان کردبوو. ئەوەش هاوەڵێکی پێغەمبەر(عبداللەی زول بجادەین) مردبوو، گۆڕیان بۆ هەڵ کەندبوو، پێغەمبەر لەناو گۆڕەکەیدابوو ئەبوبکرو عومەریش تەرمەکەیان شۆڕ دەکردەوە، پێغەمبەرﷺ دەیفەرموو: براکەتانم بۆ شۆڕ بکەنەوە، ئەوانیش تەرمەکەیان بۆ لای پیغەمبەرﷺ شۆڕ دەکردەوە بۆ ناو گۆڕەکەی، کاتێ گەیشتە جێگەی گڵکۆو ئارامگایەکەی، پێغەمبەر فەرمووی: ئەی پەروەردگارم: بەڕاستی من ئێوارە لێی ڕازی‌و دڵنیابووم، ئەتۆش خودایە لێی قایل‌و ڕازی بە. لەو کاتەدا (عبدالله ی کوڕی مەسعود)ﷺفەرمووی: خۆزگا ئەمن خاوەنی ئەوگۆڕو ئارامگایە بومایە .

## پاڵەوانیەتی ئەسمائی کچی ئەبوبکر
## بطولة أسماء بنت أبی بکر

کاتێ کە پێغەمبەرو ﷺئەبوبکر ﷺ:ویستیان کۆچ بکەن بۆ مەدینە: چەند کەسێك لە قوڕەیشیەکان ئەبو جەهلیشیان لەگەڵدا بوو، لەبەردەرگای ماڵی ئەبوبکر ڕاوەستا بوون. ئەوکاتە (ئەسمای کچی ئەبوبکر) تەمەنی(٧)حەوت ساڵانەبوو ڕۆیشتە دەرێ بۆلایان، پرسیاریان لێکرد گوتیان: کچێ باوکت لەکوێیە؟ ئەویش لە وەڵامیاندا گوتی: من نازانم، ئەبو جەهلی ناپەسند شەقازلەیەکی لێداو گوارەی گوێچکەی پچڕاندو، گوێی بەخوێن هێنا. ئەبوبکر هەرچی سەروەت و سامانی هەیبوو (٥٠٠٠) پێنج هەزار درهەم بوو، هەمووی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتبوو

بردبووی، ئەبو قوحافەی باوکی ئەبوبکر پیاوێکی کوێروبێباوەڕ بوو، گوتی: بەخودا هەرچەند کە بۆ خۆم هیچ نابینم، بەڵام وادیارە ئەبوبکر بەهۆی ڕۆیشتنی خۆیو بردنی سامانو ماڵەکەی غەمو پەژارەی زۆری بۆئێوە بەجێ هێشتووە، بەڵام ئەسمائە بەو بچوکیەی وەڵامی دایەوەو گوتی: ئەی بابەگەورە، باوکم خێرو چاکەیەکی زۆری بۆ ئێمە بەجێهێشتوە، هەستا کۆمەڵێك بەردو چەوی لەناو دەلاقەیەك دانا لەو شوێنەی کەباوکی شتی لێدادەنا دوایی بەرگ و قوماشێکی بەسەردا داو، دەستی باوکە گەورەی گرتو بردیە لای دەلاقەکەو گوتی: بابەگەورە دەست لەسەر ئەوانە دابنێ، ئەوە هەمووی پارەیە، باوکم بۆی بەجێهێشتووین، ئینجا ئەبو قوحافە گوتی: مادام شتی بۆ بەجێ هێشتونو، ڕۆیشتووە قەیدی نیە کەیفی خۆیەتی، لەڕاستیدا هیچی بەجێ نەهێشتبوو ئەبوبکر، بەڵام ئەوکچە زیرەكو بەتوانایە دەیزانی باپیری زۆر پیرو بێتوانایە و، بێهێزە زۆرغەمبارو بێئارام دەبێ بەوەی کە کوڕەکەی هیچی بەجێ نەهێشتوە، بۆیە بابە گەورەی پێهەڵخەڵەتاند هەتاکو ئاسودە و دڵئارامبێت .

## جەنگو تێکۆشان بەو جۆرە دەبێت: هکذا کان الجهاد

باوکی (ڕافیعی کوڕی ئەبوحەقیق)ی جولەکە خاوەنی تەلار و قەڵای بە هێز بوو لە خاکیی (حیجاز)دا سەنگین و دەوڵەمەند بوو، بەڵام ئادەمیزادێکی شەڕەنگێزو ئاژاوە گێڕ، هەردەم خەریکی پیلانو ئاژاوەو ئازاردانی پێغەمبەر بوو: وە هاوکاریو کۆمەکی هەموو ئەو کەسانەشی دەکرد کە ئازاری پێغەمبەریان دەدا. پێغەمبەریش ﷺکۆمەڵێك لەپیاوانی ئەنساری ئامادەکرد، کە بڕۆنە سەری، یەکێك لەوانە (عبداللەی کوڕی عتیك)ﷺبوو.خۆیان ڕێك خستو ڕۆیشتن، هەتا لە تەلارەکەی نزیکبوونەوە: (عبداللە) گوتی: ئێوە لێرە لە شوێنێك دابنیشنو خۆتان مەڵاس بدەن، من دەڕۆم هەواڵو خەبەری تەواو وەردەگرم بزانم چی هەیە؟ (عبداللە) ﷺ دەڵێ: زۆر بەنەرمیو لەسەرە خۆیی ڕۆیشتم، لەدوورەوە سەیرم دەکرد کە چۆن بڕۆمە ناوتەلارەکەو، لە کوێوە دەرفەت دەبێت:سەیرم کرد

ئاژەڵێکیان لەبەر دەست ڕای کرد، زۆر لە دانیشتوانی تەلارەکە بەدوای کەوتن بۆ گرتنەوەی، منیش خۆم وا لێکرد کەوا هەستبکەن بەدوای شتێکی زۆر پێویست دەگەڕێم، لەوکاتەدا دەرگاوان هاواری کردو گوتی: هەرکەسێ دەیەوێ بڕواتەوە ناو تەلارەکە دەنا دەرگاکە دادەخەم: منیش زۆر بەغافڵ گیری ڕۆیشتمە ژورەوەو، لەلای شوێنی ولاغەکان کە لە دەرگاوە نزیکبوو خۆم شار دەوە، شەو ئاگام لێبوو جولەکەکان لەدەورەی باوکی(ڕافع) کۆبوونەوەو، وت‌و وێژو قسەیان دەکرد، هەتا درەنگی شەو، دوایی هەریەك لەو جولەکانە گەڕانەوە شوێنی خانەو ماڵی خۆیان: لەدوای ئەوەی کە ماتەمو بێدەنگی بەسەر وەختەکە داهات‌و، جمو جۆڵ نەما. لەشوێنی حەشارگەکەم هاتمە دەرو، ئاگام لێبوو دەرگاوان کلیلی دەرگای تەلارەکەی لە کوێدانا، زۆر بە بێ هەست ڕۆیشتمە شوێنەکە و کلیلەکەم دەرهێناو، دەرگای تەلارەکەم کردەوەو، زۆر بەبێ هەستی ڕۆیشتم لەدیوی دەرەوەیان، دەرگای خانوەکانم داخست لەسەریان ، دوایی بەپەیژەو پێپلکەکاندا سەرکەوتم‌و، ڕۆیشتم بۆلای (باوکی ڕافع) بەلام، لەبەر تاریکی‌و شەوە زەنگی هیچم نەدەدیت، بۆیە هاوارم کرد گوتم: ئەی (باوکی ڕافع) ئەویش وەلامی دامەوەو منیش هەر بەو تاریکیە شیرێکم بۆ لای دەنگەکەی ڕاماڵ کرد بەلام، بەداخەوە نەی گرت، ئەمجار پیلانێکی ترم بەکارهێنادەنگی خۆم گۆڕی، وەکو ئەوەکە یارمەتی بدەم، گوتم: (باوکی ڕافع) ئەوەچی ڕوویداوە؟ پێم بلێ، لەدوای قسەکردنی، دووبارە شیرێکی ترم ڕەوانەی لای دەنگەکە کردەوە بەلام، هەر بێسود بوو، (باوکی رافع) وتی:کوڕە ئەوە تۆ خەجاڵت نابی، وا خەریکە دەم کوژن‌و، تۆش هیچ دەنگ ناکەی؟ ئەمجار هاواری کردوو هاوسەرەکەی هەستاند، ئەگەر لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەرﷺ نەبوایە کەنابێ ئافرەت بکوژن دەمکوشت، بەلام خێرا شیرێکی ترم ئاڕاستەی (باوکی ڕافع) کردولێم داو کوشتم، ئینجا زۆر بەسەرسامیەوە ڕۆیشتمەدەر تاگەیشتمە سەر پێپیلکەکان‌و، ویستم بڕۆمە خوار، کەوتم‌و قاچم شکاو، بە هەرچونێك بێت، بەشەلەشەل ڕۆیشتم‌و، گەیشتمەوە ناو هاوەڵەکانم‌و، گوتم: بڕۆن هەواڵی مزگێنی کوشتنی (باوکی ڕافع) بە پێغەمبەرﷺ بگەیەنن، ئەمنیش لێرەوە

دەمێنمەوە هەتا هەواڵی کوشتنی (باوکی ڕافع) لەناو تەلارەکەوە ڕادەگەیەندرێ، ئینجا هەر لەگەڵ سپێدەی بەیان، دەنگی نەمانو مردنی(باوکی ڕافع )بەرز بۆوەو، گوتیان: (باوکی ڕافع )گەورە بازرگانی وڵاتی حیجاز کۆچی دوایی کردووە: (عبدالله) دەفەرموێ : سوێند بەخودا کە گوێم لە دەنگی بڵاوبونەوەی مردنی بوو، هەستامو ڕۆیشتم، لەخۆشیان هەرگیز هەستم بە ئازاری قاچم نەکردو، گەیشتمەوە لای هاوڕێکانم ، پێشی هاتنی پێغەمبەر هەواڵی تەواوم بە هاوڕێیانم گەیاند.

## ئازایی و نە بەردی پێغەمبەر لەجەنگ دا

## شجاعة الرسول فی الحرب

ڕەوشتی ئازایی پێغەمبەرﷺ وەها بوو: هەرگیز لەکاتی شەڕو جەنگدا ئاوڕی بۆ دواوە نەدەدایەوە: چونکە ئەو ئاوڕدانەوە لەجەنگدا دەبووە مایەی ترسنۆکی. وە پێغەمبەری خوداﷺ زۆرجار لەلای هاوڕێکانی دەیفەرموو: من لە(ئوبەیەی کوڕی خەڵەف) دەترسێم کەلەلای دواوە فرسەتم لێبدینیۆ بۆم بێت: ئەگەر چاوتان پێی کەوت خێرا ئاگادارم بکەنەوە، لەو کاتەشدا ئوبەیە بەسەر وڵاغەکەیەوە دەرکەوت غاری دەدا، کاتێ چاوی بە پێغەمبەرﷺکەوت، هاواری کرد ئەی محمد بۆ کوێ دەڕۆی بەخوا ئەمڕۆ هەرگیز لە دەستم ڕزگارت نابێت، پێغەمبەرﷺ هەر خێرا ڕمبێکی لە (زوبەیری کوڕی عەوام) وەرگرتو، وەکو هەڵۆ پێش برکێی فڕینی دەکرد ، کە هیچ کەسێك لە هاوڕێکانی توانای ئەو هەڵمەتەیان نەبوو. کە لە چالاکی جەنگ دا بینوێنن: (ئوبەیە)ش لەلای خۆیەوە هێرشێکی بۆ لای پێغەمبەر هێنا کەلێی بدات: بەڵام (موسعەبی کوڕی عەمیر)ﷺپێشی لێگرت و شیرێکی لە دەموروخساریدا، لەبەر چاوی پێغەمبەر: پێغەمبەریشﷺ بە نیشانەیەکی تەواو ڕمبێکی لەنێوشانی (ئوبەیە) داو لە وڵاغەکەی فڕێی دایە خوارەوە بۆڕەی وەکو بۆ ڕەی گای لێدەهات. ئەو ڕوداوەش لەجەنگی(بەدر)دا بوو.

# یەکەم وتار لە ئیسلام دا

# أول خطبة فی الأسلام

حەزرەتی ئەبوبکرﷺ لەگەڵ پێغەمبەروﷺ یارەکان لەپێشی هاتنە خوارەوەی بانگەوازی بە ئاشکرا: داوای لە پێغەمبەر کرد کە ئەو پەیامەی کە خودا پێی گەیاندووە بڕواتە مزگەوت‌و بەئاشکرا بلاوی بکاتەوە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی ئەبوبەکر ئێستاکاتی ئەوە نەهاتووە چونکە ئێستا ئێمە زۆر کەمین‌و، توانای بەربەرەکانی کوفرمان نیە: بەلام ئەبوبەکر زۆرجەختی لەسەر داوایەکەی کردەوە، هەتا پێغەمبەرﷺ ڕۆیشتە مزگەوت و لە جێگەیەك دانیشت: حەزرەتی ئەبوبەکرﷺ هەستایە سەرپێ بۆ ئەوەی یەکەمین وتار لە ئیسلامدا بخوێنێتەوە، بێباوەڕان ئاگریان کەوتە گیانیان و هەستان‌و خرۆشان، شالاویان بۆ ئەبوبەکر و موسڵمانان بردو، زۆر بەبێ بەزەییانە کەوتنە لێدانی ئەبوبەکر و موسڵمانەکان ﷺ ئەبوبەکر شلو شەکەت بوو، کەوتە ژێر پێیانەوە (عەتەبەی کوڕی ڕەبیعە) ڕوویکردە ئەبوبەکرو، دوو نەعلی بە دەستەوە بوو کەوتەلێدانی گیانی ئەبوبەکرو هەموو لاشەی ئەبوبەکری شین‌و مۆر کردەوە و شوێنی هەموو نەعلەکانی پێوە دیاربوو، بە جۆرێك لە دەم‌وڕوخساری ئەبوبەکری دەدا، لەگەڵ لوت‌و کەپوی جیاواز نەدەکرایەوە ئەوەندە ئەستور ببوو، هۆزی (بەن‌و تەمیم) هەڵیان گرتەوەو بردیانەوە بۆماڵەوە هیچ هۆش‌و ئاگای لەخۆی نەمابوو هەرچی کەدەیدیت چاوەڕێی ژیانی لێ نەدەکرد. وە هیچ توانای وتەو قسەی نەمابوو. ئینجا لەسەر ئەوحاڵەی خۆی کاتێ تۆزێك هۆشی هاتەوە گوتی: تو خودا هەواڵی باشی پێغەمبەرم ﷺپێبگەیەنن هەتا دڵ‌و دەرونم ئاسودەو ئارامگرتوو بێت.

# ئاڵابدەنەدەستی کەسێك کەخوداو پێغەمبەری خودا خۆشیان دەوێ

# لأعطين الراية رجلا يحبه الله ورسوله

جەنگی (خەیبەر) بە سەرکردایەتی پێشەوای مرۆڤایەتی حەزرەتی محمدﷺ: هێندێك سەختی و ئاستەنگی ناخۆشی هاتە پێش موسڵمانان بۆڕزگارکردنی تەلارەکان. پێغەمبەر یﷺئیسلام ئەوڕۆژە ئاڵای ئیسلامی دایەدەستی حەزرەتی (ئەبوبکر)ﷺبۆ ڕزگاری تەلاری خەیبەر: حەزرەتی (ئەبوبکر) زۆر بەخۆش حاڵیەوە ئاڵاکەی وەرگرتو گوتی: بەڕاستی ئەوە ڕێز و شەرەفێکی زۆر گەورەیە بۆمن، هەر خێرا ڕاپەڕی و شەڕ و پێکدادانێکی زۆر بەرزی ئەنجامدا: بەڵام بەداخەوە نەی توانی ئەو ڕێزو شکۆمەندیە بەدەست بهێنێ، لە دوای (ئەبوبکر) پێغەمبەرﷺ ئاڵایەکەی دایە دەستی(عومەر)ﷺ ئەویش زۆر بە هیوایەتی دڵسۆزانە وەریگرت و ڕۆیشتە مەیدانی جەنگ و تاقیکردنەوە بەڵام، بە داخەوە ئەویش نەیتوانی ئەو بەهرە گەورەیە بەدەست بهێنێ.

لە دواییداپێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەو ئاڵایە بەپیاوێك دەدەم کە خودا و پێغەمبەر خۆشیان دەویێو، ئەویش خوداو پێغەمبەری خۆش دەوێ. ئینجا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەو پیاوە لە شەڕدا گەڕانەوەی نیە هەتا سەرکەوتن‌و، تەلاری خەیبەر ڕزگاردەکات: پێغەمبەرﷺ بانگی حەزرەتی (علی)ﷺ کرد کە چاوەکانی دەهێشا و ئازاری هەبوو: پێغەمبەرﷺ دەستی بەسەردا هێناو چاوەکانی ماچ کردو، فەرمووی: ئەی (عەلی) ئەو ئاڵایە هەڵگرە و بەرەو تەلاری خەیبەر بڕۆ هیوادارم خودا بەدەستی تۆ ڕزگاری بکات. حەزرەتی (عەلی)ﷺ زۆر بەخۆش حاڵیەوە ئاڵاکەی هەڵگرت و بەرە و تەلار نزیك بۆوە، دانیشتوانی خەیبەر تەواو هێرشیان بۆ حەزرەتی عەلی هێنا شەڕگەرم بوو، جولەکەیەك ڕمبێکی بۆ حەزرەتی عەلی ڕاوەشاند ڕمب‌و زرێکەی حەزرەتی عەلی لە دەستی کەوتە خوارەوە. لەو کاتەدا کە حەزرەتی عەلی لەدەرگای تەلارەکەوە نزیك بوو پەلاماری دەرگای داو کردی بەزرێو، پارێزگاری خۆی پێدەکردو، بەمەردانە دەجەنگا هەتا خودای گەورە لەسەر دەستی ئەو پیاوە بەڕێزە ئەو تەلارە ڕزگار کراو کەوتەدەستی موسڵمانانەوە.

وە لە هێندێك سەرچاوەدا هاتووەکە هەشت پیاوی بەهێزی جەنگاوەر نەیانتوانیوە ئەو دەرگایە دەربهێنن کە حەزرەتی عەلی کردویە بە قەلاغان و زرێو شەڕی پێکردوە.

# ئارەزوی لە ئیسلامە

# رغبة في الإسلام

دەگێرنەوە(عومەری کوڕی سابتی کوڕی وەقش) بە(أصیرم)بەناو بانگ بوو، واتە ڕوخسار جوان) بەلام زۆرسەرسەختو، دژ بەئیسلام بوو.بەلام، ئەو پیاوە لە جەنگی (ئوحود)دا خودای گەورە هیدایەتی داو، دلی ڕوناککردەوە بە سەربەرزی ئیسلامو، باوەڕی هێناو، ڕێبازی خۆش بەختیو کامەرانی دۆزیەوە، هەستا خۆی ئامادەو پڕچەك کردو، ڕۆیشت پەیوەندی بە پێغەمبەرەوە کردو، چووە ناو مەیدانی جەنگەوە شەڕێکی مەردانەی کرد: بەلام لەو پێکدادانەدا پێکاو بریندار بوو:هیچ کەسیش ئاگاداری ئەو ڕووداوەی نەبوون، کە (ڕوخسار جوان)باوەڕی هێناوە. هەتاوەختێك شەڕکۆتایی پێهاتو، هۆزی (عبدالأشل) بەدوای کوژراو بریندارەکانیاندا دەگەڕان. چاویان بە (عومەری کوڕی سابت )کەوت برینێکی سوکی پێوەبوو، کەسیان باوەڕیان نەدەکرد کە ئەوە (ڕوخسار جوانە) چونکە ئەو دژی فەرمانی خوداو پێغەمبەر بوو، بەلام ئێستا بۆچی لێرەیە نازانین؟ دوایی پرسیاریان لێکرد ئەی (عومەر) بۆچی هاتویە ئێرە ؟بۆ مەیدانی جەنگ، وەپشتت لەگەلەکەت کردووە؟ یان ئارەزوی ئیسلامت کردوە؟ ئەویش گوتی: بەخودا خۆشەویستی ئیسلامو موسلمانەتی منی هێناوەتە ئێرە باوەڕم بەخوداو پێغەمبەرەکەی هێناوەو، لەگەڵ پێغەمبەری خوادا جەنگاوم ، هەتا توشی برینداری بوومو، لە توانایی جەنگو شەڕی کردم. ئەوەندەی وتو، گیانی دەرچو، هەواڵەکەیان بۆ پێغەمبەرﷺ گێڕایەوە، پێغەمبەر فەرمووی: بەڕاستی ئەوە دانیشت و جێگەی بەهەشتە.

## عەلی و عەمری کوڕی وەد: علی و عمر و بن ود

کۆمەڵێك لە بێ ئەخلاق و خەراپەکارانی قوڕەیش لەجەنگ و ڕوداوی (خەندەق) لەگەڵ موسڵمانان تێکخزان و بوو بەشەڕ (عەمری کوڕی وەد) لە پێشیانەوە و سەرکردەی سوپاکە بوو. کە بە ئینسانێکی ئازاو بەهێز ناوی دەرکرد بوو لەناو جەنگەی مەیدان هاواری دەکردو، بەگاڵتەوە دەیگوت: ئەی محمد تۆ و هاوەڵانت وابیر دەکەنەوە هەر کەسێ لە ئێوە کوژرا دەڕۆنە بەهەشت؟ ئینجا هەر کەسێ لە ئێوە حەزدەکات بڕواتە بەهەشت ئەوا منیش ئامادەم خێرا ڕەوانی بەهەشتی بکەم. لەو کاتەدا حەزرەتی (عەلی کوڕی ئەبی تالیب ﷺ) هەستا و خۆی ئامادەکرد و بەشیری دەستی بەرەو لای(عەمر)بۆبەرامبەری و موبارەزە ڕۆیشتە مەیدان.(عەمر) کەچاوی پێکەوت (عەلی) زۆر منداڵ دیاری دا، بەگاڵتەوە پێی گوت: بەراستی من نامەوێ تۆ بکوژم، لەبەر ئەوەی باوکت دۆستمە و تۆش زۆر منداڵی. بەڵام ، ئازاو نەبەردی پاڵەوانی ئیسلام وای کرد کەپێشەوا (عەلی)شیری بەرز کردەوە بەرامبەری (عەمری کوڕی وەد)ی سەرکردەی سوپا و دەستی کرد بەشەڕکردن لەماوەیەکی زۆر کەمتوانی (عەمری کوڕی وەد) سەرکردەی سوپایەکەیان بکوژێ و، ئەو کۆمەڵ و سوپا جەنگاوەرەی لەگەڵیدا بوون. هەرکەس ئازابوو هەڵات و، گیانی خۆی ڕزگار کرد.

## کەلەگەڵ خودا ڕاست بێ خودا ڕاستی بۆ دێنێ

## إن تصدق الله يصدقك

کابرایەك لە هۆزی عەرەب هاتە خزمەت پێغەمبەر و باوەڕی پێهێنا و ، دوایی گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا من حەزدەکەم لەگەڵ تۆدا کۆچ بکەم. بەڵام پێغەمبەر ڕاسپار دەی کرد لەگەڵ هێندێك هاوەڵانیدا، لەدوای ئەوە پێغەمبەرﷺشەڕو جەنگێکی هاتە پێش و، لەو شەڕەدا سەر کەوتنی بەدەستهێناو، ماڵ و سەروەتێکی زۆری بەدەستکەوت و، بەسەر موسڵمانان و، جەنگاوەرانی دابەشکرد. بەڵام ئەو موسڵمانە ڕازی نەبوو هیچ شتێك لەبەشی خۆی وەربگرێ، گوتی: ئەی پێغەمبەری

خودا من بۆ ئەوە نەبوومە موسڵمان و، شوێنت بكەوم. بەڵكو من بۆیە باوەڕم پێت كردوو موسڵمانبووم، هەتا لەجەنگدا شیرێكم بێرە بكەویّ واتە: ئاماژەی بۆ بەمل و ئەستۆی بكەویّ و، شەهید ببم و بڕۆمە بەهەشت. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر ڕاست بكات خودا ڕاستی بۆدەكات.ئەو كابرایە ماوەیەكی كەم لەلای پێغەمبەر مایەوە، دوایی هەستاو ڕۆیشت بەرەو مەیدانی جەنگ و شەڕی كرد، پاشماوەیەك تیرێكی بەرگەردەنی ئەوجێگایەی كە بۆ خۆی ئاماژەی بۆ دەكرد بەركەوت و، بەهەڵگیراوی لەسەر شان هێنایانەوە دواوەی مەیدانی شەڕو بۆلای پێغەمبەر. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەوە ئەو هاوڕێیەمان بوو، گوتیان :بەڵێ هەوبوو، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: لەگەڵ خودا ڕاستی گوت: خوداش ڕاستی بۆ هێنا، لە دواییدا بە بەرگێكی پێغەمبەر، كفنیان كردوودایان پۆشی.ئینجا پێغەمبەر ﷺدوعاو نزای بۆ كردوو فەرمووی: خودایە ئەوە بەندەیەكی خۆتەو، بۆ ڕەزامەندی تۆ دەرچووەو، لەڕێبازی تۆشدا شەهید بووە، منیش شاهیدی شەهیدی بۆ دەدەم.

## خودایە لەباتی من سەلام بەنێردراوت بگەیەنە

## اللهم بلغ عنی السلام لرسول الله

لەدوای جەنگی(ئوحود) كۆمەڵێك لەهۆزی (عەزل)هاتن بۆ مەدینە بۆلای پێغەمبەری خوداﷺ گوتیان: ئێمەش چەند كەسێكی موسڵمانمان تێدایەو، حەزدەكەین كەچەند كەسێكی شارەزای ئاینمان لەگەڵدا بنێرن بۆ ئەوەی بەرنامەی ئاین و قورئانمان پێ بڵێن و فێرمان بكەن. پێغەمبەریش لەگەڕانەوەیاندا بۆ وڵاتەكەیان (١٠) دە نەفەری شارەزاو زیرەكی لەگەڵدا ناردن. بەڵام لە ڕێگا ناپاكیان لەگەڵدا كردن و، تەنها (خەبیبی كوڕی عەدی)و(زەیدی كوڕی دەسەنە)نەبیّ ئەوانی تریان هەموو كوشت و، شەهیدیان كردن، ئەو دوانەشیان بەقۆڵ بەستراوی لەگەڵ خۆیاندا بردن و، لە مەككە فرۆشتیانن و ، لە باتی ئەو سەركردانەی خۆیان كە لەبەدردا كوژرا بوون، ئەوانەیان كوشتەوە.بەڵام، چۆن كوشتنەوەیەك: (خەبیب) یان لە ماڵی (ماویە)ی لێپرسراوی هۆزی (عبدالمتلب) بەند كرد: (ماویە) دەڵیّ لەكونی

پەنجەرەکەوە چاوم بەخەبیب کەوت لەژوری بەندیەکەیدا هێشوە ترێی جوانو گەورەی لەلابو، دەیخوارد کەلەوکاتەدا دەنکێکیش ترێ نە بوو. ئەو کاتە زانیم ئەوە ڕزقو ڕۆزیەکە خودا پێی بەخشیوە، منیش لەدوای ئەوەباوەڕم هێنا. خەبیب بە ئاشکرا قورئانی دەخوێند. ئافرەتان گوێیان لەدەنگی قورئانەکە ڕادەگرتو، دەستیان دەکردبە گریان. ڕۆژێك (ماویە) ڕۆیشتە لای خەبیب هەواڵی پێدا کە قوڕەیشیەکان کۆبونەوەو بڕیاری کوشتنیانداوە. بەلأم خەبیب هیچ خۆی نەشێواندوتێك نەچوو بەوهەواڵە، داوای لە(ماویە)کرد کەپارچەیەك ئاسنی تیژی بۆ بهێنێ، ماویە پارچەیەك موسی بە کچۆڵە بچوکەکەی پێدا نارد.خەبیب بە گاڵتەوە پێی وت: سوێند بە باوکت ئەتۆ زۆر چاپوكو ئازای، ئایا باوکت نەترسا کەمن خیانەتو ناپاکی بکەم، لەو کاتەی کە دایکت ئەوموسەی بەتۆدا ناردووەو، ئێوەش دەتانەوێ بمکوژن. ماویە وتی: سوێند بەخودا ئەتۆ سەر ڕاست و پاكو پارێزگاریو، هەرگیز گومان نابەم کە تۆ ناپاکی بکەیت ! لەدوای ئەوە (خەبیب)یان لە بەندیخانە هێنایە دەرو بەرەو مەیدانی سێدارەیان برد بۆ کوشتن ، کۆمەڵانی قوڕەیش کۆبونەوە بۆئەوەی چاودێری کوشتنی خەباب بکەن.خەباب داوای مۆڵەتی دووڕکات نوێژی لێکرن ، پێشی کوشتنی، ئەوانیش مۆڵەتیان دا، دووڕکات نوێژی زۆر کورتی کردو، درێژەی بە نوێژەکەی نەداو، گوتی: بەخودا ئەگەر لەبەر ئەوە نەبایە بڵێن دەترسێ لەمردن نوێژەکەم زۆر درێژ دەکردەوە. ئەو دووڕکات نوێژە یەکەمین سونەتی نوێژ بوو لەکاتی مردندا. دوای ئەوە خەبیب یان زۆرتوند بەستەوەو، پێیان گوت: لە باوەڕەکەت پاش گەز بەوە ڕێگەت پێدەدەین و ئازادت دەکەین. ئەویش گوتی: (لاإلە إلااللە) بەخودا ئەگەر بمکەنە خاوەنی تەواوی ئەو دونیایە، نامەوێ لەئاینو باوەڕەکەم پاشگەزببمەوە.(ئەبو سوفیان) ڕۆیشتە پێشیو گوتی:حەز ناکەی تۆ لە ماڵەوە لەناو خێزانو خانەوادەکەت بیتو دابنیشیو، ئێستا محمد لە جێگەی تۆ بێت؟ خەبیب گوتی: سوێند بەخودا من حەز ناکەم لە ماڵەوەبم و دامنیشمو، پێغەمبەر یەك دڕوکی بەقاچی دابچێ ؟! زۆر ئەو قسەیەیان لێدوبارە دەکردەوە کە لە باوەڕەکەی پاشگەزبێتەوە ئازادی

ـحكەن. دەنا لە سێدارەی دەدەن و دەیكوژن. ئەویش دەیگوت: بەخوا گیانێكی من ـۆرسادە و كەمە كە لە پێناوی ڕەزامەندی خودادا بكوژرێ. لەدواییدا ئەو چەند ـەلبەستەی دەگوت.

وقد خيروني الكفر والموت دونه    فقد ذرفت عيناي من غير مدمع

ومابي حذار الموت إني لميت    وإن إلى ربي إيابي ومرجــعي

ولست ابالي حين اقتل مسلما    على اي شق كان في الله مضجعي

بێباوەڕان منیان لەنێوانی بێباوەڕی و مردندا سەر پشك كرد چاوەكانم فرمێسكیان ڕژاند بەبێ ئەوەی ئەو فرمێسكە هیچ شوێنەواری هەبێت، ئەمن باوەڕم بە مردن هەیە خۆمی لێناپارێزم چونكە دەزانم بەڕاستی من هەر دەمرم، وە گەڕانەوەو شوێنی تەواویشم بۆلای پەروەردگاری خاوەن بەزەییە، وە من هیچ باكم نیەبەهەر چۆنێ ئەمكوژن، وەڕوم بەهەر لایەك دەسوڕێنن و لەهەر لا تەنیشتێكم بێت چونكە من موسڵمانم و گەڕانەوەشم بە تەنها بۆلای پەروەردگاری بەسۆزو بەزەییە.

لەدواییدا خەبیب گوتی: ئەی پەروەردگار من بۆ هەرلایەك دەڕوانم تەنها ڕوخساری ناشیرینی دوژمنان و بێباوەڕان دەبینم. ئەی پەروەردگارمن هیچ كەسێك لێرە بەدی ناكەم كەسەلامی من بە پێغەمبەر ڕابگەیەنێ تۆ لەباتی من سەلامی پێبگەیەنە.

دەگێڕنەوە: لەو كاتەدا پێغەمبەرﷺ لە مەدینە بوو ڕووی بەرەو لای هێندێك لە یارەكانی سوڕاندو بێهۆشی و تاریكی بەسەردا هات و لەدوایی فەرمووی: سەلام و میهرەبانی خودات لێبێ. دوایی پێغەمبەر ﷺبە ئامادەبوانی فەرموو: ئەوە حەزرەتی جبرائیل بوو هات و سەلامی خەبیبی پێگەیاندم!

ئینجا بگەڕینەوە سەرباسی خەبیب: بێباوەڕ و كافرەكانی قوڕەیش كوڕ و گەنجانی باوك كوژراوانی بەدریان كۆكردەوەو یەكی ڕمبێكیان دایە دەست و هەریەكەی ڕمبێكیان لە خەبیب دا لە دواییداچەند ساتێك مایەوەو، لە ئاخر و كۆتا ساتەكانی ژیانی، دانی بەتاك و تەنهایی خوداو پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر هێناو، وتی (اشهد أن لاإله إلاالله.وأشهد أن محمدا عبده ورسوله) لە دوای تەواوی ئەودان پێدا هێنانە بە شەهیدی گیانی بەخت كرد.

## پەیمانم لەگەڵ پەروەردگارم کردوە ئەگەر بیدینم ئەیکوژم

## عاهدت ربي إن رأيته أن أ قتله

(عبدالرحمنی کوڕی عەوف)ﷺ دوو ڕووداوی ئازایەتی و پاڵەوانی دوو گەنجی میرد منداڵی ئیسلاممان بۆ دەگێڕێتەوە کە(عەوف و، معوەزی کوڕی حارس)ﷺی خەزرەجی ئەنصاری بوون. دەفەرموێ :من لە جەنگی بەدر لەڕیزی جەنگاوەران بووم: بە هەر لایەکدا ئاوڕمدەدایەوە، دوو مێرد منداڵی جوانی هەڵکەوتوم چاو پێدەکەوت. یەکێکیان هاتە نزیکم و گوتی: ئەی مامە (ئەبوجەهل) کامەیە پیشانم بدە. منیش وتم: ڕۆڵەکەم ئەبو جەهلت بۆ چییە چیدەکەی؟ گوتی: بەخودا پەیمانم لەگەڵ خودا بەستووە ئەگەر چاوم پێی بکەوێ یان لەو پێناوەدا دەمرم، یان دەیکوژم. ئینجا ئەومێردمنداڵەی تر بەدزیو نهێنی منداڵەکەی ترهات و، هەمان داوایەی لێکردم: منیش ئەبوجەهلم بۆ نیشانە کردن و پێم گوتن: ئەها ئەوە ئەبوجەهلە. ئەو دوو مێرد منداڵە هەر کە پێمگوتن: وەکو هەڵۆ شالاویان بۆ بردوو پەلاماریاندا لە هەموو لایەکەوە شیرو تیریان بۆڕادەوەشاند ، هەتا بەتەواوی شەکەت و ماندویان کردو لەسەر ولاغەکەی بەریان دایەوەو کوشتیان. بەلام ئەو دوو گەنجە لە دوای ئەو کارە گەورەیە هەردووکیان شەهید کران.

## سوێند بەخوداهەرگیز لەلایەن منەوە ئازاری پێناگا

## والله لن أضربك الحد أبدا

دەگێڕنەوە (سعدی کوڕی ئەبی وەقاص)ﷺ ( ئەبو محجنی سەقەفی)بەند کرد بوو: لەبەر تاوانی عارەق خواردنەوە: لە کاتی ڕودانی جەنگ و شەڕی قادسیە، ئەبو محجەن بەند کرابوو: لەناو بەندیخانەدا لە کونی هەواکێش و پەنجەرەکان، سەیری تێکهەڵچون و بەرامبەری جەنگاوەرانی دەکرد: کاتێ چاوی بەلاوازی و شکستی هێرشی جەنگاوەرانی ئیسلام دەکەوێ، داوای لە خێزان و هاوسەری سەعد کرد: کە لەو کۆت و زنجیرەی تێیدا ئازادی بکات، دەڕواتە بەرەکانی جەنگ، هاوسەری

سەعد ئەبو محجەنی ئازاد کردو لە بەندیخانە هێنایەدەر و ولاغەکەی سەعد کەناوی(بەلقاء) بوو بۆی ئامادەکردوو، سواری بوو، ڕۆیشتە ناو مەیدانی شەڕ، زۆر ئازایانە وەکو بروسك ڕادەپەڕیو شالاوی دەبرد، دووژمنانی دەهەژاندو پەرتەوازەی پێدەکردن. کاتێ سەعد لە میدانی شەڕ چاوی بەو جەنگاوەرە دەکەوێ . سەرسام دەبێ، دەڵێ خودایە من چیدەبینم ؟ئەو هەڵمەتو پەلامارە ئەگەر ئەبو محجەن لە بەندیخانە نەبوایە، دەموت: ئەوە هەڵمەتی ئەبو محجەنە. ولاغەکەش بە بەلقای خۆم دەچێت. بەڵام ئێستا نازانم چۆن باوەڕبکەم کە ئەوانە ئەبو محجەنو ولاغەکەی منن. ئینجا لەدوای کۆتایی شەڕو سەرکەوتنی موسڵمانان: ئەبو محجەن گەڕایەوە بۆ ژووری بەندیخانە، هەتا کۆتایی ماوەی بەندییەکەی هات. لەدوای ئازاد بوونی بەندیخانەکەی ئەو کاتە سعد زانی کەئەو ئازایە ئەبو محجەن بووە. سەعد بەدوای ئەبو محجەنی دانادروو زۆر ڕێزی لێناو گوتی: سوێند بەخودا لەدوای ئەو ئازایەتیو، نەبەردیەی کە کردتو سوپای بێباوەڕانت شکست پێهێنا و ڕزگاری ئێمەت مسوگەر کرد، دڵنیابە لەلایەن منەوە هیچ ئازارێکت پێناگات. ئەبو محجەنیش گوتی: منیش سوێندبەخودا هەرگیزا و هەرگیز نزیکی ئەو کارە پیسە نەبمەوەو نەیخۆمەوە. هەتاك و ئێستاش کە دەمخواردەوە بە سەرکەشی دەمخواردەوە لەبەر هۆزی عەرەب بوو، نەڵێن ئەبو محجەن لەترسی داری تۆڵە (حەد) ناخواتەوە، بەڵام ئێستا کەتۆ وات فەرموو: منیش هەرگیز ناخۆمەوە بۆ ئەوەی هەموو هۆزی عەرەب بڵێن: لە ترسی خودا وازی هێناو نەیخواردەوە. نەوەك و لەترسی فەرمانڕەواییان.

## خودایە ئیسلام سەر بەرز بکەیتو منیش بەشەهیدی بەریتەوە
## اللهم أعـزالإسلام وأقبضني شهيدا

مێژونوسان جەنگی (نەهاوەند)یان لە نێوانی(عەرب)و (فارس)دا بە ڕزگاری ڕزگارکەران (فتح الفتوح) ناوبردوە، چونکە ئەو جەنگە کۆتایی هێنا بە نەهێشتنی جەورو ستەمو، زۆرداریو، نەمانو ڕمانی کۆشکی پادشایەتیو، ئیمپراتۆری. لەو جەنگەدا (١٥٠٠٠٠) سەدو پەنجا هەزارجەنگاوەری فارس کۆبۆوە. لەکاتێك دا

جەنگاوەری موسڵمانان (٣٠٠٠٠)سی هەزار کەس بوون بەسەر کردایەتی(نەعمانی کوڕی مقرن) ئەو دوو سوپایە بەیەکگەیشتن لەمەیدانی شەڕدا، (نەعمان)ی سەرکردە کە بەتەواوی سازو ئامادەی جەنگ بوو لەگەڵ جەنگاوەرانی، لەسواری وڵاغەکەی سەری بەرز کردەوەو دەستی بۆ ئاسمان ڕاگرت و، بەدەنگێکی بەرز هاواری دەکردوو دەیوت: ئەی پەروەر دگارم لێت دەپاڕێمەوەو، داوات لێدەکەم، ئەمڕۆ بە سەرکەوتنی موسڵمانان، کەسەر بەرزی ئیسلامە چاوەکانم ڕۆشەن و ڕووناك بکەی و، گیانیشم بەشەهیدی بکێشی. ئینجا ڕاپەڕی و بەرەو لای دوژمن شالاوی برد، وەك و چەغماغەی تیشکی بروسکە، نەعرەتەو ناڵەی لێدەدا. جەنگاوەرانی موسڵمانانیش لەدوای ئەویەوە هێرشیان بردوو، موسڵمان و بێباوەڕان تێکەڵ بەیەکتر بوون. زەوی بەخوێنی جەنگاوەران سور هەڵگەڕاو داپۆشرا، (نەعمان) ئەو سەرکردە بەتوانایە بەنەعرەتەی هێز و تەواو، خۆی بەناو ئاپۆرەی سوپادا دەکردو، بەهێزو نەعرەتەو شیر ڕاوەشاندن ، بێباوەڕانی لەچوار دەورەی خۆی بەزەویدا دەداو، هەرچی لەدەورەی دابوون ڕایان دەکردو مەیدانیان چۆڵ دەکرد: لەوکاتی تێکهەڵچونەدا بوو تیرێك دەرچو بە تەنیشت و پەراسوەکانی (نەعمان) کەوت و، کەوتە سەر زەوی و، ئالایەکەشی هەر بە دەستەوە بوو، نەیهێشت بکەوێتە سەرزەوی. یەکێك لە جەنگاوەرانی باوەڕدار، لە دوای کۆتایی جەنگ دەگاتە لای نەعمان و، چاوی پێدەکەوێت خەریکی گیانەڵاو گیان لە دەستدانە ، هێندێك ئاوی بۆ ئامادە دەکات بۆ ئەوەی سەر و ڕوخساری سەرکردەی بریندار و خوێناوی پێبشواتەوە. نەعمان دەفەرموێ: ئەتۆ کێی؟سەر بازەکە دەڵێ من (مەعقەل کوڕی یەسار) ﷺ ئینجا لەو کاتی گیانەڵاو تەنگەتاویدا پرسیاری لێدەکات و دەڵێ، سوپای باوەڕداران چیان لێ بەسەر هاتووە؟! مەعقەلیش لە وەڵامدا دەڵێ، سوپاس بۆ خودا موسڵمانان سەر بەرز و براوەبوون. ئینجا نەعمان لەو کاتی دوا هەناسەی ژیانی بەدەم زەردەی پێکەنینەوە دەڵی سوپاسێکی زۆری بێپایان بۆ خودا بۆ نیعمەتی سەرکەوتن ، نامەیەکی سەرکەوتن بۆ حەزرەتی عومەر بنوسن. بەو جۆرە ئەوشەڕە گەورەیە بەسەرکەوتنی باوەڕداران

كۆتایی پێهات. ئینجا جەنگاوەرانی باوەڕدار پرسیاریان لەحاڵو چۆنیەتی (نەعمانی كوڕی موقرین) كرد: لەباتیان (مەعقەل) برای وەڵامی دایەوەو گوتی: بەڕاستی خودا چاوەكانی ڕۆشەن كرد، بە سەركەوتنی باوەڕداران‌و، داواكەشی بە شەهیدی قبوڵ بوو.لەدوای ئەوە ئاماژەی بۆ (حوزەیفەی كوڕی یەمان) كردوو گوتی: لێرە بەدواوە ئەوە سەركردەو پێشەوای سوپاتانەو بەفەرمانی ئەو بڕۆن بەڕێگادا.

## پاداشتی جەنگاوەران - ثواب المجاهدین

كابرایەك هاتە لای پێغەمبەر گوتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ فێری كردارێكم بكە كەبەوهۆیەوە پێی بگەمەپلەو پایەی پاداشتی جەنگاوەرانی مەیدانی شەڕ. پێغەمبەر ﷺفەرمووی: دەتوانی شەوو ڕۆژ بەبێ پشودان‌وخەوتن ، بەردەوام لە نوێژدا بیت‌و ڕانەوەستی‌و وچان نەدەی؟! وەبەڕۆژو ببی و هەرگیز نێوان و پشوی نەدەیە؟ ئەویش گوتی: بەخودا ئەی پێغەمبەری خودا ﷺمن زۆر لەوە لاواز ترو بێهێزترم كەبتوانم وابكەم. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: سوێند بەو كەسەی گیانمی بەدەستە. ئەگەر توان‌و هێزی ئەو خوداپەرستیەت زۆرتریش هەبایە؟! هێشتا نەدەگەیشتیە پلەو پایەو پاداشتی جەنگاوەرانی ڕێبازی خودا.

## لە پێناوی خودا جەنگاو ڕزگاری بوو - قاتل فی الله فنجا

كابرایەك هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ لە كاتێكدا كەچاوەدێری جەنگێكی دەكردلەگەڵ بێباوەڕان كابرا گوتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ باوەڕبهێنم ئینجا شەڕبكەم؟ یان شەڕ بكەمو دوایی باوەڕ بهێنم؟ پێغەمبەر ﷺفەرمووی: باوەڕ بهێنە ئینجا شەڕ بكەو بجەنگە.كابراش باوەڕیهێناو ڕۆیشتە مەیدانی جەنگ شەڕێكی زۆرمەردانەو نەبەردانەی كرد.كۆڵی نەدا هەتا شەهید بوو: كاتێ هەواڵی شەهیدیەكەیان بە پێغەمبەر ڕاگەیاند، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: كردەوەیەكی زۆر كەم، پاداشتێكی زۆر. هێندێك لە هاوڕێیانی پرسیاریان لەوبارەوە لە پێغەمبەر كردو، گوتیان:باشە ئەو پیاوە چۆن بەپاداشتێكی زۆر زۆرەوە دانیشتوی بەهەشتە؟! لەكاتێكدا كەیەك ڕكات نوێژی نەكردووەو، سجدە و كڕنۆشێكی بۆخودا نەبردوە.لەوەلامیان دەڵێن. پاداشتی گەورەی جیهاد، خزمەتێكی زۆری بەموسڵمانی باوەڕدار دەكات.

# ئێمەچەند هۆیەك مان بۆ مردن هەیە باشترینیان شەڕی بێباوەڕانە
# إن لنا آجالا إذا قربت فأكرمها القتل

مێژو بۆمان دەگێڕێتەوە ك ەسەركردەی گەنجی موسڵمانان (قوتەیبەی كوڕی موسلم)ﷺ ڕۆیشت بەرەو وڵاتی (صین)ولەوێ نزیكبۆوە. (مەلیكو پێشەوای)سین كەزانی سوپای ئیسلام لەوڵاتەكەی نزیك بۆتەوە، نامەیەكی بۆ قوتەیبە نوسی، كە حەز دەكەم نوێنەرێكم بۆلا بنێرێ، بزانم ئەوانە چینو، ئاینیان چییەو، چیان دەوێت؟! قوتەیبەش یەكێك لە پاڵەوان و ئازاو زیرەكو تێگەیشتوانی بەناوی (هەبیرەی كوڕی المشمرج)ﷺی هۆزی كەلانی هەڵبژارد. لەگەڵ ئەویشدا (١٠) دەپیاوی خاوەن شانو شكۆ و ڕوخسار جوانی بەتوانای دیاری كردو، لەگەڵیدا بەڕێكەوتن. كاتێ گەیشتنە لای پادشای سین: زۆر بە عیزەت و هێز و لێهات و، توندو قائیم بە چەكەوە گەیشتنە بەردەمی پادشا، كە پادشای سین بەو جۆرە چاوی پێیانكەوت سەرسامبوو: دوایی ویستی بیان ترسێنێو، سامی خۆی بەسەریاندا بدات، گوتی: چاوتان بە هێزو دەسەڵاتی زۆری من كەوتووە ، كە بەڕاستی هیچ كەس توانا و هێزو دەسەڵاتی منی نیەو، ناتوانێ بەربەرەكانیم لەگەڵدابكات، ئێستاش ئێوە بەو هێزە كەمە بێدەسەڵاتەتان كە وەكو هێلكەیەكە لەناو دەستمداو، هاتوونە ناو خاكی منەوە، ئێستاش ئێوە بڕۆنەوە لای ئەو دووسێ هاوڕێیانەتانو، پێیان بڵێن هەتا زووە با لێرە بڕۆنو ، ئەو مەیدانە چۆڵ بكەن بۆ خۆتان باشترەو، خۆتان مەخەنە گێژاوی پەشیمانی ، دەنا هێزێكتان بۆسەر ئێوەو هاوڕێكانتان دەنێرم كەنەزانن لەكوێوە هاتوون؟!هەمووتان بەهیلاك دەدەم. چونكە من مەبەستی هاتنی ئێوە بۆ خاكی ئێمە زۆرباش دەزانم ، كەبەدوای چیدا دەگەڕێن لە دوای ئەو قسانەی پادشای سین (هەبیرەی كوڕی مشمرەج)ﷺ هاتە گوفتارو گوتی: ئەی پادشا تۆ بەچی زوبانێك دەڵێی ئێوە سوپایەكی زۆركەمن: سوپای ئێمە سەرەتاییەكەی والەوڵاتی تۆدایەو كۆتاییەكەشی لەشوێنی باغو باغاتی(زەیتون)دایە واتە: لەوڵاتی (فەلەستین) ئەگەر بەڕێزت دەڵێی چاوچنۆكن: ئەدی چۆن ئێمە توانیومانە بەسەر ئەو هەموو وڵاتانەدا

برۆین هەتا گەیشتوینە ئێرە وڵاتی سین و، مەبەستی جیهاد و، ئازادکردنی ئەو وڵاتەشمان هەیەو دەتوانین. ئەو هەڕەشەی ترسان و تۆقانەی کە تۆ لەگەڵ ئێمەیدا دەکەیت: باش بزانە هەرگیز لەمردن ناترسین. ئێمە چەند هۆکارو شێوازێکی مردنمان هەیە بۆ نزیکبوونەوە و هاتنی مەرگ، چاکترینیان لەلای ئێمە کوشتنەو شانازی پێوە دەکەین. بۆیە ئێمە نەبێزارین و ڕقمان لەمردنە، وەنەلێی دەترسین و لەبەری هەڵدێین. بەو وتە پڕماناو شیرینە تیرێکی کوشندەی ژەهراوی زۆر بەهێزی لە پادشای چلێس و لەخۆ بایی و خۆ بە گەورەزاندا. پادشا تێگەیشت و حاڵی بوو، کە هاوڕێیانی محمد لەمردن ناترسێن و سڵی لێناکەنەوەوبەڵکو بەشانازییەوە پێشوازی لێدەکەن و، چەندەی هێزو توانایان هەبێت بە تەواوی مانا تێدەکۆشن و لە کاتی بەرامبەری دوژمنانیاندا بە هیچ جۆرێك پشت لە دوژمن ناکەن و مەیدانیان بۆ چۆڵ ناکەن. ئەو هەڵوێستە مەردانەی نوێنەرانی قوتەیبە وای لە پادشای سین کرد: کە تەنازول بکات و دەستبەرداری مافەکانی خۆی ببێت و، داخوازیەکانی نوێنەری (قوتەیبەی کوڕی مسلم)ﷺ قبوڵ بکات و، باج و سەرانە بدەن و، بە ئەمەك و وەفا بێت لەگەڵ سوێندو پەیمانەکەی کە داویەتی و، بەتەواوی بیباتە سەر بۆ بە جێهێنانی پەیمانەکەشی قاپێکی گەورەی دروستکراو لە زێر ئامادەکردو، پڕی کرد لەگڵ بۆ ئەوەی قوتەیبەی سەر کردە قاچەکانی لەسەر دابنێ کە ئەوەش مایەی مل کەچی و پەیمان بەرداریە. ئەویش زۆر بەسەر بەرزی و مەردانەوە وەری گرت.

## توشی گەل و نەتەوەیەك بوین ئەوە یەکێك لەلێدانەکانیانە

## لقينا قوما هذه إحدى ضرباتهم

(عەمری کوڕی عدی زوبیدی)ﷺیەکێك لەپاڵەوان و ئازاکانی جەنگ و جیهاد بوو: لەژێر فەرمانەکانی (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس) ﷺبوو: فارسەکان لەو ڕۆژەدا بە هەزاران سەربازی ئازاو بەسام و چاپوك و بەهێزیان هەڵبژارد بوو: لەپێشی سوپادا سەدان فیلی بەهێزو چاونەترسی خوێن ڕێژی زرێپۆشی تانکی داریان لەگەڵدا

بوو: هەر فیلێك (٢٠) بیست پیاوی پڕچەکی لەسەردا بوو. ئامادەی شەڕو پێکداداان بوون بە خۆڕاگری‌و سووربونەوە لەسەر شەڕ: سەرکردەی پێشەوایان بەناوبانگ ترین سەرکردەی سەردەمی فارس (ڕۆستەم)بوو لەسەر فیلێکی زۆر گەورەی بەهێز سوار ببو لەپێشی سوپاوە دەڕۆیشت (عەمری کوڕی مەعد) ﷺکە چاوی پێیکەوت ویستی یەکەمین پەلامار و شالآوی جەنگی بۆ سەر ڕۆستەم ببات: چونکە ئەگەر سەرکردەی سوپایان بکوژرێ، موسڵمانان ئاسودەو دڵنیا دەبن‌وئازارو مەینەتیان لەبیر دەچێتەوە.ئینجا ئەو سەرکردە مەزنە بەڕاستی نیشانە شکێنە کە هەردەم‌و بەردەوام شیرو تیری پێچەوانە نەڕۆیشتوەو هەردەم نیشانەی پێکاوە، بۆیە بەبێ تێڕامان ڕاستەوخۆ ڕمبی نیشان شکێنی ئاڕاستەی قاچەکانی فیلەکەی ڕۆستەمی کردوو قاچەکانی پەڕاندو ڕۆستەم لەسەر فیلەکەی کەوتە خوارەوەو فیلەکەشی بەسەرلادا کەوت هەر بە خێرایی ڕۆستەم کوژراو گیانی لەدەستدا.ئەوبارو کۆڵەی کەلەسەر پشتی فیلەکەی ڕۆستەم بوو کەوتە خوارەوە (٤٠٠٠٠) چل هەزار دیناری ئەو کاتەبوو: بوو بە بەشی موسڵمانان : وە بەڕاستی ئەولێدانە جەرگ بڕەی عەمری کوڕی عودەی بووە هۆکارێکی تەواو بۆ ڕژانی ترس‌و سامی بەهێزو نەمانی ورەی سوپایەکەی ڕۆستەم: ئینجا لە دواییدا قاچی پەڕیوی ئەو فیلەیان هەڵگرتەوە و بردیانەوە لە دیواری یەکێك لە کلیسەکانیان هەڵواسی، ئینجا هەر کاتێ هەستیان بە تێشکان و بەزینی خۆیان دەکردەوە بەرامبەر بە موسڵمانان دەیانگوت: بەخودا ئێمە توشمان بەتوشی گەل‌و نەتەوەیەکەوە هات کە ئەو قاچانە یەکەمین گورزی کوشندەی لێدانیان بوو. بەو هۆیەوە ترس‌و سام دایدەگرتنەوە. کەبەڕاستی هەر ئەو ترس‌و سامەبوو، بووە هۆکاری دەرونی بۆ سەرکەوتنی موسڵمانان.

# سوپاس بۆ خودا ئەوەی بۆ کردمە سەرمایەی ڕۆژی دوا ڕۆژم
# الحمدلله الذي جعله ذخيرة لي يوم القيامة

ـە مێژوی ئیسلامیدا بۆمان دەردەکەوێ کەدایك چی کاریگەری و پاڵەوانیەتێکی لە سەرڕۆڵەکانیدا داوەتەوەو تیشكو ڕووناکیەکی زۆرگرنگی پەخشکردوەو، جێگەی سەرسامی وگێڕانەوەی هەتا هەتایی دانیشتوانی سەر ئەو زەویەیە. با هەموومان گوێمان لەو ڕوداو چیرۆکە بەسامە بێت کە (ئەبوقودامە) پیاوی خوداو پاڵەوانی جەنگ. ماندونەناسی ڕێگابڕی ڕێگای دووری وڵاتی ڕۆم.لەکاتێکدا کە لەمزگەوتی پێغەمبەری خودا قسەی بۆ هاوڕێیانی دەکردوو، باسی یادەوەریەکانی جەنگی دەگێڕایەوە، پرسیاریان لێکرد. سەرسوڕهێنەرترین شت چییە لەو جەنگە بەرچاوتکەوتبێ ؟! ئەویش بەسەر سامیەوە فەرمووی: ڕۆژێك چومە شاری ڕوقەی) لەمزگەوت دانیشتم کۆمەڵە خەڵکانێکی زۆردانیشتبوون باسی گەورەیی پلەی شەڕو، جیهادو شەهیدیو ، تێکۆشانم بۆ کردن. دوایی ڕۆیشتم وڵاغێکم کڕی کە چەك و تفاق و خواردەمەنی شەڕی لێباربکەمو بەرەو (ڕۆم) ڕێگا بگرمەبەر. لە دوای بەڕێکەوتنم چاوم بە ئافرەتێککەوت بانگی لێکردمو، گوتی(ئەبو قودامە) ڕاوەستە؟! بۆلام هاتو گوتی: گوێم لێبوو باسی گەورەیی جیهاد و شەهیدیت دەکرد. بەڵام ، ئێمەی ئافرەت کە جیهادمان لەسەرواجب نیە:بۆیە خۆشەویست ترین شت کەمن هەمەو، گەورە ترین نیعمەتی خۆشیە خودا پێی بەخشیوم. وەهیچ ئافرەتێکم نەدیتوە کەخودا قژو پرچی وەکو من جوان بێت. ئێستاش بۆ بەشداری کردنم لە شەڕو جیهاد: وا پرچ و کەزیەکانم بڕیوەو کردومە بە(دەست بەند) ڕێشمە بۆ وڵاغەکەت فەرموو بیگرە.بەو هیوایەم کە هێندێك تۆز وغوباری شەڕ و جەنگی بکەوێتە سەر لەپێناوی ڕەزامەندی خودا.کە ئەو کەزیانەش هەمووهیوای خۆشبەختی ژیانم بووە.(قودامە) دەفەرموێ: لەدوای ئەوە دەست بەندەکەم لێوەرگرت، ئینجاگوتی: ئەی (ئەبو قودامە) هاوسەرەکەم کوژراوە و شەهید بووە. جوانترین منداڵی بۆ بەجێ هێشتوم، کە فێری قورئان خوێنیو، سوارچاکیو، تیر ئەندازی کردووە.بە ڕۆژ بە ڕۆژوەو بەشەو شەونوێژ دەکات، وە کێڵگە و

خانوبەرەیەکی باشیشمان هەیە کە کورەکەم هیچ کەڵکو سودیان لێنابینێ بۆیە پێشی ڕۆیشتنت ئەوانیشم کردە سەدەقەو دیاری لەپێناوی خودادا بۆ پێویستی بەرەکانی جەنگ بەهیوای پاداشتی پەروەردگاری مەزن.وە لە خوداش دەخوازم کەخودای گەورەلە پاداشتی جیهادو شەهیدی بێبەشم نەکات. ئینجا (ئەبو قدامە) زۆر سوپاسی هەستی بەرزی ئەو ئافرەتەی کرد لەسەر ئەو ئازایی و غەم خۆریەی بۆ ئیسلام. لەدوای تەواوبونی قسەی ئەو ئافرەتە (قودامە) لەگەڵ هاوڕێکانی بەڕێ کەوتن و ڕۆیشتن.کاتێ گەیشتنە لای تەلاری (مەسلەمەی کوری عبد الملك)دەفەرموێ:چاومان بە سوارێك کەوت لە دوامانەوە زۆربە چاپوك و ئازایی دەهات و هاواری دەکرد و دەیوت: ڕەحمەتی خوداتان لێبێ تۆزێك ڕاوەستن؟ لەدوای تۆزێك ڕاوەستان: ئەو سوار چاپوك و ئازایەیان لێنزیکبوٚوەو، دەستە ملانەی یەکتر بوون ئینجا گوتی:(الحمد لله الذی لم یحرمنی صحبتك ولم یردنی خائبا لقد جئت لأغزو معك) واتە: سوپاس بۆئەو خودایەی کە لە هاوڕێیەتی ئێوەی بێبەش نەکردمو، بەسەر گەردانیو نائومێدی دەری نەکردمو ، گەیشتمە لاتان بۆ ئەوەی هاوڕێی جیهادی ئێوەبم. (ئەبو قودامە) زۆر لەو گەنج و سوارە تێڕاما سەیری کرد زۆر مێردمنداڵ دیاربوو، بۆیە ئەبو قودامە پرسیاری لێکرد ئەی ڕۆڵە گیان تۆ باوکت هەیە؟! ئەو گەنجەگوتی: نەخێر. بەڵام باوکم لەجەنگدا شەهید بووەو، دەمەوێ تۆڵەی باوکم بکەمەوەو، لەخوداش دەخوازم وەکو باوکم شەهیدیم بە نسیب ببێت. دوایی ئەبوقودامە گوتی:ئەدی دایکت هەیە؟ گوتی: بەڵێ، ئەبو قودامە گوتی: بڕۆوە داوای مۆڵەتو ڕێپێدان لەدایکت بکە: گەنجەکە گوتی: ئەی بەڕێز ئەتۆ من ناناسی کوڕی کێم؟ من کوڕی خاوەنی دەست بەندەکەم، ئەگەر خودا حەز بکات یەکێك دەبم لە شەهیدەکان، بەخودا سوێنت دەدەم سەیری بچوکیم مەکەنو بە بێڕێزی سەیرم مەکەنو، لە جیهادو تێکۆشان، لەگەڵ خۆتان ڕێگەم لێمەگرن، چونکە دایکم سوێندی داوم کە بەتەواوی جەنگ بکەمو نەگەڕێمەوە دواوە و، پشت لەدوژمنان نەکەمو، پشت بەخودا ببەستمو، داوای هاوسێیەتی لەگەڵ باوکم و هاوڕێ و برا بەڕێزەکانی سەنگەر و جیهادم بکەم لە

بەهەشتداو، وەپێی گوتم: ئەگەر خودا شەهیدی كردە بەشت لە داواكاری و پاڕانەوە بێبەشم نەكەیت، ئینجالەدوایی دایكم باوەشی پێدا گرتم و، بەسنگ‌وبەرۆكی خۆیەوە گوشیم‌و، سەری بەرزكردەوە بۆ ئاسمان‌و گوتی: ئەی پەروەردگارم، ئەی گەورە و سەردارم، ئەو كوڕە ڕۆڵەی منە! خۆشەویست و تێكەڵی خوێن‌ودڵمە، وابەتۆم سپارد بەشترین پارێزگاری سپاردە ئەتۆی ، تۆش لەباوكی نزیك بكەوەو بیكە بەهاوسێی ئەو بەهەشتدا. كاتێ (ئەبو قودامە)ﷺگوێی لەو قسانە بوو: چاوەكانی پڕ بوو لە فرمێسك و، ڕازی و قایل بوو كەئەوگەنجە بەشداری سوپاو جەنگاوەرانی شەڕی بكات و، لەگەڵیاندا بڕوات. ئەویش لەگەڵیاندابوو بە هاوڕێ‌و، ئەو شەوە كە ڕۆژیان كردەوە بۆ بەیانی بانگ كەرێك بانگی كرد ئەی سوارچاكانی خودا ئەی هەڵگرانی ڕێبازی ڕاستی، سواربن‌و سەركەون بەهەشت چاوەڕێتانە بڕۆن بەسەنگینی‌و، سەربەرزی تێكۆشن و، بجەنگن بۆ سەربەرزی بەرنامەی خودا. زۆری نەبرد سوپای بێ باوەڕان هێرشیان بۆ هێنان‌و پەلاماریان دان. یەكەمین كەس كە هەستاو ڕووبەڕوویان هاتەوە ئەوگەنجە خاوەن دەست بەندە بوو، كەبەڕاستی ئازایەتی‌و، لێهاتویی هێزو بینایی بینەرانی دڵخۆش‌و سەر سام كرد:كەهەر جارەی بەلایەكدا دووژمنانی دەڕەتاندو، بڵاوەی پێدەكردن‌و ، سوار چاك و چاپوكەكانی بێباوەڕانی لەزەوی دەدا و دەیكوشتن. ئەو شەڕە خوێناویە زۆری درێژە كێشا بەڵام، لەكۆتاییدا بەشەهید بوونی چەندین قارەمانی جەنگ‌و، ئەو گەنجەكوڕی خاوەنی ئافرەتی (دەست بەند)كە كۆتایی پێهات سەركەوتن بووبە بەشی موسڵمانان. لەدوای گەڕانەوەی سوپای ئیسلام بەرەو شاری(ڕوقەی) (ئەبو قودامە)ﷺ ڕووی كردە ماڵی ئەو ئافرەتە خودا پەرست‌و بەهیمەتە بۆ ئەوەی هەواڵی سەركەوتنی شەڕ و شەهید بوونی كوڕەكەی پێبدات.گەیشتە لای‌و پێی گوت: خۆشی‌و مزگێنی بێت كە خودای گەورە هەدیە و دیاریەكەی لێوەرگرتی؟! ئافرەتەكە بەچاوی پڕ فرمێسكەوە گوتی: تو خودا كوڕەكەم شەهید بوو، خودا بردیەوە؟! (ئەبو قودامە) گوتی:بەڵێ خودا بردیەوە: ئەمجار ئەو ئافرەتە سەری بەرز كردەوە بۆ ئاسمان‌و گوتی:(الحمد لله الذى جعله ذخيرة لى يوم القيامة ) واتە: سوپاس بۆئەو خودایەی كە ئەوەی كردە سەرمایە و توێشوی پارێزگاریم بۆ ڕۆژی دوایی.

# سوێندبێت خودا ئەوانە سەردەخات کە پشتگیری بەرنامەکەی دەکەن

## ولينصرن الله من ينصره

لە سەردەمی خەلافەت و سەرداری (عومەری کوڕی خەتاب)ﷺسوپای موسڵمانان بەسەر کردایەتی(سعدی کوڕی وەقاص)ﷺکەوتە ڕێگا بەرە و جەنگی فارسەکان لە شەڕی قادسیە دا:لەپێشی بەڕێکردنی سوپای ئیسلام داخەلیفەی موسڵمانان. لەوکاتی تەواوی ئامادە باشی ڕۆیشتن بۆ ئەو جەنگە گەورەیە. سەرکردە و سەر بازەکانی کۆکردەوەو، وتەیەکی زۆر بەنرخی بۆ خوێندنەوە: لە وتەکەیدا فەرمووی: ئەی سەرکردەی سوپا (سەعدی کوڕی وەقاص)ﷺ فەرمان بەتۆش‌و بە هەموو سوپای جەنگاوەران دەکەم کەلەخودا بترسن‌و، تەقوای خودابکەن لە هەمو کات و سەردەمێکدا، چونکە بەڕاستی خۆپارێزی باشترین چەك ودەستکەوتە بەسەر دوژمنانداو، گەورەترین پیلان و تاك تیکی سەرکەوتنی شەڕە. وە داوا لە تۆش و جەنگا وەرانی شت دەکەم زۆر بە توانا و خۆڕاگربن، لەبەرامبەری پارێزگاری لە گوناهەکانتان زۆر زیاتر لە پارێزگاری لە دوژمنەکانتان. چونکە بە ڕاستی تاوان و گوناهی سوپا زۆر بە ترسترە لەجەنگ و شەڕی دوژمنان. باش بزانن ئێمە بەهۆی زیاتر خەراپی‌و تاوانی دوژمنانەوە سەرکەوتوو دەبین: نەوەك‌و بەهۆی توانا و ئازایەتی‌و سوپای زۆرەوە. وە زۆرباش بزانن‌و، ئاگاتان لەخۆتان بێت کە بەڕاستی لەڕێگا بڕین‌و ڕۆیشتنیش تاندا چەند فریشتەیەکی خوداتان لەگەڵ دایەوئاگاداری هەمووهەڵس‌وکەوت‌ورەفتارتانە هەرچی دەیکەن پێیان ئاگادارەو، لێیان بزر نابێت. دە ئێوەش شەرم لەو پەروەردگارە بکەن ونافەرمانی خودا مەکەن، کە ئێستا ئێوە لەپێناوی ڕەزابونی خودا کاردەکەن. ئێوە بەوەش غرور و لە خۆتان بایی مەبن بڵێن دوژمنەکەمان لەخۆمان شەڕەن گێزتر و خەراپترن و، بەسەرماندا سەرکەوت و نابن. زۆر گەل و نەوەی خەراب سەرکەوتوو بوون بە سەر نەتەوەیەکدا کە لە سەرکەوتوەکان زۆر باشتربوون. هەروەکو ئاگرپەرست و، بێباوەڕانی سەرخست بەسەر هۆز و گەلی نەوەی ئیسرائیل، لە کاتێکدا کە تاوانیان بە ئاشکرا ئەنجام دەدا، بەڵام هێشتاش گوناه و تاوانەکانیان زۆر کەمتریش بوو

ـبتپەرست و ئاگر پەرستەكان ( فَجَاسُواْ خِلَـٰلَ ٱلدِّيَارِ ۚ وَكَانَ وَعْدًا مَّفْعُولاً )الإسرى/٥
واتە: بەڵێنی خودایە كە ڕۆژێك دێت موسڵمانان بەدوای جولەكە و یەهودیدا ـگەڕێن و هەموو كون و كە لەبەرێكی شاخ و شار دەپشكنن و بەدوایانەوە دەگەڕێن بیاندۆزنەوە. ئەوەش وەعدو بەڵێنی خودای گەورەیە كەدێتە جێ إنشاء الله.
ئینجا لە خودا داوا بكەن كە سەركەوتووتان بكاتو پارێزگاریتان لێبكات بەسەر گیانو نەفستان لە گوناه و تاوان، لە پێشی ئەوەی داوای سەركەوتن و یارمەتی لە خودا بكەن بۆ سەركەوتنتان بەسەر دوژمنانتاندا.

## لەخودادەخوازم كەبەودوو قاچە شەلەوە بڕۆمە بە هەشتێ

## أرجو الله أن أطأ بعرجتي الجنة

دەگێڕنەوە (عەمری كوڕی جەموح)ﷺ شەلێكی تەواو شەل بوو: ئەو پیاوە بەڕێزە چوار كوڕی هەبوو: هەر كاتێك پێغەمبەرﷺ بڕۆیشتبایە بۆ جەنگ ئەو كوڕانە لەگەڵیدا دەڕۆیشتن و دەجەنگان. هەتاكاتی جەنگی(ئوحود)هاتە پێشەوە( عەمر ) بەكوڕەكانی گوت: بەخودا لەو جەنگەدا منیش لەگەڵتاندا دێم بۆ مەیدانی جەنگ. كوڕەكانی گوتیان: ئەی بابە تۆ زۆر شەلیو، توانای چونە شەڕت نییە؟ وە ئەگەر تواناشت هەبێت خودای بەبەزەیی مۆڵەتی تۆی داوەو، شەڕی لەسەر پێویست نەگێڕاوی:ئەتۆ دانیشەو ئێمە لەباتی تۆش دەڕۆینە مەیدانی جەنگ و دەجەنگین، (عەمر) بەشەلەشەل ڕۆیشت بۆلای پێغەمبەر و سكالای كوڕەكانی لەلای پێغەمبەرﷺكرد، گوتی ئەی پێغەمبەری خودا كوڕەكانم ڕێگەی جەنگم لێدەگرن و، ناهێڵن لەگەڵ بەڕێزتاندا بێم بۆ جەنگ، چونكە بەڕاستی من زۆرحەزم لە جەنگ و شەهیدیە لەڕێبازی خوداو، دەمەوێ بە وقاچە شەلانەوە بڕۆمە ناوبەهەشت. پێغەمبەرﷺفەرمووی: ئەی (عەمر)خودا ڕێگای تۆی داوە و مۆڵەتی نەڕۆیشتنی بەرەكانی جەنگی لە تۆ وەرگرتوە، بەڵام (عەمر)لە سەر ڕۆیشتنی بۆ بەرەكانی جەنگ بەردەوام بوو بۆیە پێغەمبەر بەكوڕەكانی گوت: لێیگەڕێن با(عەمر) لەگەڵتاندا بێت بۆبەرەكانی جەنگ ، هیوا دارم كەخودای گەورە شەهیدی بەنسیب بكاتو، بەو هۆیەوە ببێتە دانیشتوی بەهەشت. لەدوای ئەوە (عەمر) لەگەڵیان ڕۆیشتە بەرەكانی جەنگو، لە دوای شەڕكردنێكی مەردانە (عەمر) شەهید بوو، بە شەهیدی گەڕایەوە خزمەت پەروەردگاری مەزن.

## ئازایی و نەبەردی: الشجاعة

تعالى {ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُواْ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَـٰنًا وَقَالُواْ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ }:آل عمران/١٧٣ واتە: ئەو ئینسانە باوەڕ لاوازو ترسنۆکانەی پەروەردەی دەستی کوفر و بێباوەڕین دەڕۆنە لای باوەڕدان بۆ ئەوەی لە باوەڕەکەیان دووریان بخەنەوە بە قسەی درۆزنانەی خۆیان وا لە باوەڕداران دەکەن دەڵێن: بەخوا کۆمەڵێکی زۆری بێباوەڕان واخەریکی پیلان‌ولەناو بردنتانن ئەگەرواز نەهێنن لەو ڕێبازەی لە سەرین. بەڵام ئەو باوەردارانە بەو جۆرە گوتەو قسانە باوەڕەکەیان زیاتر و بەهێز تر دەبێت‌و، هەرگیز ئە وپڕ و پاگەندە چەپەڵانە کاریان تێناکا و تەنها دەڵێن: ئێوە بڕۆن بەڕێگە چەپەڵەکەی خۆتان، ئێمە خودامان هەیەو بەسمانە بەڕاستی خودا باشترین یارمەتیدەرە بۆمان.

ئادەمیزادەکان بە جۆرێك بارهاتوون: کە هەردەم بە ئازایان‌و نەبەردان دا هەڵبلێن‌و ستایشیان بکەن‌و بەرزیان بکەنەوە. زانایان‌و لێهاتوانی ڕەوشتی باش زۆرشتی باش‌و جوانیان بۆ گەورەیی‌و ئازایەتی لە پێشەوەی هەموو بەها بەرزەکانی ئادەمیزاد داناوە. ئازایەتی وەکو بیری لێدەکەینەوە و دێتەوە بیرمان لەناو بژی‌و، ئاشتکردنەوەی نێوانی پاڵنەری هۆش و هەست و بەربەستی دڵسۆزی هەستیاری و دەرونییە: وە ترسنۆکیش لە نێوانی نائارامیدا واهەست دەکات کە بەو ترسەی پارێزگاری لە نەفس و گیانی دادەکات و ژیانی پارێزرا و دەبێت: بۆیە لەپێناوی مانەوەکەی هەموو سەرشۆڕی و ملکەچیەك قبوڵ دەکات‌وپێی ڕازییە. وەهەڵ چون و شاڵا و بردن بەبێ بیرکردنەوە پاڵنەری نەریت‌و سروشتی شەڕەنگێزیە. گیان‌و کرۆکی دوژمنکارانەش بەبێ ئەوەی کەهیچ هیوای شەڕو دوژمنایەتی بێت‌وداوای بکات: لەو کارانەیە کە ئادەمیزاد بەگەورەی دادەنێت‌و ڕێزی لێدەگرێ: وەئەو شتە گەورانەی کە گەورەیی ئازایی ڕێزی لێدەنێ‌و بەگەورەی دەزانێ لەو گەورایەتیە نیە کە بە بەرز و گەورە دەژمێر درێ و سود و قازانجێکی تایبەتی دەست دەکەوێت تەنانەت ئەگەر ئە وسودە پێوەرێکبێت لەو پێوەرانەی کەڕەوشتی پێ

دەپێورێتو، کرداری پێدەپێودرێتو، چارەنوسی ئادەمیزادی پێ دیاری دەکرێ.
ئازایەتی لە تەواوی ڕوداوەکاندا لە گەورەیی خۆیداکەم ناکاتەوەو دانابەزێ بەهۆی ئەوڕوخانو تێشکانە لەپێشی ئەوەی حسابی سەرکەوتنو بردنەوەی بۆبکرێ، ئازایەتی ئەو پاڵ نەرە گەورەیە یە کە پاڵمان پێوە دەنێ بۆ کرداری باشو سودمەندلە تێکۆشانو جەنگدا ئەو کردارە جوانو گەورانەش سودو کەڵکەکانیان بۆکەسانێك ڕادەماڵێ کەزۆر باش ترو جوان تربێت لە سودو کەڵکەکانیان لە خاوەنەکەی.
ئازایەتی لە باوەڕەوەیە: هەر بۆیەشە پێغەمبەری خودا نمونەی بەرزبووە لە ئازایەتیدا لەناو کۆمەڵی باوەڕداران.حەزرەتی عەلی دەفەرموێ: **(كنا إذاأحمر البأس ولقى القوم القوم إتقينا برسول الله فما يكون أحدأقرب إلى العدومنه) وقال أيضا( لقد رأيتنى يوم بدر ونحن نلوذ بالنبى وهو أقربنا إلى العدو وكان من أشد الناس يومئذ بأسا )**
بەڕاستی ئەوە تەنها باوەڕەموسڵمان وا لێدەکات کە ئەو گیانەی لەپێناوی بەدی هێنانی ئامانج و باوەڕەکەی و، نەهێشتن و لابردنی دوژمنی دووژمن کاراندا و پارێزگاری و سەروەری شەرەف و ئابڕوی گیانی شیرینی بەکەم دەزانێو، لەو پێناوەدا پێشکەشو بەختی دەکات، وە بەڕاستی تەنها باوەڕە کە ئازایەتی و نەبەردی خۆنەویستی بە حەزرەتی (خالید)دە بەخشێ کەلە پێناویدا گیانی ببەخشێ کەئامادەی(١٠٠) سەد جەنگ بووە و جێگەیەکی ساغی نەماوە کەشیرو ڕمبو تیری بەرنەکەوێت. لە کۆتایشدا لەسەر جێگایماڵەوەی بە ڕازیبون و قایلی دەمرێو، فەرمایشتە بەرێزەکەی لە جیهاندا دەنگدەداتەوە کە دەفەرموێ: (لانامت أعين الجبناء) واتە:چاوی ترسنۆك ناخەوێت. وە بەڕاستی ئەو باوەڕە وا لە حەزرەتی (ئەبوبکر) بکات ئەو وشە جوانە هەردەم درەوشاوە بێت کە دەفەرموێت (أحرص على الموت توهب لك الحياة) واتە: بەخەمو تەنگی مردنەوە مەبە، ژیانت پێدەبەخشێ. بەڵێ بەڕاستی هەر باوەڕەکەوا لە موسڵمان بکات هەردەم خۆنەویستو خۆڕاگربێت بەرامبەر هەموو پێشهاتەکانی ژیان: هەروەکو خودا دەفەرموێ:{ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُوا۟ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَـٰنًا وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ. فَٱنقَلَبُوا۟ بِنِعْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضْلٍ لَّمْ يَمْسَسْهُمْ سُوٓءٌ وَٱتَّبَعُوا۟ رِضْوَٰنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَظِيمٍ }ال عمران/١٧٣-١٧٤
لە پێشەوە واتەی ئەو ئایەتەمان کرد.

# ئەی محمد لەمن ناترسی

# أما تخافني يا محمد

دەگێڕنەوە پیاوێك لە هۆزی (مەحاریب)خۆی ئامادەی سەفەر كرد و لەماڵەوە دەرچو بەرەو لای پێغەمبەر: بە هیوای كوشتنی! كاتێ گەیشتە لای پێغەمبەر سەیری كرد لە جێگەیەك دانیشتوە و شیرەكەشی لە دووری خۆی هەڵواسیوە، بۆیە كابرا پەلاماری شیرەكەی داو بەدڵنیاییەوە گوتی:محمد ئەها شیرەكەت سەیری بكە! پێغەمبەرﷺفەرمووی: بەڵێ ئەوە شیرەكەمە، ئەو كابرایەش بەشیری رووتی ڕای دەوەشاندو، ڕووی كردە پێغەمبەرو لێی نزیكدەكەوتەوە، بەڵام خودا پارێزگاری لێدەكرد گوتی:ئەی محمد ئێستا لە من ناترسی؟ وا بەشیری ڕووتەوە بەرامبەرت ڕاوەستاوم ؟پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نانەخێر لێت ناترسم خودا لە تۆدەم پارێزێ بەو جۆرە ئەو پیاوە هەر دەڕۆیشتە پێش و هەڕەشەی دەكرد، بەڵام هیچ توانا و دەسەڵاتێكی دەست درێژی نەبوو، هەتا شیرەكەی لەدەست كەوت و، پێغەمبەریﷺ خودا. پەلاماری داو هەڵیگرتەوە ئەو ڕووداوە لە جەنگی(ذات الرقاع) ڕویداوە كە بەڕاستی زۆر دڵتەزێنەكە ئازایەتی و نەبەردی و، خۆڕاگری و، دامەزراوی باوەڕی پتەوی پێغەمبەری خوداﷺبەدیار دەخات.

# لە باوكی عمارە بگەڕێن بەڕاستی جنێوی زۆرم بە برازاكەی داوە

# دعوا أبا عمارە فقدسببت إبن أخيه

جارێكیان(ئەبوجەهل) لەلای كێوی(سەفا)بەلای پێغەمبەردا تێپەڕی زۆر جنێو قسەی ناشیرینی پێوت و، زۆرباسی كەموكوڕی و بێدەسەڵاتی و، لاوازی و، ترسنۆكی پێغەمبەری گوت: هەتا وەڕەز و بێتاقەت بوو: ئینجا پێغەمبەریﷺ بەجێهێشت و، ڕۆیشت بەرەو چایخانەو یانەی قورەیشیەكان لەلای كەعبەو، لەگەڵیان دانیشت: پێغەمبەرﷺجنێوەكانی زۆر پێناخۆش بوو: وەڕز و بێتاقەت بوو بەڵام، هیچ وەڵامی ئەبوجەهلی نەدایە وە. لەو كاتەدا كارە -كەروپێش

خزمەتێکی (عبداللەی کوڕی جودعان) لەماڵی خۆیانەوە گوێی لێدەبێت. کەئەو هەموو قسە سوكو ناشیرینانە بە پێغەمبەر دەڵێت. لە دوای ئەوە بەچەند ساتێکی کەم(حمزەی کوڕی عبدالمتلب ﷺ)بە چەك و تیرو کەوانەوە لە ڕاو دەگەڕایەوە، ڕۆیشتە کەعبەو تەوافی کرد.چونکە عادەتی حەمزە وەها بوولە هەر شوێنێك دەگەڕایەوە هەتا زیارەتی کەعبەی نەکردبا نەدەڕۆیشتەوە بۆ ماڵ. لە دواییدا بەرەو ماڵ گەڕایەوە، بەلای یانەی قورەیشیەکاندا دەڕوات و سەلامیان لێدەکاو وتووێژیان لەگەڵدا دەکات: حەمزە بەڕێزترین گەنجی قورەیشیەکان بوو، ئینسانێکی بەتوانا و بەهێزبوو: چاوی بەکارە کەرەکەی (عبدالله ی کوڕی جودعان) دەکەوێت و پێی دەڵێ ئەی (باوکی عەمار) ئەگەر تۆزێك پێشی ئێستا کوڕی برایەکەت محمدت دەدیت لێرە دانیشتبوو: ئەبو جەهلی کوڕی هوشام بەلای داهات چی پێدەوت؟ زۆر شتی ناشیرین و سوکایەتی و زۆری ئازار پێگەیاند هەتا ئەبوجەهل وەڕەز بوو ڕۆیشت. بەڵام محمد هیچ قسەی نەکردو، لە دوای ئەوە ئەویش ڕۆیشتەوە. حەزرەتی (حەمزە)لەگەڵ ئەو هەموو ڕێز و پایەی کە هەیبوو: زۆر ڕقی هەستاو، دەستی کرد بە گەڕان بەدوای ئەبوجەهل دالەلای کەس ئۆقرەو ڕاوەستانی نەبوو: هەتا چاوی بە ئەبوجەهل کەوت لەلای یانەی قورەیشیەکان دانیشتوە. حەمزە پەلاماری داو کە وانەکەی لەسەر سەری داو لایەکی سەری شکاند، پێیگوت: ئەتۆ قسەی ناشیرین بە کەسێك دەڵێی، کە ئەمن لەسەر ڕێبازی ئەوم، ئاینی ئەوم وەرگرتووە، ئەگەر ئازاو پیاوی ئەوقسانە بۆمن دووبارە بکەوە، بەڵام ئەبوجەهل هیچی نەوت، کۆمەڵێك لە پیاوانی هۆزی مەخزومی بەرەو ڕوی حەمزە بوونەوە بۆ پشتیوانی لە ئەبوجەهل بەڵام ئەبوجەهل هاتە قسەو گوتی: لە باوکی عەمارە گەڕێن، بەڕاستی من زۆر قسەی ناشیرینم بە کوڕی براکەی گوتوە: حەزرەتی حەمزە ﷺ زۆر خۆڕاگر و بەئارام بوو لە شوێنکەوتنی ئاین و بەرنامەکەی پێغەمبەر ﷺ.

# شەهید عەرش و کورسی خودای بۆ دەلەرزێ

# شهید إهتز له العرش

کاتێ هێرشی بێ باوەڕان تین و هێزێکی زۆری کردە سەر باوەڕداران‌و، گەمارۆی مەدینەیان داو، ویستیان بەهێز و دەسەلآتێکی تەواوەوە بڕۆنە ناوشاری مەدینەوە لەوکاتەدا دوو سوپای زۆر گەورە بەرامبەری یەکتر ڕاوەستا بوون و تیرهاوێژان تیربارانی یەکتریان دەکرد. پێغەمبەری خوداش لە لایەکەوە بە ئامادەباشی تەواو لەسەر ولآغەکەی ڕاوەستا بوو. (سەعدی کوڕی وەقاس)ﷺیش چاودێری سنوری شاری مەدینەی دەکرد، هەتا دووژمن دزەنەکەنە ناوشار. بێباوەڕان هەوڵیاندەدا حەشارگەیەك بدۆزنەوەو لەوێوە کارەکانی خۆیان ئەنجام بدەن: زۆرهەوڵیان دەداو چەندین هێرشی یەك لەدوای یەکیان بۆ دەکرد. هەتالە ئەنجامدا (جیهادی کوڕی قەیسی کوڕی عەرقەی) توانی بە لێدانی تیرێکی جەرگ بڕوکوشندە دەماری سەرەکی خوێن بەری سەعدی بڕی(جیهان) هاواری دەکردو و دەیگوت بزانن ئەمن کوڕی (عەرقەم) (سەعد)یش بەلاشەی خوێناویەوە وەلآمی دایەوە گوتی:خودای گەورە دەموچاوت لەناو ئاگری دۆزەخ عارەقاوی بکات: خوێن لەلاشەی سەعد دەهاتەخوار و لەبەری دەڕۆ یشت ئینجا خێرا بەهانای گەیشتن‌و، دەرمان داویەکی کاتیان بۆ کرد بۆئەوەی خوێن بەریەکەی بوەستێ، پێغەمبەرﷺ فەرمانی داڕەشمالێك لە تەنیشتی خۆیەوە بۆ سەعد هەڵبدەن بۆ ئەوەی سەعد لەژێر چاودێری خۆی دابێت. ئینجا سەعد سەری بەرزکردەوە بۆ ئاسمان وگوتی: (اللهم إنك تعلم انه ليس أحدأحب إلى من أن أجاهدفيك قوماكذبوارسولك وأخرجوه، اللهم أظن انك قدوضعت الحرب بيننا و بينهم فان كان بقى من حرب قريش بشىء فابقنى لهم حتى اجاهد فيك، وان كنت قد وضعت الحرب بيننا و بينهم فافجرها واجعل موتتى فيها ولاتمتنى حتى تقرعينى من بنى قريظة)

بەو جۆرە پێغەمبەر و موسڵمانان چەند شەوێك لەژێر گەمارۆی بێباوەڕاندا بوون: دوایی لەبەر خودا پاڕانەوە. دەیانفەرموو:(اللهم انى انشدك عهدك ووعدك، اللهم منزل الكتاب سريع الحساب اهزم الاحزاب)خودای بەبەزەیی دوعاونزاکەی

پێغەمبەری وەرگرت. خودای بە دەسەڵات بەشەو بایەکی زۆر بەهێزی هەڵکرد، دونیای کردە تەپ‌وتۆزو تەمتومان ، بە جۆرێك هێز و سوپای (ئەحزاب)ی پەرتەوازە کردو، توانا و دەسەڵات یان نەماو، پێش‌و بەردەمی خۆیان نەدەدیت. بەو جۆرە خودای بەدەسەڵات باوەڕدارانی پاراستو، ڕزگاری کردن لەو سوپا گەورە و بەهێزەی بێباوەڕان. موسڵمانانیش سوپاس و ستایشی پەروەردگاری مەزنیان کرد. ئینجا لەدوای ئەو بەڵایەی کە بەسەریاندا هات مەیدانی جەنگیان چۆڵ کردوگەڕانەوە دواوە. لەدوای گەڕانەوەی سوپای ئەحزاب، پێغەمبەری خودا هەڵوێستێکی وەرگرتو، بیری دەکردەوە لەوەی کەخودای گەورە ڕق و قینی لەو شوێنە گرتووەو توڕە بووە، لە بەو هەڵوێستی نامرۆڤانەو دووژمن کاریان بۆ ئیسلام و موسڵمانانو، هەڵوەشانەوەی ئەو پەیمان‌وبەڵێنەی کەدابوو یان.لەدوای ئەوە موسڵمانان(٢٥) بیستو پێنج ڕۆژ ئابڵوقە و گەمارۆی هۆزی (قریزە)یاندا لە دوای ئەوە جولەکەکان نوێنەریان بۆ لای پێغەمبەر نارد کە ڕێگەیان پێبدەن‌و وازیان لیَ بهێنن کەکۆچ بکەن بۆ (ئەزروعات) لەوڵاتی شامو، هەرچی ماڵ و موڵکی مەدینەیان هەیە بۆ موسڵمانانی بەجیَ بهێڵن. بەڵام پێغەمبەر لەبەر ئەو هەموو دووژمن کاریانەیان داوایەکەی لیوەرنەگرتن و قبوڵی نەکرد. فەرمووی: بایەکێك دیاری بکەن بۆ ئەوەی ببێتە دادوەری نێوانی ئێمەو ئەوانیش: کاتیَ جولەکەکان زانیان هیچ ڕێگای چارەکردنیان نییە، بە بیَ خۆ بە دەستەوەدانو، هەڵبژاردنی دادوەرێك لە نێوانیاندا، بۆ ئەو مەبەستە (سەعدی کوڕی مەعان) یان کردەدا دوەری نێوانیان. ئینجا پێغەمبەر داوای لە(سەعد) کرد کە لە بن خەیمەکەی بریندار و کەوتبوو بێت و دادوەری نێوانی موسڵمانانو جولەکەکانی هۆزی قەریزە بکات: سەعد لەدوای ئامادەبونی نوێنەری ئەو دولایەنە ڕاپۆرتی ئەو هەموو زوڵم و ستەم و غەدرەی کە هۆزی قەریزە بەرامبەر بەموسڵمانان کردویانە، کەئاخرشەڕو جەنگیان، ئەو شەڕی خەندە قە یە ، کە زۆر نزیك بوو موسڵمانان شکستی تەواو بهێننو، شاری مەدینە داگیر بکەن، خستیە ڕووخوێندیەوە. ئینجا زۆر بە ئازا و بوێرانە، لەگەڵ زانیاریەکی تەواو دادگەریانە، بە بێکارێکی دووژمنکارانە وەکو

نوێنەری ڕاستەقینەی هەردووك لا، چونکە ئەگەرئەوڕاستیودۆستایەتیە نەبایە، جولەکەکان هەڵیان نەدەبژارد. یەکەم فەرمانێکی دادگەریانە گوتی: دەبێ شەڕکەرو جەنگاوەرەکانی هۆزی قوڕەیزە بکوژرێن و، سەردا بگیرێ‌و، بەسەر موسڵماناندا دابەش بکرێ. ئینجا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی (سەعد) بەراستی دادوەریەکەت بە گوێرەی فەرمان و دادوەری خودا بوو، وە هۆی ڕەزابون وقایلی خوداو، تەواوی باوەڕداران بوو، کەبەڕاستی هەر بەو شێوە یەش لە ئایندا فەرمانت پێکراوە. لە دوای ئەوە ڕۆیشتە ناو شاری مەدینەو فەرمانی چاڵهەڵکەندنیان داویەك بەیەك جولەکە جەنگاوەرەکانیان هێناو لە سەریاندان و لەو ناوچاڵانەیان هاویشتن و شاردیاننەوە. لەدوای تەواوبوونی دادوەریەکە، سەعد گەڕایەوە بۆ بن ڕەشماڵەکەی و، برینەکەی کە بە ئاگر سوتێندرا بوو (کەوی) کرا بوو، خوێنی لێدەهاتەوە، بۆیە بۆ دووەم: جار کەویکرایەوەو، بە ئاگرداخ کرا، دووبارە خوینی تەواوی لەبەر دەڕۆیشت و تەواو (نەزیف) ببوو هیچ چاری بۆ نەکرا و گیانی دەرچوو، شەهیدبوو: لە دوای ئەوە حەزرەتی جبرائیل هاتە لای پێغەمبەری ﷺ خوداو فەرمووی: ئەی محمد ئەو کەسە کێیە کەدەرگای ئاسمانەکانی بۆ کراوەتەوەوعەرش و کورسی خودای بۆ لەرزیوە؟ پێغەمبەریﷺخودا تاكو ئەو کاتە نەیزانیبوو کە سەعد مردووە، بۆیە خێرا ڕاپەڕی و ڕۆیشتە بن ڕەشماڵەکەی سەعدو، سەیری کردگیانی دەرچووە، ئینجا تەرمەکەیان لەژێر ڕەشماڵەکە هێنایە دەرونووێژیان لە سەر کردووبەرە و جێگای هەتا هەتایەیان هەڵگرت بۆ شاردنەوەی، هاوڕێیانی پێغەمبەر گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوداﷺبەخوا ئێمە چەندین تەرمی مردومان هەڵگرتووە بە ئەندازەی ئەو تەرمەش نەبووە، لەوتەرمە قورس و گرانتر بووە ، بەڕاستی ئەوتەرمە هیچ وەزن وکێشی تێدا نییە و زۆر سوکە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی :چۆن واسوك و بێوەزن نابێت، کە چەندین فریشتە و مەلائیکەتی خودا لە ئاسمانەوە دابەزیون‌و، تەرمەکەیان هەڵگرتووە، کە تا ئێستا نەمدیوە ئەوەندە فریشتە دابەزنە خوارەوە.

# ئازایەتی لە جەنگو شەڕدا

# الشجاعة فی الحرب

دەگێڕنەوە كاتێ(سەعدی كوڕی وەقاس)ﷺ گەیشتە نزیكی دەریای (دجلە) شاری مەدائن)یان لێ بەدەركەوت سەیریان كرد هەتا چاو بڕ دەكات شار و ئاوەدانیو خۆش یەو، چاویان بەباڵە خانەو كۆشكەكانی(كسری)كەوت جوانی و ڕازاوەیی و گەورەیی ئەو باڵەخانانە بێوێنەبوون: بیروڕایان واكرد كە هیچ كەسێكیان لەسواری وڵاغەكان یان دانەبەزنو، بەبێ كەشتیو بەلەم بەسەر دەریادا بپەڕنەوە.! كە بەڕاستی ئەوەش كارێكی زۆر دژوار و دەگمەن و نوێكار بوو بەلایانەوە: بۆیە لەپێشەنگی هەموویانەوە (عاصمی كوڕە عەمر)لەگەڵ(٦٠٠)شەش سەدنەفەری چاپوك و ڕزگاركەر، ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە سەر كەناری دەریاو، ویستیان یەكەمین كۆمەڵ كە لەو دەریایە دەپەڕنەوە ئەوان بن، بەڵام هێندێك لە پیاوانی ئەو كۆمەڵەیە ڕاڕاو دو دڵبوون لەتوانای پەڕینەوەی سەر دەریا. بۆیە (عاصم)ئەو ئایەتەی بۆ سوپای جەنگاوەران خوێندەوە:{وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ كِتَٰبًا مُّؤَجَّلًا ۗ وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا نُؤْتِهِۦ مِنْهَا وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ ٱلْءَاخِرَةِ نُؤْتِهِۦ مِنْهَا ۚ وَسَنَجْزِى ٱلشَّٰكِرِينَ }.ال عمران/١٤٥

واتە: دەبێ ئێمە زۆرباش بزانین هیچ كەسێك بە بێویستی خودا نامرێتو هەتا ئەو كاتەكە خودای بە توانا بۆی دیاری كردووە، ئەوەش وامان بۆ دەردەخات كە هەرگیز لەمردن نەترسینو، هەموو ئیشوكارە جوانەكانمان بەچاكی ڕاپەڕێنین. ئینجا ئەوانەی كە تەنها ژیانی دونیایان دەوێت هێندێكی پێدەبەخشین، وە ئەوەی كەژیانی دواڕۆژیشی دەوێت، ئێمە هەرپێی دەبەخشین، با ئادەمیزادەكان خۆیان سەرپشك بن لە كاروباری ژیانی خۆیاندا، دونیایان دەوێت یان دواڕۆژ، وە لە ڕۆژی دوایی پاداشتی چاكانو سوپاسگوزاران دەدەینەوە.

ئینجا(عاصم) سەری بەرزكردەوە و خۆی بەدریادادا‌و، سوپایەكەشی لەدوای ئەو خۆیان بە دەریادا داو دەستیان كرد بە پەڕینەوە بۆ پاراستنی كەناری دەریا. لەدوای ئەو(قەعقاعی كوڕی عومەر)ﷺكە بەشێكی لەشكری یەك بوو (الكتیبە

الاولی): چاویکەوت بە جەنگاوە رانی بەرە و پێشەوە دەڕۆن، سەیری کرد وا دوژمن لە ڕێگایەکی کەوە ئامادەباشی دەکات بۆ ئەوەی لەو کاتی پەڕینەوەدا فرسەتیان لێبدینێ و لێیان بدەن. قەعقاع فەرمانیدا هەر خێرابە هەر (٦٠٠)شەش سەد کەس و وڵاغەکانیش یا نەوە لە دەریا بدەن و بڕۆنە ناوی بۆ پەڕینەوە وەك و عاصم و هاوڕێکانی، بەڵام دوژمنانی بێباوەڕ کە چاویان بەوکارە کەوت سەرسام و سەرگەردان بوون: کەئەوانە چین بەو جۆرە لە دەریا دەدەن؟! بۆیە ئەوەیان بەفرسەتزانی کە لەوکاتەدا پەلاماریان بدەن و زەرەریان پێبگەیەنن، هەر خێرا پیاوە ئازاو جەنگاوەرە کانیان نارد کە نەهێڵن بپەرنەوە بە سەلامەتی و، شەڕیان لەگەڵدا بکەن.لەوکاتە دا(عاصم) هاواری کردو و فەرمووی: خێراکەن تیر ئەندازەکان بەتیرەکانیان چاویان کوێر بکەن بەو جۆرە سوپای ترس و سام (کتیبە الاهوال) هەموویان بە سەلامەتی پەڕینەوە.

## مەترسێن

## لن تراعوا

سەیری پێغەمبەری ﷺخودابکەن ئازاترین و، بەخشێنەر ترین و، جوانترین، ئادەمیزاد بوو: جارێکیان دانیشتوانی مەدیە گوێیان لە دەنگەدەنگ و هەرایەکی زۆر دەبێت، هەموو خەڵکان ترسیان لێهات، کە ئەوە دوژمنەو بەسەریان داداون: پێغەمبەریش یەکێك بوو لەو کەسانەی کە گوێی لەودەنگە دەبێت هەر خێرا خۆی ئامادە دەکات و شیر و چەك لەخۆی دەبەستێت و، سواری وڵاغەکەی دەبێت و بە تەنیا لەپێشی هەموو خەڵکەکە بەرەولای دەنگەکە دەڕوات. زۆر دەگەڕێ و هیچ بەدی ناکات، لەدواییدا دەگەڕێتەوە، لەڕێگا چاوی بەخەڵکی مەدینە دەکەوێت ئەوانیش بەرەولای دەنگەکە دەڕۆن لەڕێگا چاویان بە پێغەمبەرﷺ دەکەوێ لەلای دەنگەکەوە دەگەڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ پێیان دەفەرموێ: بگەڕێنەوە و مەترسێن و مەشڵەژێن هیچ نەبوو ئینجا هەموویان دەگەڕێنەوە.

# پیاوان مێژوویان دروستکرد

# رجال صنعوا التاريخ

پێشەوای موسڵمانان (عومەری کوڕی خەتاب)ﷺهەتا کاتی کۆتایی هاتنی جەنگی یرموك) نەگیانی ئاسودەیی و ئارمی بەخۆیەوە دیتو، وە نە چاوەکانیشی چونەخەو هیلاکی تێدا نەمێنیّ. فەرمانێکی بۆ سەرکردەکانی جەنگ دەرکرد لە سەروی هەموو شیانەوە (ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەراح)ﷺداوای لێکردن کە بە تەواوی چاودێری سوپای ڕۆم بکەن لەو ڕێگایانەی پێیدا دەڕۆن‌و، لەکوێش کۆ دەبنەوە. وەفەرمانیدا کە (ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاحﷺ، لەگەڵ خالیدی کوڕی وەلید)ﷺ بۆلای باکوری شام بڕۆن بۆ ئازادکردنی وڵاتی سوریا (دیمشق) وە (عەمری کوڕی عاص‌و، شەرحەبیلی کوڕی حسنە)ﷺ بەرەو فەلەستین بڕۆن وەسوپای ڕۆم لە (بەتحەل‌و، ئەجنادەین) کۆبونەوە و پشتیان زۆر بەهێزە بە سەرکردەی ئازاو پاڵەوانی ڕۆم (ئەتریۆن) چونکە ئەو سەرکردە گەورەترین پاڵەوان‌و، زیرەك‌و هوشیارترین سەرکردەی ڕۆم بوو. ئەو ئەتریۆنە وای بەباشزانی، هەموو سوپای ڕۆرم لە فەلەستیندا لەیەك شوێن کۆ بکاتەوە، بۆ ئەوەی فەرمان دەی سوپا هەمووی بەدەستی خۆیەوە بێت و پەرتەوازەو، پچڕ پچڕ نەبن‌و بە ئاسانی بکەونە دەستی موسڵمانانەوەو، تێکیان بشکێنن. وە لە فەلەستینیش زۆربەی سوپایەکەی بەلای (ئەجنادەین) دابرد و لەوەیّ کۆی کردنەوە، بۆ ئەوەی لەو سەرخاکە لەگەڵ موسڵماناندا بجەنگیّو، سوپایەکەی لەویّ پارێزراوتر بێت کە جێگەو شوێنە کەی باشتر و شیاوترە لە شوێنانی ترو، قەڵاو تەلارێکی زۆر گەورەو بەهێزی لێبوو، کە بە تەواوی مانا پشتیان بەوقەڵایەوە ئەستور بوو. کاتیّ عەمری کوڕی عاصﷺ چاوی بەوسوپا زۆرە بێشومارەی ڕۆمکەوت، کە هەرچی پێویستی شەڕبێت تەواو ئامادەبوو لەخواردن، لەچەك، لە تۆپ‌و، بارخانە، وڵاخی سواری ئەوکاتە، وە سەرکردەکەشیان بەزاناو بلیمەت‌و فێڵبازو ساختە چی ناوی دەرکرد بوو. وە(عەمری کوڕی عاصﷺ)یش سەرکردەیەکی لێهات‌و زاناوئازاو، زیرەك و شارەزا بوو. هیچی لەئەتریۆن کەمتر نەبوو بەڵکو بەهۆی باوەڕو

ئیمانەکەی زۆر بە هێزترو بەتوانا تر بوو لە ئەتریوّن. وە پشت ئەستور بە خوداو باوەڕە کەی، هیواو ئومێدی سەرکەوتنی هەبوو بەیارمەتی و پشتیوانی خودا. (عەمری کوڕی عاص) هەر خێرانامەیەکی بۆ حەزرەتی(عومەری کوڕی خەتاب‌ﷺ) نوسی باسی زۆری سوپای ڕۆم‌و، چەك‌و بارخانەیان‌و، باسی ئازایی‌و فێڵبازی و ساختەچی ئەتریوّنی تێدا نوسی: وە داوای هاوکاری و یارمەتی خێرای لێکرد، بۆ ئەوەی خێرا بەسەر دوژمندا بدات، لە ئەجنادەین، کاتێنامەی عەمر گەیشتە خەلیفەی موسڵمانان‌و، خوێندیەوە داوای خێراترین یارمەتی‌و هاوکاری دەکات بۆ هێرشکردنە سەر سوپای ڕۆم حەزرەتی عومەر ﷺ دەستی کرد بە پێکەنین و هەر بە پێکەنینی شەوە بەهاوڕێیانی دەوروبەری خۆی گوت: بەڕاستی برایان ئێمە بە ئەتریوّنی موسڵ مانان لە ئەتریوّنی ڕۆمماندا، ئینجا سەیر بکەن خۆشی چۆن تەواو بڵاودەبێتەوە. ئینجا(عەمری کوڕی عاص‌ﷺ)زۆری هەوڵدا کە کەسێکی شارەزا بدۆزێتەوە بۆ تێپەڕبوون بەسەر ئەو تەنگە تاوە ناخۆشیانەی ڕۆمەکان یان کەسێکی وەهابێت شارەزای ڕێگای ڕۆیشتنی ناو قەڵاو، تەلارەکەبێت‌و، لەو چاڵ‌و خەندەکانەی لەڕێدابەربەست‌و نادیارن، شارەزای هەبێت بۆ ئەوەی بەئاسانی بتوانن بڕۆنە ناو قەڵاکەوە. بەڵام، کەسێکی وای دەست نەکەوت.ئەمجارە پیلانێکی تری ڕێکخست بۆ هێرش بردنە سەر ئەو قەڵایە، ئەویش ئەوە بوو هەوڵی زۆریدا بۆ دۆزینەوەی ناڕێکی‌وناتە واویەکا نی ناوڕیزەکانی دووژمن. بۆ ئەوەی دەست پێشخەری لە هێرش بردن بکات‌و، دووژ من تێیدا سەرفیراز نەبێت‌و، هیچ سودی بەدەستنەهێنن. بۆئەو مەبەستە (عەمر) نوێنەرێکی ناردبۆلای (ئەتریوّن) بۆ گۆڕینەوەی بیروڕاو، دۆزینەوەی چارە سەریەك بۆ ئاشتی‌و، نەهێشتن ڕژانی خوێن لە نێوانیاندا: وەنوێنەرەکەش وا تێگەیەندرا بوو کە بەئازایی و زیرەکی لەگەڵ وتووێژی ئاشتیدا بتوانێ ڕێگە چارەیەکی باش بۆ هێرش بردن لەو سەفەرەیدا بدۆزێتەوە بەڵام، بەداخەوە ئەویش سەری نەگرت‌و نەی توانی‌و هەلێکی بۆ ئەو ڕێگا یەڕێکنەکەوت‌و، هیچ ڕێگە چارەیەکی نە دۆزیەوە. تەنها هاتەسەر ئەو بیروڕایەکە (عەمر) بۆ خۆی ئەو کارە ئەنجام بداو، ڕێکخەری پیلانەکە بێت،

ئەمجارە بۆ خۆی وەك و نوێنەری (عەمر)خۆی ئامادەكرد و ڕۆیشت بۆ لای (ئەتریۆن) بەڵام زۆر بە نهێنیوچاپوكانە كاری دەكرد، نەبادا پیلانەكە ئاشكرا بێتو (ئەتریۆن) پێی بزانێ كە ئەو نوێنەرە بۆ خۆی (عەمری كوڕی عاصە) ﷺچونكە ئەو پیلانە ئاشكرا بێت كوشتنی مسۆگەرە. (عەمر) ڕۆیشتە بەردەركی قەڵاو زۆر بە ئاگادار و زانایی دەیڕوانیو، وێنەی قەڵاكەی بەباشی دەگرتو، ئەیزانی چیدەكا و چۆن دەڕوات.لە دوای چونەلای (ئەتریۆن) وەكو نوێنەری عەمری كوڕی عاصﷺ )هەردوكیان دەستیان بەوتوویژی ئاشتی كرد. زیرەك و دانایی (ئەتریۆن) لە وتەكانی(عەمر)كەوتە گومانەوە ، لەدڵی خۆیدا گوتی: بەخودا ئەو پیاوە یان (عەمرە) یان ڕاوێژكاری تەواوی (عەمر)ە؟! ئەگەر ئەوە بكوژم بەڕاستی كاریگەرێكی زۆر و تەواوی لەسەر ئەو گەل و سوپایە دەبێت! بۆیە (ئەتریۆن) بەنهێنی لەگەڵ سەربازێك لەپاسەوانەكانی دوا و گوتی: هەر كاتێ ئەو عەرەبە لەگەڕانەوەی گەیشتە فلانە شوێن لێی بدەن و بیكوژن؟ بەڵام (عەمر)یش بەزیرەك و دانایی خۆی، لەساختەو تەڵەكەبازی (ئەتریۆن) تێگەیشت كەچی نیەتێكی خەراپی هەیە. بۆیە بە (ئەتریۆن)ی گوت: ئەی سەركردە من گوێم لە وتەكانی تۆ بوو، تۆش گوێت لەوتەكانی من بوو، بە ڕاستی وتەكانت كاریگەریەكی زووری لەسەرم هەبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی من یەكێكم لەو(١٠)دە نەفەرانەی كە حەزرەتی(عومەر)ﷺناردوینی كەئاگاداری هەڵسوكەوتی (عەمری كوڕی عاصﷺ) بكەین بزانین چیدەكات، بۆیە دەبێ ئێستا ڕێگەم پێبدەی دەڕۆم قسە لەگەڵ ئەوانی تریش دەكەمو، هەمووومان پێكەوە دەگەڕێینەوە بۆئێرە، ئینجا ئەگەر بیر و هەستی ئەوانیش وەكو هەستی من بوون، ئەوە هەموو سوپاو سەركردە لەگەڵمان دایەو، زۆر باشە، خۆ ئەگەر بیروڕای ئەوان وانەبوو، ئەوە ئەوان دەگەڕێنمەوەو، منیش لەژێر فەرمانی تۆ دادەبم. كە (ئەتریۆن) گوێی لەووتە بوو، گومانەكەی لەدڵ دەرچوو نەماو، ئەو سەربازەی كە بەنهێنی قسەی لەگەڵدا كرد، گەڕاندیەوە بۆ لای خۆی ، بۆ ئەوەی ئەو فەرمانە بەجێنەهێنێ كە پێی سپاردووە. ئینجا بە (عەمر)ی وت: بڕۆ هاوڕێكانت بهێنە؟ (عەمر) گەڕایەوە بۆ لای سوپا و سەربازەكانیو، لای بە

هیچ لایەكدا وەرنەگێڕا. وە هیوای گەڕانەوەی جارێكی تری نەبوو بۆ لای (ئەتریۆن) بگەڕێتەوە. لە دوای تەواوی پیلانەكە و ڕزگاربوونی (عەمر) ئەتریۆن گوتی: بەڕاستی ئەوكابرایە بەزیرەكی و دانایی فریوی دامو هەڵی خەڵە تاندم: زۆر لەمن زیرەك تر و زۆرزانتر بوو؟ لە دوای ئەوەی كە ئەو هەواڵە گەیشتەوە (عومەر) فەرموی: بەڕاستی (عەمر) بەسەر (ئەتریۆن)دا سەركەوت، ئای (عەمر) بەخودا سوێندت دەدەم. ئینجا (عەمری كوڕی عاص) بەهۆی زیرەكیو دانایی‌و ئازایەتی سەركەوت بەسەر ساختە چیی‌و پاڵەوان‌و، فێڵباز ترین دووژمنانی.

## كاتی ئەوە نەهاتووە كە سوارچاكان بكەونە پێیان

## أما آن للفارس أن يترجل

لە كاتێكدا كە (حەجاجی كوڕی یوسفی) سەقەفی تەنگ‌و بێزاری بەسەر (عبداللەی كوڕی زوبەیر)دا هەڵچنی كە جێگەو پەناگەی لەناو حەوشەوحەشارگەی (بيت الله الحرام) بوو: كاتی یەك لایەنكردنەوەی جەنگی یەك لایی لە نێوانیاندا: لە كاتێكدا كە هاوڕێ و، لایەنگر و یارمەتیدەرانیان لێیان دووركەوتبونەوەو، وازیان لیٚ هێنا بوو (عبدالله) ڕۆیشتە لای دایكی كە (ئەسمائەی كچی ئەبوبەكری صدیق) بوو خاوەنی دووپشتێن(ذات النطاقين) وتووێژی لەگەڵدا كردو و گوتی: ئەی دایە زۆربەی هاوڕێ و كەس و دۆستانم وازیان لێهێناوم و لێم دووركەوتوونەوە هەتا تەنانەت كوڕ و خێزان و خانەوادە كەشم. تەنها چەند كەسێكی كەمی بێتوانام بە دەورەوە ماوە كە توانای بەرامبەری و پارێزگاری و، خۆڕاگریان زۆر كەمە و لە جەنگدا بێتوانان. بەڵام بۆ لایەنی سەروەت‌وماڵ بەخشین هەرچیم بویٚ پێم دەدەن و دەیبەخشن. ئینجا ئەی دایەگیان تۆش فەرمانت بەچییە؟ دایكی گوتی: ڕۆڵەكەم تۆ بۆ خۆت زۆر باشتر خۆت دەناسی، ئەگەر دەزانی حەق بە تۆیە و لەسەر ڕاستی، وە هەوڵ و كۆشش دەكەیت بۆ بەدەستهێنانی ئەو ڕاستیە؟ ئەوە ڕامەوەستیٚ‌و، برۆ بە ئەنجامی بگەیەنە. لەسەر ئەو ڕێبازە ڕاستەش بوو، كە هاورێیانت كوژران، خۆت وا لێمەكە كە مندالٚ‌و گەمژەی هۆزی (ئومەیە) گاڵتەت پێبكەن‌و، بەسەرتا

زاڵبن‌و، گەردن کەچیان بۆ بکەی، وە ئەگەر لەو کارەشتدا مەبەستت تەنها بۆ دەستکەوتی ماڵ و سامان و دەسەڵاتە. ئەوە تۆ خەراپترین‌و بەدبەختترین ئادەمیزادی‌و، گیانت بەهەدەر لە دەستت دەدەی‌و، هەرچی لەگەڵ تۆشدا بڕوات‌و بکوژرێ ئەوە بەدبەخت و خەسارەتمەندە. کوڕم گەر تۆ دەڵێی من لە سەرحەق‌و ڕاستیم، ئەوسستی‌و، لاوازی‌و، بێهێزی خۆت‌و، هاوڕێیانت بۆچی.! بەڕاستی ئەو سستیە کاری مرۆڤی ئازاد و سەربەست‌و، باوەڕدار نییە! هەرچەند لەو دونیا یەدا بەزەبونی و لاوازی بژیەی؟ باش بزانە کوڕی (زوبەیر) نەمان و کوشتن باشترین دەسکەوتە. سوێند بەخودا لێدانی شیر و تیر لە سەر هێز و قوەت و سەربەرزی و دەسەڵات، بەلای منەوە زۆر خۆشەویست تروباشترە، لە قامچی و شوارکێك، لە ملکەچی‌و داماویدا.دوای (عبدالله)گوتی:ئەی دایە:من لەوەدەترسێم لەدوای بەربەرەکانی و بەرامبەری بدۆڕێم و دوایی سوکایەتیم پێ بکرێ و هەڵمبواسن. دایکی گوتی: ڕۆڵەکەم کەوڵ کردن و پێست داماڵینی بەران لەدوای سەربڕینی هیچ ئێش و ئازار و زەرەری پێناگەیەنێت، کوڕم هەستە بەدانایی و کارامەییەوە برۆ و داوای یارمەتی‌و کۆمەکی لەخودا بکە.(عبدالله) لەدایکی نزیکبۆوەو سەری دایکی ماچکردو، گوتی: سوێند بەخودا ئەوەی کە تۆ فەرمانت پێکردم: هیواو هەڵوێست و ئاواتی من بووە، هەر لەو ڕۆژەوە هەتا ئێستا هەرگیز پشتم بە دونیا نەبەستوە و دونیاشم ئەوەندە خۆش نەویستوە، وە لەبەر خودا نەڕۆیشتومە مەیدانی شەڕ، نەوەکو لە کار و فەرمانێکدا ڕق و قینم لێبگرێت بە نەزانی‌و سەرکێشیەوە، ڕاستی بەناڕاست بزانم، بۆیە هاتمە لای تۆپێم خۆشبوو بیروو ڕای تۆش وەرگرم‌و، ڕوگەشی‌و کارامەیی‌و، زانیاری تۆش لەگەڵ بیرو هەست و کارامەیی خۆم تێکەڵ بکەم. ئەی دایە: تۆ وا هەست بکە لە ئەمڕۆوە من کوژراوم و، دڵتەنگ‌و غەمبار مەبە و خۆت تەسلیمی فەرمانی خودابکە. ئەی دایە: بەڕاستی دڵنیابە کە کوڕەکەت هیچ ڕێگەیەکی خەراپەی نەگرتوە، کارێکی ناشیاوی ئەنجام نەداوە، وە هیچ کاری نامەردانەی نەکردووە، وەهیچ کارێکی ستەم کارانەی نە لەگەڵ مرۆڤەکان ، وە نە لەگەڵ بەرنامە و ڕێبازەکەی خودا ئەنجام نەداوە، ستەمم

لە هیچ بەندەو، عەبدو پەیمان پێدراوێکم نەکردوە. وە هەر ستەم و زۆرداریەکی فەرمانداروو ژێر دەستەیەکیشم پێگەیشتبێت پێی قایل و ڕازینەبووم، بەڵکو بەرپەرچیم داوەتەوە و پێم ناخۆش بووە و پێی قایل نەبووم، وە هیچ شتێکم بە ئەندازەی ڕەزابون‌وقایل بوونی خوداپێ خۆشترو گەورەتر نەبووە، ئینجا خودایە ئەو پاساوە بۆ گیانم ناهێنمەوەو، بۆ بێگوناهی و پاکبونەوەی گیانم ناکەم، چونکە تۆ زۆر باشتر لە من دەزانی، تەنهامن بۆیە ئەوە دەڵێم کەببێتە دڵدانەوەی دایکم‌و، لەدوای خۆم دڵتەنگ و غەمبار و نائارام نەبێت بۆم‌و، هەردەم دەم بەدوعا و پاڕانەوە بێت بۆم، دایکی گوتی: هەردەم زوبان بە دوعاوە دەبم. ئینجا هەر کەسێ کە لە بەرامبەرت بەناڕەوا دەکوژرێ، بزانەکە تۆ لەسەر حەق و ڕاستی دەکوژرێی، لەدوای ئەوە دایکی سەری بۆ ئاسمان بەرزکردەوە و وتی: خودایە بەزەیی وسۆزت بەو بەژن و باڵا شۆخ‌و شەنگ‌و بەرزەدا بێتەوە، ئەولاشە دەموشك و تینوە لە ئاوارەو دەربەدەری مەدینەدا، وە خودایە بەزەیی و میهرەبانی لەگەڵ باوکی و لەگەڵ منیشدابکەی، خودایە وا بۆ ئەو کارە بەتۆم سپاردو بە هەموو کار و فەرمان‌و بەسەر هاتێکت ڕازی و قایلم هەرچی لەلای تۆوەیە، خودایە: گیانی ئارامی و خۆڕاگریم پێبدەی‌و پاداشتی ئارامگران و سوپاس گوزەرانم پێببەخشی، ئەو دوعا و نزایانە بە جۆرێك هێز و غیرەت و حەماسی (عبدالله)ی بزواندو، بەهێزو حەماسیەوە گەڕایەوە ناو هاوڕێ و دۆستەکانی‌و، بەو غیرەت و حەماسیەی هێرشی بردە سەر دوژمن‌و، بە چاپوکی و باوەڕێکی تەواو خۆڕاگر شەڕی کرد، بەڵام کاتێکی زۆری نەبرد هێرشی تەواویان کردە سەروبە شیر و تیرلێیانداو کەوتە سەر زەوی و گیانی دەرچو. لەدوای ئەوە هەر وەك‌و بۆ خۆی لە دوا ڕۆژی خۆی دەترسا کە هەڵیبواسن بەو جۆرە (حەجاج عبدالله)ی لە دەروازەی دەری مەدینەوە هەڵواسی، ئەوەندەمایەوە هەتا دایکی کوێر و نابینای ڕۆیشت بەلایدا، دەستی بەسەر لاشەکەیدا دەگێڕاو، ئەو وتە بەرز و شیرینە شکۆدارەی، لە زوبان دەهاتە دەرو دەیفەرمو: ئایاکاتی ئەوە نەهاتوە کە سوارچاکان بکەونە پێیان. مەبەستی لەو وتەیە ئەوە بو ئایا وەختی ئەوە نەهاتوە کەلاشەی ئەو پاڵەوانە لە سەرداری سێدارە بهێننە خوار.

# ئازایەتی و پاڵەوانێتی ئافرەتان لەجەنگدا

# شجاعة النساء فی الحرب

سەفیەی کچی عبدالمتلب)وتی:(حسانی کوڕی سابت) لە تەلاری (فارع) لە ڕۆژی خەندەق) لەلامان بوو: ئەو ڕۆژە منداڵو ئافرەتمان لە لابوو: کابرایەکی جولەکە هەر بەلا ماندا دەهات و دەچوو لە دەورەی تەلارەکە دەورەی دەداین. گوتم: ئەی حسان) ئەو جولەکە دەبینی بەدەورەی تەلارەکەدا دەسوڕێ، بەڕاستی من لەو جولەکەیە دڵنیا نیم کە جولەکەکانی تر ئاگادار ناکاتەوەو، هەواڵی ئێمەیانی پێڕاناگەیەنێ و لە دواوە بەنهێنی نایەن و پێغەمبەر یش لەئێمە بێئاگایە. ئەی حسان تۆ بڕۆ بۆ لای و بیکوژە؟ حسان گوتی: ئەی کچی (عبدالمتلب) خودا ڕەحمت پێبکات ئەتۆ بۆ خۆت ئەمن ناناسی پیاوێکی بێهێزو ترسنۆکم و، توانای ئەو کارانەم نییە، (سەفیە)گوتی: کە(حسان)ئەوها وەڵامی دامەوە سەیرم کرد هیچ شتێکم بەلایەوە نەدیت: هەر خێرا بە پەڕۆیەك سەری خۆی پێچاو، کوڵەگە و ستونێکم هەڵگرت و، لەسەر تەلارەکە چومە خوارو، بەرە و لای جولەکە کە ڕۆیشتم بەو کوڵەکەو ستونەی پێم بوو:کەوتمە سەری بەلێدان هەتا کوشتم. دوایی گەڕامەوە بۆ سەر قەڵایەکە، وتم: ئەی حسان ئێستا ئەتۆ بڕۆ بۆ خوارەوە بۆلای تەرمەکەی و ڕووتی بکەوە. لەبەر ئەوەی ئەو پیاو بوو: بۆیە ڕوتم نەکردەوە، حسان گوتی: بەخودا کچی(عبدالمتلب) من هیچ پێویستیم بەشتەکانی نییە.

# ڕەوشت

# الأخلاق

خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەربارەی ڕەوشت و ئاکاری پێغەمبەر دەفەرموێ: {وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ }القلم/٤ واتە: بەڕاستی ئەی محمد تۆ لە بەرزترین پلەی ڕەوشت و خوی بەرزو جوانی. پێغەمبەری خوداﷺدەفەرموێ: (إنما بعثت لأتمم مكارم الأخلاق) ڕەوشت گیان و ژیان و هەڵوێستی گەل و نەتەوەیەکە: ئەگەر گیان باش بوو ئەو گەل و نەتەوەیەش باش دەبێت ، بە ژیانێکی بەهێزو

سەر بەرز، ژیان دەباتە سەرو، لە هەمولایەکەوە یارمەتی و کۆمەکی و پشتی پێ دەبەستن و ڕێزدارانە ڕێزی لێدەگیرێ. بەلاّم بە پێچەوانەوە هەر گەلێك گیان و ڕەوشتی پووچ وفاسدبوو، ئەوە ئەو گەلە سست و لاواز و بێهیز دەبێت و توانای ڕاوەستانو خۆڕاگرتنی نامێنێو، ئەو گەلە دەبێتە هیوا و ئومێدی چڵێس و چاو چنۆکانو، ئامانجی دووژمنان. ئەو گەل و نەتەوەی کە لە کۆمەڵە خەڵکێکی ڕەگەز جیاوازی دوور لە ڕەوشت و بەها بەرز و جوانەکانی قیەمی مرۆڤایەتی بێت: دەبێ ڕێز و نرخی ئەو گەل و نەتەوەیە چیبێت؟ تەنها تۆز و خۆڵ و خاکێکی بێسودە. هەر ڕەوشت و کرداری جوانە سەربەرزیوبەهای گەلو نەتەوەیە بەبێ ئەوڕەوشتە جوانانە هەموو زێڕ و خێر و بێری ولاّت بێڕێزو بێبایەخە، بۆیە دەڵێین: ڕەوشت و ڕەفتارە بەهاکانی ئادەمیزاد، چەكو هێزی تەواوی لەبن نەهاتوی گەل و نەتەوەیەو، هیچ هێزێکی دەرەکی خۆی لەبەرامبەریدا ڕاناگرێت. بەو جۆرە ڕەوشتی ئیسلامی بەشێوە و ڕەوشتی چاکەوباشی بێ سنور ناوزەد دەکرێتو، بەدەسەلاّت و توانای تەواو گشتی دیاری دەکرێت، کە بەڕاستی تەواوی ڕەوشت و بەها جوانەکانی ئینسان لە دەرەنجام شوێنکەوتەی دین و ئاینەوەیە و، زامنو دەستەبەری چاکەو بێسنوری بەردەوام و گونجاوە بۆ تەواوی بەرەی ئادەمیزاد لە سەرچاوەی ئەو شتانەوە هیزێکی کاریگەری ڕاستگۆی بەرپرسیاری تەواوی بە جێگەیەنەر ئامادە دەکات، لە ئاشکراو نادیاریداو، لەخۆشی و ناخۆشیدا، چونکە چاودێری تەواوی ئەوکارە، خودای بەتواناو خاوەن دەسەلاّتە، نەدەخەوێو نەوەنەوزیش دەباتەوە، وە بەوردیلەیەکیش نە لە ئاسمانو نەلەزەمین لێی پەنهانو نادیار نابێت: ئینجا هەرلەسەر ئەو ڕەوشت و پێوەرو پێوانە بوو باوەڕدارانی پێشوبوونە پێشەنگ و سەروەری بۆ ئازادکردن و سەرداری ولاّت، ئەوەش لە ئەنجامی خوداپەرستیو، ڕاستی لە تەقوا و خۆپارێزیدا: وە لەڕاستیشدا هیچ سەرچاوەیەکی پاکی و خۆپارێزی و، خاوێنیو، ڕاستیو، بەخشینو، لەسەرە خۆیی و وەفایی نابینیو بەدەست ناکەوێ کەوەكو تەقوا و خۆپارێزیو، پابەندبوون بە بەجێهێنانی فەرمانەکانی خوداو دوورکەوتنەوە لە تاوان و

نافەرمانیەکانی باشترو چاکتربێت. هەر لەسەر بنەمای ئەو ڕەوشت و ڕێبازە پاك و بەرزەبوو کە هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر ڕاپەڕین و ژیانێکی سەربەر.زانەی کۆمەڵگای ئیسلامیان بەدی هێنا.وە هەر بەهۆی ڕەوشتی جوان و بەرزی بوو، ئالای سەربەرزی ئیسلام لەتەواوی سەرڕوی زەمین دەشەکایەوە: بەڵام چۆن وانابێت کە ئەو هاوڕێیانە لە زانکۆ و کۆلیجەکانی پێغەمبەر و سەروەر و سەردار خوێندویانەو هەر لەو خوێندنگایەشدا دەرچوون‌و پێگەیشتون. ئەو پێغەمبەرەﷺکە خاوەنی تەواوی دەسەلات و بەتوانای ئەو بوونەوەرە لەباسیدا بفەرموێت: ( وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ):القلم/٤.

## من و هاوڕێکەم زۆر لەوە زیاتر پێویستترین ئەی عومەر

## أنا و صاحبي أحوج إلى غير هذا يا عمر

دەگێرنەوە کەجولەکەیەك وامی (قرض) لەلای پێغەمبەر بوو ﷺویستی داوای وامەکەی بکاتەوە لە پێشی کاتی هاتنی وامەکەی.

لە ڕێگای مەدینە پێشی بە پێغەمبەر(د.خ) گرت‌و بە تورەییەوە ڕەخنە لە پێغەمبەر ﷺ دەگرێ و دەڵێ: بەڕاستی ئێوەی هۆزی (عبدالمطلب) گەل و نەتەوەیەکن زۆر قەرز کوێرن وقەرز نادەنەوە خاوەنی، کاتێ حەزرەتی(عومەر)ﷺچاوی پێدەکەوێ ئەوا جولەکەیەك پێشی بە پێغەمبەر ﷺ گرتووە و قسەی پێدەڵێ، زۆر تورە دەبێ و ڕقی هەڵدەستێ‌و دەڵێ: ئەی پێغەمبەریﷺ خودا ڕێگام پێبدە لە گەردەنی بدەم؟ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ :ئەی (عومەر)ﷺ ئێمە و هاوڕێکەمان زۆر پێویستمان هەیە بۆ شتێکی تر بێجگە لەوشتە. پێویستە تۆ بە جۆرێکی تر داوا لەوخاوەن وامە بکەی بڵێی، تۆ بە شێوە و داوایەکی جوانتر داوای وامەکەت بکەوە: وە بەمنیش بڵێی ئەتۆش زۆر بەباش و جوانی وامەکەت بدەوە: ئینجا پێغەمبەر ﷺزۆر بە هێمنی ڕوی لە جولەکە کە کردو گوتی: ئەی جولەکە وامەکەت سبەی کاتی دانەوەیەتی، نەوەك‌و ئەمڕۆ.

# برادەرێك برادەرەكەی دەگرێنێ

# صديق يبكى صديقه

كاتێ سەردار و خواپێداو (زەیدی كوری حاریس)ﷺ شەهید دەكرێ لەجەنگی (مؤتە)دا پێغەمبەر(د.خ) دەفەرموێ: بە ڕاستی زەید لە پێناوی خوادا زۆر بەباش‌و ڕاستی جەنگاو ، ئەمرۆ بە خزمەتی خودا دەگاو، هیچ شتێكی ناخۆشی بەسەرەوە نابێت بەڵام كچی زەید لەدوای ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر (د.خ) لەسەر تەرمەكەی باوكی دەگریاو دەیگوت: ئەوە چیە من دەی بینم؟ پێغەمبەر (د.خ) كە لە لای تەرمەكەی ڕاوەستابوو، فرمێسك ی لە چاوان قەتیس مابوودەی فەرموو: برادەرێك برادەرەكەی دەگریەنێ. لەسەر ڕوو داوی ئەو چیرۆكە (تۆماس چارلیل) نوسەری بە ناوبانگی ئینگلیزی ڕونكردنەوەیەك دەردەبڕێ و، دەڵێ ئەو گوفتارو كردارانە لە محمدی براو دۆستی هەموو ئادەمیزادەكان دادەبینین، وە بەڕاستی ئەو بە بەزەیی‌و میهرەبانە، دۆست و برای هەموومانە. ئەو بەسۆز ودڵ نەرمە، میهرەبان و دڵ ناسكە: كوڕی دایكی یەكەم و باوكە گەورەی یەكەممانە.

# ئایا من چاكەم لەگەڵتدا كردووە؟

# هل أحسنت إليك؟

ڕۆژێك عەرەبێكی دەشتەكی داوای شتێك لە پێغەمبەرﷺدەكات. پێغەمبەریش شتەكەی پێدەبەخشێ. لەدوای چەند كاتێك پێغەمبەرﷺ بەكابرا دەفەرموێت: ئەرێ من هیچم پێ بەخشی؟ كابرای دەشتەكیش لەناو یارەكانیدا دەڵێت، نە بە خودا نەچاكەت لەگەڵمدا كردووەو، نە ڕەفتاری جوانیشت لەگەڵدا بەكارهێناوم. باوەڕداران لە درۆی ئەو كابرایە زۆر تووڕە بوون‌و، لێی هەستان‌و، بەرەولای ڕۆیشتن كەلێی بدەن.بەڵام پێغەمبەر هەستاو بەرەو ماڵ گەڕایەوەو، ئاماژەی بۆ هاوڕێیانی كرد نەكەن دەست درێژی نەكەنە سەر و، هاوڕێكەمان ئازار نەدەن. ئینجا پێغەمبەر لەماڵەوە بە دوای ئەو كابرا دەشتەكیەی دانار دوو، شتێكی زۆرترو باشتریشی پێ بەخشی، لە دوای ماوەیەك پێغەمبەرﷺ پرسیاری لەو

كابرایە كردەوە گوتی: ئایا ئێستا من هیچ شتم پێبەخشیوی؟ كابرا گوتی:بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوداﷺ شتی زۆرت پێبەخشیوم خودا پاداشتی چاكەی تۆو، گەل و هۆزو نەتەوەكەشت بداتەوە.ئینجا لە دوای ئەوە پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی برام تۆلەناو هاوڕێكانمدا شتێكی ناشیرینت گوت: كە هەموویان دڵیان گەردی گرت و، پێی غەمار و نائارام بوون: ئەگەر دەتەوێ هاوڕێكانم دڵیان گەردی تێدا نەمێنێ و، بەرامبەرت دڵپاك ببنەوە، ئەو وتەیەی كەئێستا لەلای من گوتت: لە لای ئەوانیش دووبارەی بكەوە. كابرا بەدڵ خۆشیەوە گوتی: بەڵێ بەسەر چاو. بۆ ڕۆژی دوایی كابرای دەشتەكی هاتەوەلای پێغەمبەرو یارەكانی: پێغەمبەر ﷺفەرمووی: ئەوكابرایە بوو كە دوێنێ شتێكی ناشیرینی گوت: بەڵام لەدواییدا ئێمە بۆمان زیاد كرد: ئەویش قایل و ڕازی بووە، وانیە ئەی برای دەشتەكی؟ ئەویش زۆربەدڵ خۆشیەوە گوتی: بەڵێ ڕاستە ئەی پێغەمبەری خودا، خودای گەورە پاداشتی چاكەی تۆش و هەموو هۆزو نەوەو هاوڕێیانت بداتەوە. لەو كاتەدا ڕوخساری پێغەمبەرﷺلەخۆ شیان دەدرەوشایەوە.

ئینجا: پێغەمبەرﷺڕوداوێكی بۆیارەكانی فەرموو: شێوەی من و ئەو برا دەشتەكیە وەك و شێوەی كابرایەك وایە، كە حوشترێكی هەبێ و لەبەردەستی ڕابكات و خەڵكانێكی زۆر بە دوایداڕابكەن: بەڵام حوشترەكە هەر چەند چاوی بەو جەماوەرە زۆرە دەكەوت زیاتر هەڵی دەتیزاندو، ڕای دەكردو، دوورتر دەكەوتەوە. خاوەنی حوشترەكەش هاواری لەخەڵكەكە دەكرد و دەی وت: تو خودا برایان واز لە حوشترەكەم بهێنن و بگەڕێنەوە، مەیدانی حوشترەكە بۆ من چۆڵ بكەن. چونكە ئەمن بۆ خۆم ڕەوشتی حوشترەكەم دەزانم، زۆر بە ئارام و میهرەبان تریشم بۆ حوشترەكەم لە ئێوە. ئینجا، كابرای خاوەن حوشتر زۆر بە هێمنی بۆلای حوشترەكەی ڕۆیشت و چنگێك خۆڵ و خاكی زەوی هەڵگرت و بۆ لای حوشترەكەی هاویشت و، حوشترەكەش بەرەو لای كابرا گەڕایەوەو، ئەویش زۆر بە هێواشی بەرە و لای ڕۆیشت، كاتێ لێی نزیكبۆوە كابرا داوای لە حوشترەكەی كرد كەوەركەوێتە سەر زەوی، حوشترەكەش زۆر بەهێواشی كەوتە سەر زەوی و وەركەوت. ئینجا

كابرا دەستی بەسەردا گرتەوەو كۆپان و كەل و پەلەكەی لیٚ قائیم كردەوەو، بەسەر چڵێسی حوشترەكەیدا سەركەوت. بەڕاستی منیش ئەگەر ئەو كابرا دەشتەكیەم لەلای ئێوە بەجیٚ هێشتبایە لەدوای ئەوەی ئەو وتەیەی گوت و، ئێوەش دڵتان گەردی گرت، ئەوە ئێوە دەتان كوشت و، ئەو كابرایەش دەڕۆیشتە ناو ئاگریەوە.

## دارم لە پشتی هەركەسیٚ داوە ئەوە پشتم

## من كنت جلدت له ظهرا فهذا ظهري

دەگێڕنەوە جارێكیان هاوڕێیەكی پێغەمبەرﷺ دەڕواتە لای پێغەمبەرﷺ: بەڵام لەبەر شەرم و حەیا لە پێغەمبەر ﷺزۆر دەترسیٚو هەرچەندی دەكات ناتوانیٚ بەتەواوی قسە لەگەڵ پێغەمبەردا بكات: پێغەمبەرﷺ هەستی خەجاڵەت و ترسی پێدەكات و زۆر لە سەرە خۆوە پێی دەڵێت براكەم هۆشت بێنەوە سەرخۆ و ترست نەبیٚ: منیش وەك و تۆ ئادەمیزاد یكم و، كوڕی ئافرەتێكم كە لەمە كە گۆشتی وشككراوەی دەخوارد.

ڕۆژێك پێغەمبەرﷺ بەلای كۆمەڵێك خەڵكدا دەڕوات:ئەوانیش بۆ ڕێزلێنان و ئەدەب لە بەریهەڵدەستن. بەڵام پێغەمبەر ﷺ نەیهێشت لەبەری هەستن و، پێیگوتن: ئێوە وەك و عەجەم وامەبن كە هێندێكیان لەبەر یەكتری هەڵدەستن بە كڕنۆش بردنەوە هەڵدەستن.

وە پێغەمبەری ئیسلام ﷺكاتیٚ بەتەواوی بۆی دەركەوت و هەستی كرد كە كۆچ دەكات لەدونیا: لەدوای ئەوەی كە خودای بە دەسەڵات تەواوی بەخشیش ونیعمەتی گەورەی ئیسلام و بەرنامە و ئاینی بۆ سەر موسڵمانان تەواوكرد. ڕۆیشتە سەر (منبر)و فەرمووی: ئەی ئادەمیزادەكان هەر كەسیٚ دارێكم لێی داوە ئەوە پشتم و بادارەكەم لێبداتەوە تۆڵەی خۆی بكاتەوە. وە هەر بەو جۆرە هەر كەسێك وتەیەكی ناشیرین یان جنێوێكم پێداوە، با بێت و پێم بڵێتەوە. وە هەر كەسیٚ ماڵم لێساندووە: ئەوە ماڵم و باهەڵیی بگرێتەوە: وە هیچ لە تۆڵەی دوا ڕۆژی خۆی نەترسیٚ، چونكە تۆڵە سێنەوە لە شان و شكۆی من ناوەشێتەوە.

ڕۆژێك (غەوسی كوڕی حارس) ڕێگەی لە پێغەمبەر گرت و، شیری لەكالان دەرهێنا بۆ كوشتنی پێغەمبەرﷺگوتی: ئەی محمد ئێستا دەتكوژم كیٚ هەیە لەدەستی من

ڕزگارت بكات؟ پێغەمبەرﷺ لەوەڵامدا فەرمووی (الله) هەر لەگەڵ وشەی (الله) شیرەكەی لە دەستی بەربۆوە و كەوتە سەر زەوی: پێغەمبەر ﷺ پەلاماریداو هەڵیگرتەوەو گوتی: ئەدی كێ تۆ لە دەستی من ڕزگارت دەكات؟ غەوس گوتی: بەڕاستی تۆ زۆربە بەزەیی و بەخشندەی: پێغەمبەریش ئازادی كرد و ڕۆیشتەوە ناو گەل و هۆزەكەی‌و پێیگوتن: من لەلای باش ترین‌و چاكترین ئادەمیزادی سەر ئەو گۆی زەویەوە هاتووم بۆلاتان.

## شیردۆشی مەڕەكانە ئەی دایە

## حالب شاة یاأماه

دەگێڕنەوە سەروەر و پێشەوامان حەزرەتی (ئەبوبەكرﷺ) لە پێشی هەڵبژاردنی بە پێشەوای موسڵمانان‌وجێنشینی پێغەمبەری خودا.بەردەوام خەریكی بەجێهێنانی ئیش‌و كاری باش و پیرۆز بوو بەرامبەر بەهاو سێ و هەژاران، بۆ ماڵی شەهیدو، هەتیو، نەدارو، لاوازو، بێنە وایاندەڕۆیشت‌و، پێویستی‌و ئیشوكارەكانیانی بۆ بەجێدەگەیاندن‌و لە هەر شوێنێك كە پێویستیان بەو سەركردە پێشەوایە ببوایە هیچ درێخی نەدەكرد و دەڕۆیشت‌و، ئامادە باشی لەو شوێنە هەبوو، بۆ ڕێزلێنانی ئەو نەدار و هەژارانە، ئاژەڵی بۆ دەدۆشین‌و ، نانی بۆ دەكردن‌و، بەزەیی و سۆزی پێیاندا دەهاتەوە.كاتێ بووبە پێشەواوجێنشین.ئەو هەژارو نەدارانە ترس وبیمێكی گەورەیان توش هات، وتیان ئەمجار لەمەودواوە تازە( ئەبوبكر) ئەو سۆز و بەزەییەی نامێنێ بەرامبەرمان، چونكە بۆتە سەر كردەو پێشەوا، ئەبوبكر گوێی لێبو بێوەژنێك دەی گوت: تازە ئاژەڵمان بۆ نادۆشێ، بەڵام ئەبوبكر وەڵامی دایەوەو گوتی: بەخودا هەتا گیانم تێدا مابێت هەر بۆتان دەدۆشم! ئینجا بەخێرایی ئەبوبكر بەرەو لای دەرگایەكەیان دەڕۆیشت‌و، منداڵێكی بچوك دەرگای لێدەكاتەوە. هەر كە چاوی پێدەكەوێت هاوار دەكات‌و، دەڵێ ئەی دایە ئەوە مەڕو ئاژەڵ دۆشەكەیە. هەر لەبەر ئەو هەموو سۆزو میهرەبانیەی ئەبوبكر بوو، كە پێغەمبەریﷺخودا تەواوی ماف و فەرمانی پێبەخشی بوو ، كاتێ كەپێی دەوت بەبەزەیترین نەتەوەم بەبەزەیی نەتەوەی ئەبوبەكرە.

# خودای گەورە لەوی باشتری پێنەداوم

# ما أبدلني الله خيرامنها

لەدوای تێشکان و سەرنەکەوتنی گەمارۆی قوڕەیشیەکان: بەسەر موسڵماناندا. حەزرەتی(خەدیجە) لەگەڵ پێغەمبەری خودا گەڕانەوە شوێن و جێگەی خۆیان بۆ مەککە. وە ئەو شتەی کە پێغەمبەر و هاوسەرەکەی پاڵی پێوەنان بوئەوەی لە ماڵ و جێگەی خۆیا ن دەربچن‌و، ڕوبکەنە دۆڵی (ئەبوتالیب) کە نێوانی دوو کێو بوون: کە هیچی لێنەبوو ما وەی سێ ساڵ لەو دۆڵەدا مانەوەو گەمارۆ و ئابڵوقەیان لەسەر بوو: ئازارو ئەشکەنجەو ناخۆشی تەواویان بەهۆز و گەلەوە زۆر چێشت. بێ ئیشوکارەکەم خۆراك‌و خواردەمەنی. لەماوەی ئەوسێ ساڵەدا حەزرەتی خەدیجە سەروەت و سامانێکی زۆری ماڵە کەی بەئارەز و خۆشی خۆی خەرج دەکرد و دەیبەخشیەوە، زۆربە ئارامی‌و گیانی فیدا کارانە. لە دوای سێ ساڵ بەرە و مەککە گەڕانەوە. بەڵام گەڕانەوەکەیان زۆر جیاوازی هەبوو لە دەرچون‌و ڕۆیشتنەکەیان: چونکە ڕۆیشتنەکەیان چاوەڕوان‌و ئەگەری نەمان‌ولەناوچونی تێدابوو:سەرەڕای ئەوهەمووشەکەت‌وماندووبوون‌و ئازاردانەش. حەزرەتی خەدیجە لەوکاتەدا تەمەنی بەساڵداچوبووبێ هێزوکەم تاقەت ببووتینی تێدا نەما بوو تەمەنی گەیشتبووە (٦٥) شەست و پێنج ساڵ‌ولەسەر جێگەدا کەوتبوو، پێغەمبەریش بەلایەوە مابۆوە و لێی دوور نەدەکەوتەوەو، نیشانەی مردنی پێوە دیار بوو.سێ ڕۆژ بە نەخۆشی و ئازارو ماندوبوونی زۆرەوە مایەوە: زۆری ئارەز و دەکرد کە لەو کاتەدا نەمرێت هەتا بەری بانگەوازو سەرکەوتنی ئیسلام دەبینێت. خۆی وەها دەهێنایە پێش کە هیوایەتیەکی زۆری لە پێشە بۆیە بە کچە بەرێزەکەی ئوم کەلسومی دەوت کچەکەم خۆزیا تەمەن مۆڵەتی دەدام هەتائەو شەکەت وماندووبوونەم لە بیر دەچۆوە و ڕوخۆش و ئاسودە بوومایە وتاموچێژی خۆشیم بچێشتبایە. ئوم کەلسوم لەوەڵامیدا دەیوت ئەی دایە بەڕاستی هیچ سام وناخۆشیت لەسەرییە.ئینجا حەزرەتی خەدیجە هاتەوە گوفتارو وتی: ئەی کچم بەڕاستی ئێستامن هیچ ترس‌و سامم لەسەر نیە، وە هیچ ئافرەتێك لە ئافرەتانی قوڕەیش وەك و من تاموچێژی

خۆشیان نەچێشتوە.وە هیچ ئافرەتێك نەگەیشتۆتە ئەو پلەیەی كەمن پێی گەیشتوم بەشی من لەو جیهانەدا بەسە كە محمد سەروەر و هاوسەری خۆشەویستم بوەو، لە دوارۆژیشدا ئەوەم بەسە كەبوومە یەكەمین ئافرەتی موسڵمان لەو جیهانەو دایكی موسڵمانانیشم. ئینجا لە دوای ئەوە چاوەكانی بەیەكدادا و زۆر بەدەنگێكی هێواش و لەسەرەخۆ گوتی:

(اللهم إني لاأحصي ثناء عليك ، اللهم إني لا أكره لقائك، ولكني أطمع في مزيدمن التضحية لأكون جديرة بماأنعمت علي) لەو كاتەدا وامانهەست كرد كە خەریكە گیانی بەخودا دەسپێرێت و ماڵ ئاوایی یەكجاری لەو ژیانە دەكات: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خودایە دەرچونی گیانی بۆ ئاسان و سوك بكە. وە مژدەی بەهەشتی پێدا، كە خودای بەبەزەیی(جنات النعيم) بەهەشتی خۆشی بۆ ئامادە كردوە بە بۆنەی ئەوەی كە یەكەمین ئافرەت بووە كە باوەڕی هێناوەو، سەروەت و سامانەكەی لە خزمەتی خوداو موسڵماناندا بەخشیوە، خزمەت و یارمەتی تەواوی پێغەمبەرو ﷺ ڕێبازی ئیسلامی داوە بۆ سەركەوتنی ڕێبازو ئاینی ئیسلام: خودای گەورە دەفەرموێت: {إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٖ وَعُيُونٍ. ءَاخِذِينَ مَآ ءَاتَىٰهُمۡ رَبُّهُمۡۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَبۡلَ ذَٰلِكَ مُحۡسِنِينَ. كَانُواْ قَلِيلٗا مِّنَ ٱلَّيۡلِ مَا يَهۡجَعُونَ. وَبِٱلۡأَسۡحَارِ هُمۡ يَسۡتَغۡفِرُونَ. وَفِيٓ أَمۡوَٰلِهِمۡ حَقّٞ لِّلسَّآئِلِ وَٱلۡمَحۡرُومِ }الزاريات/١٥-١٩ واتە: بەڵێ بەڕاستی ئەوانەی كە تەقواكار و خۆپارێزن لە ناوباخ و باخات و كانیاوەكانی بەهەشت ڕادەبوێرن و، ئەوەی كەخودای گەورە پەیمانی پێدابوون لە دونیادا پێیان دەبەخشێ و، ئەوانیش بەخۆشیەوە وەریدەگرن، چونكە حەقی ئەو كارەیانە كە لەدونیادا كردوویانە بەڕەفتاری جوان و باش، تەنانەت لەبەر ڕەزابوونی خودا شەو خەویان لە چاویان زڕاندوە بۆكرداری چاكەو ، بەیانیشیان تەرخان كردووە بۆ زیكرو یادی خوداوداوای پەشیمانی و لێخۆش بوون دەكەن و، وە بەشێك لەو سەروەتەی كە پێیان بە خشراوە دەیبەخشن بۆ هەژارو نەدارو كەم دەستان.

ئینجا لەدوای ئەوە خاتو خەدیجە گیانە شیرینەكەی ڕۆیشت بۆ خزمەتی خودای بەبەزەیی‌و میهرەبان. بەڕاستی پێغەمبەری خوداﷺ زۆر بەوەفاو دڵسۆز بووبەرامبەر بەهاوسەرە بەڕێزەكەی، تەنانەت ڕۆژێك پێغەمبەرگوێی لەدەنگی (هالە)ی خوشكی شیری دەبێت لەلایەكی گۆشەی خانوەكەی، كەدەنگی زۆر بەدەنگی خەدیجەخاتون دەچوو، پێغەمبەر دڵی ڕاچەنی‌و هاواری كردووگوتی: هالە ئەوەئەتۆی !چونكە پێغەمبەرﷺ خەدیجەی زۆر خۆشدەویست بۆیە هەردەم لەبیرو خەیاڵولەبەرچاوی دابوو لەیادی نەدەچۆوە.لەوكاتەدا حەزرەتی عائیشە غیرەت گرتی‌و خۆی بۆ نەگیراو نەی توانی هەستوهۆشی خۆی كپ‌و بێدەنگ بكات بەرامبەر بەو هەموو سۆزو خۆشەویستیەی پێغەمبەر بەرامبەر بە خەدیجە، بۆیە بە پێغەمبەریﷺ فەرموو: ئەوەچیەئەتۆ بەردەوام باسی ئەوئافرەتە پیرەقوڕەیشیە دەكەی كەكوڵمی سوری چرچ‌ولۆچ ببوو: تەواو پیروبەساڵدا چوبوو بەڕۆیشتنی ڕۆژگاركۆتایی تەمەنی گیانی دەرچوو:خوداش لەباتی ئەوەئافرەتێكی زۆرگەنج‌وجوانتروباشتری لەوی پێ بە خشیوی. بەڵام پێغەمبەر ڕەنگی گۆڕاو توڕەبوو، بەرقەوە بە عائیشەی فەرموو: سوێند بەخودا ئەی عائیشە خودا لە خەدیجەی باشتروچاكتر پێنەداوم؟ خەدیجە لەكاتێدا باوەڕی پێهێنام كەهەموو خەڵكان‌و، ئادەمیزادەكانی ترباوەڕیان پێم نەبوو:خەدیجە منی بەڕاست‌وڕاستگۆ دەزانی، لەكاتێك دا كە هەمو ئادەمیزادەكان منیان بەسەر لێشێواودرۆزن دەزانی. خەدیجە بەماڵ‌وسەروەتەكەی هاوكاری‌و كۆمەكی دەكردم، لەكاتێكدا كە ئادەمیزادەكان لەمنیان دەگرتەوەوبێبەشیان دەكرم. خودای گەورە لەخەدیجە منداڵی پێبەخشیم‌و لە هاوسەرو خێزانەكانی تر هیچی پێنەبەخشیم.

## لەڕەوشتی پێغەمبەرایەتی

## من أخلاق النبوة

دەگێڕنەوە (سەمامەی كوڕی ئاسال)ی حەنەفی گەورە پیاوی هۆزی یەمامە، بەرەو شاری مەدینەی پێغەمبەری خودا كەوتە ڕێ، بۆ مەبەستێكی گڵاوی نابەجێ، بۆ كوشتنی پێغەمبەری خودا: لەگەڵ گەیشتنی بۆ مەدینەی پێغەمبەر پۆلێك (سریە)

لەسەر بازانی (محمدی کوڕی مەسلەمە)بەدیلیان گرتو، لە کۆڵەکەیەکی مزگەوت بەستیانەوەو، هەواڵی گرتنەکەیان ڕاگەیاند، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ڕەفتاری جوان لەگەڵ دیلەکەتان بکەنو، هەواڵی بەماڵەوە ڕاگەیاند کەچی خواردنێکمان هەیە ببەن بۆ ئەو دیلە، شیری ئەو حوشترەی کە ڕۆژانە خۆراكو پێخۆریانە بۆی بەرن، لەدوای ئەوە پێغەمبەر بۆخۆی ڕۆیشت بۆ لای سەمامەو، فەرمووی:ئەوە چیە سەمامە بۆچی هاتوی؟ تۆ ئەو توانا و هێزەت هەیە ئەوکارە بە ئەنجام بگەیەنی؟ سەمامە وتی: ئەی محمد حەق بەتۆیە بەڵام، ئەگەر لەبری ئەوە تۆ بمکوژیەوە ئەوە تۆ تەنها خاوەنی خوێنیك دەکوژی، خۆئەگەر لێبوردنو عەفوشت هەبێ، ئەوە بەڕاستی جێگەی سوپاسە و کارێکی گەورەت ئەنجامداوە، وە ئەگەر داوای پارە و بەخشیش بکەی ئەوە هەتا دەتوانی داوابکەی پێت دەبەخشم.! لەسێهەم: ڕۆژی بەدیل گرتنەکەی، پێغەمبەری خودالێی خۆش بوو ئازادی کرد. دوای ئەوە (سەمامە) ڕۆیشت و گەڕایەوە چووە سەر ئاوێك خۆی جوان شوشت و جلەکانی خاوێن کردەوە و، بەرە و مەدینە گەڕایەوەو، ڕۆیشتەوە بۆلای پێغەمبەرو، گوتی: سوێند بە خودائەی پێغەمبەری خودا کەهاتم بۆمەدینە هیچ ڕوخسارو کەسێکم لەسەر ڕوی ئەو زەمینە بەئەندازەی تۆ ڕق لێی نەبوو. بەڵام، سوێند بەخودا ئێستا ڕووخساری تۆ لەلام لەهەموو ڕوو خسارەکان خۆشەویست ترو بەڕێز ترە بەلامەوە. وە سوێندبە خودا کە هاتم هیچ ئاینو ڕێبازێکم بە ئەندازەی ئەو ئاینە ڕق لێی نەبوو. بەڵام ئێستا ئەو ئاینو ڕێبازەی تۆ لە هەموو ئاینو ڕێبازەکانی تر خۆشەویست تر و بەرزو پیرۆز ترە بەلامەوە. وە هەروەها هیچ شارو ئاوەدانیەکم بە ئەندازەی ئەو شاری مەدینە ڕق لێنەبوو. بەڵام ئێستا ئەو شارە لە هەموو شارەکانی جیهان خۆشەویست ترو بەڕێز ترە بەلامەوە. لە دوای ئەو گفتوگۆیە بەڕاست و تەواوە شاهیدی بەڕاستی داو موسڵمان بوو. لە دوای باوەڕهێنانی بە ڕاستی، داوای لە پێغەمبەرﷺکرد کە بگەڕێتەوە بەرە و لای خانەوادەکەی بەسەردان بۆ مەککە: کاتێ قورەیشیەکانی مەککە تێگەیشتن کە سەمامە باوەڕی هێناوە و موسڵمان بووە، پێیانگوت: ئەی سەمامە ئەوە لەئاینەکەت

هەڵگەڕاویەوەو پەشیمانبوویەوە، لەوەڵامدا گوتی: نەخێر هەڵنەگەڕاومەوە بەڵكو موسڵمانبوومو بەدوای ئاین و ڕێبازی پێغەمبەر کەوتووم. بێباوەڕانی قوڕەیش خەریك بوون پەلاماری بدەنوبیکوژن، بەڵام لەوەترسان کەهەرچی خواردنو دانەوێڵەیە ڕێگایان لێبگیرێو، بۆیان نەیا و، ئابڵوقەی خۆراکیان بکەوێتە سەر، چونکە هەرچی خۆراكو دانەوێڵە هەیە لەیەمامەوە بۆیان دێت: بۆیە نەیان وێرابیکوژن. بەڵام سەمامە پەیمانیدا کەتازە لێرە بەدواوە هەرچی خواردن و خۆراك هەیە، نابێ لەیەمامەوەهیچ بگاتە دەستیان تەنها بە فەرمانی پێغەمبەر نەبێت. لەدوای گەڕانەوەی سەمامە بەرەو یەمامە پەیمانەکە هێنایەدیو، نەی هێشت یەك دەنکە دانەوێڵە بگاتە مەککەو هەموو ڕێگایەکانی لێ بڕین. بەجۆرێك دانیشتوانی مەککە زۆر برسی و بێتاقەت بوون: بە ناچاری نوێنەریان بۆلای پێغەمبەر ناردکەلەبەرخاتری خوداوسۆزو بەزەیی بەهەژارانو نەدارانی مەککە فەرمان بە سەمامە بکاتو هیچ کە گەمارۆی ئابڵوقەمان لەسەر نەکات و ڕێگامان بۆ بکاتەوە و نەبێتە بەربەستی ڕێگای خواردەمە نیمان. ئینجا پێغەمبەری خودا نامەیەکی بۆ (سەمامە) نوسی کەهیچی تر نەبێتە بەربەست و ڕێگری خواردن و دانەوێڵەیان و ، ڕێگایان بۆ بکاتەوە. ئەویش بەفەرمانی پێغەمبەر ڕێگای بۆ ئاواڵە کردنەوەو خواردنو دانەوێڵەیان بۆ بەڕێکرا.

## بگەڕێوە بۆلای هۆزەکەت ئێمە خەرا پەو نا پاکی ناکەین

## إنطلق إلى قومك فإننا لانغـدر

دەگێڕنەوە (ئەبو بەسیر)ﷺ یەکێك بوو لە هەژارو نەدارەکانی مەککە، باوەڕی هێناو، کۆچ و باری کرد بۆ شاری مەدینە، بێباوەڕان نامەیەکیان بۆ پێغەمبەر ﷺ نووسی دەربارەی (ئەبوبەسیر) ناوەرۆکی نامەکە بەو جۆرە بوو: ئەی محمد ئێمە لە نێوانی خۆماندا پەیمانێکمان واژۆ کردووە بەچەند بەندێکەوەو لە سەری ڕێککەوتوین: یەکێك لەبەندەکان ئەوەیە: هەر کەسێك لەئێمە بێتە لای ئێوە دەبێ بۆمانبگێڕنەوە: ئێستاش (ئەبو بەسیر) هاوڕێیەکی ئێمە بوو هاتۆتە لاتانو دەبێ بۆمانڕەوانە بکەنەوە؟ پێغەمبەریش ﷺ بانگی ئەبو بەسیری کردو و فەرمووی: ئەی

ـەکی بەبسیر ئێمە لەگەڵ بێباوەڕانی قورەیش پەیمانێکمان واژۆ کردووەو لەسەری ێکـو ڕازیبووین. پەیمانەکەش ئەوەیە هەر کەسێ لە هۆزی قورەیش بێتەلامان نابێ ێمە وەری بگرین بۆیە ئێستاش ئەگەر تۆلەلای خۆمان بهێڵینەوە ئەوە دیارە ـتمعمان لە پەیمانەکەمان کردووە بۆیە پێویستە ئێستا تۆلەگەڵ نوێنەری نامەکەدا ـگەڕێیەوە بۆ مەککە. ئەبو بەسیر گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا من موسڵمان بووم‌و ـاو بێباوەڕاندا هەڵاتووم‌و ڕامکردووە تۆش ئێستا ڕەوانەی بەردەستی بێباوەڕانم ـکەیەوە، ئاژاوەم بۆدروست بکەن‌وبم گێڕنەوەسەر بێ باوەڕی‌و لەئاینی ڕاستەقینە ـوورم بخەنەوە؟ پێغەمبەر لەسەر داوایە کەی بۆ گەڕانەوەی ئەبو بەسیر سوور بوو فەرمووی: ئێمە نابێت پەیمان و وەفاشکێن بین ئەگەرچی لەگەڵ دووژمنەکانیشماندا، وە هیوادارم لەخودای گەورە ئەگەر حەز بکات لەو ناخۆشی و تەنگەتاویانە ڕزگارت ـکات و دەرگای خۆشی‌و ڕووناکیت بۆدەکاتەوە.

## خاوەنی کەل‌و پەل بۆخۆی پێویست ترە بۆهەڵگرتنی

## صاحب الشیء أحق بحمله

ڕۆژێك (ئەبوهورەیرە)ﷺلەگەڵ پێغەمبەردا ڕۆیشتە بازار شتومەکی پێویستی بکڕێت: کابرای فرۆشیار هەر خێرا هەستا و پەلاماری دەستی پێغەمبەریﷺ دا ماچی بکات بەڵام پێغەمبەرﷺ دەستی کێشایەوەو نەی هێشت ماچی بکات‌و، فەرمووی: ئەوە کار و پیشەی عەجەمانە لەگەڵ پادشا و گەورەکانیان بەکاری دەهێنن، خۆئەمنیش پادشانیم‌و تاکەکەسێکی وەك‌و ئێوەم. لە دواییدا ئەبو هورەیرە ویستی شتەکانی بۆ هەڵبگرێ، بەڵام پێغەمبەرﷺنەی هێشت‌و، فەرمووی: خاوەنی شتومەك بۆ خۆی شایانتری هەڵگرتنی شتەکانیەتی.

## بڕۆ دار بهێنە

## إذهب فاحتطب

دەگێڕنەوە ڕۆژێك کابرایەکی ئەنساری داوای تۆزێك خواردنی لە پێغەمبەر کرد پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: برام تۆ لە ماڵتدا هیچت نییە؟ لە وەڵامدا گوتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری ﷺخودا ژێر ڕاخەرێکمان هەیە کە هێندێکی ڕادەخەین و ئەوەکەی

تریشی بەخۆماندا ئەدەین‌و، قاپێكی ئاو خواردنەوەشمان هەیە: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: برۆ بۆمبهێنە. كابرا ڕۆیشت لەماڵەوە هێنای پێغەمبەرﷺ فەرمووی: كێ ئەوانەم لێدەكڕێ؟ كابرایەك گوتی: من بەدرهەمێك دەمەوێ پێغەمبەر ﷺفەرمووی: كێ زیادی دەكات، یەكێكیتر گوتی: من بە دوو درهەم دەمەوێ: پێغەمبەر ﷺ شتەكانی دایەو دوو درهە مەكەی لێوەر گرت‌و، دایە دەستی كابرای ئەنساریەكە و پێی فەرموو: برۆ بە درهەمێك خواردن بۆ خۆت و خانەوادەت بكڕەو، بە دەرهەمەكەی تر (بیور) یان (تەشوێ) یەك بكڕە و بۆم بهێنەوە، ئەنساریەكە ڕۆیشتە بازاڕو شتەكانی كڕی‌و گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر، ﷺئەویش دەسكێكی داری بۆ بە بیورەكە خست و فەرمووی: برۆدار لەو كێوە بێنە و بیفرۆشە، بەڵام هەتا (١٥) پانزە ڕۆژی تر نەیەوە بۆ لام: كابرا ڕۆیشت دەستی بەدارفرۆشتن كرد، لەدوای پانزە ڕۆژەكە گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ(١٠) دەدرهەمی قازانج كردبوو. هێنێك لەو پارەیەی بە خواردن و هێندێكیشی بە جلوبەرگدا و، ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە زۆر باشترە بۆ تۆ كەبچی سواڵ بكەی‌و دەست لەخەڵك پان بكەیەوە، شتت پێبدەن یان پێت نەدەن بەڕاستی ئەوە خاڵێكی زۆر ناشیرینە بە ڕووخسارتەوە لەڕۆژی دواییدا.

## هەر كەسێك لە ڕێبازی ئێمە دووربكەوێتەوە لە ئێمە نیە

## من رغب عن سنتي فليس مني

دەگێڕنەوە ڕۆژێك سێ نەفەر هاتنە ماڵی پێغەمبەرﷺپرسیاری عیبادەت و خودا پەرستی پێغەمبەریان كرد: كاتێ خوداپەرستی پێغەمبەریان بۆ ڕوونكردنەوەو تێیانگەیاندن، ئەوانە خوداپەرستی پێغەمبەریانﷺ زۆر بە كەمزانی. بەڵام گوتیان: باشە ئێمە لە كوێ و پێغەمبەر ﷺلە كوێ، خودا لە گوناه و تاوانی پاش و پێشی خۆشبووە ، خوداپەرستی پێغەمبەر ﷺ وەكو ئێمە نییە، بۆیە پێویستە ئێمە زۆرتر خوداپەرستی بكەین: یەكێكیان گوتی: ئەمن لە دوای نوێژە واجبەكان، شەو هەر نانوم و هەر نوێژ دەكەم.

سووەمیان گوتی: منیش لە باتی ڕۆژووی ڕەمەزان هەر دوانزە مانگەكەی ساڵ بە ڕۆژو دەبم و نایشكێنم.

سێهەمیان گوتی: منیش هەر گیز ژن ناهێنم.

دوای ئەوە كە پێغەمبەر هاتەوە ماڵ. هەواڵی ئەو نەفەرانەیان پێدا كەچیان گوتووە: پێغەمبەر ﷺموسڵمانانی لە مزگەوت كۆ كردەوە و وتارێكی بۆ خوێندنەوە و فەرمووی: ئەوەچیە هێندێ كەس بەئارەزوی خۆیان قسەدەكەن؟ ئەوها و ئەوها دەڵێن: سوێند بەخودا من لە هەمووتان لەخودا نزیكترم و، لە هەمووشتان زیاتر دەترسێم. بەڵام بە ڕۆژو دەبم و، بێجگە لەڕەمەزان بە ڕۆژوش نابم. نوێژیش دەكەم و شەویش دەنوم و، پشوش ئەدەم و، ژنیش دەهێنم، هەر كەسێكیش لە ڕێبازی من لابدا ئەوە لەمن نیە: واتە بەموسڵمان ناژمێردرێ.

## میرات گرانت بەدەوڵەمەندی بەجێ بهێڵی باشترەنەك بەهەژاری
## إن تذر ورثتك أغنياء خير من أن تذرهم عالة

دەگێڕنەوە(سەعدی كوڕی وەقاس)ﷺخاوەن سەروەت و سامانێكی زۆرو، خۆش گوزەران بوو. لە كاتی گەنجی و لاویدا نەخۆشیەكی سامناك و ترسناكی نزیك لە مردن توش هات. پێغەمبەرﷺسەردانی كرد: (سەعد)ﷺفەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ من سەروەت و سامانێكی زۆرم هەیە.میرات گریشم تەنها یەك كچم هەیە. ڕاسپاردەیەك (وصیە) دەكەم بە دووبەش لەسێبەشی ماڵەكەم؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ناشتی وامەكە نابێت. ئەمجار سەعد فەرمووی: نیوەی ماڵكەم دەكەم بەوەسیەت؟ پێغەمبەر فەرمووی: ناشتی واش مەكە نابێت. لەدواییدا (سەعد) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ، بەشێك لەسێ بەشی ماڵەكەم دەكەم بەوەسیەت؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی :(سەعد) سێیەك زۆرە. ئەگەر میرات گرەكەت بە دەوڵەمەندی بەجێبهێڵی زۆر باشترە لەوەی كەبە هەژاری بەجێیبهێڵی و، چاوەیان لەدەستی خەڵكان بێت و، دەستیان بۆپان بكەنەوە.

# دادوەربەرگری كردلەوەرگرتنی بەخشیش

# منع الحاكم من أخذ الهدايا

دەگێڕنــەوە پێغەمبــەری ﷺ خــودا كــوڕی (تەیبــە)ی ڕاســپارد بــۆ وەرگــرتن و كۆكردنــەوەی خێــرو بەخــشندەیی هــۆزی (ســەلیم)لــەدوای كۆكردنــەوەی خێــرو بەخــشندەكانی و، وەر گرتنیــان و گەڕانــەوەی كۆمــەڵێك ئەشــیای جیــاوازی پێبــوو. ڕۆیــشتەلای پێغەمبــەرو ﷺ گــوتی: ئــەی پێغەمبــەری خــودا ﷺ ئــەوە خێــرو بەخشندەكانی هۆزی سەلیمەو، ئەو كۆمەڵە شتەش بەشی خۆمە بەتەنیا پێیان بەخشیوم، بەڵام با ئەوەش بۆ ئێوە بێت لەگەڵ ئەوانەی تر. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی كوڕی( تەیبە) ئەگەر ڕاست دەكەی ئەوەبەشی خۆتە ئەدی بۆ لەماڵی خۆت دانەدەنیشتی هەتا ئەو شتانەت بۆ دەهات؟. بخاری / ٩٢٥–ومسلم/١٨٣٢

مەبەستی پێغەمبەر ﷺ لێرە ئەوەبوو ئەو بەخشیشەی كە پێیانداوە لەبەر ئەو پیشەیەی بووە كە پێی سپێردراوە داویانەتێ نەك لەبەر خۆی.ئایا ئەگەر لەماڵەوە دانیشتبا ئەو شتانەیان بۆدەهێنا؟.

# دینی نیەئەوەی پارێزگاری لەسپاردەنەكات

# لادين لمن لاأمانة له

حەزرەتی عەلی ﷺ خودا ڕوخساری ڕووناك بكات دەفەرموێ: ڕۆژێك لەخزمەت پێغەمبەر ﷺ دانیشتبووین لەناكاو كابرایەكی دەوەڵەمەندی خاوەن شكۆ هاتەلامان و، گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ: پێم بڵێ چی شتێك لەو ئاینەدا لە هەموو شتێك گەورەتر و بەنرخترە؟ وەچ شتێكیش لە هەموو شتێك ئاسان و نەرم ترە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لە هەموو شتێك نەرموونیان و ئاسانتر: وشەی (اشهد ان لا إله إلا الله ، واشهدان محمدا عبده ورسوله)یە، و لە هەمووشی گەورەتر و بەهێزتر ئەی برای خاوەن شكۆ سپاردە (امانة)ە:بەڕاستی دین و ئاینی نیە ئەوەی پارێزگاری لە سپاردەو ئەمانەتدا نەكات با نوێژو ڕۆژ و شی هەبێت.

# ئادەمیزادی ئازادو سەر بەست درۆناکات
# الحر لا یکذب

کاتێ جەنگی (یرموك)لەنێوانی عەرەب و ڕۆم ڕویدا: کاتێ کەوتنە بەرامبەری یەکتروپاڵەوان بازی، لەناو ڕیزەکانی سوپای ڕۆمداسەرکردەیەکی ئەرمەنی بەناوی(جرجە)لەناو کۆمەڵێك تیمی سەربازی زۆردا کەژمارەیان(١٢٠٠٠)دوانزە هەزار جەنگاوەربووهاتە نێوانی هەردووك سوپاو، هاواری کرد:با(خالیدی کوری وەلید)ﷺم بۆ بێتە مەیدان.!(خالیدی کوڕی وەلید)ﷺیش لەگەڵ بیستنی دەنگی(جرجە) خێراهەستا و ڕۆیشتە مەیدان. هەریەك لەو دوو پاڵەوانە ئازاییو خۆشحاڵی خۆیان دەردەبڕی بەرامبەر بەیەکتریو، هەردووکیان پەیمانی زەرەر بەیەکتر نەگەیاندنیان بەیەکتریدا ئینجا (جرجە)هاتە گوتەو گوتی:ئەی خالید تۆ لەگوفتارو ڕەفتارت ئازادو سەربەستیو، ئادەمیزادی سەربەست ، ڕاستی دەڵێو بەرامبەرەکەی هەڵنافریوێنێو نای خەڵەتێنێ: وە ئادەمیزادی ڕێزدار، نێردراوی خۆی لەخشتەنابات: ئایا خودای گەورە هیچ شیری بۆ پێغەمبەرەکەت ناردووەو ، ئەوەیش بەتۆی بەخشیبێتو، بەسەر هەر گەل و هۆزو پاڵەوانێکت دادابێتوشیرت لێڕاکێشابێت، خۆی بۆ ڕانەگرتوویی و تێکتشکاندووە؟ (خالید) لەوەڵامدا فەرمووی: نەخێر شتی وانەبووە.(جرجە)گوتی: ئەدی بۆچی پێت دەگوترێ شیری خودا؟ (خالید) فەرمووی: خودای گەورە پێغەمبەرێکیﷺ بۆ ناردینو منیش باوەڕم پێی نەکردو، لەگەڵیدا دەجەنگامو شەڕم لەدژی دەکرد: لە دواییدا خودا ڕێنمونی کردمو، هیدایەتی دامو بەشوێن ڕێبازو بەرنامەکەی کەوتم. پێغەمبەری خودا ﷺهەڵینامو، بۆ ڕێز لێنانو ئازایەتیم پێی فەرمووم: ئەتۆ شیرێکی لە شیرەکانی خودا لەکالان دەری هێناوی بۆ بڕینی ملو ئەستۆی بێباوەڕانو هاوبەش پەیداکەران. لە دواییدا دوعاو نزای سەرکەوتنی بۆ کردم (جرجە)گوتی: ئەی (خالید) ئەوانەی کە باوەڕ دەهێننو موسڵمان دەبن چی جێگەو مەرتەبەیەکیان دەستدەکەوێ ، لەوەڵام دانەوەی ئەو بانگەوازەی ئێوە بانگەشەی بۆ دەکەن؟ (خالید) فەرمووی: شوێنو مەرتەبەی بانگ خوازەکانو شوێن

كەوتوەكان یەك شوێن و جێگەیە (جرجە)گوتی: لە خێرو پاداشتی چاكەشدا وەك و یەكن(خالید)فەرمووی: بەڵێ و بەزیادەوەش، چونكە ئێمە كە باوەڕمان بە پێغەمبەری خوداﷺ هێنا، زیندووبوو لە ژیاندا بوو، هەواڵ و خەبەری نادیاری پێدەداین و، شتی سەرسوڕهێنەرمان لێی دەدیت و، بەڵگەو نیشانەی سەیری پیشان دەداین، بەڕاستی واجبی سەر شانی ئەوانەی كەوەك و ئێمە دەبیستێی و دەبینیْ باوەڕی پێبهێنیْ، ئینجا ئێوەكەنەتان دیتوە و شتتان لێی نەبیستوە هەر كەسێك بەنیەتێكی پاك و ڕاستەوە باوەڕی پێی بهێنیْ ئەوە زۆر لە ئێمەش چاكترو باشترە. ئینجا لەو كاتەدا (جرجە) هەڵگەڕایەوەو زرێیەكەی هەڵسوڕاندو، پاڵیدایە لای (خالید)و گوتی:ئەی (خالید) ئاینی ئیسلامم فێربكە؟ حەزرەتی (خالید) (جرجە)ی لەگەڵ خۆیدا برد بۆ بن خەیمەو چادرەكەی و، كوندەیەك ئاوی لێ بوو پێیدا كردو خۆی پێشوشت و، دوو ركات نوێژی كردوو، لەگەڵ خالید گەڕایەوە مەیدانی جەنگ و، شەڕێكی زۆر ئازاو مەردانەی دەكرد هەر لە دەركەوتن و بەرز بوونەوەی ڕۆژ ، هەتاسێبەرو ئاوابونی ڕۆژ، لەكاتی ئاوابوونی ڕۆژ (جرجە) پێكاو بریندار بوو لە پێكەوت و ، هیچ توانای نەما و لەودووركات نوێژەی موسڵمان بوون و باوەڕەی زیاتر (جرجە) هیچ سوجدە و كڕنۆشێكی تری نەبرد. بەشەهیدی گیانی پاكی سپارد.

## من بۆئەوەنەنێردراوم نەفرین لەخەڵك بكەم

## إني لم أبعث لعانا

لە ڕۆژی جەنگی ئوحود لە كاتێكدا كە ڕوخساری پێغەمبەری ﷺخودا هەموی بریندار بوو خوێنی لێدەتكا، كە بەڕاستی هاوڕێ و شوێنكەوتوانی پێغەمبەرﷺ زۆر عاجزو غەمبار ببون و ئەو كارە ناخۆشی و بێئارامیەكی زۆری كردە سەریان: گوتیان ئەی پێغەمبەری خوداﷺبۆچی دوعا و نزایان لێناكەی خودا لەناویان بەری. پێغەمبەرﷺ لە وەڵامدا فەرموی:من بۆ ئەوە ڕەوانە نەكراوم نەفرین (لعنە) لەخەڵك بكەم: بەڵكو بۆ ئەوە ڕەوا نەكراوم كە بانگەوازێكی كارامەو میهرەبان بم لەگەڵ خەڵكیدا. ئەی خودای گەورەو بەبەزەیی، پەروەردگاری بونەوەر، ڕێنمونی

گەل و هۆزەکەم بکە، چونکە بەڕاستی ئەوانە زۆر نەزان و نەفامن. وە هەر وەها کاتێك کە خودای بە دەسەلآت پێغەمبەری سەربەرز و سەرکەوت و کرد بەسەر دوژمنانیدا شاری مەککەی لە دەستی بێباوەڕان ڕزگار کرد و موسڵمانان سەربەرز و سەرکەو تو بوون: دووژمنانی قوڕەیش لەدوای ئەو هەموو ئازار و کوشتن و دەربەدەریە گوومانیان لە تۆڵە سەندنەوەی پێغەمبەرﷺنەبوو: بۆیە لەدوای کۆکردنەوەیان پێغەمبەر ﷺفەرمووی: دەزانن چیتان لێدەکەم؟ هەموویان بە جارێك گوتیان ئێمە هەر هیوای چاکەمان بە تۆ هەیە و، هەر چاکەش چاوەڕوان دەکەین ، تۆ برایەکی باش و، کوڕی برایەکی باشی، پێغەمبەریشﷺ چاوپۆشی لەهەموو تاوانەکانی پێشویانی کردو و فەرمووی: هەمووتان لەلایەن ئێمەوە ئازادن و بڕۆن.

## پێغەمبەر لە بانگەوازەکەیدا ڕاستی فەرموو

## صدق الرسول فی دعوته

ئەبو تالیبی مامی پێغەمبەرﷺ:بە نوێنەرایەتی خەڵك ڕۆیشتەلای پێغەمبەروﷺ پێی گوت: ئەی کوڕی برام گەل و هۆزەکەت هاتوونە لام و زۆریان گلەیی و گازندە لە تۆ هەیە و، پێیان گوتم:کوڕی برایەکەت زۆردەم درێژی دەکات وجنێو قسەی ناشیرین بە خودایەکانمان دەدات و دین و ئاینەکەمان بە ناشیرینی سەیر دەکات و هیچ ڕێزێك بۆ خودایەکانمان دانانێ، وە هیوا و ئاواتەکانمان بە پوچ و بێبایەخ باس و وەسف دەکات و، باوك و باپیرانمان بەنەزان و سەرلێ شێواو دادەنێت: گوتیان: دەبێ تۆ کارێکی وای لەگەڵ بکەی کە ئەو ڕەفتارە ناشیرینانە بەرامبەرمان نەکات و وازبهێنێ. یان دەبێ ڕێگە بە ئێمە بدەی بزانین ئێمەو ئەو چی دەکەین: ئێمە زۆر باشیش دەزانین کە بۆچوونی تۆش هەروەك و بۆچوونی ئێمە وایە: پاریزگاری و جێگیر بوونی ئێمەو گیانی خۆشت بکەو کارێکی وامان لەسەر دامەنێ کە توانامان بەسەری دانەبێت. پێغەمبەر ﷺگومانی وابردکەمامی وازی لێدەهێنێ و، سست و لاوازو بێهێزە لە یارمەتیدانی و پشگیری لە بانگەوازەکەی ناکات. پێغەمبەرﷺ لە وەڵامیدا فەرمووی: ئەی مامە سوێند بەخودا ئەگەر ڕۆژ لەسەرشانی ڕاستەم دابنێن و مانگیش لەسەر شانی چەپەم دابنێن بۆ ئەوەی

وازلەو کارو بانگەوازەم بهێنم شتێکی نادروست و نەگونجاوە، هەتا خودای گەورە لەو ڕێگەیەدا سەرکەوتووم دەکات: یان لەو ڕێبازەدا سەر دەنێمەوەو نامێنم وازی لێناهێنم؟ پێغەمبەر ﷺلەدوای ئەو وتووێژە زۆر خەمبارو نائارام بوو دەستی کرد بە گریان و، لەلای مامی هەستاو ڕۆیشت، ئەبوتالیب بانگی لێکردوو گوتی: ئەی برازام ڕوم تێبکەو وەرەلام؟ پێغەمبەرﷺیش بەرە و لای ڕووی سوڕاند بزانێ مامی چی دەڵێ؟! ئەبو تالیب گوتی: ئەی کوڕی برام هیچ خۆت دڵتەنگ و خەفەتبار مەکە بڕۆ چۆنت ئارەزولێیە بانگەوازەکەی خۆت ڕابگەیەنە. سوێند بە خودا بەهیچ جۆرێك تۆ بەدەستەوە نادەم.

## کۆتایی ستەم و ناپاکی

## نهاية الغدر

دەگێڕنەوە (عامری کوڕی مالیکی کوڕی جەعفەر)ناز ناوی ئەبو (براء)بەنوێنەری هۆزەکەی هاتە خزمەتی پێغەمبەرﷺ. ئەویش داوای لە (عامر) کرد موسڵمان ببێ؟ عامر لاری کرد و موسڵمان نەبوو. لە دواییدا داوای لە پێغەمبەرﷺکرد ئەمن باوەڕ ناهێنم بەڵام، پێم خۆشە کۆمەڵێك لە هاوڕێکانت بنێرە بۆ وڵاتی(نەجد)بۆئەوەی خەڵکی بانگ بکەن بۆسەر ڕێبازی ئاینی سەربەرزی ئیسلام و، فێری ئاینیان بکەن. ئینجا، وەك و لە ئەبو ئیسحاقەوە ڕیوایەت کراوە پێغەمبەرﷺ (٤٠)چل کەسی لە هاوڕێ بەڕێزەکانی نارد. بەڵام ، لە فەرموودەی صحیح داهاتووە پێغەمبەرﷺ (٧٠)حەفتا کەسی لە هاوڕێیانی قورئانخوێن و زیرەك و پیاوە بەڕێزەکانی شاری مەدینەدا نارد. ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە بیری (مەعونە) کە شوێنێکە دەکەوێتە نێوانی هەوارگەی هۆزی بەنی عامرو، زەوی بەنی سەلیم کە بە بەردی ڕەش داپۆشراوە، لەو شوێنە بارگەیانخست و پشویاندا.

لە دواییدا نامەیەکی پێغەمبەریان بە(حەرامی کوڕی مەلحان)دا نارد بۆلای (عامری کوڕی تەفیل) هەرکە زانی نامەکە لەلای پێغەمبەرەوەیەﷺ هەر سەیری نەکردو نامەکەی پارچە پارچەکردو، خێرا نوێنەرو پەیامنێری پێغەمبەری ﷺکوشت. وە بەزوترین کات عامر هەواڵی دایە هۆزی سەلیم کە هەموو هاوڕێ و نوێنەرانی

محمـد بکـوژن؟ ئـەوانیش هـەر خێـرا گەمارۆیانـدانو هـەموویان کوشـتن ﷺ تـەنها(عـەمری کـوڕی ئومەیـەی زەمـەری) نـەبێت بۆیـان نـەکوژراو بـەرەو شـاری مەدینە گەڕایەوە: لەڕێگادا گەیشتە دوو پیاوی هۆزی عامر ئەویش هەردوو کیانی کوشـت؟ زۆربـەخۆش حاڵیـەوە وای زانـی کـارێکی زۆرباشـی کـردووە و بەشـێك لەتۆڵەی هاوڕێیانی کردۆتەوە: بـەڵام کارەکە بەجۆرێکی تربـوو ، ئەو دوو پیاوە لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ نوسراو پەیمانی پێغەمبەریان ﷺ پێ بوو، بەڵام عامر ئاگای لـەو ڕووداو بەسـەرهاتە نـەبوو. پێغەمبـەر ﷺ بەگەیشتنی ئەوهەواڵـە زۆر خەفـەت بارویەرێشان بـوو. وە خـەمو ئازاری زۆریشی بـۆ ئەو دووپیاوە کـوژراوە خـوارد. لەبـەر ئـەوەی ڕەوشـتو ئاکاری پێغەمبـەرو ﷺ ئیسلام پێـچەوانەی بیرو بۆچوونی بێباوەڕانـە. فـەرمووی: لەبـەر ئـەوەی ئێمـە پـەیمانمان لەگەڵـدا بەسـتوونو، لـەژێر پەیمانی ئێمەدا کوژراون دەبێ وەكو ئیسلام ئێمە خوێنی هەردوك پیاوەکە بدەین. بۆ ئەو مەبەستە پێغەمبەری ﷺ خودا ڕۆیشتە ناو جولەکەی هۆزی (بەنی نەزیر) کە پـەیمانی ڕێککـەوتنیان لەگـەڵ یـەکتر هـەبوو، کەشـەڕ لەگـەڵ یـەکتردا نەکـەنو، هـەر کـاتێکیش پێویستیان هـەبوو هاوکـاریو کۆمـەکی یـەکتر بکـەن. پێغەمبـەر ﷺ داوای یارمەتی خوێنی کوشتنی ئەو دوو کوژراوە بەهەڵەی لێکردن: ئەوانیش لـەوەڵامی پێغەمبـەردا ﷺ بەوتـەی شـیرینی سـەردەمیان، سەرپێـچیان نـەکردو، ئامادەباشـیان پێشکەش کـردو گوتیـان: ئـەی بـاوکی قاسـم ئێمـە پـەیمانی ئاشـتیو کۆمـەکیمان لەگەڵ یەکتریـدا هەیـە و هەرشتێك کـەتۆ پێـت بـاش بێـت ئێمـەش قایلو ڕازیـنو فەرمانت بەسەر چاو هەرچی تۆبیڵێی ئێمە ڕازین و واز لەتۆ ناهێنین. بەڵام ئەوانە هەمووی وتەی لوسو غـافڵگیری بـوو، لەلایـەکی ترەوە دەیانویست بەوتـەی لـوس داخـی دڵـی خۆیـان بەپێغەمبــەر ﷺ بڕێــژن. لەوکاتــەدا کەلــەبن دیــواری مــاڵی جولەکەیەك دانیشتبوون گوتیان: ئەی محمد تۆلێرە دابنیشەو پشویەك بدە هـەتا ئێمە دەچین پارەکەت بۆ کۆ دەکەینەوە. لەولاشەوە کابرایـەکی جولەکـەیان ئاگـادار کردبوەوە کە بڕواتو لەسـەربانەوە بەردێکی گـەورەی وەکـو دەسـتاڕ بەسـەرسـەری پێغەمبەردا بداتو، بیکوژێ و پێغەمبـەریش ﷺ بـێ ئاگـا لـەو پیلانـە گـڵاو خەراپە.

ئینجا خودای بەدەسەلاٌت و بەزەیی حەزرەتی پێغەمبەری ﷺ لەو پیلانە دزێوەی جولەکەکان ئاگادارکردەوە. پێغەمبەریش ﷺ لەو شوێنە هەستا بەناوی ئەوەی کە کارێکی زۆرگرنگی بەبیر کەوتۆتەوەو، دەڕوات بەجێگەی دەهێنێ. ڕۆیشت موسڵمانانی ئاگادار کردەوەو، کۆیکردنەوەو دەورەی جولەکەکانی گەمارۆدلو لەماڵ و جێگای خۆیانی بەدەرنانو ، دەریکردن بەهۆی ئەو ناپاکیو خەراپەیان .

## ڕەوشتی ئیسلام

## أخلاق الاسلام

لەو کاتانەی کە موسڵمانان گەمارۆی شاری(سوس)یاندا لە کاتی شەڕو جەنگیان لەگەڵ فارسەکاندا خەڵکی شار لەو کاتە پڕ ترس و ناخۆشیەیاندا بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر دانیشتوانی ناو شار دەهاتنە بەرچاو، دەرگای ماڵەکانیان دەکردەوەو، بەبێ سیلاح و چەك دەڕۆیشتنە بازاڕ، زۆر بە ئەمینو دڵنیاییەوە، هەروەكو لەشەڕ دانەبن وابوو. موسڵمانان نوێنەریان بۆلایان نارد بۆئەوەی سڕو نهێنی ئەوکارە ناوازەیان پێبڵێن، بۆچی کە هەواڵی سوپای موسڵمانان گەیشتە ئەو شوێنە بۆ وا بەخێرایی دەرگای ماڵەکانیان کردەوەو بەرەو بازاڕ ڕۆیشتن بەبێ چەك بۆ بەجێهێنانی پێویستیان هەروەك و حاڵەتی شەڕ نەبێت وابوو لە هیچ نەدەترسان. دانیشتوانی شار لەوەلاٌمدا گوتیان: ئێوە ئێمەتان ئاگادار کردەوە بە هێمنیو ئارامی ئێمەش بەدڵنیایەوە وەرمان گرتو قبوڵمان کرد ، وە ئێمەش داوای پاداشتمان کرد بۆ ئێوە لە بەرامبەری ئەوەی کەوازتان لێهێناوین. موسڵمانەکانیش بەسەرسامیەوە گوتیان: ئێمە وازمان لێنەهێناونو، وەکو ئێوەش دەڵێن وامان نەگوتوە. دووبارە ئەوانیش گوتیان: ئێمەش ڕاستی دەڵێینو، درۆمان نەکردووە. بەو بۆنەوە موسڵمانەکان کەوتنە ووتو وێژو پرسیارکردن لەگەڵ یەکتردا: یەکێك لەموسڵمانان بەناوی (مکنف)کەلە ڕاستیدا سەربازێکی (یەسابور) بوودەڵێ ئەوبووە کەمۆڵەتی دڵنیاییو ئاسودەیی پێبەخشی بوون. موسڵمانان ویستیان ئەو ئەمانەتو ئاسودەیان لێوەربگرنەوە، چونکە تەنها سەربازێك بەبیرو ڕای خۆی ئەوەی کردوە بەبێ ئاگاداری هیچ بەر پرسو

لێپرسراوێك. ئەوانیش لەوەڵامدا گوتیان: ئێمە ئازاد و حر، بەندەو عبدتان لەیەك جیاواز ناكەینەوە. تەنها ئەوە دەزانین ئێوە دڵنیایی و ئاسودەیتان پێبەخشیوین و ئێمەش لێمان وەرگرتوون و قبوڵمان كردوە، تازەش ڕەدی ناكەینەوەو نایگۆڕین، ئینجا ئەگەر ئێوەش چۆن حەزدەكەن زوڵم و ستەممان لێبكەن كەیفی خۆتانە فەرموون. بیكەن. بەو هۆیەوە موسڵمانان ناچاربوون، كە جەنگ ڕابگرن و دەست درێژی نەكەنە سەریان، هەتا پرسیار لە پێشەوای موسڵمانان حەزرەتی (عومەری كوڕی خەتاب ﷺ) دەكەن حەزرەتی عومەر لەوەڵامدا فەرمووی: خودای گەورە پەیمان بردنەسەری زۆر بەگەورەو بەڕێزداناوە. ئێوەش پێتان ناگوترێ خاوەن وەفا، هەتا بەتەواوی پەیمان نەبەنە سەر، ئینجا ئەگەر ئێوە گومانتان لە بەڵێنەكەتان هەیە ئەوە پاداشتی تەواویان بدەنەوەو، پەیمان و بەڵێنی تەواویان پێبدەن و، بەڕاستیش بیبەنەسەر لەگەڵیاندا. موسڵمانانیش بەتەواوی فەرمانەكەی حەزرەتی عومەریان بەجێهێناو پەیمانی دڵنیاییان تەواو بردە سەر و هیچ كەموكوڕی و ناتەواویان لەمافەكانی پەیمانبردنە سەر نەكرد و دڵنیایی تەواویان پێدان.

## چاكترینی ئادەمیزادخێر بە خەڵك گەیاندنە

## خير الناس من ينفع الناس

دەگێڕنەوە (عبداللەی كوڕی عەباس ﷺ) لەمزگەوتی پێغەمبەرداﷺ گۆشەنشینی و خوداپەرستی دەكرد(معتكف) لە ناكاوێكدا كابرایەك هاتە ژووری مزگەوت وسەلامی كردو، هاتە لام دانیشت. عبدالله ﷺ فەرمووی: برام لەحاڵێكی نایاسایی دەتبینم، ماتەم و غەمبار دیاری؟ كابرا لە وەڵامدا گوتی: خاوەنی ئەو گۆڕە ماف و پێویستی سالاری و سەرداری لەسەرم هەیە، بەڵام بەداخەوە دەستم پێی ناگاو، توانام نیە بەسەریدا پاداشتی بدەمەوە.عبداللەی كوڕی عەباس ﷺ)گوتی: حەزدەكەی لەباتی تۆ قسەی لەگەڵدا بكەم؟ كابراگوتی: ئەگەر تۆ حەزبكەی من زۆر ئارەزومەندم و پێم خۆشە: لەدوای تەواو تێكەیشتنی، عبدالله ﷺ هەستاو لە مزگەوت ڕۆیشتەدەر ، كابرا گوتی: ئەی كوڕی عەباس تۆ مەبەستی گۆشەنشینی مزگەوتت لەبیرچۆوە بۆچی لێرەی؟! عبداللەی كوڕی عەباس ﷺ گوتی:

نەخێر لەیادم نەچۆتەوە، بەڵام گوێم لە دەنگی خاوەنی ئەو گۆڕەی کەتۆ باسی دەکەی بوو، بانگی لێکردم، کە پەیمانی چاو دێریەکە زۆرنزیکبوو، چاوەکانی پڕ لە فرمێسك بوو، لەگەڵ فرمێسکی چاوەکانی دەیگوت: هەرکەسێ بۆ بەجێهێنانی پێویستی ئادەمیزادێك بڕوا و کارەکەی بۆ بەجێبهێنێ‌و ڕێکیبخات، ئەوە خێر و پاداشتی لە(٢٠) بیست ساڵی گۆشەنشینی‌و خوداپەرستی باشترە. لە کاتێکدا کە هەرکەسێك یەك ڕۆژ لە پێناوی ڕەزابوونی خودا گۆشەنشینی بکات، خودای بەدەسەڵات ماوەو نێوانی ئەو ئادەمیزادە و ئاگری دۆزەخە سێ چاڵ دووری دەخاتەوە، کەپانی نێوانی هەر چاڵێك بە ئەندازەی نێوان ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوایە.

## خۆبەخت کردن لە پێناوی بەرژەوەندی گشتی

## التفانی فی سبیل المصلحة العامة

لەدوای مردنی پێغەمبەری خودا ﷺ(حەزرەتی ئەبوبەکری صدیق ﷺ) دیاری و دەستنیشان کرا بۆ جێنشینی پێغەمبەری خودا ﷺ.لەدوای و لێدوان‌و ووت‌و وێژێکی تەواو ئەبوبکر دیاری کرا ﷺبە جێنشینی پێغەمبەر(ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح ﷺ) کەیەکێك بوو لە پاڵێوراوان بۆ ئەو پۆستە. هەستایە سەر پێ‌و ، بەدەنگێکی بەرز هاواری کردوو گوتی: بەڵێ ئەبوبکر هەڵدەبژێرین، سوێند بەخودا ئەبوبکر گەورەترینی کۆچ کردوانە نەفەری دووەمی هاوڕێی پێغەمبەری ﷺخودایە لەناو ئەشکەوتداو، هەر خۆی جێنشینی پێغەمبەری خودایە ﷺ، جاهەر کەسێ حەزدەکات‌و ئارەزوی لێیەو ئەو کارە دەگرێتە ئەستۆی خۆی بابێتە پێشەوە؟.
لەوکاتدا حەزرەتی عومەر هاتە پێشەوەو ئەو ووت‌و وێژەجوانەی کەوەك گەوهەر و مرواری بەسەریەکدا دەهاتە خوارو، ڕیزی دەبەست ، هاتە نێوانەوە ، کەبەڕاستی گەورەترین خەبات‌و تێکۆشانە، لە پێناوی بەرژەوەندی گشتی. عومەر فەرمووی: بەڕاستی ئەبوبکر تۆ زۆر لەمن گەورەترو، بەڕیزتری و، شایانی ئەو جێنشینیەی. ئەبوبەکریش هاتە گوفتارو فەرمووی: بەڕاستی عومەر تۆش زۆر لە من بەهێزو بە تواناتری. لەدوای ئەوە حەزرەتی عومەر هاتەوە گوفتارو فەرمووی: ئەبوبکر هێز و توانایەکەی من لەگەڵ گەورایەتی و ڕێزی تۆ بێت.

## من ئەوەنیم بتوانم نهێنی پێغەمبەر بدركێنم

## لم اكن لافشي سر رسول الله

دەگێڕنەوە لەدوای مردنی هاوسەری (حەفصەی كچی حەزرەتی عومەر) بەبێها و سەریو بێوەژنی مایەوە، حەزرەتی عومەر ڕۆیشتە لای حەزرەتی عوسمانو داوای لێكرد كە پێی خۆشە كچەكەی لەخۆی مارە ببڕێ! بەڵام حەزرەتی عوسمان﷛ هیچ ئامادەباشی نەبوو، لەدوای دڵنیابوونی ڕۆیشتە لای حەزرەتی ئەبوبكر﷛، ئەویش هیچ ئامادەباشی و ئاكامێكی نەبوو.لەو بارەوەش حەزرەتی عومەر ﷛ بۆ خۆی ئەو ڕووداوەمان بۆ دەگێڕێتەوە باگوێی لێ بگرین دەفەرموێ: كە بە حەزرەتی عوسمانم گوت: لە وەڵامدا گوتی: ئەی عومەر بابیرێكی لێبكەمەوە، لەدوای تێپەڕینی چەندین شەو عوسمان توشم هات و فەرمووی: ئەی عومەر بۆمن وا باشە كە لەوكاتەدا ژن نەهێنم. بەڵام حەزرەتی ئەبوبكر هەر وەڵامی نەدامەوە و نەهاتەوە بۆ لام، بۆیە هەرچەند لەهەردووكیان دڵگران بووم ، بەڵام لە ئەبوبكر زیاتر دڵ گرانو داخاوی بووم. بەڵام لەدوای ماوەیەك پێغەمبەری خودا ﷺ بۆ خۆی داخوازی لێكردمو مارەی بڕی. ئینجا لە دوای ئەوەی كە پێغەمبەر ﷺ حەفصەی مارەبڕی چاوم بە ئەبوبكر كەوتو، فەرمووی: ئەی عومەر دڵت هیچ نەكات ئەو كاتەی كە باسی حەفصەت لەلاكردمو، منیش هیچ وەڵامم نەدایەوە لەبەر ئەوە بوو، ڕۆژێك پێغەمبەری خودا ﷺ لەلای من باسی حەفصەی كردبوو، بەڵام من نەمتوانی نهێنی پێغەمبەری خودا ﷺ لەلات بدركێنم بۆیە هیچ باسم نەكرد. وە ئەگەر پێغەمبەری خودا ﷺ وازی لێ بهێنابایە و نەیویستبایە من قبوڵم دەكرد.

## جوانی گومان لەباوەڕە - حسن الظن من الإيمان

لەدوای بوختانو درۆ گەورە هەڵبەستراوەكەی بە حەزرەتی عائیشە. هاوسەری ئەبو ئەیوبی ئەنساری﷛ بە هاوسەرەكەی گوت: ئەی باوكی ئەیوب تۆ بیستوتە كە خەڵكانێك چیان بۆحەزرەتی عائیشە هەڵبەستوە؟ ئەویش فەرمووی: بەڵێ ئەو درۆو بوختانەم بیستووە.باوكی ئەیوب فەرمووی: ئەی دایكی ئەیوب ئەتۆش وات

گوتوه؟! دایکی ئەیوب گوتی: بەڕاستی حاشا کەمن هەرگیز گومانو درۆی ئاوا بکەم. ئینجا باوکی ئەیوب فەرمووی: سوێند بەگەورەیی خودا عائیشە زۆر لە تۆ چاك ترو پاك ترە ئەی دایکی ئەیوب.

## لە من تووڕە بووی ئەی پێغەمبەری خودا

## أو جدت علي يا رسول الله

دەگێڕنەوە جارێك پێغەمبەرﷺدانیشتبوو هێندێك لەیارە بەڕێزەکانی لەلا بوو: کابرایەك هاتو قسەی زۆر ناشیرینی بە ئەبوبکر گوت: بەڵام ئەبوبکر بێدەنگ بوو.کابرا ڕانەوەستاو هەر جنێوو قسەی ناشیرینی دەگوت: ئەبوبکر هەر وەڵامی نەدایەوە. کابراش هەردرێژەی بە جنێوەکانی دەدا. ئەبوبکر ڕقی هەستاو ئەویش جنێوی بەکابرا دایەوە. پێغەمبەرﷺ خێرا هەستاو ڕۆیشت، ئەبوبکر فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ لەمن دڵگرانو تووڕەبووی: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی ئەبوبکر ئەو کاتەی کە ئەو کابرایە جنێوو قسەی پێدەگوتی: فریشتەیەك لەئاسمان هاتەخوار و، ئەو کابرایەی بەدرۆ دەخستەوە و جنێوەکەی بۆ کابرا دەگێڕایەوە: بەڵام کە تۆ جنێوەکەت پێدایەوە فریشتەکە هەستاو ڕۆیشتو شەیتان هاتە جێگەی. منیش هەر شوێنێك شەیتانی لێبێ لێی دانانیشم.

## ئەگەر ئەوئەوەی فەرمووبێ ڕاستی فەرمووە

## لئن كان قال ذالك فقد صدق

کاتێ کەپێغەمبەری خوداﷺ شەوڕەوی پێکرا لەمەککەوە بۆ بيت المقدسو ، لەوێشەوە بۆ فەزای سەروی ئاسمانەکان. هەواڵی ڕۆیشتنەکەی بە(هند)ی دایکی هانی کچی ئەبوتالیب ڕاگەیاند لە جێگەی پشودانی. ئینجا کاتێك پێغەمبەرﷺ ویستی هەستێو، هەواڵەکە بەخەڵك ڕابگەیەنێ، قاچی لەدەلینگی گۆشەی کراسەکەی گیر بووکەزانی محمد دەڕواتەدەر، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ سوێندت دەدەم بەخودا، ئەی کوڕی مامم، نەکەی ئەو قسەو هەواڵی شەوڕەویە لە لای قوڕەیشیەکانی مەککە باس بکەیو بەکەس ڕابگەیەنی ، بەڕاستی من دڵنیام لە

راستی رووداوەكە، بەڵام ئەوان بەدرۆت دەخەنەوەو باوەڕت پێناكەن‌و، بە پێچەوانەی گوفتارەكانی تۆ رەفتار دەكەن: پێغەمبەر ﷺبەدەستی گۆشەی داوێنی كراسەكەی لاداوڕۆیشت، چەندكەسێكی قورەیشیەكان دانیشتبوون لە ناویاندا :موتعەمی كوڕی عودە) و (ئەبوجهلی كوڕی هوشام)یان لەناودا بوو. پێغەمبەر ﷺلەناویاندا دانیشت ، بەڵام زۆر بەدڵتەنگی و غەمباری چونكە دەیزانی ئەگەر باسی ئەو رووداوە گەورەیە بكات، هەرگیز باوەڕی پێناكەن. ئەبوجەهل بەگاڵتە پێ كردنەوە گوتی: ها محمد چی روویداوە ئەمڕۆ؟! پێغەمبەریش ﷺفەرمووی: ئەمشەو شەو رەویم پێكراوە؟ ئەبوجەهل گوتی: بۆ كوێ چووی؟ پێغەمبەر ﷺفەرمووی: چومە (بیت المقدس) ئەبوجەهل گوتی: ئەم شەو چویە (بیت المقدس)و ئێستاش لەناو ئێمەدای؟ پێغەمبەرﷺفەرمووی: بەڵێ؟ ئەبوجەهل گوتی: بەڕاستی شتێكی سەیرە، ئەگەر ئێستا گەل و هۆزەكەمان كۆ بكەینەوە لێرە، ئە وقسانەی كە بۆ ئێمەت كرد بۆ ئەوانیش باس دەكەی؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی بەڵێ: ئەبوجەهل هاواری كردو و بانگی راهێشت، ئەی كۆمەڵانی قورەیش ئەی هۆزی كەعبی كوڕی لوئەی: خەڵكان هەرچی گوێیان لەو بانگەوازە بوو راپەڕین‌و رۆیشتنە شوێنی دانیشتن‌و كۆبوونەوەكانیان.ئەبوجەهل گوتی: محمد پێیان بڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڕاستی من ئەمشەو بردیانم بۆ ( بیت المقدس) كۆمەڵێك پێغەمبەرانعليهم السلامهاتنە پێشوازیم كەحەزرەتی ئیبراهیم‌و عیسی‌و موسی یان تێدابوو.كاتێ قورەیش ئەوەیان بیست، هەراو هاوارێكی زۆر بەرزبۆوە و، ئەو شەو رەوەیان بەلاوە شتێكی زۆر گەورە و سەرسوڕهێنەر بوو. وە لەڕاستیشدا بیر لە دەسەڵاتی خودا نەكەیەوە ئاوابووە.بۆیە هێندێك لەو خەڵكانەی كە گوێیان لە فەرمایشتەكەی پێغەمبەرﷺ بوو، بەسەرسامیەوە بەسەری خۆیاندا دەداو، دەیان كردە چەپڵەو هەرا، (موتعەی كوڕی عودەی) گوتی: فەرمان‌و داواكانی محمد لە پێشی ئەمڕۆ كارێكی ئاسان‌و سوك بوو.بەڵام ئەو داواكاریەی ئەمڕۆی زۆر جیاوازو، دیارو ئاشكرایە، كە درۆزن و فێڵبازە. چونكە ئێمە لێرەوە كە دەڕۆین بۆ بیت المقدس بەسواری حوشتر بەئازارو سەختی‌و ناخۆشیەكی

زۆرەوە، بەیەك مانگ ڕێگا بڕین دەیگەینێ‌و، بە مانگێکیش لەو سەر دەگەڕێینەوە، تۆ چۆن بەشەوێك چویە بیت المقدس و لەوێشەوە گەڕایەوە، بە ڕاستی جێگەی سەرسوڕمانە؟ سوێند بەلات و عوزا. تۆ ڕاست ناکەی و درۆدەکەی. وە لەو کاتەشدا تەکنۆلۆجی وەك‌و ئێستا نەبووە سەیارە و تەیارەو، وەسائیلی گەیەنەر هەبێت و، بتوانی بەخێرایی بڕواو بگەڕێتەوە.چەند کەسێك کە ئەوەیان بیست ، خێرا ڕۆیشتن بۆ لای ئەبوبکر هەواڵەکەیان پێڕاگەیاند، چونکە دەیان زانی ئەبوبەکر زۆر لەگوێ‌و فەرمانی پێغەمبەر ﷺ دابوو، دەیان ویست بەگوێ لێ بوونی ئەبوبەکر. لە قسەی پێغەمبەرﷺئەویش لێی دوور بکەوێتەوەو، بەڕاستی نەزانێ (١) بۆیە گوتیان: ئەی ئەبوبکر وەرە بۆلای هاوڕێکەت محمد بزانە چیدەڵێ ؟بانگەشەی شەوڕەوی دەکات کەئەم شەوی ڕابردوو ڕۆیشتۆتە بیت المقدس‌و گەڕاوەتەوە، ئەبووبەکر فەرمووی: ئایا پێغەمبەر ﷺوای فەرمووە؟ گوتیان بەڵێ وای گوتووە: حەزرەتی ئەبوبکر ﷺفەرمووی: سوێند بەخودا ئەگەر پێغەمبەرﷺ وای فەرمووبێت: بەبێ دوودڵی ڕاست‌و دروست‌و تەواوە. ئینجا حەزرەتی ئەبوبکرﷺ هەر لەو ڕۆژەشەوە نازناوی ڕازگۆیی (صديق)ی پێدراو لە بارەیەوە خودای بە بەزەیی‌و بەدەسەڵات ئەو ئایەتەی ناردە خوارەوە: {وَٱلَّذِى جَآءَ بِٱلصِّدْقِ وَصَدَّقَ بِهِۦٓ أُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ }الزمر/٣٣ واتە:ئەوکەسەی ڕاستی هێناوەوباوەڕی تەواویشی پێیەتی بەڕاستی ئەوانەن خۆپارێزو تەقواکارو لە خودا ترس.

## لە پێناوی خودادا تۆ ئازادی

## أنت حر لوجه الله

حەزرەتی عەلی کوڕی ئەبی تالیب ﷺلەبەڕێزترین ئادەمیزادەکان و جوانترین ئاکارو ڕەوشتی بووە. ڕۆژێك بانگی لە پێش خزمەت‌و، بەردەستەکەیان دەکات بەڵام، کەس وەڵامی نەدایەوە، دووبارە و سێبارە بانگی لێکردوو، بێسود بوو، حەزرەتی عەلی ﷺڕۆیشت بۆلای چاوی پێکەوت ڕاکشاوەو بەخەبەرە. پێی گوت :تۆ گوێت لە بانگەوازەکەی من نەبوو. بەردەستەکەیان گوتی بەڵێ: گوێم لێ بوو، پێشەوا عەلی

ﷺفەرمووی: باشە چی هۆیەك بوو وەلامت نەدامەوە؟ پێش خزمەتەکەیان گوتی: بەخوا من لەوە دڵنیابووم کەهیچ ئازارو سزایەکم لەلایەن تۆوە پێناگات بۆیە کردمە تەمبەڵی و بێدەنگ بووم. ئینجا حەزرەتی عەلی ﷺفەرمووی: لەباتی کە تۆڵەت لێوەر بگرمەوە، ئەوە لەپێناوی ڕەزابوونی خودا ئازاد و سەربەستم کردی.

## لە ڕەوشت و ئاکاری پێغەمبەر لە پێشی بانگەوازیدا

## من أخلاق الرسول قبل النبوة

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێ :ئەوئاکارو ڕەوشتانەی کەلەدەوری نەزانیدا ئادەمیزادەکان دەیان کرد و پەیڕەویان لێی دەکرد. هەرگیز ئەو کردارانە هیوایەت و بۆچونی من نەبووەو بەلایاندا نەڕۆیشتووم: بە تەنها دووجار نەبێ کەوا ڕێکەوتووە کە ئارەزوویان بەکەمو توشیان ببم. بەڵام سوپاس بۆ خودا، لەو کردارانە ڕووی وەرگێڕاوم و منی لێیان پاراستووە. لەدوای ئەوەش هیچ مەیل و ئارەزویەکم بۆ هیچ شتی تر نەبووە، هەتا خودای گەورە پەیامی پێغەمبەرایەتی ﷺبۆ ناردم و ڕێزی پێبەخشیم. ئەوەش بەسەرهاتی ئەو دووجارە بوو، کە ئارەزو هیوایەتم بووە ،جارێکیان بەو هاوەڵە ئیشکەرەی کە هەردەم لەگەڵ خۆم بوو، بۆ ئیشوکارو بەجێ هێنانی کاری ڕۆژانەمو، پێکەوە شوان بووین.لەهەورازو پشتەوەی مەککە. پێم گوت برای بەڕێزم ئەگەر چاودێرو ئاگاداری مەڕەکانم بۆ بکەی تۆزێك دەڕۆمە ناو مەککەو هێندێك شادیوخۆشی دەردەبڕمو، وەكوگەنج و لاوەکانی مەککە ڕادەبوێرنو شادی دەکەن، شوانە هاوڕێیەکەم پێیگوتم: بڕۆ و هیچ غەمو نیگەرانی مەڕەکانت نەبێ؟ منیش بەو هیوایەتە خۆشەوە دابەزیمە خوار بۆ ناو شاری مەککە. یەکەمین ماڵ کەپێی گەیشتم، لە دەرەوە گوێم لێبوو، مۆسیقاو، زوڕناو، تەپڵو، دەفو، نایەو، گۆرانی، دەنگی دەدایەوەو ، ئەو ناوەی پڕ لە ئاوازی هەمەجۆر کرد بوو، پرسیارم کرد ئەوەچییەو چی ڕووی داوە؟! گوتیان: فلان کوڕی فلان ژن دەهێنێ، کچی فلانە کەس. منیش لەلایەکەوە دانیشتم بۆ گوێگرتنو تەماشاکردنی ئەو ڕەقسو چەقەنەی گۆرانیو مۆسیقایە، بەڵام خودای بەدەسەلات نەیهێشت حەزرەتی محمدﷺ لەناو تاواندا بتلێتەوەو، وەنەوزەو

خەوێکی واگرتی هەرچی هۆش بێت نەی ماو خەوی لێکەوت.وەختێ بەهۆش هاتەوە قرچەی گەرمای ڕۆژبوو. ڕۆیشتەوە بۆ لای هاوڕێکەی‌و، گوتی: هائەم شەو چیت کرد؟گوتم: بە خوا هیچم نەکردوو ، هەواڵەکەی پێڕاگەیاند.

جاری دووەمیش: هەر بەهەمان شێوە داوام لە هاوڕێکەم کردەوە کە چاودێری مەڕو ئاژەڵەکان بکاتەوەو، منیش بڕۆمەوە بۆ ناو شاری مەککە، بۆیاری‌و گوێگرتن‌و ڕابواردن. هاوڕێکەم دووبارە ڕێگەی پێدام‌و، منیش ڕۆیشتم بۆ ناو شاری مەککە هەر لەگەڵ گەیشستنم بەناو شار، وەك‌و جاری پێشوو، گوێم لەدەنگی گۆرانی‌و مۆسیقابوو، منیش بەرە و لایان ڕۆیشتم سەماو ، ڕەقس‌و، سوڕدان بوو. ویستم لەلایەکەوە دابنیشم بۆ سەیرکردن‌و گوێ گرتن. بەهەمان جاری پێشو گوێیەکانم کاسبوون‌و، چاوەکانیشم تاریك هەڵگەڕاو، هۆشم لەهیچ نەماو خەوم لێکەوت. سوێند بەخودا لەگەڵ گەرمای ڕۆژ خەبەرم بۆوەو، گەڕامەوە بۆ لای هاوڕێکەم‌و، هەواڵی ڕۆیشتنەکەم پێڕاگەیاند. لەدوای ئەم جارە هیچ جارێکی تر بیروکاری وا لاوازو پوچم نەکردەوە. هەتا خودای گەورە پەیام‌و بەرنامەی پێغەمبەرایەتی‌ﷺ پێبەخشیم.

## بە ڕاستی ئەی محمد تۆ لە بەرزترین پلەی ڕەوشت باشی دای

## وانك لعلى خلق عظيم

دەگێڕنەوە جارێك کابرایەك هاتە خزمەت پێغەمبەری ﷺخوداوگوتی: ئەی پێغەمبەری خودا، ﷺ ڕۆژێك تۆ ئازارت بەمن گەیاندووەو لێتداوم: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: برای شیرینم بفەرموو: من چۆنم لێداوی وەرە لێم بدەوەو ، تۆڵەی خۆت بکەوە. کابرا ووتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ، ئەو ڕۆژەی کەتۆ لێتداوم، من شانم ڕووت بوو، پێغەمبەر ﷺکراس‌و بەرگەکەی داناو، شانی ڕووتکردەوەو فەرمووی: وەرە تۆڵەی خۆت بکەوە. کابراش زۆر بە پێخۆش حاڵیەوە ئاوات‌و داخوازیەکانی هاتەدی، بەرە ولای لاشەی پێغەمبەرﷺ نزیك بۆوەو، پەلاماری شانی پیرۆزی پێغەمبەریداو، ماچی کردو گوتی: دایك‌و باوکم بەفیدات بێت، کێ هەیە حەق‌و مافی لەسەر تۆ بێت. من تەنها بۆیە وامکرد هەتابەو بۆنەیەوە بگەمە ئەو شەڕەفە بەرزو گەورەیە کە لاشەم بەلاشەتەوە بکەوێ، کەبەڕاستیش پێی گەیشتم.

# ئێمە بەهۆی ئەوەی قسەی پێدەکەین سزادەدرێین
# وإنا لمؤاخذون بما نتكلم به

٭موعازی کوڕی جەبەل(ﷺ)ەوە دەگێڕنەوە، دەفەرموێ: بە پێغەمبەرم ﷺ گوت: ئامۆژگار یەکم بکەو، هەواڵی کارێکی وام پێبڵێ، کە لەئاگری دۆزەخ بمپارێزێ و، نوورم بخاتەوەو، پێشی بڕۆمە ناو بەهەشت. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڕاستی پرسیارت لەشتێکی زۆر گەورە کرد. وە لە ڕاستیدا ئەو پرسیارە زۆرکەمە[1] بۆ ئەوانەی کە خودا سوکو ئاسانی بکات بۆیان.گوێ بگرە بۆ ئەو کار و فەرمانانە کەپێت دەڵێم، ئەگەر بە ئەنجامیان بگەیەنی، ئەوە بەڕاستی دەگەیە هیواوئامانجی خۆت.ئەویش ئەوەیە؟ بەتەواوی خوداپەرستی بۆخودا بکەی و، بەهیچ جۆرێك شەریك و هاوەڵی بۆبڕیار نەدەی. نوێژەکانت بە تەواوی بەجێ بگەیەنی بەبێکەم و کوڕی. زەکاتی ماڵت دەربکەی وبەجێی بگەیەنی بەتەواوی. ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بەتەواوی بگری. وە ئەگەر ماڵی زیادەت بوو بەو ئەندازەی ، پێی بڕۆیە ماڵی خوداوپێی بگەڕێیەوە، واجباتی حەج بەجێ بگەیەنی. لەدوای ئەوە فەرمووی: ڕێگاو دەرگای خێر و چاکەت پیشان بدەم، چین و چۆنن؟ باش بزانە، کە ڕۆژوو، خۆپارێزییە. بەخشیش و سەدەقە و چاکە، گوناه و تاوان دەشواتەوە. هەروەك و ئاو ئاگردەکوژێنێتەوە. وەنوێژکرد نیش لەنیوەی شەودا. لەوکاتەدا پێغەمبەرﷺ ئەو ئایەتەی خوێندەوە. (تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَـٰهُمْ يُنفِقُونَ. فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِىَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ)الم السجده/١٦ واتە: ئەو موسڵمانە ڕاستەقینانەی کە شەوانە بەخەو و بێ ئاگایی بەڕێ ناکەن و بەڵکو جێگەی نەرموو گەرمی شەویان بەلاوە دەنێن و، زۆربەی کاتەکانیان لەبەر ترس و سامی پەروەردگار و دواڕۆژیان ، بە عیبادەت و خودا پەرستی دەبەنە سەر چونکە لەخودا دەترسێن کەبەئاگری دۆزوەخ بیان سوتێنێ و، وە هیواو ئومێدی بەهەشت و لێ خۆش بوونیان هەیە لەلایەن خوداوە. وە لەو بە شە ڕزق و ڕۆزیەی کەخودا پێی داون ، هەر لە پێناوی خوداداهێندێکی دەبەخشن. بۆیە بەڕاستی کەس نازانێ کەخودای بەدەسەلات چی

بۆ ئەوانە ئامادەکردووە، کە لەڕۆژی دوایی چاوەکان پێی گەشودڵیان پێی ئارامو خۆش دەبێت، ئەوەش پاداشتی ئەوکردەوانەیە کەلەدوونیا کردویانە. خودا پێمان ببەخشێ.
لەدواییدا فەرمووی: پێت بڵێم سەرەتاو جەمسەری فەرمان و کۆڵەگەی بەهێزی سەرەچڵەپۆپەی لوتکە چییە؟ منیش گوتم، بەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ پێم بڵێ: لە وەڵامدا فەرمووی: سەرچاوەی فەرمانی تەواو ئیسلامە.پایەو ڕاگری ئیسلام نوێژە. وە سەرەچڵەپۆپەی ئیسلامیش جیهاد و تێکۆشانە.دوایی فەرمووی: پێشت بڵێم خاوەنی تواناو دەسەڵاتی تەواوی ئەوانە هەموویان چین؟ گوتم بەڵێ ، پێم بڵێ: پێغەمبەریشﷺ زوبانی خۆی گرت وفەرمووی:ئاگات لەوەبێ و بیگرەو بەرەڵای مەکە، دەفەرموێ: گوتم ئەی پێغەمبەری خوداﷺ بۆ لەسەر ئەو گوفتارو قسانەی کەدەیکەین سزادەدرێین؟.پێغەمبەرﷺ فەرمووی:دایکت ڕۆڵە ڕۆت بۆبکا مەعاز، ئەدی نازانی ئەوانەی فڕێدەدرێنە ناو ئاگرەوەو، لەسەردەم و چاو ڕادەکێشرێن ، یان لەسەردەم و لوتی ڕادەکێشرێن هەر لەسەر دروێنەی زوبانی نییە !.

## هیچ لەسەر تۆ نییە ئەی برام

## لابأس عليك ياأخي

لەدوا کۆتایی سەرکەوتنی سوپای موسڵمانان ، بەسەر فارسەکاندا لەجەنگی قادسیە: بەسەرکردایەتی (سعدی کوڕی ئەبی وەقاسﷺ) سەعد نامەیەکی سەرکەوتنی بۆ(عومەری کوڕی خەتابﷺ) نوسی و بەیەکێ بە جەنگاوەرانیدا بەناوی (بەشیر) ڕەوانە کرد: حەزرەتی عومەریشﷺ لەوکاتو سەردەمانەدا ڕۆژانە دەهاتە دەرەوەی مەدینەو، سەر ڕێگاو بانەکان، چاوەڕوانی هەواڵی بەرەکانی جەنگی دەکرد کە پێی بگات: حەزرەتی عومەرﷺ هەر کە چاوی بەو جەنگاوەرە کەوت لە دوورەوە بۆ لای ڕۆیشت، حەزرەتی عومەر ﷺهەر خێرا ڕووی لەو کابرایە کردوو گوتی: برام هەواڵی بەرەکانی جەنگی موسڵمانانت پێیە، خێرا پێم بڵێ بزانم چی بووە؟ بەشیر تەنها بەوەڵامێکی کەمی سەرزارەکی گوتی:خودای گەورە بێباوەڕو هاوبەش پەیداکەرانی شکست و تێشکاو کردووە:حەزرەتی عومەر

ﷺهەرپرسیاری لە (بەشیر) دەكردوو (بەشیر)یش لەبەر ئەوەی كەحەزرەتی عومەری ﷺبەباشی نەدەناسی و، هیچ بەرگێكی پێشەوایی لەبەردانەبوو، وەك و ئینسانێكی سادە دەهاتە بەرچاو، بۆیە زۆر گوێی بۆ ووتەكانی نەدەگرت و، تەنانەت لەولاغەكەشی دانەبەزی و، دەیویست خێرا بڕوات و بگاتە بارەگای حەزرەتی عومەر، ﷺ خەبەرەكەی پێبگەیەنێ: لەدوای ئەوەی كە گەیشتە ناو شارو، حەزرەتی عومەریش ﷺ هەر بەدوایەوە دەڕۆیشت. سەیری دەكرد، خەڵكانی ناو شار زۆر ڕێز لەو پیاوەی لە دوایەوەیەتی دەگرن و، سەلامی لێدەكەن و، پێی دەڵێن پێشەوای موسڵمانان ، بۆیە ئەو جەنگاوەرەش بۆی دەركەوت كە ئەو پیاوەی لەدوای دەڕوات و، هەر پرسیاری لێدەكات، ئەوە حەزرەتی عومەرو پێشەوای موسڵمانانە. بۆیە خێرا لە ولاغەكەی دابەزی و، بەشەرمەزاریەكە وە بەحەزرەتی عومەری ﷺفەرموو: ئەی بەبەر ڕەحمەت و میهرەبانی خودا بكەوی، من كە تۆم نەناسیووە بۆچی بۆخۆت پێت نەگوتم ، كە تۆ سەركردە و پێشەوای موسڵمانانی؟! بەڵام حەزرەتی عومەرﷺ فەرمووی: برای بەڕێزم هیچ مەشڵەژێ و هیچ باكت نەبێت و، تۆ هیچت لەسەر نیە.بۆ خۆم حەزم نەكرد پێت بڵێم، من پێشەوای موسڵمانانم.

## بەهەواڵی ئاسمانەكانیش باوەڕت پێدەكەم
## أصدقك بخبر السماء

لە(خوزەیمەوە)ﷺدەگێڕنەوە كەیەكێك بووە لە هاوڕێ بەڕێزەكانی پێغەمبەرﷺ: جارێكیان پێغەمبەرﷺولاغێكی لەعەرەبێك كڕی بەناوی (سەوائی كوڕی قەیس)ی مەحاربی، لەو كاتەدا پێغەمبەرﷺپارەی پێنەبوو: بە خێرا ڕۆیشت پارەكەی بۆبهێنێ، عەرەبە دەشتە كیەكە وردە وردە لە پێشیەوە زۆر بەهێواشی دەڕۆیشت: چەند كەسێكی توش هات چەندوچون و سەودای فرۆشتنی ولاغەكەیان لەگەڵدا دەكرد:ئەوانە نەیان دەزانی كە ولاغەكەی فرۆشتووە ، بۆیە نرخی كرینەكەیان لەسەر یەك بۆزیاد دەكرد. لەكاتی زیادكردنی نرخەكەیان، كابرا لە فرۆشتنی بە پێغەمبەر پەشیمان بۆوە، هاواری كردوو، گوتی: ئەگەر ولاغەكەم لێدەكڕی وەرە

بیكڕە دەنا دەیفرۆشم؟ پێغەمبەرﷺ كەگوێی لەبانگی كابرا بوو هەڵوێستەیەكی كردووفەرمووی: برام ئەدی من ولاغەكەم لێنەكڕیوی؟ دەشتەكیەكەش سوێندی خوارد كەلێت نەكڕیوم و نەمفرۆشتووە: پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: بەڵێ من ئەو ولاغەم لەتۆ كڕیووە، هەتا كۆمەڵە خەڵكێكی زۆر كۆبوونەوە لەلایان. عەرەبەكە هاتە ئەوڕادەیەی بەپێغەمبەرﷺی گوت: ئەگەر دەڵێی لێت كڕیوم ، ئەمن گومانم هەیە بڕۆ شاهیدم بۆ بهێنە كە كڕیوتە، ئەو جەماوەرەی كە لەلایان وەستابوون دەڕۆیشتنە لای كابرای عەرەبو دەیانگوت: كوڕە تۆ دەزانی لەگەڵ كێدا قسە دەكەی. ئەوەپێغەمبەری ﷺخودایەو، هەرچی ڕاستی نەبێت نایڵێ.كاتێ خوزەیمەی كوڕی سابت‌ﷺ گەیشتە ئەو شوێنەو كێبەركێی كابرای خاوەن ولاغەكەی گوێ لێبوو پەشیمان بۆتەوەو، هەر هاواردەكات دەڵێ، بڕۆ شاهیدێكم بۆ بهێنە ، كەمن ئەو ولاغەم پێفرۆشتوی: خوزەیمە هاتە پێشەوەو، گوتی: بەڕاستی من شاهیدی دەدەم كەتۆ ئەو ولاغەت فرۆشتووەو، پێغەمبەرﷺ كڕیویەتی؟ پێغەمبەرﷺ ڕووی لە خوزەیمە كردوو فەرمووی: ئەی خوزەیمە تۆبەچی حەقێك شاهیدی دەدەی، خۆ تۆ ئامادەنە بووی كە كڕیم؟. خوزەیمە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺمن كە بە هەواڵی ئاسمانان باوەڕت پێ بكەم چۆن بەهەواڵو گوفتارت باوەڕ ناكەم. پێغەمبەری خودا ﷺشاهیدی دانی خوزەیمەی بە شاهیدیدانی دووپیاو وەرگرت، ئەوەش هیچ جێگەی سەر سووڕمان نیە، چونكە هەر كاتێ موسڵمانان باوەڕی تەواویان بە بەرنامە بەڕێزەكەی ئیسلام هەبوو، وە دڵنیابوون لە ڕاگەیاندنی بەرنامە و ئاینەكەی: ئەوە زۆر پێویست ترە كە دڵنیابن لە گوفتار و كردارەكەی دونیای چونكە پێغەمبەر ﷺ هەرگیز لەخۆیەوە قسەی نەكردووە، هەروەكو خودا خۆی دەفەرموێ:{يَنطِقُ وَمَا عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ.} النجم/٣ واتە: پێغەمبەر هەرگیز لە خۆیەوە قسەی نەكردوە تەنها هەرچی فەرموویەتی: بە فەرمانی خودا بووە.

## من دەترسێم خەراپە و شەڕبچێتە دڵتانەوە

## إنی خشیت أن یقذف فی قلوب كما شرا

جارێكیان پێغەمبەری خودا ﷺلە خەڵوەدا بوو:(سەفیەی كچی حەی) خێزانو هاوسەری دەڕواتە لای و سەردانی لێدەكات. لە دوای چەند ووتوێژێك، دەیەوێت بەرە و ماڵ بگەڕێتەوە. پێغەمبەری خوداﷺلەگەڵیدا ڕۆیشت، كەبەڕێی بكاتو بیگەیەنێتەوە بۆ ماڵەوە ، كە لە خانووی (ئوسامەی كوڕی زەید)دابوو: لە كاتی ڕۆیشتنی چاویان بەدوو پیاوی ئەنساری كەوت بەلایاندا تێپەڕین. ئەو دووپیاوەكە چاویان بە پێغەمبەر ﷺ كەوت، سەریان نەوی كردوو خێرا ڕۆیشتن: بەلام پێغەمبەرﷺ بانگی لێكردنو فەرمووی: براكانم بزانن ئەوە (سەفیەی كچی حەی) هاوسەرمە؟ ئەو دوو پیاوەش زۆر بە خەجاڵەتیەوە گوتیان: پاك و بێلەكەیی بۆ ئەو خودایەیە ئەی پێغەمبەری خوداﷺ ئێمە خەیاڵی خەراپ بەرامبەر بە تۆ نابەین، پێغەمبەر ﷺفەرمووی: پێویستە كەمن پێتان ڕابگەیەنم چونكە شەیتان وەك و خوێن لەدەمارەكانی ئینساندا دەگەڕێت:منیش لەوە ترسام كەبیری خەراپە بكەوێتە دڵتانەوە: بۆیە پێم ڕاگەیاندن كەتوشی دڵەڕاوكەنەبن.

## دڵ تێری موسڵمان

## قناعة المؤمن

دەگێڕنەوە لە یەمەنەوە(١٣)سێنزە پیاو و مێرد منداڵێك بە نوێنەرایەتی هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەرﷺ: ئەویش هەروەكورەوشتو باوی تایبەتی خۆی هەریەكەی دیاریو هەدیەیكی پێبەخشین. بەلام لە دواییدا پێغەمبەرﷺ بۆ دڵنیایی خۆی فەرمووی: ئایا هەمووتان ئەودیاریو بەخشیشەتان وەرگرتووە؟ ئەوانیش گوتیان: منداڵێكمان لەلای ولاغەكانمان بەجێهێشتووە، ئەو وەرینەگرتووە: پێغەمبەرﷺ فەرمووی بڕۆن ئەو منداڵە بهێنن، بائەویش دیاری خۆی وەربگرێت. لەدوای ئامادەبوونی منداڵەكە پێغەمبەرﷺ ویستی دیاری پێشكەش بكات. ئەومنداڵە گوتی: ئەی پێغەمبەری ﷺخودا، ویستو خواستی من وەكو هاوڕێكانم نییە،

هەرچەند کە ئەوانیش هیواو ئومێدی موسڵمان بوونیان هەیە، بەڵام بەخودا ئەو ئاوات و ئارەزووەی کەمنی بۆهاتووم بۆ لای بەرێزت ئەوەیە، کەتۆ بۆم لەخودا بپارێیەوە کەلێم ڕازیبێت و، میهرەبانیم لەگەڵدا بکات و، لێم خۆش بێت و:دڵ تێری و قەناعەتیم بخاتە دڵەوە، پێغەمبەریش ﷺبۆئەو مەبەستە دوعای بۆکردو، دیاری خۆی پێبەخشی و بەرەو یەمەن گەڕانەوە. لەدوای ئەوە لەساڵی(١٠) دەیەمدا چاوی بەکۆمەڵێك لەوپیاوانە لەمیناداکەوت: پێغەمبەرﷺ هەواڵی ئەومنداڵەی لێپرسین، ئەوانیش گوتیان: بەخودا ئەی پێغەمبەری ﷺخودا هەرگیز ئێمە هەتا ئێستا ئینسانی ئەوها خوداپەرست و بەقەناعەت و دڵ تێرمان نەدیتووە ئەگەر ئینسانەکان هەموو دوونیا لە بەینی خۆیاندا دابەش بکەن، هەرگیز چاوی تێوە نییە و ئاوڕی لێناداتەوە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڕاستی ئەوە بۆمن هەواڵێکی دڵ خۆشکەرو سەرسوڕهێنەر بوو. دوای فەرمووی: سوپاس بۆ خودا هیوادارم کە ئەو منداڵە بە هەموو هیوایەتێکی تەواوی مردنەوە بمرێت. یەکێك لەناویاندا گوتی: بۆچی ئەی پێغەمبەری ﷺخودا، ئینسان کەدەمرێت بەتەواوی نامرێت؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڕاستی هیواو ئاواتەکانی دونیا ئەوەندە زۆرە، ئینسان سەرقاڵی سەدان ئاواتیەتی و، لەناو خەیاڵات و بیر و جەنجاڵی دونیادا سەرگەردان و ڕۆچووە، دەشێ لەوکاتی سەرقاڵیە ی ژیانی دەرچێ و بمرێت. ئەو کاتە خودا بێباکە لەهەر لایەکەوە بە هیلاك و لەناوی بەرێت.

## پێویستە لەگەیاندنی پەیام ڕاست گۆبین

## وجوب التثبت من الخبر

دەگێڕنەوە جارێك پێغەمبەرﷺ وەلیدی کوڕی عەقەبەی نارد بۆ لای (حارسی کوڕی زراری)خوزاعی بۆ وەرگرتنی زەکات و، سەروەت و سامانی حارس و، هۆزەکەی: وەلید ڕۆیشت و ڕێگای گرتەبەر، بەڵام لەدواییدا لە ڕێگای ڕۆیشتنی ترس و سامی لێنیشت و کەوتە دڵەکوتە و گەڕایەوە. ڕۆیشتە لای پێغەمبەروﷺ، درۆ یەکی شاخداری هەڵبەست، گوتی یارەسول الله چومەلای حارسی کوڕی زرار بەڵام توندو تیژییەکی زۆری بۆهێنام و هیچی پێنەدام. پێغەمبەرﷺ وابیری کردەوە کە

حارس لە ئاینەكەی ھەڵگەڕابێتەوە، بۆیە بەوجۆرە ڕەفتاری لەگەڵ نوێنەرەكەیدا كردبێت، چونكە حارس پەیمانی بە پێغەمبەرﷺ دابوو كەزەكاتی خۆیو ھۆزوەكەی بۆ كۆ بكاتەوەو، لەدواییدا پێغەمبەرﷺ نوێنەرێك بنێریٚو بیان باتەوە. بۆیە حارسیش لەلایەنی خۆی وابیری كردەوە كەئایا پێغەمبەرﷺ باوەڕی بە پەیمانەكەی من نەبووە بۆیە ھیچ كەسی نەناردووە، لەبەر ئەو بیرو خەیاڵە حارس ھەربۆخۆی خێراداھاتی زەكاتی خۆیوھۆزەكەی لەچەندین حوشتر باركردو لەگەڵ چەندكەسێكی ھۆزە كەی خۆی ڕۆیشتن بۆشاری مەدینەی پێغەمبەری ﷺخودا، لەو لاشەوە پێغەمبەرﷺ چەند كەسێكی وەك‌و نوێنەر ئامادەكردو بۆلای حارسی بەڕیٚ كردن، بۆئەوەی بزانیٚ ھۆی نەناردنی داھاتو زەكاتەكەی چییە؟ وە ھۆكاری ڕێگرتنەكەی چیبووە، وارێكەوت ھەردووك نوێنەر لەڕێگادا توشیان بەتوشی یەكتر ھاتو، بەیەك گەیشتن ، ھەر لەو شوێنەدا ھەریەكە ھۆی ھاتنی خۆیان بۆیەكتری باس كرد.نوێنەرانی پێغەمبەرﷺ گوتیان: ئێمە بۆیە ھاتوین بزانین بۆچی وەڵامی وەلیدت بەو شێوە توندوتیژیە داوەتەوە، چونكە ئەگەر ئەوھابێت ، دەبێت لەگەڵتدا بجەنگین‌وشەڕبكەین. بەڵام حارس بەبیستنی ئەوقسەیە سەری سوڕماو، سوێندی خوارد كە ھیچ كەسێكی نەدیتووە ، بێت بۆ لایو ھەواڵیشی پێنەدراوە، حارس بەخۆی و ھەموو ئەوانەی كەلەگەڵیدا بوون، درێژەیان بە سەفەرەكەیان داوڕۆیشتن ھەتا گەیشتنە شاری مەدینە و ڕۆیشتنە خزمەتی پێغەمبەرو ﷺھەواڵو خەبەری تەواوی بە پێغەمبەری خودا گەیاند و، خودای گەورەش ئەو ئایەتەی ناردەخوارەوە كەدەفەرمویٚ : يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ أَن تُصِيبُواْ قَوۡمَۢا بِجَهَٰلَةٖ فَتُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَا فَعَلۡتُمۡ نَٰدِمِينَ. الحجرات/٦ واتە: ئەی ئەوانەی كەباوەڕتان ھێناوە. ئەگەركەسێك ھەواڵێكی بۆ ھێنان خێرا باوەڕی پێمەكەن بەڵك‌و سەرنج بدەن‌و لێی بكۆڵنەوە تابۆتان ڕوون دەبێتەوەبزانن ڕاستە یان نا، نەبادا ئەوھەواڵە بەبیٚ لێكۆڵینەوە ناخۆشیو گرفت دروست بكاتو پەشیمان ببنەوەو ھیچ چارەش نەمێنیو كار لەكار ترازابیٚ.

حارس زۆر بە باوەڕو ئیمانێکی دامەزراو بە دڵنیاییەوە جێگەی متمانەی پێغەمبەری خودا بوو چونکە بەتەواوی لەپەیمان و بەڵێنەکەیدا ڕاستگۆ بوو.بەڵام وەلید جێگەی متمانەی پێغەمبەری خوداﷺ نەبوو، وە سپاردەو ئەمانەتیەکەی پێغەمبەری خودایﷺ بەحارس نەگەیاندو نامەکەی نەگەیاندە دەستی.

## یارمەتی لاوازو بێنەوایان

## نصرة الضعيف

پێغەمبەری خوداﷺ ڕۆیشتە بازاڕ چاوی بە(ئەبوجەهل) کەوت لەناو کۆمەڵێك خەڵك دا هەراوکێشەی لەگەڵ پیاوێك هەبوو، دەیویست حوشترێکی بەکەمترین نرخ لێبکڕێت و، کەسیش نەیدەتوانی بچێتە نێوانیان ونرخ لەسەر(ئەبوجەهل) زیادبکات لەبەر هێزو دەسەڵاتی. ئەویش دەیویست بەو هێزو دەسەڵاتە زۆرداریەی خۆی بەسەر کابرایدا بسەپێنێت. لەوکاتەدا پێغەمبەر ڕۆیشتە پێشەوەو، نرخی حوشترەکەی لەسەر (ئەبوجەهل) زیاد کرد، (ئەبوجەهل)یش زیادی دەکردبەوجۆرە نرخی زیادکردن کەوتە مەزادەوە هەتا ئەبوجەهل توانای زیاد بوونی نەماو ، نەی توانی هیچکە زیاد بکات، بەناچاری بەسەر شۆڕییەوە کشایەوە دواوە. وەنرخ و کڕینی حوشترەکەش زۆر لەنرخی بەرامبەری خۆی زیاتری کرد. لەدوای ئەوە پێغەمبەرﷺ حوشترەکەی بەپارەیەکی باش فرۆشت و، نرخی تەواوی حوشترەکەشی بەخاوەنەکەی داو ئەو پارە زیادەی لەنرخی حوشترەکە مابۆوە بەسەر هەتیوو بێوەژن و نەدارانی مەککەی دابەش کرد.

## ئەوە پاش ماوەی میراتی محمدە

## فذاك ميرات محمد صلوات الله عليه

جارێکیان ئەبو هورەیرە بەبازاڕی مەدینەدا دەڕۆیشت تەماشای کرد هەرکەسەو بەئیشێکەوە سەر قاڵەو کەس ئاگای لەکەس نییە، لەشوێنێك ڕاوەستاو هاواری کردو گوتی: ئەی خەڵکینە بۆ واکەم تواناو بێدەسەڵات بوون: گوتیان، چی بووە ئەبو هورەیرە چی ڕوی داوە؟ ئەویش فەرمووی: ئەوە لەمزگەوتی پێغەمبەرﷺ

بۆماوە (میرات) دابەش دەکرێ بۆناڕۆن بەشی خۆتان وەر بگرن؟ ئەوخەڵكو
جەماوەرە هەر خێراو بە هەڵەداوان ڕۆیشتن بۆ مزگەوت، ئەبو هورەیرە لەشوێنی
خۆی ڕاوەستاو بۆ هیچ لایەك نەڕۆیشت. زۆری نەبرد جەماوەرەکە لەمزگەوت
گەڕانەوە، ئەبو هورەیرە گوتی:ئەوە چی بوو، وازوو گەڕانەوە؟ گوتیان: چووینە
مزگەوت بەڵام، هیچمان نەدیت دابەش بکرێت، ئەبو هورەیرە گوتی:لەمزگەوت
چاوتان بەچی کەوت، گوتیان:هێندێك کەسمان دیت، نوێژیان دەکردو و ،
هێندێکی ترقورئانیان دەخوێندو، هێندێکی تردەرس‌و، زکریان دەخوێندو، باسی
شتی ڕەواو نارەوایان دەکرد، ئەبو هورەیرە فەرمووی: هاوارە بۆئێوە، بۆ تێناگەن
ئاخر ئەوەمیراتی پێغەمبەرە ﷺ.

## هەر کەسێ لەبەر خودا داماوی بکات، خودا بەرزی دەکاتەوە
## من تواضع لله رفعه

دەگێڕنەوە لەدوای گەمارۆیەکی چڕوتووندی(بیت المقدس)ماوەیەکی زۆردرێژەی
خایاند.سەرۆکی گاورەکان (بتریرك صفرونیوس) لە دوای سەیر و تێڕامانێکی
زۆرو چەندین فێڵو پیلانی بێسود، گەمارۆکەش گەیشتبووە دەورەی
باڵەخانەوقەلا، بۆیە بەناچاری (صفرونیوس)داوای لەموسڵمانان کرد کەئێمە
خۆمان بەدەستەوە دەدەین بەڵام، بەومەرجەی کە سەرکردەو پێشەوایەکەتان بێتە
پێشەوە و لەسەر دەستی ئەوخۆ بەدەستەوە دەدەین. لەو کاتەدا سەرکردەی سوپا
ڕۆیشتە پێشەوە، بەڵام (بەتریارك ) گوتی:مەرجی ئێمە سەرکردە و خەلیفەی
موسڵمانانە، بۆخۆی سەرپەرشتی قودس‌و خۆ بەدەستەوە دانەکە بکات ، لەو
کاتەدا سەرۆکی سوپا نامەیەکی بۆخەلیفەی موسڵمانان (عومەری کوڕی
خەتاب)نوسی لە نامەکەدا نوسرابوو، کە دانیشتوانی (بیت المقدس) داوای
ئاشتی دەکەن‌و، دەیانەوێ خۆبەدەستەوە بدەن بەومەرجەی کەدەبێ خەلیفە
بۆخۆی ئامادەبێت. حەزرەتی عومەر هەر لەگەڵ گەیشتنی نامە خۆی
ئامادەکردوو. بەتەنها لەگەڵ یەك پێش خزمەتیدا بەهەر دووکیان یەك ولاغیان پێ
بوو، پێشیکەوتنە ڕێیان خەلیفە فەرمووی: برام ئێمە هەردووکمان یەك ولاغمان

پێیە ، ئەگەر من سواربم‌و تۆبەپێیان بیت، دیارەمن ستەمم لەتۆكردووە ، وەئەگەر تۆش سواربیت‌و من بەپێیان بم، ئەوەش ستەمە لەمن، وەئەگەر هەردووكیشمان سواربین ، ئەوە ستەمە لە ولاغەكەمان‌و ، پشتیمان شكاندووە. بۆیە دەبێت سوار بوونەكەمان بكەینە سێ بەش ، بۆماوەیەك من سوار دەبم‌و، ماوەیەكیش تۆو، ماوەیەكیش پشودانی ولاغەكەبێت ، ئینجا لەسەر ئەو بڕیارە كەوتنە ڕێگا بەرەو شاری قودس.كەنۆبە سواری حەزرەتی عومەرﷺ دەبوو پێش خزمەتەكەی ڕێشمەی ڕادەكێشا.وەئەگەرنۆبەی پێش خزمەتەكەی دەبوو بۆسواربوون، حەزرەتی عومەرﷺ ڕێشمەی ڕادەكێشا، ئەو كاتەش كە نۆبەی تەنها ولاغەكە بوو بەبێ سواری ڕێشمەیان ڕادەكێشا، بەوشێوەیە ڕێگایان بڕی ، هەتا گەیشتنە شوێنێكی بەرز كە قودسی تەواو لێدەركەوت. هەر لەو كاتەشدا نۆبە سواری حەزرەتی عومەرﷺ كۆتایی هات‌و، هەر لەسواری ولاغەكەی (اللەاكبر)ی كردوو. لە دوایی دا دابەزی‌وبەغلام‌و پێش خزمەتیەكەی فەرموو :وەرە سەركەوە؟ بەلام غلامەكەی گوتی: ئەی پێشەوادامەبەزە من سوارنابم: وا ئێمە بەرە و شاردەڕۆین، لەناو شاریش ئادەمیزادی پۆشەن بیرو، زاناو، شارستانی‌و پێشكەوتووی زۆرلێیە، وە هەروەها ولاغی خرین‌و، جوان‌وڕازاوەی زین كراو، عارەبانەی گالیسكەو، زەڕكەش‌و، لە ئالتون گیراوی لێیە. ئینجاكەمن سواربم‌و، پێشەوای موسلمانان خەلیفە ڕێشمەی ولاغەكەی ڕابكێشی‌و، بگەینە ناوشارو، جەماوەرو، سەركردەكان بمان بینن، گالتە و شۆخیمان پێدەكەن‌و، دەبێتە كاریگەرێكی زۆر لەڕێگری سەركەوتنمان. حەزرەتی عومەرﷺ بە غولامەكەی فەرمووی : وەرە سواربە نۆبە نۆبەی خۆتە؟ ئەگەر نۆبەی من بایە سوار نەدەبووی، ئێستا كە نۆبەی خۆتە ، سوێند بەخودا سواردەبی! بەوجۆرە غولامەكە سواربوو.حەزرەتی عومەریشﷺ ڕێشمەی ولاغەكەی ڕادەكێشا، كاتێ گەیشتنە شورای شارو، دەرگای ئەو شورایە بەناوی دەرگای دیمەشق بوو، لەو شوێنەدا كۆمەلێكی زۆری سەركردەو، سەربازو، جەماوەرێكی زۆری لێبوو. لە پێشەوەی هەموانیشدا سەرۆكی قدس (بتریرك) (صفرونیوس) لەگەلدابوو، لەو كاتەداكە چاویان بە

حەزرەتی عومەرﷺكەوت ڕێشمەی ولاغی غولامەكەی ڕادەكێشیٚو غولامەكەشی سوار بووە. هەموویان دەستیان كردبە(اللهاكبر)و كڕنۆشیان برد. لەوكاتەدا غولامەكە لەسەر ولاغەكەیەوە بەرز بۆوەو هاواری كرد ئەی هاوار سەر بەرز كەنەوەو كڕنۆش مەبەن؟ چونكە كڕنۆش تەنها بۆخودا دەبردریٚو، دروست نییە هیچ كەسێكی تر كڕنۆشی بۆببردریٚ. ئینجا سەریان بەرزكردەوەو، بتریرك سفر و نیوس ڕۆیشتە گۆشەیەكو دەستی كردبەگریان.حەزرەتی عومەرﷺكەچاوی پێی كەوت بەزەیی پێدا هاتەوەو، بەڕوویەكی پاكەوە بەرەولایەوە ڕۆیشتو دڵی دایەوە، صفرونیوس گۆتی:من بۆیە گریام كەبەڕاستی بڕوام وایە كە هەتا هەتایە خاكو ولاتتان هەردەمێنیٚو، هەرگیز تەنك نابێتو كۆتایی نایاو ناپچڕێت.

## چاو پۆشی ئیسلام

## سماحة ألإسلام

ئەو كاتەی كە حەزرەتی عومەر ﷺڕۆیشتە شاری قودس، نامەیەكی دڵنیاییو ئەمینی بۆ دانیشتوانی شاری قودس نوسی.موسڵمانانی قودس مزگەوتێكیان لەو شوێنەی كە حەزرەتی عومەر ﷺنوێژی لێكرد دروست كرد.كە بەڕاستی ئەو ڕۆژە تۆمار كراو بووە ڕۆژێكی مێژوویی نەمری هەتا هەتایە بۆ خەلیفە عومەرو، بۆ ئیسلام. ئەوڕووداوە بەو جۆرە بوو بتریرك سفرونیوس: بانگهێشتی لەحەزرەتی عومەرﷺ كرد بۆ ئەوەی كە گەشتێك بەناوكەنیسەی قیامەتدا بكات. حەزرەتی عوەمەریشﷺ داوایەكەی قبوڵ كردو بەدەنگیەوە ڕۆیشت، لەكاتی گەشتو گەڕانەكەی بەناو كەنیسەدا نوێژ بوو، ڕووی لە بتریرك كرد كەلە كویٚ نوێژ بكات ئەویش گوتی: هەرلە جێگەی خۆت نوێژ بكە. بەلام حەزرەتی عومەر ﷺفەرمووی: بۆ عومەر نابێت نوێژ لێرەدا بكات، چونكە ڕۆژێك دێت لەدوای خۆم موسڵمانان دەڵێن: عومەر لێرە نوێژی كردووە بابیكەینە مزگەوت، بۆیە حەزرەتی عومەرﷺ بەئەندازەی بەردهاوێژێك دوور كەوتەوە و عەبایەكەی بەری ڕاخستو نوێژی كرد.لەدوای حەزرەتی عومەرﷺفەرموودەكەی بەڕاست گەڕاو، هەر لەو شوێنەشدا مزگەوتێكیان دروست كردكە بەردهاوێژێك لە كەنیسەكە دوورەو، هەتائێستاش ئەومزگەوتە بەناوی عومەرەوەو هەر ماوە.

# سەرراستی پێغەمبەرو، پەیمان جوانی

# وفاء الرسول وحسن عهده

ڕۆیشتە لای پێغەمبەر ﷺفەرمووی:خوشکم تۆ کێی؟ئافرەتەکەش گوتی: من (حەسانەی مەزینەم) پێغەمبەر ﷺفەرمووی: ئەتۆ حسانەی؟ ئێوە چۆنن؟ حاڵ و گوزەرانتان چۆنە؟ لەدوای ئێمە چیتان لێهات چۆن بوون ؟ ئافرەتەکە گوتی: بەدایك وباوکمەوە بە فیدات بین زۆر باشین.لەدوای ماوەیەك کە ئافرەتەکە ڕۆیشت، حەزرەتی عائیشە فەرمووی: ئەی پێغەمبەری ﷺخودا ئەو ئافرەتە بەوجۆرە پێش وازیوڕێزی لێدەگری کێیە؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئەی عائیشە ئەو ئافرەتە لەکاتی ژیانی خەدیجەدا جار بەجار دەهاتە لامان. ئەی عائیشە بەڕاستی پەیمان جوانی لەباوەڕەوەیە.

# بەرەو کوێ ئەی کچی باوکی ئومەیە؟

# إلى أين يابنت أبى أوميه؟

کاتێ(ئوم سەلەمە) کۆچی کرد لە (مەککە)وە بۆ (مەدینە)سواری حوشترەکەی بوو منداڵەکەشی لەبەردەمی خۆی داناودەستی کرد بەڕۆیشتن بەرە و مەدینە بە تەنیاو بە بێ کەس لەو ڕێگا دوور و و درێژو شاخ و دۆڵە پڕ مەترسیەدا: لە میانەی ڕێگایەکەیدا گەیشتە (عوسمانی کوڕی تەلحەی کوڕی ئەبوتەلحە)ی پێیگوت ئەی کچی ئەبوو ئومەیە بەرەو کوێ دەڕۆی؟ (دایکی سەلەمە) گوتی: دەڕۆم بۆ (مەدینە) بۆ لای هاوسەرەکەم (عوسمان) گوتی: خوشکم هیچ کەست لەگەڵدایە؟ ئەویش گوتی: نەبە خوداتەنها خوداو ئەو کوڕەم نەبێ کەسم لەگەڵدانیە ( عوسمان) گوتی: سوێند بەخودا بەتەنها بەجێت ناهێڵم. هەوساری حوشترەکەی گرتوپێشی کەوتو، لەگەڵیدا کەوتە ڕێگا. ئوم (سەلەمە) دەفەرموێ: سوێند بەخودا لەناو عەرەبدا هاوڕێیەتی هیچ کەسێکم نەکردووە وەك ئەو پیاوە، پاكو مەردو بەڕێز بێت: ئەگەر دەگەیشتینە شوێنی حەسانەوەمان حوشترەکەی بۆ نیخ دەدامو، بۆ خۆشی زۆرلەئێمە دوور دەکەوتەوە هەتا لەسواری حوشترەکەم دەهاتمەخوار.

ئینجا دەهات هەوساری حوشترەکەی دەگرت دەیبرد و لەدارێك یان لە شتێك دەیبەستەوەو، بۆ خۆشی زۆر لەئێمە دووردەکەوتەوەو، دەڕۆیشتە بن دارو سێبەرێك پشووی دەدا. وەئەگەر کاتی ڕۆیشتنمان بهاتبایەوە حوشترەکەی دەهێناو لێمان دوور دەکەوتەوە هەتا سوار دەبوین ئینجا دەگەڕایەوەو، ڕێشمەو هەوساری حوشترەکەی ڕادەکێشاوەو دەڕۆیشت، بەوجۆرە هەتاگەیشتینە مەدینە بۆ لای هاوسەرەکەم. ئوم سەلەمە دەیگوت سوێند بە خودا نەم زانیوە هیچ کەسێك لەخانەوادەی (بەیت)لە ناو ئیسلامدا توشی ناخۆشی و چەرمەسەری بێت وەك و چۆن خانەوادەی دایکی سەلەمەی توشهات بێت. وە هیچ هاوڕێیەکیشم هەرگیز نەدیتوە وەك و (عوسمانی کوڕی (تەلحە)باش و بەڕێزو، بەخشندە و چاکبێت، لە کاتێکیشدا ئەو کاتەی کە عوسمانی کوڕی ئەبو تەلحە ئەو هەموو خەبات و کۆششەی کردوە: هێشتا باوەڕی نەهێنا بوو موسڵمان نەببوو. چونکە تەلحە لەکاتی پشوی ئاشت بوونەوەی حودەیبە موسڵمان بوو .

## ماڵی خۆت بۆخۆت بگرە

## أمسك عليك مالك

ئەبو هوڕەیرە‌ﷺ: لە پێغەمبەرەوەﷺ: دەگێڕێتەوە (سێ) نەفەر لە ناو هۆزی بەنی ئیسرائیلیان ، خوداویستی تاقیان بکاتەوە: بەڵەکێك‌و، کەچەڵێك‌و، کوێرێك، فریشتەیەکی بۆلایان نارد. یەکەم جار ڕۆیشتە لای (بەڵەکەکە)و پێیفەرموو: تۆ لە دونیادا ئارەزوی چی دەکەی‌و چیت پێخۆشە؟ لەوەڵام دابەڵەکەکە گوتی: ئارەزوی ڕەنگ‌و پێستێکی جوان و باش دەکەم‌و ئەو ڕەنگەبەڵەکیەی کە هەمەو خەڵکان قێز و بێزم لێدەکەن ، پێوەم نەمێنێ‌وپاك ببمەوە: فریشتەکە دەستی بەلاشەی داهێناو بە فەرمانی خودا هەرچی ناشیرینی پێست‌و لاشەی بوو هیچی پێوەنەماو ساف‌و جوان‌و پاك بۆوە. ئینجا لەدوای ئەوە فریشتەکە فەرمووی: ئەدی لەماڵ‌وسامانی دوونیاچیت پێخۆشە؟ کابرا گوتی: بەڕاستی زۆرم حەزو ئارەزولە حوشتریە. بەفەرمانی خوداکۆمەڵە حوشترێکی جوان و ڕەسەن و ئاوسی پێبەخشی‌ودوعای بەرەکەتی لەخودا بۆ کرد و لەلای ڕۆیشت.

ئینجا فریشتەكە ڕۆیشتە لای (كەچەڵ)و پێیفەرموو: لە دونیادا حەزو ئارەزوی چیت هەیە بەفەرمانی خودا پێت دەبەخشم ؟ ئەویش گوتی: حەزم لە موویەكی ڕەش‌و جوانە بۆ سەرم ، وە ئەو چڵك‌و پیس‌و بۆگەنیەی كە پێمەوەیەو، خەڵكان بێزو قێزم لێدەكەن نەمێنێ. فریشتەكە بەفەرمانی خودادەستی بەسەری داهێناوهەرچی چڵك‌وپیسی‌و ناشیرینی نەماو، سەری جوان‌وموویەكی ڕەش‌و جوانی لێڕوایەوە. ئینجا فریشتەكە فەرمووی: ئەدی لەماڵی دونیا ئارەزوت لە چییە؟ ئەویش گوتی: حەزوئارەزوی زۆرم لە مانگا و ڕەشەوڵاغە. فریشتەكە بە فەرمانی خوداكۆمەڵێكی زۆر ی لەمانگای ئاوس‌و ڕەشەوڵاغی پێ بەخشی و فەرمووی: خودابەرەكەتی تێبخات.

لەدوای ئەویش ڕۆیشت بۆ لای (كوێرەكە)و پێیفەرموو: لەدونیادا حەزو ئارەزووی چیدەكەی؟ ئەویش لەوەڵام دا گوتی: ئارەزووی دوو چاوی ڕۆشەن‌و ڕووناك دەكەم. فریشتەكەش بە فەرمانی خودا دەستی بە سەرچاوەكانیدا هێناو، بەفەرمانی خودا چاوەكانی ڕۆشەن‌وجوان بوونەوە.ئینجا فریشتەكە فەرمووی: ئەدی لەماڵی دونیادا حەزو ئارەزووی چیدەكەی ؟ ئەویش گوتی: بەڕاستی زۆر حەزو ئارەزم لەبزن‌و مەڕە: فریشتەكە بە فەرمانی خودا كۆمەڵێكی باشی لە مەڕو بزن پێبەخشی‌و دوعای بۆ كرد كەخودا بەرەكەتی تێبخات.

بەو شێوەیە ڕۆژگار هات‌و ڕۆیشت خودای گەورە پیت‌و بەرەكەتێكی زۆری خستە ناو حوشترو مانگاو مەڕەكان‌و، چەندین مێگەل‌ و وای لێ پەیدابوو. بەپڕی دۆڵ‌و كێوەكان. ئینجا خودای گەورە بۆ ئەزمون‌و تاقیكردنەوەیان ، هەمان فریشتە بە شێوەو ڕەنگ‌و، ڕوخسارێكی جیاواز ناردەوە لایان. یەكەمین جار ڕۆیشتەوە بۆلا (بەڵەكەكە)و پێی گوت: برای بەڕێزم من گەشتیاریم‌و ڕێگەیەكی دوورو درێژم لە پێش دایەو، هیچ تواناو دەسەڵاتی ماڵیم نەماوە بگەمەوە شوێنی خۆم. دیارە تۆش سوپاس بۆ خودا دەوڵەمەندو ساماندارى داوات لێدەكەم كە لەبەر ڕەزابوونی خودا یارمەتی‌ودەست گرۆییم بكەی‌و حوشترێكم پێ ببەخشی، بۆئەوەی گەشتەكەم تەواو بكەم‌و، بگەمەوەجێگەی خۆم. بەڵام(بەڵەكەكە)سەرپێچی

لەهەمووداوایەكانی ئەوفریشتە بەناوگەشتیارە كردو یارمەتی نەدا.ئینجا لەدوای ئەوە ئەو فریشتە كەخۆی لەشێوەی هەژارێكی نەدار پێشان دەدا، لەكابرای سەروەت و ساماندار چووە پێشەوەوپێی گوت: باشە برام خۆمن ئەتۆم دیوە، كە پیاوێكی نەخۆش و بەڵەك و پیس بووی، خودا شیفای نەخۆشی بۆ ناردیو، هەژارو نەداربووی ئەوهەمووسەروەتو ساما نەی پێبەخشی؟ كابرای بەڵەك هەر خێرا بەڕوویدا هەڵچەرخیەوەو گوتی:هەرگیز من نەخۆشو هەژار نەبوومو، ئەو سەروەتو سامانەشم لەباوكمەوە بۆماوەتەوە. فریشتە كە فەرمووی: یاڕەبی خودایە كە درۆبكەی وەك و پێشوت لێبكاتەوە. بەڵەكو هەژار ببیتەوە؟

ئینجا لەدوای ئەوە ڕۆیشتە لای(كەچەڵەكە)وبەشێوەی گوفتوگۆی لەگەڵ بەڵەكەكەدا بەردەوام بوو.(كەچەڵیش) هیچ هاوكاری فریشتەی بەناو هەژارو گەشتیاری نەكرد. لەكۆتاییدا فریشتەكە دوعای لەویش كرد فەرمووی: یاڕەبی ئەگەر درۆ بكەی وەكو پێشوت لێبێتەوە.

ئینجا فریشتەكە لەدوای بەڵەكو، كەچەڵەكە ڕۆیشتە لای (كوێرەكە)و وەكوئەوانی پێشوداوای یارمەتیوكۆمەكی لێكرد.(كوێرەكە)گوتی:برای شیرینم من كوێرونا بینا بووم خودای گەورە چاوەكانی بۆڕووناكوڕۆشەن كردمەوە.هەژارونەداربووم خودا دەوڵەمەندی كردم.ئێستاش خودای گەورە ئەوهەمووبزنو، مەڕەی پێ بەخشیوم. سوێند بەخودائەتۆش بڕۆپێكات لێناگرم، هەرچیت دەویۆچی ئارەزودەكەی هەڵی بگرە بۆخۆت. ئینجا فریشتەكە فەرمووی:بەڕاستی خودای گەورەتاقی كردنەوەی لەگەڵدا كردن ، بزانێت كامەتان خێروچاكەلەسەر ئەوماڵە دەكەنو دەستی هەژارانو ، نەدارانی دەگرنو، كۆمەكی بەهەژاران دەكەن، ئێستاش تۆ بڕۆ ماڵی خۆت بۆخۆتو، خودا لەتۆ ڕازی و قایلەو، لەئەزمونو تاقیكردنەوەكان تۆ نمرەی نایابو باشت هێنا، خودا بەرەكەت و پیرۆزی باشتربخاتە سەروەت و سامانەكەت بەڵام، خودالەدووهاوڕێیەكەت.ڕازیوقایل نەبوو، ساقیتو بێدەست مایە هەژار و نەخۆشكەوتنەوە.

## ئەوە چاکترین و بەڕێز ترینی بەڕێزانە

## هو أكرم الاكرمين

کابرایەکی عەرەبی دەشتەکی ڕۆیشتە لای پێغەمبەری خوداﷺگوتی: ئەی پێغەمبەر ﷺ چی کەسێك لەهەمووکەس لێپرسینەوەی ڕاستی دەکات؟ پێغەمبەرﷺ لەوەلآمدا فەرمووی: (الله) کابرای عەرەب گوتی: خودی خودا بۆ خۆی لێپرسینەوە دەکات پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵێ، عەرەبەکە پێکەنی .پێغەمبەرﷺ بە عەرەبەکەی فەرموو: بۆچی پێکەنی؟ عەرەبەکە گوتی:ڕاستە بەڕێزان‌و چاکان کە توانایان هەبوو لێدەبوورن. پێغەمبەریش ﷺفەرمووی: بەڕاستی ڕاستدەکەی. بەلآم هیچ چاکە کارو بەڕیزێکیش لەخودا چاکتر نیە.خودا باشترین‌و چاکترینی بەڕێز ترینی بەڕێزانە. لەدواییدا پێغەمبەرﷺ بەیارەکانی فەرموو: ئەو عەرەبە شەرعزانێکی زۆرباشە.

## بەخێر بێت ئەوەی کە خودا لەسەر ئەو سەرزەنشت و گلەیی لێکردم

## أ هلا بما عاتبني بة ربي

جارێکیان پێغەمبەری ﷺخودا گوفتوگۆی لەگەڵ (عەتبەی کوڕی ڕەبیعە)و (ئەبو جەهلی کوڕی هوشام)و(عەباسی کوڕی عەبدالمتلب) دەکرد زۆر بەگرنگی و بایە خەوە لەگەڵیاندا دەدوا بۆ ئەوەی باوەڕبهێنن. لەو کاتەدا (عبدالله ی کوڕی مەکتوم)ﷺ بەلایان دا دەڕواو بەهەموو دەنگی بەهیزی هاوار دەکات‌و دەڵێ، ئەی محمد لەو شتەی کە خودا فێری کردووی لەبارەی ئاینەوە شتێکم پێبڵێ‌و، فێرم بکە، پێغەمبەرﷺ لەو کاتەدا گوتەکەی عبداللەی پێناخۆش بوو گوێی پێنەداوپشتی تێکرد و ڕووی لێسوڕاند. کاتێ پێغەمبەر ﷺ گوفتوگۆیەکەی لەگەڵ ئەو نەفەرانە کۆتایی پێهات، بەرەو ماڵەوە گەڕایەوە، حاڵەتی نیگای وحی بۆ هات کە چاوەکانی تاریك و لەرزی لێهات، خودا ئەو ئایەتەی بۆ نارده خوارەوە کە دەفەرموێ: (عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ. أَن جَآءَهُ ٱلۡأَعۡمَىٰ : وَمَا يُدۡرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ. أَوۡ يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ ٱلذِّكۡرَىٰٓ.)عبس/١-٤ واتە: کاتێ عبداللەی کوڕی مەکتووم ﷺ هات بۆ لای پێغەمبەرﷺ ، ڕووی خۆی لێ گرژ کردوو، وەرگێڕا، خودای گەورە گلەیی لە

پێغەمبەرﷺکرد کەبۆچی ڕووی لێوەرگێڕا بەشکم ئەوە هاتبێت تا دڵو دەروونی پاكو خاوێن بکاتەوە، یان نسیحەتو ئامۆژگاری گوێ لێبێت بۆ ئەوەی زیاتر کەڵك و سوود وەربگرێ.

لەدوای هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە، هەر چەند جاری کە پێغەمبەر دەگەیشتە (عبداللەی کوڕی مەکتوم)ﷺیان دەهاتە لایو چاوی پێدەکەوت، پێغەمبەرﷺ کراسەکەی یان عەبایەکەی خۆی بۆ ڕادەخستو دەی فەرموو: یاخودا بەخێر بێی ئەوکەسەی کەخودا لەسەر ئەوی سەر زەنشتو گلەیی لێکردم .

## پارێزگاری لە زوبان ودڵو چاوەکانت بکە

## إحفظ لسانك، وقلبك، وعينيك

کابرایەك هاتە خزمەت پێغەمبەروﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺمن لەو سونەتو واجبانەی کە هەیە لەڕۆژوودا تەنها مانگی ڕەمەزان بە ڕۆژوو دەبم و هیچی ترناگرم. وە لە نوێژەکانیشدا تەنها پێنج نوێژە واجب و فەرزەکان دەکمەم و هیچی ترزیادە ناکەم. وە بەڕاستیش من زۆر هەژار و نەدارمو توانای خێر و بەخشیشو سەدەقەشم نییە ، لەپێناوی خودادا بیبەخشم. ئەگەر مردم بەوحاڵەوە لەکوێدا دەبم؟ پێغەمبەرﷺفەرمووی: لە بەهەشتدا دەبیت. کابرا گوتی لەگەڵ تۆدا دەبم لە بەهەشت، پێغەمبەرﷺپێکەنیو فەرمووی: بەڵێ لەگەڵ منداەبیت، ئەگەر دڵو گیانت لە دووشت بپارێزی لەفێڵ، (خيانة) وە لە ئێرەیی (حسادە) وەزوبانیشت لەدووشت بپارێزی؟ لەباس کردنی خەڵك لە پاشەملە، (غيبة) وەدرۆکردن (كذب) وە چاویشت لە دوو شت بپارێزی، لە تەماشاکردنی ناڕەوا (حرام) وە بەچاوەکانت گاڵتەجاڕیو، سوکایەتی بەموسڵمانان نەکەی، ئەوکاتە هەردووکمان پێکەوە بەجووتە دەڕوینە بە هەشت.

# باش پەیڕەو كردنی ژن بۆ هاوسەرەكەی

# حسن تبعل المرأه لزوجها

دەگێڕنەوە جارێك پێغەمبەرﷺ لەناو یارەكانی دانیشتبوو ئافرەتێك بەناوی (ئەسمائەی كچی یەزید)ی ئەنساری هاتە خزمەتی و پێیگوت: دایكم و باوكم بە فیدات بێت ئەی پێغەمبەریﷺ خودا من بە نوێنەرایەتی ئافرەتانەوە هاتوومە خزمەتت. خودا تۆی بۆ ڕێنمایی تەواوی بەرەی ئادەمیزادی پیاو و ئافرەت ناردووە، وە ئێمەش باوەڕمان بە تۆو پەروەردگارت هێناوە. وەئێمەی كۆمەڵی ئافرەتان گەمارۆ و چواردەورە گیراوین لەچوار گۆشەیماڵەكانماندا بەندكراوین، ئێمە دامەزرێنەری ماڵەكانتانین، بە جێهێنەری دامركانەوەی ئارەزو و خواستەكانتانین، وە هەڵگری كۆرپەو، بەخێوكردنی منداڵەكانتانین. بەڵام ئێوەی كۆمەڵی پیاوان، لەخودا پەرستیشدا زۆر لە ئێمە لەپێشتر و گەورەترو ، لەسەر ئێمە بەرێزترن، بەهۆی نوێژی بە كۆمەڵ و، نوێژی هەینی و، زیاتر سەردانی نەخۆش و، ئامادەبوونتان لەسەرتەرمی مردوو شاردنەوەی و، حەج لەدوای حەجكردنتان و، لەوانەش گەورەتر جیهادو تێكۆشان لەڕێبازی خودا، وە كاتێكیش كەدەڕۆن بۆ حەج، یان عەمرە، یان جیهاد، ئەو كاتە ئێمەش زیاتر بار گرانی و، ئەركمان دەكەوێتە سەرشان، بە پارێزگاری كردنی ماڵ و منداڵ: وە سەرەڕای جل شۆرین و، دوورین و خزمەت كردنی ماڵ و منداڵ و، پاك و خاوێن ڕاگرتنی. ئایا ئێمە بەشداری ئەو پاداشت و خێرو بێرەی پیاوان دەكەین یان نا؟ ئینجا پێغەمبەرﷺ ڕووی تەواوی لەیارەكانی كردوو فەرمووی: ئێوە هەرگیز گوێتان لەووتەی هیچ ئافرەتێك بووە، كەجوانتربێت لەپرسیار و وتەی ئەو ئافرەتە لەبەرامبەر فەرمانی دین و ئایینەكەی: ئەوانیش گوتیان: بەڕاستی ئەی پێغەمبەری خوداﷺ هەرگیز گومانمان نەدەبرد كە ئافرەتێك بەو جۆرە شارەزای ئاینەكەی بێت. لەدواییدا پێغەمبەرﷺ ڕووی بەلای ئافرەتەكەدا سووڕاندوو فەرمووی: خوشكم باش گوێ بگرەو تێبگەو، ئافرەتانی دوای خۆشت تێبگەیەنە و فێریان بكە. كە ڕەفتارو پەیڕەوی جوانی ئافرەتان، بۆ هاوسەرو مێردەكانیان و، بەجێهێنانی ئارەزوو، بەگوێكردنی داواكانیان و، شوێنكەوتن و پەسندكردنی ڕاو پێشنیارەكانیان. تەواوی هاوسەنگی و، بەرامبەری تەواوی هەموو خێرو چاكەكانیانە. ئافرەتەكە ئینجا زۆر بە دڵ خۆشی و شادییەوە گەڕایەوە بەرە و ماڵ.

## بڕۆ تۆ نایناسی

## إذهب فلست تعـرفه

ڕۆژێك كابرایەك هاتە لای سەركردەو پێشەوا حەزرەتی(عومەری كوڕی خەتاب ﷺ) مەدحی پیاوێكی دەكردوو، پێیهەڵدەگوتو، سوپاسی دەكرد. حەزرەتی عومەریش بە كابرایەكەی فەرموو: برام ئەتۆ مەدحی ئەوكابرایە دەكەی ، ئایا تۆ دراوسێی نزیكی ئەو كابرایە بووی كە تەواوی هەڵسوكەوتەكانی ژوورەوەو دەرەوەی بزانی؟

كابرا ووتی: نەخێر.

ئەمجار حەزرەتی عومەر ﷺ فەرمووی: تۆ هاوڕێیەتی ئەو كابرایەت كردووە لە گەشتوگوزاردا، بۆ ئەوەی شارەزای كردار و ڕەفتاری ڕەوشتی ئەو پیاوە بیت؟

كابرا ووتی: نەخێر.

حەزرەتی عومەر ﷺ فەرمووی: ئیشوكاری بازرگانی و دینار و پارەت لەگەڵ ئەو كابرایەدا كردووە بۆ ئەوەی لە خوداترسان و سەرڕاستی ئەو كابرایەت بۆ دەركەوێ؟

كابرا گوتی: نەخێر.

حەزرەتی عومەر ﷺ فەرمووی: واهەست دەكەم لە مزگەوت چاوت پێیكەوتبێ لە نوێژو قورئان خوێنی، كەهێندێك جارسەر بۆ سەرەوەو، هێندێ جاریش بۆ خوارەوە دەلە قێنێو ، كزەڵۆكە خۆیت پێنیشان دەدات؟

كابرا گوتی:بەڵێ ئاوام دیتووە.حەزرەتی عومەر ﷺ فەرمووی: برام تۆ ئەو كابرایە نا ناسی. بڕۆ یەكێكی تری وابهێنە كەبیناسیێ.

## خودا لێت خۆش بێت ئەی ئەبوبكر

## غفرالله لك يا أبابكر

دەگێڕنەوە لەنێوانی سەروەرمان حەزرەتی (ئەبوبەكری صدیق ﷺ)و(ڕەبیعی ئەسلەمی) گوتو وێژو قسەیەكی ڕەق و ناشیرین ڕوویدا، كە(ئەبوبكر) بە(ڕەبیع)ی گوت: ڕەبیع زۆری پێیناخۆش بوو: لە دواییدا (ئەبوبكر) كەزانی ڕەبیع پێی ناخۆش بوو لەقسەكەی پەشیمان بۆوەو، بەڕەبیعی فەرموو: وەرە قسەكەم پێ بڵێوەو، تۆڵەی خۆتم لێبكەوە، ڕەبیع گوتی: هەرگیز من شتی وات پێ ناڵێمەوە.

بەڵام ئەبوبکر بەدڵنیاییەوە فەرمووی: ئەی ڕەبیع یان دەبێ قسەکەم پێ بڵێیەوە، یان لەگەڵمدا دێی بڕۆین بۆ لای پێغەمبەرﷺ، ڕەبیع گوتی: ئەوەشت لەگەڵدا ناکەم، ئەبوبکر بەتەنیا ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەرو ، ڕەبیعیش لەدوای ئەبوبکرەوە ڕۆیشت ، لە دواییدا کۆمەڵێك پیاوی هۆزی (ئەسلەمی) بەدوای ڕەبیع دا دەگەڕان‌و، دۆزیانەوە ڕۆیشتنە لای، لەدوای تێگەیشتنیان لەڕوداوەکە، پێیان گوت:خودامیهرەبانی لەگەڵ ئەبوبکردا بکات ، لەپێناوی چیدادەبێ لەلای پێغەمبەرﷺئامادەبن خۆئەوەی کە قسەی کردووەو، تاوان بارە ئەبوبکرەو، ئەوەی کەویستوویەتی تەواو بەتۆی گوتووە؟ ڕەبیع وەڵامی دانەوە ئەی ماڵوێرانینە ئێوەدەزانن ئەو کەسەکێیە؟ ئەوە ئەبوبەکری صدیقە ، ئەوە دووەم کەسی دوونەفەری ناوئەشکەوتە، کەخودا لەبارەیەوە دەفەرموێ:(ثَانِيَ ٱثۡنَيۡنِ إِذۡ هُمَا فِي ٱلۡغَارِ )التوبة/٤٠ ئەوە خاوەنی بەتەمەنی باوەڕدارانە، توخودا داواتان لێدەکەم، مەڕۆنە پێشەوە بانەتان بینێ، وا هەست بکات کەئێوە بۆ یارمەتی من هاتوون، ئەویش توڕەبێت‌و، بڕواتە لای پێغەمبەرو، ئەویش بە تووڕەبوونی ئەبوبکر تووڕە بێت، ئینجا خودای گەورەش بە هۆی تووڕەبوونی ئەوانەوە توڕەبێت‌و، ڕەبیعیش بەو بۆنەیەوە بە هیلاك و لەناو بچێت، لە دواییدا ئەوانیش گوتیان:ئەی باشە تۆچی فەرمانێکمان پێدەدەی؟ گوتی: ئێوە بگەڕێنەوە بەرە و دواوە، ئەبوبکر لە پێشەوە دەڕۆیشت‌و، ڕەبیعەش بە تەنها بەدوای ئەبوبکردا ڕۆیشت، تا گەیشتە لای پێغەمبەری ﷺخودا: ئەبوبەکر ڕووداوەکەی بەتەواوی وڕاستی بۆ پێغەمبەری گێڕایەوە، پێغەمبەرﷺسەری بەرزکردەوەو فەرمووی: ئەی ڕەبیع ئەوە لەگەڵ ئەبوبەکری ڕاست گۆچیتان بووە؟ ڕەبیعیش گوتی: ئەی پێغەمبەری ﷺخودا هەر ئەوها بوو قسەمان دەکرد، ئەبوبکریش قسەیەکی ڕەق‌و ناشیرینی گوت: پێمناخۆش بوو.دوایی گوتی: ئەی ڕەبیع چیم پێگوتووی پێم بڵێوە لە تۆڵەی خۆت.بەڵام، من گوتم: نەخێر شتی وا ناڵێم، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: باشە قسەکەی پێ مەڵێوە: بەڵام لەجیاتی قسە ناشیرینە کەی پێی بڵێ (خودالێت خۆش بێت ئەی ئەبابەکر) ڕەبیعیش گوتی: خودا لێت خۆش بێت ئەبوبکر، لەوکاتە دائەبوبەکرﷺڕووی سوڕاندو، پشتی تێکردن و دەستی کرد بەگریان‌و، گەڕایەوەو ڕۆیشت .

# تۆڵەی خواردنی ماڵی نارەوا

# جزاء آكل مال الحرام

(ئەبونافع) پێش خزمەتی پێغەمبەری خودا ﷺدەگێڕێتەوە: كاتێ پێغەمبەری ﷺ خودا نوێژی (عەصر)ی دەكرد دەڕۆیشت بۆ ناو هۆزی (ئەشهەل) لە یارمەتی دەرانی ئەوس ئامۆژگاری و قسەی بۆ دەكردن‌و، هەتا نزیكی شێوان دەمایەوە و، بۆ نوێژی مەغریب بەخێرایی دەگەڕایەوە. ڕۆژێكیان لەگەڕانەوەی بەرە و مزگەوت بەلای گۆڕستانی (بەقیع)دا تێپەڕی كەجێگای مردووی موسڵمانانە لەمەدینە. پێغەمبەر فەرمووی: ئاخ وئۆف لەتۆ، ئاخ و ئۆف لەتۆ، بەرەو ڕووی سینگ‌و بەرۆكی (الله اكبری) كرد بەڵام (ئەبوڕافع) بە غەڵەت‌و نادروست لەپێغەمبەر تێگەیشت، بۆیە نەی توانی بەتەواوی گوێ بیستی ووتەكەی پێغەمبەری ﷺخودا بێت: چونكە واتێگەیشت كە پێغەمبەرﷺئەو ئاخ و ئۆفەی لەبەرئەو كردبێت، بۆیە (ئەبوڕافع) دەفەرموێ: خۆم دواخست: پێغەمبەر ﷺفەرمووی: ئەوەچییە بۆ واسست دەڕۆی (ئەبوڕافع)؟ بەردەوام بە لەڕۆیشتن.(ئەبوڕافع) دەڵێ گوتم: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ چی بووە چی ڕویداوە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەوە چییە؟ (ئەبوڕافع) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ ئەو ئاخ و ئۆفەت لەگەڵ من بوو. پێغەمبەر ﷺفەرمووی: نەخێر. بەڵام ئەو گۆڕە گۆڕی فلانە كەسە ناردم بۆ ناو فلانە هۆزی بۆوەر گرتنی واریدات‌وزەكاتی ماڵیان: ئەویش دزی كرد و بەرگ و پۆشاكێكی لەخوری بۆ خۆی هەڵگرتبوو، ئێستاش بەگوێرەی ئەو بەرگە بەرگێكی لە ئاگری لەبەردایە و ئازاری پێدەدرێ.

# دان پێدا نەهێنان بە بەخشین‌و، پێداوەكانی خودا

# الجحود بنعمةالله

دەگێڕنەوە (سەعلەبەی كوڕی حاتەبﷺ)ی ئەنصاری لەسەردەمی پێغەمبەردا ناو بانگی بەكۆتری مزگەوت دەركرد بوو: چونكە بەردەوام لەمزگەوت و خزمەتی پێغەمبەردا بوو: بەڵام هەتا بڵێی زۆر هەژار و نەداربوو، بەو بۆنەیەوە زۆردڵتەنگ و

بێزاربوو، بەو نەبوونی وكەم دەرامەتیەی. بۆیە داوای لەپێغەمبەرﷺ كردكەدوعای بۆبكاتو، خودای گەورە دەرووی خێروپاداشتی لێبكاتەوەو، گوشادیو، خۆشی خۆراك ومالْی پێ ببەخشێت، پێغەمبەرﷺ بەو جۆرە وەلآمی دایەوەو فەرمووی: ئەی سەعلەبە هاوارەبەڕاستی كەم خۆراكیو، سامان و ڕۆزی كەم، كەسوپاس گوزاری خودای لەسەر بكەی زۆرباش ترو بەكەڵك ترە، لەوەی كەزۆرت هەبێتو سوپاسو ستایشی لەسەر نەكەی، بەلآم سەعلەبە لەسەر داواكەی سوربوو، زۆری لە پێغەمبەرﷺكردكە وەلآمی بداتەوەو، داوایەكەی لێوەربگرێ، سەعلەبە.پەیمانیدا گوتی: ئەگەر خودا سەروەتو سامانم بداتێ، بەڕاستی هەمووحەقو مافێكی ئەو مالْە بە جێدەگەیەنمو هەموو خاوەن حەقو مافێك، مافی خۆی بەتەواوی دەدەمێ: پێغەمبەریشﷺداوای بۆكردو، خوداش داوایەكەی بۆ گیرا كردو، مالْوسەروەتو سامانێكی زۆری پێبەخشی، وای لێهات ئەوسەعلەبەی كە بە كۆتری مزگەوت ناوی دەركرد بوو، لەبەر هیلاكو ماندوو بوونی نەی دەتوانی وەكو پێویست بڕواتە مزگەوتو فەرمانەكانی خودا بە جێگە بهێنێ: ڕۆژ لەدوای ڕۆژ كەسامانەكەی زۆر زیادی كرد، بە جۆرێك لەو شوێنەی خۆی جێگەی نەدەبۆوە، بۆیە زیاتر سەرقالْو ماندوبوو نوێژو فەرمان و مزگەوتی هەر لەبیر چۆوە: هەتا خودا قورئانی لەبارەیەوە ناردەخوار كە دەفەرموێ { خُذۡ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡ صَدَقَةٗ تُطَهِّرُهُمۡ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيۡهِمۡۖ إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٞ لَّهُمۡۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ } التوبه/١٠٣ واتەی ئەو ئایەتەمان لە پێشەوە كردووە. واتە: خوای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەركردكە زەكات لەمالْو سامانی موسلْمانان وەربگرێت، چونكە ئەو سامانە دەبێتە خاوێنوپاك بوونەوەی سامانو مالْو دلْو دەرونیانو، بارانی ڕەحمەتو بەرەكەت بەسەریاندا دەڕژێ. وە ئەگەر مردیشن نوێژیان لە سەر بكە چونك ئەو نوێژە دەبێتە مایەی خۆشیو دلْ ئارامی وە بەڕاستی خوداش زاناو بینایە بە هەموو شتێك.

سالْ بەسەر سەروەتو سامانی سەعلەبەدا تێپەڕی و كاتی دەركردنی زەكاتی مالْی هات ، پێغەمبەر ﷺنوێنەرێكی بۆلای نارد كە حەقو مافی مالْی لە سەروەتەكەی دەر بكات، كاتێ نوێنەری پێغەمبەرﷺ بە نوسراوەوە گەیشتەلای

سەعلەبە: دونیای لێبەیەك هاتەوەو، دڵ تەنگوبێئارام بوو، بە نوێنەرەكەی گوت:بەڕاستی من ماڵی خۆم بە بەلاش نادەم بەكەس، ئەوەی كە محمد پێغەمبەرﷺ داوای دەكات ئەوە سەرانەیەو هیچ پەیوەندی بەماڵی منەوە نیە: سەعلەبە ئەوبەڵێنو پەیمانەی كە پێشودا بووی پەشیمان بۆوەو، هیچی لەسامانی ماڵەكەی دەر نەكردوو، بەدەستی بەتاڵ نوێنەری پێغەمبەری ﷺڕەوانەكردەوە، ئینجا لەوكاتەدا خودای گەورە ئایەتی پەیمان شكێنی دەربارەی سەعلەبە نارده خوارەوەو، سەعلەبەی بە دۆڕاو پەیمانشكێن ناوزەد كرد هەتا ئەو كاتەی دەگاتەوە بەردەمی دادگاڕاستو بەرپێزەكەی وەكو دەفەرموێ: {وَمِنْهُم مَّنْ عَـٰهَدَ ٱللَّهَ لَئِنْ ءَاتَىٰنَا مِن فَضْلِهِۦ لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ. فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُم مِّن فَضْلِهِۦ بَخِلُوا۟ بِهِۦ وَتَوَلَّوا۟ وَّهُم مُّعْرِضُونَ. فَأَعْقَبَهُمْ نِفَاقًا فِى قُلُوبِهِمْ إِلَىٰ يَوْمِ يَلْقَوْنَهُۥ بِمَآ أَخْلَفُوا۟ ٱللَّهَ مَا وَعَدُوهُ وَبِمَا كَانُوا۟ يَكْذِبُونَ }. التوبة/٧٥-٧٧. واتە:هێندێك لەئادەمیزادەكان پەیمانو بەڵێن دەدەن كەخودا ماڵو سامانیان پێ بدات ئەوانیش زەكاتوخێری لێدەكەنولەپێناوی ڕەزابونی خودادەی بەخشنو لەڕیزی پیاو باشان و چاكاندا دەبن.بەڵام كاتێ خودای گەورەماڵوسامانی پێدان ئەوانە لە بەڵێنەكەیان پەشیمان دەبنەوە وچاوچنۆكی دەكەنوپاشە كشەی لێدەكەنو پەیمانەكەیان نابەنەسەر خودای گەورەش بەهۆی ئەو ناپەیمانەیان سزایان بەنەخۆشی دووڕوویی لەدڵو دەرونیان دەدات هەتا ئەو ڕۆژەی دەگەڕێنەوە لای خودا بۆ لێپرسینەوە ئایا بۆچی پێچە وانەی بەڵێنەكەیان جوڵاونەوەودرۆیان كرد.

تێبینیەك: من پێم وایە ئەو بەسەرهاتەی سەعلەبە دەست تێوەردانێكی دووژمن كاریانەی تێدابێت چونكە سەعلەبەیەكێك بووە لە یارانی بەدر و پێغەمبەریش لە بارەیانەوە دەفەرموێ:﴿ لعل اللة إطلع إلى أهل بدر فقال:إعملوا ما شئتم فقدغفرت لكم﴾ واتە: لەوانەیە خودای گەورە لەبارەی ئامادەبووانی بەدر فەرمووبێتی: چیدەكەن بابیكەن من لێیان خۆش بووم. بخاری ومسلم ڕیوایەتیان كردووە.

# دادگەری‌و چاكەی ئێوە بەلامانەوەخۆشتربوو لە ستەمی ڕۆم

# وأعدلكم وأحاسنكم أحب إلينا من جور الروم

دەگێڕنەوە ئەوكاتەی كە شاری(حمس)لەسەردەستی شێری بڕندەی خودا (خالیدی كوڕی وەلید)ﷺئازادكرا، لەو ناوچەیەدا تەنها شارێكی بچوكی ئەو دەبەرە ئازاد نەكراو مایەوە، بەڵام زۆر بەداد گەریانەو ، ویژدانەوە هەڵسوكەوت و ڕەفتاریان لەگەڵدا دەكرا، تەنها سەرانەیان لێدەسێندرا، چونكە هەر لەژێر ئاینی یەهودی خۆیان مابونەوە. بەڵام كاتێكی زۆری نەبرد كەیەكێك لە دانیشتوانی ئەو شارۆچكەیە هاتە لای سەركردەی سوپای موسڵمانان، لە ناوچە ئازاد كراوەكانداو: بە سەرلەشكری ڕاگەیاند كەوا سوپای ڕۆم واخەریكی گەلەكۆمین‌و، سوپایەكی گەورەیان كۆكردۆتە وەوبەرە وشاری (حمس) بۆ بەربەرەكانی گەڕانەوەی ئەو شارە هەنگاو دەنێن‌و، بەرەو ڕوتان دەبنەوە. لەو كاتەدا سەركردەی سوپا، بەرپرسو لێپرسراوانی سوپای كۆكردەوەو ڕاوێژكاری تەواوی لەگەڵدا كردن‌و، بەكۆی گشتی بڕیاریاندا كە شاری (حمس) چۆڵبكەن‌و، بگەڕێنەوە دواوەو شەڕو، ترس‌و، ناخۆشی لەو وڵاتەدا ، لەگەڵ بێباوەڕا نیان برەوێننەوە: چونكە سوپای ڕۆم سوپایەكی بێژمارەو، ئەوشەڕەش لەو وڵاتەدا دەبێتەمایەی لەناو چونی زۆری موسڵمان‌و، دانیشتوانی ئەودەبەرە: بۆیە بۆ ئەو مەبەستە سەركردەی موسڵمانان هەموو پیاوە بەناوتواناو لێهاتوە كانی دانیشتوانی شاری(حمس)ی كۆكردەوە و ڕاوێژی تەواوی لەگەڵ ئەوانیشدا بە ئەنجام گەیاندو، پێی فەرموون: ئێمە كە بڕێك پارەی سەرانەمان لە ئێوە وەرگرتوە لە پێناوی پارێزگاری گیان‌ومالی ئێوەو، بۆ پارێزگاری‌و، بەرژەوەندی‌و، سەلامەتی ئێوەدابووە، بەڵام ئێستاش كەمادام دوژمنی ڕۆم هێرش و سوپای هێناوە بۆ گەڕانەوەی ئێوە بۆ ژێر دەسەڵاتی خۆیان، ئێمە نامانەوێ بەرامبەریان بووە ستینەوە لەبەر بەرژەوەندی ئێوە، لەبەر ئەوە دەگەڕێینەوە دواوە. ئەو سەرانەی كەئێمە لە ئێوەمان وەرگرتوە بۆتان دەگێڕینەوە.ئینجا نوێنەران‌و دانیشتوانی (حمس) وەڵامی سەركردەی موسڵمانانیان دایەوە و گوتیان: ئەی سەرۆك ئێمە لەوچەند ڕۆژە كەمەی كەئێوە

سەعلەبە: دونیای لێبەیەك هاتەوەو، دڵ تەنگ‌وبێئارام بوو، بە نوێنەرەكەی گوت:بەڕاستی من ماڵی خۆم بە بەلاش نادەم بەكەس، ئەوەی كە محمد پێغەمبەرﷺ داوای دەكات ئەوە سەرانەیەو هیچ پەیوەندی بەماڵی منەوە نیە: سەعلەبە ئەوبەڵێن‌و پەیمانەی كە پێشودا بووی پەشیمان بۆوەو، هیچی لەسامانی ماڵەكەی دەر نەكردوو، بەدەستی بەتاڵ نوێنەری پێغەمبەری ﷺڕەوانەكردەوە، ئینجا لەوكاتەدا خودای گەورە ئایەتی پەیمان شكێنی دەربارەی سەعلەبە ناردە خوارەوەو، سەعلەبەی بە دۆڕاو پەیمانشكێن ناوزەد كرد هەتا ئەو كاتەی دەگاتەوە بەردەمی دادگاڕاست‌و بەرپێزەكەی وەك‌و دەفەرموێ: ﴿وَمِنْهُم مَّنْ عَـٰهَدَ ٱللَّهَ لَئِنْ ءَاتَىٰنَا مِن فَضْلِهِۦ لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ. فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُم مِّن فَضْلِهِۦ بَخِلُوا۟ بِهِۦ وَتَوَلَّوا۟ وَّهُم مُّعْرِضُونَ. فَأَعْقَبَهُمْ نِفَاقًا فِى قُلُوبِهِمْ إِلَىٰ يَوْمِ يَلْقَوْنَهُۥ بِمَآ أَخْلَفُوا۟ ٱللَّهَ مَا وَعَدُوهُ وَبِمَا كَانُوا۟ يَكْذِبُونَ ﴾. التوبة/٧٥-٧٧. واتە:هێندێك لەئادەمیزادەكان پەیمان‌و بەڵێن دەدەن ك ەخودا ماڵ‌و سامانیان پێ بدات ئەوانیش زەكات‌وخێری لێدەكەن‌ولەپێناوی ڕەزابونی خودادەی بەخشن‌و لەڕیزی پیاو باشان و چاكاندا دەبن.بەڵام كاتێ خودای گەورەماڵ‌وسامانی پێدان ئەوانە لە بەڵێنەكەیان پەشیمان دەبنەوە وچاوچنۆكی دەكەن‌وپاشە كشەی لێدەكەن‌و پەیمانەكەیان نابەنەسەر خودای گەورەش بەهۆی ئەو ناپەیمانەیان سزایان بەنەخۆشی دووڕوویی لەدڵ‌و دەرونیان دەدات هەتا ئەو ڕۆژەی دەگەڕێنەوە لای خودا بۆ لێپرسینەوە ئایا بۆچی پێچە وانەی بەڵێنەكەیان جوڵاونەوەودرۆیان كرد.

تێبینیەك: من پێم وایە ئەو بەسەرهاتەی سەعلەبە دەست تێوەردانێكی دووژمن كاریانەی تێدابێت چونكە سەعلەبەیەكێك بووە لە یارانی بەدر و پێغەمبەریش لە بارەیانەوە دەفەرموێ:﴿ لعل اللة إطلع إلى أهل بدر فقال:إعملوا ما شئتم فقدغفرت لكم﴾ واتە: لەوانەیە خودای گەورە لەبارەی ئامادەبووانی بەدر فەرمووبێتی: چیدەكەن بابیكەن من لێیان خۆش بووم. بخاری ومسلم ڕیوایەتیان كردووە.

## دادگەری و چاكەی ئێوە بەلامانەوەخۆشتربوو لە ستەمی ڕۆم

## وأعدلكم وأحاسنكم أحب إلينا من جور الروم

دەگێڕنەوە ئەوكاتەی كە شاری(حمس)لەسەردەستی شێری بڕندەی خودا (خالیدی كوڕی وەلید)ﷺئازادكرا، لەو ناوچەیەدا تەنها شارێكی بچوكی ئەو دەبەرە ئازاد نەكراو مایەوە، بەلام زۆر بەداد گەریانەو ، ویژدانەوە هەلسوكەوت و ڕەفتاریان لەگەلدا دەكرا، تەنها سەرانەیان لێدەسێندرا، چونكە هەر لەژێر ئاینی یەهودی خۆیان مابونەوە. بەلام كاتێكی زۆری نەبرد كەیەكێك لە دانیشتوانی ئەو شارۆچكەیە هاتە لای سەركردەی سوپای موسلمانان، لە ناوچە ئازاد كراوەكانداو: بە سەرلەشكری ڕاگەیاند كەوا سوپای ڕۆم واخەریكی گەلەكۆمێن و، سوپایەكی گەورەیان كۆكردۆتە وەوبەرە وشاری (حمس) بۆ بەربەرەكانی گەڕانەوەی ئەو شارە هەنگاو دەنێن و، بەرەو ڕوتان دەبنەوە. لەو كاتەدا سەركردەی سوپا، بەرپرسو لێپرسراوانی سوپای كۆكردەوەو ڕاوێژكاری تەواوی لەگەلدا كردن و، بەكۆی گشتی بڕیاریاندا كە شاری (حمس) چۆلبكەن و، بگەڕێنەوە دواوەو شەڕو، ترس و، ناخۆشی لەو ولاتەدا ، لەگەلْ بێباوەڕا نیان برەوێننەوە: چونكە سوپای ڕۆم سوپایەكی بێژمارەو، ئەوشەڕەش لەو ولاتەدا دەبێتەمایەی لەناو چونی زۆری موسلمان و، دانیشتوانی ئەودەبەرە: بۆیە بۆ ئەو مەبەستە سەركردەی موسلمانان هەموو پیاوە بەناوتواناو لێهاتوە كانی دانیشتوانی شاری(حمس)ی كۆكردەوە و ڕاوێژی تەواوی لەگەلْ ئەوانیشدا بە ئەنجام گەیاندو، پێی فەرموون: ئێمە كە بڕێك پارەی سەرانەمان لە ئێوە وەرگرتوە لە پێناوی پارێزگاری گیان ومالی ئێوەو، بۆ پارێزگاری و، بەرژەوەندی و، سەلامەتی ئێوەدابووە، بەلام ئێستاش كەمادام دوژمنی ڕۆم هێرش و سوپای هێناوە بۆ گەڕانەوەی ئێوە بۆ ژێر دەسەلاتی خۆیان، ئێمە نامانەوێ بەرامبەریان بووە ستینەوە لەبەر بەرژەوەندی ئێوە، لەبەر ئەوە دەگەڕێینەوە دواوە. ئەو سەرانەی كەئێمە لە ئێوەمان وەرگرتوە بۆتان دەگێڕینەوە.ئینجا نوێنەران و دانیشتوانی (حمس) وەلامی سەركردەی موسلمانانیان دایەوە و گوتیان: ئەی سەرۆك ئێمە لەوچەند ڕۆژە كەمەی كەئێوە

نەناوماندا بوون زۆربەچاکی لەڕەوشت وئاکارو دادگەری‌و چاکەی ئێوە شارەزا بووین: ئێمە هەر چەند کە لەوڵاتی خۆمان و لە ژێر دەسەلاتی ڕۆم دابوین، زۆر چەوساوەو ستەم لێکراو، بەد بەخت بووین، بەهۆی ئەوەی ، ئەو ڕژێمەی خۆمان زۆریان دەچەوساندینەوەو، ئازاریان دەداین.حەز بەوە ناکەین کە بگەڕێینەوە ژێر ستەمو ، زوڵمی ئەوان، دەمانەوێ لەژێر فەرمان بەرداری ئێوەدابین، نەوەك و ڕۆمی ستەمکار، بۆیە بەبڕیا ڕێکی تەواوداواتان لێدەکەین ئێوە بەجێمان مەهێڵن‌و، خۆڕاگرو، بەئارام بن‌و، بەربەرەکانی سوپای ڕۆم بکەن‌و ، ئێمەش بە هەموو هێزو توانای خۆمان لەگەڵتاندا دەجەنگین‌و، پشت بەپشت‌و، سەرکەوتن لەخودا، ئەگەر ژیاین ئەوا پێکەوە دەژیەین لەژێر سێبەری دادگەری ئیسلام، وە ئەگەر بشمرین ئەوە بۆ لای خودا دەگەڕێینەوە. بەو شێوەیە دانیشتوانی(حمس)ی یەهودی لەگەڵ موسڵمانان شیریان هەڵگرت بۆ بەربەرەکانی دژی ستەمکاری ڕۆم بۆ پارێزگاری لەوڵات‌و نیشتمانەیان ، لەژێر دادگەری‌و فەرمان ڕەوای ئاینی سەر بەرزی ئیسلام.

## بەرگری‌و سەرکێشی لە ناڕەواییدا

## ألعناد فی الباطل

دەگێڕنەوە لە پێغەمبەرەوە:کابرایەك دارخورمایەکی لەناو حەوەشە و دیواری پیاوێکی نەسرانی دابوو زۆرکاری ناخۆش و ڕووداوی نادروستی لێڕودەدا: کابرای نەسرانی داوای لەکابرای خاوەن دار خورما کرد کە پێی بفرۆشێ: بەڵام کابرا نەی فرۆشت، دوایی داوای لەکابرای کرد کە بەدار خورمایەکی ترلەگەڵی بگۆڕێتەوە؟ دیسان کابرالەگەڵی نەکرد.نەسرانیەکە لەبەر نەهێشتنی ڕووداو، کارەسات ڕۆیشتەلای پێغەمبەرو:باسی ئەو دار خورمایەی بۆ کرد: پێغەمبەر بانگی کابرای خاوەن دار خورمای کردوو پێی فەرموو: ئەودار خورمایە بەو کابرای نەسرانیە بفرۆشە؟ بەڵام کابرا زۆر سەرکێش بوو گوتی نای فرۆشم، پێغەمبەر فەرمووی: لەگەڵی بگۆڕەوە؟ کابرا گوتی ناشی گۆڕمەوە. پێغەمبەر فەرمووی: بەڕاستی تۆپیاوێکی شەڕەنگێزو زیانبەخشی. فەرمانی بە کابرای نەسرانیدا کەدار خورمایەکەی ببڕێ.

# کێ ئەم شەو خێرو چاکەی کردووە؟
# أين المتصدق الليلة ؟

دەگێڕنەوە (عەلبەی کوڕی زەید) چاوی بە چەند موسڵمانێك کەوت کە پێشبڕکێ‌و خێرا یی لەچاکەکردندا دەکەن بۆماڵ بەخشین‌ویارمەتی کۆمەڵی سوپای سەغڵەتی: (عەلبە)ش زۆرئارەزوی بوو کە ئەویش بەو جۆرە پێشبڕکێ و کۆمەکی بکات: بەڵام لەبەر هەژاری‌و نەداری ئەو هەلە گەورەیەی بۆ نەدەڕەخسا و نەیدەتوانی بەشداری بۆ ئەومەیدانە پڕ سەروەریەی بکات.بۆیە زۆر بەکەساسی‌و مەلولی ئەوشەوەی بە چاوی پڕ فرمێسکی قەتیس ماوە بردەسەرو، پێلوی چاوی بۆ خەو بەیەك دا نەداو هەر لەخەڵکانەوە ڕامابوو ، کە هەریەکەی خەریکی خۆڕێك خستن‌و پێچانەوە بوون‌و، یەك بەدواییەکدا دەڕۆیشتن (عەلبەش) هەرئاخ‌و ناسۆری هەڵدەکێشاو ئاواتی دەخواست کەئەویش وەك‌و ئەو خەڵکە توانای ببوایە و لەگەڵیاندا بەشداری ئەو خێرە پڕ سەروەریەی بکردابایە بەڕۆیشتن یان بەکۆمەکی: بۆیە لەبەر خودا دەپاڕایەوەو دەیگوت:( اللهم إنك قد أمرت بالجهاد ورغبت فيه ثم لم تجعلني يد رسولك مايحملني عليه، وها أنا اتصدق علي كل مسلم بكل مظلمةاصابني فيها مال اوجسداوعرض)

(عەلبە) بەو هەموو غەمونا سۆریانە شەوی کردەوە بەڕۆژ، ئینجا ڕۆیشت و چاوی بە پێغەمبەری خوداکەوت لەناو کۆمەڵێکدا کەخۆیان ئامادەی ڕۆیشتن کردبوو هاواری لێدەکردن‌و دەیفەرموو: کوا کێن ئەوانەی کەئەم شەوخێرو چاکەو سەدەقەیان کردووە؟ پێغەمبەر ئەو فەرموودەی دووبارە دەکردەوە، ئینجا لەدوای ئەوە (زەید) ئەوبەسەرهات‌و ڕوداوەی(عەلبە)ی بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە: پێغەمبەر ﷺ پێیفەرموو:مزگێنی‌وشادی بێت، سوێند بەو کەسەی کەگیانی منی بە دەستە خێرو پاداشتی زەکاتی وەرگیرا و قبوڵ کراوت بۆ نوسراوە.

# وازبهێنن و دوور بکەونەوەلەگومان و چاوێنی

# ذرواالمراء

دەگێڕنەوە ڕۆژێك پێغەمبەرﷺ بەلاماندا تێپەڕی: لەو کاتەدا لەبارەی دینەوە مشتومڕو لێدوانمان دەکردو، دەمانگوت: هەر بەو جۆرە یەکێك لە هاوڕێیانی پێغەمبەرﷺ بەوجۆرە لەگەڵمان دواوەو قسەی بۆ کردوین. پێغەمبەر ﷺگوێی لێبوو زۆر تووڕەبوو بەجۆرێك هەرگیز وا تووڕە نەبووە: ئێمەش خێرا کۆتایمان بە لێدوانەکەمان هێنا، پێغەمبەرﷺفەرمووی:ئەی گەل و نەتەوەی پێغەمبەر ﷺ توخودا ئێمە بەو جۆرە فەرمانمان پێکردوون؟ بەڕاستی زۆربەی گەل و نەتەوەکانی پێشی ئێوە بەهۆی ئەو مشتومڕو نارێکیانە خودا لەناوی بردوون، دەئێوەش بەباشی وازلەوزۆر بڵێی و مشت و مڕیە بهێنن.چونکە مشتومڕ و زۆر بڵێیی هەردەم لە زەرەرو خەراپەو بەد بەختی دان و ، نیشانەو شێوەی پیاوەتی و ڕەوشت بەرزی پێوەنییە، وە پیاوی باش زۆربڵێ و گاڵتە جاڕی نییە. وەتەنها ئەوەندە تووش بوون و گێرۆدەی خەراپە و تاوان بەسە بۆ دوورکەوتنەوەی ئینسان لە زۆرگوتنی بێ سوودووشەڕەن گێزی.وەبەڕاستی پیاوی زۆر بلێ و درێژدادر لەڕۆژی دواییشدا بە بەر شەفاعەت و لێ بووردەیی ناکەوێ. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: منیش خاوەنی سەرداری و گەورەیی سێ شتم لە خاوەنداری باغ و باغاتەکانی بەهەشتێدا، لەژێر و خوارەوەیدا لە ناوەڕاستەکەیداو، لە سەرەوەکەشیدا ، ئەوەش بۆ ئەوانەی کەواز لەگەمە و گاڵتەو مشت و مڕ دەهێنن و، ڕاست و ڕاسگۆیانە ڕەفتاردەکەن. دەئێوەش واز لە گەمەو گاڵتەو زۆربڵێیی بهێنن ، چونکە بەڕاستی خودا یەکەمین شت لەدوای وازهێنان لە بت و سەنەم وخودا دەستکردەکان، فەرمانم پێدرا بەدوورکەوتنەوە لەزۆر بڵێی و مشت و مڕوگەپ وگاڵتەی بێسود و بێکەڵك: هەروەك و پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (إن أبغض الرجال إلى الله الألد الخصم)واتە: پیسترین ئادەمیزاد لەلای خودا ئەوانەی زۆر، زۆر بلێ وچەنەباز و خەراپ کارن لە زۆر بڵێیی و گوتەی نابەجێ.

## بەرەکەت و پیرۆزی لە کاردایە
## في العمل بركة

ڕۆژێکیان سەرلەبەیانی حەزرەتی(عەلی) لەماڵ هاتەدەرو، ڕۆیشتە دەرەوەی (مەدینە) بۆ بەدەست هێنانی کارێك کە بژێوی خۆیو خانەوادەکەی بەدەست بهێنێ: چاوی بە ئافرەتێك کەوت، لە کرێکارێك دەگەڕا، کەئاوی بۆ لەبیر هەڵنجێنێو، بۆی لەچاڵێکی قوڕینی بکات. حەزرەتی عەلی فەرمووی: ئەمن زۆرباشم بۆ ئەوکارە؟ ئافرەتەکە حەزرەتی (عەلی) بەکرێ گرت، هەر دۆلکەیەك ئاوی بەیەك دەنکە خورما بۆ هەڵێنجێ، حەزرەتی عەلیش لەگەڵیدا ڕۆیشت (٢٠) بیست دۆلکەی ئاوی بۆهەڵێنجاو، بیست دەنکە خورمای لێوەرگرتو، بەرەوماڵ گەڕایەوە: لە ڕێگا توشی پێغەمبەرﷺهاتو، فەرمووی: ئەی عەلی ئەوەچیە بەدەستەوە؟ حەزرەتی عەلیفەرمووی:ئەی پێغەمبەری ﷺخودا ئەوە خورمایە، کرێی هەڵکێشانی ئاوی ناو بیرە کەکردوومە، سەیر بکە بەهۆی بەدەست هێنانیەوە هەردوو دەستم سور هەڵگەڕاوە، چونکە پەتەکەی لەپیشاڵی دار خورما بوو: پێغەمبەرﷺ دەستی گرتو، دەستی پیرۆزی بەسەر دەستیدا دەهێناوبۆی بەستەوەو ، ئینجا دەستیشی بەسەر دەمووچاو ڕووخساریداهێناو، فەرمووی: ئەوە دەستێکە خودا بەرەکەتو پیرۆزی تێبخات.ئینجا فەرمووی: ئەی عەلی دانەیەك لەو خورمایەم بدەیە تەداوی پێدەکەم.

## دڵسۆزی و سەر ڕاستی بەندکراو
## وفاء سجين

دەگێڕنەوە (مەرداس)ی خواریجی یەکێك بوو لەبەندەکانی گرتوخانەی ( عبیداللەی کوڕی زیاد) لێپرسراوی بەندەکان پێی گوت، ئەمن حەز دەکەم کەیارمەتیو کۆمەکی باشت بکەم، ئینجا ئەگەر من یارمەتیت بدەمو، لە حەفتەی جارێك ڕێگات بدەم بڕۆیەوە بۆ ماڵەوە سەردانی بکەی، دوایە بۆ خۆت دێیەوە بۆ گرتوخانە بەبێ ئەوەی بە شوێنتدا بگەڕێم؟! ئەویش گوتی: بەڵێ دەگەڕێمەوە. بەو جۆرە هەموو

هەفتەیەك ڕۆژێك سەردانی ماڵی دەکردوو ، ڕۆژی دوایی دەگەڕایەوە بەندیخانە، هەتا ڕۆژێك کۆمەڵێك لە دەرچوان (خەواریج) ئەو پاسەوان‌و لێپرسراوەی (عبداللەی کوڕی زیاد)یان کوشت ، کوڕی زیادیش فەرمانی دەرکرد، کە هەموو کۆمەڵی خەواریجی ناوبەندیخانە لەتۆڵەی ئەوەدا بکوژنەوە: بەڵام وارێکەوت کە (مەرداس) لەوکاتەدا لە دەرەوەی بەندیخانە بوو، خزم‌و کەس‌و خانەوادەی پێیانگوت: ئەی مەرداس ئەوە فەرمانێکی کوشتنی دەرچوان خەواریج دەرچووە تۆش پارێزگاری لەخۆت بکەو ئاگات لەخۆت بێت، مەڕۆوە بۆ بەندیخانە دەناتۆش وەك‌و ئەوان دەکوژرێی: (مەرداس)گوتی: بەخودا من نامەوێت بەخیانەت‌و فێڵ گیانی خۆم ڕزگار بکەم بە زۆرداری و ستەم بگەڕێمەوە بۆ لای خودا: بەڵێ بەڕاستی کوڕی زویاد زۆردارو ستەمکارە ، بەڵام هەرگیز خۆشحاڵ‌و شادمان نابێت بەکوشتنی بەندیەکان. خێرا مەرداس گەڕایەوە بۆ بەندیخانەو بە پاسەوانی بەندیەکانی گوت: ڕیسواوشەرمەزاردەبێت هاوڕێ و سەرکردەکەتان ئەگەر ئە ونیازو مەبەستەی بۆ کوشتنی هاوڕێکانمان ئەنجام بدات، بۆیە خێرا گەڕامەوە بۆ ئەوەی لێپرسراوەکەتان توشی نائارامی نەبێت، پاسەوانی بەندیەکان گوتی: تۆ هەر ڕێگەیەك دەگری بۆ ڕزگاریت ئازادی و بیگرە، خودا ئازادت بکات.

## خۆت‌و خانەوادەت بیخۆن

## كله أنت وعيالك

کابرایەکی عەرەبی دەشتەکی هاتە لای پێغەمبەری ﷺخودا گوتی: یا ڕەسول الله ﷺ فەوتام‌و لەناوچوم ، پێغەمبەر ﷺفەرمووی: چیشتێك لەناوی بردی؟ کابرا گوتی: ئەی پێغەمبەرﷺ چومە لای خێزان‌و هاوسەرەکەم بەڕۆژی مانگی ڕەمەزان‌و بە ڕۆژو و بووم: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بۆ کەفارەتی ئەو کارەت دەبێ بەندەیەك ئازاد بکەی؟ کابرا گوتی: بەخودا توانام نیە.پێغەمبەرﷺ فەرمووی: دوومانگ لەسەریەك بە ڕۆژووبە؟ کابرا گوتی: بەخودا توانام نییە. پێغەمبەرﷺفەرمووی: خواردنی(٦٠) شەست هەژار بدە؟ کابرا گوتی: بەخوا ئەو ماڵەم نییە بتوانم خواردن بدەم بەهەژاران. پێغەمبەرﷺسەبەتەیەك خورمای بۆ هێنا کە(٣٠)سی

پێوانە (ساع)ی تێدابوو، پێغەمبەرﷺ فەرمووی:برۆ ئەوەبکە بەخێروسەدەقە بۆ هەژاران؟ کابرا گوتی: بە خودا ئەی پێغەمبەری ﷺخودا هیچ کەسێك شك نابەم کە هێندەی خۆم پێویستی بەوخواردنە بێت: پێغەمبەرﷺپێکەنی بەجۆرێك ددانەکانی بە دەرکەوت: ئینجا بە کابرای فەرموو: برۆ بۆ خۆت و خانەوادەکەت بیخۆن.

## ڕەوشتی باشی خۆش دەویست

## كان يحب مكارم الاخلاق

لەسەردەمی پێغەمبەرﷺجەنگی هۆزی (تەی) کۆتایی پێهات ئەوکاتە دیلەکانیان هێنا بۆلای پێغەمبەرﷺ: ئافرەتێك لەناو دیلەکاندا هەستاو دەستی کرد بەقسە کردن و گوتی: ئەی محمدﷺ ئەگەر تۆ ڕێگە بەمن بدەی و بڕۆم بۆ ئەوەی هۆز و گەلی عەرەبم پێخۆش نەکەن ئاواتەخوازم کەڕێگەم پێبدەن: لە دواییدا داوایەکەی دووبارە دەکردەوە و دەیوت: باوکم یارمەتی هەژاران و داماوانی دەداو، برسی تێر دەکردو، دیلی ئازاد دەکردو، هەرگیزداوای داماوانی دوانەدەخست و بەلاوەی نەدەدا، من کچی حاتەمی تائیم. پێغەمبەرﷺ فەرمووی :ئەی کیژۆڵە بەڕاستی ڕەوشتەکانی باوکت ڕەوشت و ڕەفتاری ئیسلامی بوون. ئەگەرباوکت موسڵمان بووبایە بەزەیی و سۆزمان بۆی دەبوو: لە دواییدا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەوکیژۆڵەی ئازاد بکەن بابڕوات. چونکە بەڕاستی باوکی ڕەوشت و ڕەفتاری جوانی خۆشدەویست.

## بەڕاستی مارەی بڕی

## أنكحك الصدق

بیلالی حەبەشیﷺ بانگ دەری پێغەمبەری ﷺخوداداوای ئافرەتێکی قورەیشی بۆ برایەکی خۆی کرد: بلال بە خانەوادەی کچەکەی گوت، پێشی هەموو شتێك پێم خۆشە بە تەواوی خۆمانتان پێ بناسێنم؟ ئێمە دوو بەندە بووین بە مهرەبانی خودا ئازادیان کردین. وەئێمە سەرلێشێواو ڕێ لێتێك چووبووین ڕێنموونی کراین، وە هەژار بووین دەوڵەندی کردین ، ئێستاش من داوای کچی ئێوەدەکەم بۆبرایەکی خۆم، ئەگەر پێمان ببەخشن و مارەی ببڕین ئەوەمیهربانی خودایەو زۆرسوپاسی

خودا دەکەین، وە ئەگەر نەشمان دەنیّو داواکەمان ڕەدبکەنەوە، ئەوەخودای گەورە بەتوانا و دەسەڵاتە. لەدوای ئەوە هێندێکیان سەیری یەکتریان دەکردوودەیان گوت: ئەی بیلال ئێمەڕابردووی ئێوەمان زانی، وەجێگەوشوێنی دیاری کراوتان دیارییە لەلای پێغەمبەرﷺ.لەبەر ڕاستی و گوفتارتان کچەکەمانتان پێشکەش بێتو ، وەرن مارەی ببڕن. لەدوای مارەبڕین و گەڕانەوەیان، براکەی بیلال بە بیلالی گوت: ئەی خودا لێت خۆش بێت، بۆچی تۆ پێشینەی خۆمانتان بۆکردن، بەڕاستی من زۆر دەترسام لەبەر ئەوە نەماندەنیّ ؟ تۆ تەنها باسی پلەوپایەی ئێستای لای پێغەمبەرت ﷺ کردبا و وازت لە پێشینەکەمان بهێنابایە، بیلال گوتی قسەی ڕاستمان گوتو ، بەهۆی ڕاستیمان کچەکەیان داینیّ و مارەمان بڕی.

## گەورەیی ڕاستی

## فضیلة الصدق

جارێکیان (حەجاجی کوڕی یوسف)ی سەقەفی ووتارێکی زۆر درێژی خوێندەوە: کابرایەکی ئەهلی مزگەوت کەبەردەوام لە مزگەوت خەریکی نوێژبوو لەبەرئەوەی کە دڵی لای نوێژەکەی بووهاواری کرد بەسیە نوێژە، نوێژ: چونکە بە ڕاستی نوێژ چاوە ڕێی تۆناکاتو، پەروەردگاریش بێنو بەهانەت لێوەرناگریّ.حەجاج لەو کابرایە توڕە بوو فەرمانیدا بەندی بکەنو، بیخەنە گرتوخانە: لە دواییدا خزمو خانەوادەکەی هاتن ولەلای حەجاج ڕجایان بۆ کرد کە عەقلی تەواو نیەو شێتە بەریبدات: حەجاج گوتی بڕۆن بیهێنن ئەگەر دان بەشێتو بێعاقڵی خۆی بهێنیّ بەریدەدەم:ڕویشتن بۆ لایو پێیان گوت حەجاج ئاوای گوتوە ، ئەگەر تۆش دان بەوە دابنێی ئەوەباشەو بەرت دەدا بەڵام، کابرا گوتی: پەنابەخودا کە من هەرگیز خودا ئەزمون و تاقی کردنەوەی شێتی پێنەداومو ، هۆشو عەقڵێکی زۆرباشی داومیّو، بەتەواوی هۆشیشەوە قسەم کردووە، کاتیّ حەجاج ئەو قسەیەی کابرای بیستەوە کەبەڕاستی قسەی کردووە، لەبەر ڕێزو گەورەیی ڕاستگۆییەکەی ئازادی کردو لێی خۆش بوو.

# ئێمە ئەوەمان لە تۆ داوا نەدەکرد

# إنا لم ترد منك هذا

دەگێڕنەوە حەزرەتی (عائیشە) فەرموویەتی:جارێك لە نێوانی منو پێغەمبەردا ﷺ دڵگرانیەك ڕوویدا: دوایی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: وەرەبا ئاشتبینەوە بەڵام عائیشە ڕازینەبوو گوتی: دەبێت یەکێك لە نێوانماندا هەبێت ئینجا ئاشتدەبمەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەکێ ڕازیدەبی بێتە نێوانمانو، دەمڕاستو، ناوبژیمان بکات؟ ئایا بە (ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح ﷺ) ڕازیدەبی؟ منیش گوتم نەخێر، چونکە ئەو پیاوێکی نەرمو نیانەو بڕیار بۆ تۆ دەدات فەرمووی: بە باوکت ڕازیدەبی؟ گوتم بەڵێ: کاتێ ئەبوبەکر هات، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی عائیشە قسەکەی بۆ بگێڕەوە؟ منیش گوتم: نەخێر تۆ بیگێڕەوە. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئەو کێشەی نێوانمان ئەوها و ئەوها بووە. منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری ﷺ خوا بەڕاست و تەواوی بیگێڕەوە: ئەبوبکر ﷺ دەستی بەرزکردەوە هەتا هێزی تێدابوو شەقاز لەیەکی لێدامو، گوتی:ئەی کچی دایکی ڕامان، تۆچۆن بەرامبەر بە پێغەمبەری ﷺخودا قسەی وادەکەی؟ ئەگەر پێغەمبەری ﷺخودا قسەی ڕاستو تەواو نەکات ، کێدەیکا؟ بەو شەقازلە خوێن لەدەمولوتم بەربوو: ئەمجار پێغەمبەر ﷺهاتە ناوبژیمان و جودای کردینەوە و فەرمووی: ئەبوبکر ﷺ ئێمە ئەوەمان لەتۆ نەدەویست. لە دواییدا پێغەمبەر ﷺ خوێنی جلەکانی دەشوشتەوەو دەیفەرموو: باشەعائیشە ئەوەت پێخۆش بوو. بزانەمن چۆن بە فریات گەیشتمو لە دەستی ئەو پیاوەم ڕزگار کردی.

# لێبوردن لەنەریتی ڕێزدارانە

# العفومن شیم الکرام

دەگێڕنەوە: لە نێوانی پێشەوا(حسێن ﷺ)و، (محمدی کوڕی حەنیفە ﷺ)ی برای باوکی ناخۆشیو دڵتەنگیەك ڕوویدا: لەدوای لەیەك دابڕانیان محمد نامەیەکی بۆ حسێن نوسیو فەرمووی: ئەی حسێن سەلامی خودات لێبێت :من و تۆ

هەردوکمان باوکمان یەکە کە عەلی کوڕی ئەبوتالیبە: نەتۆ لەمن گەورەتری‌و، ئەمنیش لە تۆ گەورەترم بەهۆی عەلیەوە: بەڵام دایکی من ئافرەتێکە لە هۆزی ئەبو حەنیفەیە: بەڵام دایکی تۆ فاتمەی زەهرایە کچی پێغەمبەری ﷺخودایە، سوێند بەو کەسەی گیانمی بەدەستە ئەگەر ئەمن پڕ بەپڕی ئەوخاک‌و زەویەم زێڕو گەوهەر هەبێت، دایکی من هاوتاو شێوەی دایکی تۆ ناکات. بۆیە ڕێز و گەورەیی هەر بۆ ئێوەیە، ئەگەر نامەی منت پێگەیشت زووخێرا وەرە بۆلام ئاشتم بکەوە، چونکە تۆ خاوەنی ڕێزو گەورەیی‌و هەر تۆش خاوەنی لێبوردن و بەخشینی. کاتێ پێشەواحسێن نامەکەی پێگەیشت‌و خوێندیەوە بەڕاستی کاریگەریەکی تەواوی هەبوو، کاری لەدڵودەروونی حسێنی کردو، هەرخێرا خۆی ئامادەکردو و ڕۆیشت بۆلای محمدو ئاشتی کردەوە، بەو هۆیە شەوە، بوو بە خاوەنی پلەی ڕێزو خۆشەویستی، کە بەڕاستی هەر بۆخۆشی شایانی ئەو ڕێز و پایە بەرزیەیە.

## چۆن ڕەفتار بکەی ئاوا ڕەفتارت لەگەڵ دەکرێ

## كما تدين تدان

پێشەوا (ئەحمد) لە ئەبو ئومامەوە دەگێڕێتەوە: گەنجێك هاتە خزمەت پێغەمبەری ﷺخودا و گوتی: بەڕاستی من زۆر ئارەزوی داوێنپیسی زینادەکەم، ڕێگەم پێبدە بڕۆم زینا بکەم: هاوڕێیانی پێغەمبەرﷺ کە گوێیان لەگوتەی ئەو کوڕە بوو لە بەرامبەر پێغەمبەر ﷺدا بەو بێشەرمیەی دەدوێت: ڕاپەڕین و هاواریان کردو، بەڕوی ئەو گەنجەدا هەڵگەڕانەوەو ویستیان لێی بدەن: بەڵام پێغەمبەرﷺ بەشێوەیەکی زۆر هێمنانە بە گەنجەکەی فەرموو: هەستەوەرە پێشەوەو، لێم نزیکبکەوە، گەنجەکە هاتە پێشەوە و لە تەنیشتی پێغەمبەر ﷺدانیشت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: تۆپێت خۆشە زینالەگەڵ دایکتدا بکرێت ؟ گەنجەکە گوتی:دایکم‌و باوکم بە قوربانت بێت بەخودا حەزناکەم. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڕاستی خەڵکانیش حەزناکەن زینا لەگەڵ دایکیاندا بکرێت. ئەمجار پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەدی حەزدەکەی زینا لەگەڵ خوشکتدا بکرێ ؟ گەنجەکە گوتی: نابەخودا ئەی پێغەمبەریﷺ خودا حەزناکەم. پێغەمبەر ﷺفەرمووی: خەڵکانیش بەو شێوە

حەزناکەن زینا لەگەڵ خوشکیاندا بکرێ. ئەمجار پێغەمبەرﷺ فەرمووی: حەز دەکەی زینا لەگەڵ کچەکەت ، یان پورت، یا هەر کەسێکی خزمتدا بکرێ؟ گەنجەکەش بەهەمانشێوە دەیگوت: نەبە خوادایکم و باوکمت بە قوربان بێت حەزناکەم. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: زۆر باش بزانە هیچ کەس حەز ناکات زیناو داوێن پیسی لەگەڵ کەسی خزمیدا بکرێت. ئینجا لەدوای ئەوە پێغەمبەرﷺ دەستی لەسەر سینگی گەنجەکەدا ناو فەرمووی: خودایە دڵی پاك بکەوەو، لە تاوانی ببورەو، دامێنی لەخەراپە بپارێزە. لەدوای ئەوە ئەو گەنجە وای لێهات هیچ شتێکی بە ئەندازەی زیناوداوێن پیسی قێزوڕقی لێنەدەبۆوە.

## هێمن و لەسەرەخۆیی عومەری کوڕی عبدالعزیز

## حلم عمر بن عبدالعزیز

خەلیفە و پێشەوای موسڵمانان (عومەری کوڕی عبدالعزیزﷺ) بۆ گەڕان و سوڕانیو، بۆ کاروبار و، ئاگاداری ولاتی، خووڕەوشتی وابوو تەنها یەك پاسەوانی لەگەڵدا دەبوو: شەوەێکی تاریك ڕۆیشتە مزگەوت زۆرتاریك بوو چاوی نەیدیت قاچی بەکابرایەك کەوت کە لە مزگەوت ڕاکشابوو، کابرا سەری بەرز کردەوەو گوتی: کوڕە تۆشێتی بەو شەوە شەق لەمن هەڵدەدەی؟ حەزرەتی عومەر ﷺفەرمووی: نەبەخودا برام شێت نیم: پاسەوانەکەی پەلاماری بۆ برد لێی بدات. حەزرەتی عومەر ﷺفەرمووی: نەکەی لێی بدەی؟ ئەو کابرایە خۆ هیچی نەگووتووە تەنها گوتی: ئەتۆشێتی؟ ئەوپرسیاری لێکردم، منیش وەلامم داوەتەوە، برام شێت نیم .

## موسڵمان لە کونێکەوە دوو جار پێوەی نادرێ

## لا یلدغ المؤمن من جحرمرتین

دەگێڕنەوە جارێکیان کابرایەك جنێوو قسەی ناشیرینی بە پێغەمبەریﷺ خودا گوت: پێغەمبەرﷺ فەرمانیدا ئەو کابرایە چارەنوسێکی پیسو خەراپی هەیە بڕۆن بیکوژن؟ کابرا دەستی کرد بەهاناو هاوار و پاڕانەوە: پێغەمبەریشﷺ لێی خۆش بوو بەخشی. بەلام، ئەوکابرایە لەدواییدادەستی لە خەراپە و باس کردنی

پێغەمبەرﷺ نەهێنا، هەردەمو بەردەوام جنێوی بەپێغەمبەرﷺ دەداو، قسەی ناشیرینی لە پاشملە پێدەگوت: دووبارە پێغەمبەرﷺفەرمانیدا بیكوژن؟ بەهەمان جاری پێشو ئەو كابرایە هاواری دەكرد و دەپاڕایەوە كە پێغەمبەرﷺبیبەخشێ: بەڵام ئەمجارەیان پێغەمبەرﷺ:نەی بەخشیوعەفوی نەكرد: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەخودا ئەمجارە وازت لێناهێنم، دوایی بڕۆی بە دەشتو كێوەكانی مەكەدا و بڵێی ئەوە دوو جار گاڵتەم بە محمد كرد، بڕۆن بیكوژن. چونكە موسڵمان لە كونێكەوە دووجار پێوەی نادرێ و ناگەزترێ.

## خۆشەویستی لەبەر خودا

## المحبه فی الله

{وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ ۚ لَوْ أَنفَقْتَ مَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مَّا أَلَّفْتَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ أَلَّفَ بَيْنَهُمْ ۚ إِنَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ} الانفال/٦٣ واتە: خودای گەورە دڵ و دەرونی ئادەمیزادەكانی بە یەكەوەبەستەوە، خۆئەگەر هەموو سەروەت وسامانی دوونیاتان خەرج بكردبایە بۆ بەستنەوە و بەیەك گەیاندنی دڵەكان نەتاندەتوانی. بەڵام خودای گەورەبەهۆی ئاینی سەربەرزی ئیسلامەوە توانی پەیوەندی خۆشەویستی لەگەڵیاندا ببەستێتەوە، بەراستی خودا بەتواناو زانایە.

## خۆشەویستی

## المحبة

سلمانان لەلای خودای گەورە جۆرا و جۆرە، وە پلە و مەرتەبەی بەرزو نزمیان لە یەكتری جیاوازە. بەرزترین پلە و جێگاو، گەورەترین شوێن بۆئەو باوەڕدارانەیە كە هەموو كار و فەرمانێكیان، خۆشەویستیو، ڕق لێبوونەوەیان تەنها و تەنها لە پێناوی خۆشەویستی و ڕەزابوونی خودادایە، وە لە بەرنامەی ئیسلامیشدا دڵسۆزیو خۆشەویستی پێویستەو بڕیاردراوە، هەر لەبەر ئەوەیە هەر كەسێ كەسێكی خۆش ویست، پێویستە لەلای باسی بكاتو دەری ببڕێت، بۆ ئەوەی لە دڵو دەروونی یەكتردا جێگیر بنو تاكو كۆمەڵیش فێری بنو، هەموو

ئادەمیزادەكان بگشتی پەیڕەوی لێبكەن: چونكە ئەو خۆشەویستیە بەختەوەری موسڵمانانو، كۆمەڵگای تێداو، تەنانەت بەختەوەری هەموو مرۆڤایەتی تێدایە بە گشتی.هەروەك و لە پێشەوا و سەردارمانەوە (عومەری كوڕی خەتاب) دەگێڕنەوە فەرموویەتی: كەپێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:

(قال رسول الله ان من عبادالله لأناسا ماهم بانبياء ولاشهداء يغبطهم الأنبياء والشهداء يوم القيامة بمكانهم من الله ، فقال الصحابة: يارسول الله تخبرنا من هم؟ فقال عليه الصلاة والسلام: هم قوم تحابوا في الله على غير أرحام بينهم ولا أموال يتعاطونها، فوالله إن وجوههم لنوروإنهم لعلى نورلايخافون إذا خاف الناس ولايحزنون إذا حزن الناس. ثم تلا قوله تعالى :{أَلَآ إِنَّ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ. ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ. لَهُمُ ٱلۡبُشۡرَىٰ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِۚ لَا تَبۡدِيلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ } يونس/٦٢-٦٤ واتە: بەڕاستی ئاگاداربن كە بە هیچ جۆرێك خۆشەویستان و ئەولیا یانی خودا ئازارو ترسو بیمو ناخۆشی ڕویان تێناكات لەڕۆژی دوایی، ئەوانەش ئەوكەسانەن كە باوەڕیان بەخودا هێناوەودڵیان لەسەر ئاینەكەیان دامەزراوە و لەخودا دەترسێن و خۆپارێزی دەكەن. ئەوانە خۆشیو مزگێنیان پێدەدرێت لەژیانی دونیادا بە هۆی ئایەتەكانی قورئانو، لەڕۆژی دوایش بەمزگێنی چونە بەهەشتیانەوە، مزگێنیو فەرموودەكانی خوداش هەرگیز گۆڕان كاریان بەسەردا نایاتو حەتمەن دێتەدی ، بەڕاستی ئەوەش گەورەترین سەربەرزی و سەرفرازیو خۆشبەختیە.

هەر لەبەر ئەو بنەمایەیە كە سەردار و پێشەوامان حەزرەتی پێغەمبەرﷺ بۆمان ڕووندەكاتەوە، ، تێمان دەگەیەنێ، كەڕۆژی دوا ڕۆژ ئەو ڕۆژە گەورەیەیە، كەشایانی لەبیر نەچو نەوەیە، هەر ئادەمیزادێك لە شوێن و تایبەتی خۆی دادەنرێت كەبۆی دیاریو ئامادە كراوە، وەدەبرێتە ئەو پلە و مەرتەبەی كە شایانیەتی، بە گوێرە و ئەندازەی كردارو ڕەفتارە كانی، كە خودا پێیدەبەخشێ، ئینجا بەو بۆنەیەوە كۆمەڵە كەسانێك هەن نە پێغەمبەرنو، نە شەهیدن، پێغەمبەران و شەهیدان ئاواتیان بۆدەخوازن لەڕۆژی دوایی بەهۆی ئەو پلەوپایە و نیعمەتو بەخشیشەی كەپێیان دراوەو، بۆیان دیاری كردوون لەشوێنی

خۆشەویستانی خوداو، ئەوەش كە بۆ خۆشەویستانی خودادیاری كراوە، ئەو خۆشەو یستیەش خێر و بەختەوەری بەسەر گەل و كۆمەڵدا بڵاودەكاتەوە، هیواو ئاواتەكان دەپێكێ، بەوهۆیەوە هێزت پێدە بەخشێ وگیانێكی خۆنەویستی و، تێكۆشەرێكی بەهێزت لێ دەردەچێت و، بەو هۆیە شەوە دەگەیە سەركەوتن بەسەر دووژمن و، ناحەزان و، لەبیروڕادا وەك و یەك ئادەمیزادتان لێدەردەچێت، خودا پارێز گاریت لێدەكات وپشتیوان و هێزت دەبێت و هورەت بەرز و هیمەتت بەهێزدەكات ، چاكە و خۆشیت پێدەبەخشێ و، گەورەیی و رێزو توانایت پێدەبەخشێ، ئەوەش چەند نمونەیەكی بەرچاوە لە خۆشەویستی لەپێناو خودادا كەلەكات و ژیانی پێغەمبەردا ڕوویداوە.

## خۆشەویستی عوسمانی كوڕی عەفان بۆ پێغەمبەری خودا
## محبة عثمان بن عفان لرسول الله

حەزرەتی(عثمان) بەهۆی هاوسەرگیری خاتو (ڕوقیە)ی كچی پێغەمبەری خودا لە ژیانێكی خۆش و پڕ گوزەرانی ژیانی بەسەر دەبرد، بەبێ خەمو ئاخ و ناسۆر.بەڵام ئەو پیاوە بەڕێزە، خۆشی و ئاسودەیی هەتاسەر بەردەوام نەبوو:مردن بەرۆكی هاوسەرە بەڕێزەكەی گرت ولەژیانی خۆشی دوونیای بێ بەشكرد.حەزرەتی عوسمانیش بەهۆی كۆچی دوایی هاوسەرە بەڕێزەكەی و، پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی لەگەڵ پێشەوای مرۆڤا یەتیدا، لەسەر ئەو ژیانە خۆش ودڵگەشیەیدا، وای لێهات توشی خەم و ناخۆشی و ئازاربوو: بە جۆرێك عوسمان هەرچی هەبونی و خۆشی هەیە بەهۆی ئەو كارەساتەی كە بەسەری داهات كە لە هەموویان ناخۆشترنەمانی پەیوەندی خزمایەتی بوو، لەگەڵ پێغەمبەردا بەهیچ شتێك دڵخۆش وئاسودە نەدەبوو: هەردەم پەژارە و دڵتەنگی دایگرتبوو: بۆیە پێغەمبەر كە بەو شێوەیە عوسمانی دەدیت زۆربۆی بە پەرۆش بوو: پرسیاری لێكرد ها عوسمان بۆ بەو جۆرە پەژارە و ماتەمینی دایگرتوی و، لە ڕوخسارتدا ڕووناكی و خۆشی نابینم؟حەزرەتی عوسمان فەرمووی: ئەی پێغەمبەر ی خودا ئەو بەڵاو كارەساتەی كە بەسەرمندا هاتووە، بەسەر كەسیتردا

هاتووە؟! ئەمن خۆشەویست ترین هاوسەرم، کچی گەورەترین پێغەمبەروﷺ، خۆشەویستترین هاورێ و سەروەرم، کۆچی دایی کردووەو، پەیوەندی خزمایەتی نێوانمانی لەیەك هەڵوەشاندو، پشتی شکاندم. پێغەمبەری ﷺ خودا دڵنەوازی عوسمانی کردوو پرسەی کۆچی هاوسەرەکەی پێراگەیاندوو: هەر لەو کاتەدا کچێکی تری بە ناوی (ام کلسوم) لێمارە بڕی.ئەو غەم و ناسۆرەی لەدڵی عسماندا لابردووڕەواندیەوە.حەزرەتی عسمان هەتا لە ژیاندا بو ولەگەڵ ئەوهاوسەرە بەڕێزەیدا ژیانی بردەسەر تاکۆچی دوایی کرد. وە بەهۆی ئەوەی کە حەزرەتی عوسمان بۆتە هاوسەری دووکچی پێغەمبەرﷺ(ڕوقیەو، ام کلسوم)ناودەبرابە(ذی النورین) واتە: خاوەنی دوو ڕووناکی.وە لە هیچ سەرچاوەیەکی ترەوە نەزانراوە کە پێغەمبەرﷺ دوو کچی لەکەسی تر مارە بڕابێت.

## من لەوانە نیم کەکسێکی تر بەسەرتۆدا هەڵبژێرم

## ماأنا بالذی أختارعلیك أحدا

دایکی (زەید) لەگەڵ کوڕەکەیدا بەمەبەستی سەردانو دیدەنی بۆ ناو خزم و کەسەکانیان ڕۆیشتن بۆ لای هۆزی (بەنی معن) لە ڕێگا چەند سوارێکی هۆزی (قینی کوڕی جسر)یان توشهات، هەرچەند کە (زەید) منداڵ بوو بەڵام گرتیانو لەگەڵ خۆیاندا بردیان، لەبازاڕی (عکاظ) بە (حەکیمی کوڕی حزام)یان فرۆشت بە(٤٠٠) چوار صەد درهەم بۆ (خەدیجەی کچی خوەیلد) کە دایکی موسڵمانانو هاوسەری پێغەمبەریﷺ خودابوو، (خەدیجە)ش ئەو منداڵەی بە پێغەمبەرﷺبەخشی کەتەمەنی(٨)هەشت ساڵانە بوو. باوکی (زەید)کە هەواڵەکەی پێگەیشت زۆر غەمبار و نا ئارام بوو هەموو هەوڵ و کارێکیان بەکارهێنا کە بزانن کوڕەکەیان چی لێ هات و بەرەوکوێ بردیان: لە دوای ماوەیەك کۆمەڵە خەڵکێکی هۆزی (کلیب) ڕۆیشتن بۆ بەجێهێنانی واجباتی حەج، چاویان بە(زەید)کەوتو ناسیانەوەو، ئەوانیش خۆیان پێناساند: لە دوای گەڕانەوەیان بۆ وڵاتەکەیان. ڕۆیشتنە لای باوکی (زەید) و هەواڵەکەیان پێراگەیاند کە کوڕەکەیان لە کوێیە و لەکوێ دیویانە. باوکی زەیدیش ئاگری جەرگ هەڵیگرتو، ڕێگەی (مەککە)ی

گرتەبەر. لەگەڵ گەیشتنی بەمەکە پرسیاریان لە پێغەمبەری ﷺخودا کرد کەماڵیان لە کوێیە: هەواڵیان پێدا کە پێغەمبەر والە مزگەوتە. ئەوانیش بەرە و مزگەوت رێگەیان گرتەبەر: کە گەیشتنە خزمەت پێغەمبەرﷺ بەگریانەوە دەپارانەوە و گوتیان: ئەی کوڕی عبدالمتلب، ئەی دانیشت و جێنشینی حەرەمی مەککەی پیرۆز، ئەی گەورە و بەڕێزی هۆزەکەت ، بیستومانە ئێوە بە سۆز و بەزەیین بەرامبەر بە بەندەیی و گیراوان، ئازادکاری مرۆڤەکانن، بە بەزەیی و سۆزنو، خواردن بەدیلو گیراوان دەدەن. ئێمەش هاتوین بۆلای بەڕێزتان منداڵێکمان لەلاتانە، پیاوەتیو گەورەیی و، بەخشندەیی خۆتانمان بەسەردا بڕێژنو، ڕەفتاری چاکوباشمان لەگەڵدا بەکاربهێننو ، کورەکەمان بۆ ئازاد بکەنو بماندەنەوە، وە بەرامبەری ئازاد کردنەکەشی هەرچی داوابکەن پێتان دەبەخشین.
پێغەمبەرﷺفەرمووی: ئێوە کێتان مەبەستە؟ ئەوانیش گوتیان (زەیدی کوڕی حارس)ە پێغەمبەرﷺفەرمووی:چیتان دەوێت پێتان دەدرێت، فەرمووی: بڕۆن زەید بانگ بکەن بابێتو، سەر پشکی بکەن لە ڕۆیشتنو، مانەوەی بە ئارەزوی ئەوبکەن، کێ هەڵدەبژێرێ. کە ئێوەی هەڵبژارد ئەوە بۆ ئێوەو، من هیچ پاداشتێکم لە ئێوە ناوێت، وە ئەگەر منیش هەڵبژێرێت، ئەوە سوێند بەخودا لەو زیاتر هیچ شتێکی تر هەڵنابژێرم پێغەمبەرﷺ فەرمانی کرد بڕۆن زەید بهێنن کاتێ زەیدهات پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوانە دەناسی کێن؟ زەید گوتی:بەڵێ ئەوەیان باوکمە و ئەوەشیان ماممە: پێغەمبەرﷺفەرمووی: زەید تۆمن دەناسیو دەزانی هاوڕێیەتیم لەگەڵ تۆ چۆنە؟ ئەتۆش بۆخۆت سەرپشکی بەئارەزوی خۆت کێ هەڵدەبژێری؟
زەید گوتی: بەخودا هیچ کەسێك بەسەر تۆدا هەڵنابژێرم، تۆ بۆمن لەجێگەی باوکمو، مامو، هەموو کەسێکمی!.باوكومامی هاواریان کردو و گوتیان: ئەی هاوار زەید ئێمە لەداخی تۆئارامماں لێ هەڵگیرا بوو لەبەر تۆ ژیانمان پڕ لەداخ و ناسۆری بوو هەتا سۆراخی تۆمان کردووە و لەوڕێگا دوورەوە بەدوات داهاتوین ئێستاش تۆ بەندایەتی و دەربەدەری هەڵدەبژێری، بەسەر ئازادی و گەڕانەوەت بۆ لای باوکتومامتو خانەوا دەکەت. زەید گوتی: بەخواباش بزانن ئەوەی من لەو پیاوەم دیوە هەرگیز ئامادەنیم کارێکی وابکەم کەهیچ کەسێکی تر بەسەر ئەو دا

هەڵبژێرم، پێغەمبەر لەوكاتەدا ڕۆیشتەلای حجر و فەرمووی: بە شاهیدبن زەیدكوری خۆمەو، پاشماوەی (یرات)لێم دەگریٚو، منیش میرات پاشماوەی لێدەگرم. ئەو ڕووداوەش لەپێشی پەیامی پێغەمبەرایەتی بوو. ئینجا لەدوای ئەوڕووداوە باوكو مامی بەخۆشیو دڵنیاییەوە گەڕانەوە بەرەومالّو نیشتیمانی خۆیان. ئینجا لەدوای ئەوە پێغەمبەر ﷺپەیامی پێغەمبەرایەتی بۆهاتو، ئەو ئایەتەش دەربارەی زەید هاتە خوارەوە. ﴿ٱدۡعُوهُمۡ لِأٓبَآئِهِمۡ هُوَ أَقۡسَطُ عِندَ ٱللَّهِ﴾الاحزاب/٥. چونكە لەپێشی هاتنی ئەو ئایەتە زەیدیان بەكوڕی محمد ناودەبرد: بەڵام لەدوای ئەوە زەید یان بەناوی باوكیەوە ناودەبرد دەیانگوت زەیدی كوڕی حارس.

## ناسیو هۆگری بوو

## عرفت فالزم

دەگێرنەوە(حارس)گەنجێكی موسڵمانی لەخودا ترس بوو: كاتێك نەخۆشبوو، پێغەمبەری ﷺخوداسەردانی لێكردو، فەرمووی: ئەی(حارس) ئەمشەو چۆنت ڕۆژكردەوە؟ گوتی: سوپاس بۆ خودا كە باوەڕی تەواوم پێی هەیە. بەڵام پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی حارس هەموو گوتەیەك ڕاستیو حەقیقەتێكی هەیە:پێم بڵێ ڕاستی باوەڕی تۆ چییە؟ حارس) گوتی: ئەی پێغەمبەریﷺ خودا ئەو شەوم بە بێخەوی كردەوە بە ڕۆژو، ئەو ڕۆژەشم بە تینوایەتی بردەسەر. دونیام لەبەر چاو زۆربێنرخو سوكەو، بەلامەوەهیچ بایەخی نییەو، بە ڕووگەوهەری ئەودوونیایەم هەموو لەلاوەك یەكە. وا هەست دەكەم كە لەسەر پردی سیرات بەندكراوم. وەلەگەڵ دانیشتوانی بەهەشت لەخۆشیو خۆشگوزەرانیدامو، لەگەڵ دانیشتوانی دۆزەخیشدا سزا و ئازار دەكێشمو، واهەست دەكەم بەرەو تەخت وعەرشی خودا سەر دەكەوم. پێغەمبەرﷺفەرمووی: بەڕاستی تۆ خوات ناسیوەو پابەنێ و هۆگری ببە. ئەوە بەندەیەكە كەخودای گەورە دڵ و دەروونی بەئیمانە وە ڕووناك كردۆتەوە.حارس گوتی: ئەی پێغەمبەریﷺ خودا دوعای شەهیدیم بۆبكە لەرێگای خودادا: پیغەمبەریشﷺ دوعای بۆ كرو و حارس بووبەیەكیك لەشەهیدانی (بەدر)لەدوای ئەوەدایكی لە فرسەتیكدا هات بۆلای

پیغەمبەروﷺگوتی:ئەی پێغەمبەری خوداﷺئەتۆ باش دەزانی کەمن چەندە حارسم خۆش دەوێت هەرگیز لەدڵم دا وون نابێت و لەبیرم ناچێتەوە.پێم بڵێ ئەگەر لەناو بەهەشتدایە بادڵ‌ودەروونم ئاسودە بێت‌وشادمان ببم. ئەگەر نەچۆتە بەهەشتیش هەواڵم پێبدە باهەتا لەژیاندام بۆی بگریەم، پێغەمبەر ﷺلەوەڵامیدا فەرمووی: حارس لەیەك بەهەشتدا نییەبەلکو لەچەندین بە هەشتدایە حارس لە بەهەشتی فردەوسی ئەعلادایە، ئەمجاردایکی حارس زۆرشادمان بوو هەستاو زۆر بەدڵخۆشی و پیکەنینەوە گەشایەوە بەرەو ماڵ و دەیگوت بەخ بەخ لەوخۆشیەی کە حارسی تیدائەی حارس خۆشی و شادی بۆ تۆ کە لەناو بەهەشتدای.

## ئەوە ڕاخەری پێغەمبەری ﷺخودایە

## هذافـراش رسول اللهﷺ

دەگێڕنەوە (ئەبوسوفیانی کوڕی حەڕب) لە پێشی موسڵمانبوونی هاتە مەدینەو ڕۆیشتەماڵی پێغەمبەری ﷺخودا بۆلای کچەکەی (ام حەبیبە) کە هاوسەری پێغەمبەری ﷺخودا بوو: ویستی لەسەر ڕایەخەی پیغەمبەریﷺ خودا دابنیشێ (ام حەبیبە) خێرا ڕاخەرەکەی لولدا و هەڵیگرت. باوکی گوتی: کچم بۆچی واتکرت من بەڕاستی نازانم ڕاخەرەکەت بەمن ڕەوانەبینی، یان منت بەلاوە پەسندتر بوو. کچەکەی فەرمووی: ئەی بابە ئەو ڕایەخ ئی پیغەمبەری ﷺخودایەو تۆش لە هاوبەش پەیداکەرانی، ئەوانیش پیسن بۆیە نامەوێ تۆلەسەرڕایەخی پێغەمبەرﷺ دابنیشی. سەیرکەن ئەو هەڵوێستە خۆشەویستیەی بەرامبەر بە پێغەمبەری ﷺخودا هەیان بووە کەتەواوی دڵەکانیانی داگرتبوو بەجۆرێك لە سەرووی توانای ئادەمیزادەوە بووە لەکاتکێدا کە پێغەمبەرﷺ نموونەی تەواوی سەروەری هەموو ئادەمیزادەکانە بەتێکڕایی.

## ئەوانە لەگەڵ ئەوانەن کە خودا بەخشیشی بەسەردا ڕژاندوون
## فأولئيك مع الذين أنعم الله عـليهم

دەگێڕنەوە هاوڕێیەکی پێغەمبەر ﷺبە ناوی (سەوبان) زۆری پێغەمبەر ﷺخۆشدەویست تواناى خۆڕاگرتنی دووری لە پێغەمبەری ﷺنەبوو .ڕۆژێك هاتە خزمەت پێغەمبەریﷺ خودا زۆر بە بێ هێزیو، لاشەیەکی لاوازو، ڕووخسارێکی زەردو هەڵبزڕکاو، پێغەمبەرﷺ پرسیاری لێکرد ئەی(سەوبان)چی بووە بۆ بەوجۆرە خەماوییو، ناسۆریەت دەبینم ئازاری کوێت هەیە؟ ئەویش لەوەڵام داگوتی: ئەی پێغەمبەری ﷺخودا بە خودا هیچ ئازاری جەستەو لاشەم نییە. بەڵام هۆی کەم دیتنی تۆ وام لێدەکات کە بێهێز و بێتاقەت ببم ، دووری تۆ یەوا دەکات هەست بە تەنیایی بکەم .ئینجا لەسەر ئەوحاڵە شەوە بیری دواڕۆژم کردەوە کە من ئێوە نابینم، چونکە ئەگەر بڕۆینە بە هەشتیشەوە ئەوا پلەو پایەی ئێوەی پێغەمبەرانعليهم السلام لە پلەی ئێمە بەرزتر و گەورەترە هەرناتان بینین: بۆیە بەوجۆرەم لێهاتووە.ئینجا لەو کاتەدا ئەو ئایەتەهاتە خوار کە دەفەرموێ: {وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَـٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّـٰلِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُوْلَـٰٓئِكَ رَفِيقًا النساء/٦٩ واتە: هەر کەسێك تەقواکارو خۆپارێز بێتو فەرمانەکانی خوداو پێغەمبەری مەزن بەجێ بگەیەنێ ئەوە ئەوانە لە ڕۆژی دوایی لە بەهەشتدا لەگەڵ پێغەمبەران و شەهیدان وپیاو چاکاندا ژیان دەبەنەسەر ئای بەڕاستی ئەوانە هاوڕێو دۆستی چاكو باشیان هەیە.

## هەمووکارە ساتێك لەدوای تۆ بچوکە ئەی پێغەمبەری خودا
## كل مصيبة بعدك صغيرة يارسول الله

دەگێڕنەوە ئافرەتێکی ئەنصاری لە جەنگی (ئوحود) باوكو، براو، هاوسەرەکەی شەهید دەکرێنو، دەکوژرێن :کاتێ ئەوهەواڵو کارەساتە دڵ تەزێنەی پێدەگات : هیچ خۆی تێکنادات و، لەوەڵامدا دەڵێت :ئەدی پێغەمبەری خودا چۆنە ؟هیچی بەسەرهاتووە؟ دەڵێن، سوپاس بۆ خودا پێغەمبەر ﷺ تەندروستی باشو

سەلامەتە. ئافرەتەکە دەڵێ ، توخودا پیشانم بدەن بادڵم ئاسودە بێت: کاتێ پیشانی ئەدەن چاوی پێدەکەوێ:لەناخی دڵیەوە هاوار دەکاتو، دەڵێت :بەڕاستی هەموو کارەساتو ناخۆشیەك لەدوای تۆ سوكو، ئاسانو، بچوکە ئەی پێغەمبەری ﷺخودا.

## خۆشەویستی هاوەڵان بۆ پێغەمبەرەکەیان

## محبة الصحابة لنبيهم

کاتێك دانیشتوانی (مەککە) (زەیدی کوڕی دەسەنە)یان لە حەڕەمی کەعبە هێنایەدەر بۆ ئەوەی بیکوژن (ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب)گوتی: ئەی زەید سوێندت ئەدەم بەخودا :حەزت نەدەکرد ئێستا محمد لەجێگەی تۆدا بایەو، ئەتۆش لەناو خانە وا دەی خۆت دانیشتبای؟ لەوەڵامدا زەید گوتی: سوێند بە خودا من حەز ناکەم پێغەمبەر ﷺلەو جێگەیەی کەلێیەتی، تەنها یەك دڕوکیشی بەلاشەی دابچێو، منیش لەناو خێزانم دابنیشم :ئینجا ئەبوسفیان گوتی:بەخودا هیچ ئادەمیزادێکم نەدیتووە لە ناو هەموو ئادەمیزادەکاندا کەکەسێکیان خۆشبوێ: وەكو خۆشەویستی هاوڕێکانی محمد بۆ محمد.

## بەیانیدەگەینە خۆشەویستان

## غدا ألقى الاحبة

دەگێڕنەوە کاتێ بیلالی حەبەشی ﷺنەخۆشیەکی زۆر سەختی گرتو، هیوای ژیانی لێنەدەکراو، خەریکی گیانەڵا بوو:خزمو خانەوادەکەی لەسەری دەگریانو، هاواریان دەکردوو دەیان گوت :ئەی هاوار بۆ بیلال:بەڵام بیلال کە تۆزێك توانای وەڵامدانەوەی مابوو زۆر بەخۆشیوشادیەوە دەیگوت :تو خودا ئێوە وا مەکەن بەڕاستی ئەمڕۆ من لەخۆشیەکی زۆر خۆشیدام کەخودا گیانم بکێشێ بۆ بەیانی من دەڕۆمە لای تاکە خۆشەویستەکەم و هاوڕێ بەڕێزەکانی، ئینجا بەڕاستی ئازار و ناخۆشی مردن لەگەل خۆشیوشادی هیوای بەیەکگەیشتنو تێکەڵاو بوون، ناخۆشی لەبیر بردبونەوە .وە تام وشیرینی خۆشی باوەڕ کە لە فەرموودەکانی

پێغەمبەرﷺدا ئامارژەی پێکراوە ڕەنگ دەداتەوە، کەدەفەرموێ):ثلاث من كن فيه وجد حلاوةالأيمان أن يكون الله ورسوله أحب إليه من سواهما وأن لايحب المرءلا يحبه إلا لله وان يكره أن يعود في "الكفر كمايكره أن يقذف في النار) رواه البخاري، ومسلم، واحمد، وغيرهم.

## دڵ خۆشەویستی ئەو كەسە ڕای دەكێشێ كە چاكەت لەگەڵ دادەكات

## جبلت القلوب على حب من أحسن إليها

دەگێڕنەوە (جەعفەری کوڕی محمد)ﷺ ئادەمیزادێکی قۆشمە و گاڵتەباز بوو :بەلام کاتێ ناوی پێغەمبەریان ﷺلەلا دەهێنا ڕەنگی زەرد دەبوو، زوبانی وشك دەبوو، دەستی دەکرد بەگریان فرمێسی چاوی دەڕشست، هەتا ئاوی چاوی وشك دەبوو. ئەوە یەكێك بوو لەوانەی محمدیان زۆرخۆش دەویست.خۆشەویستیەك كە خورشت و خۆراکی دڵەکانو، خواردەنی گیانو، ڕووناكی چاوەکان بوو، تەنانەت خۆشەویستیەکەی خۆشی تەواوی ژیان بوو. بەڕاستی کەسێك لەوجۆرە خۆشەویستیە بێبەش بێت، ئەوە لە ڕیزو کۆمەڵی مردوانە، چونکە خۆشەویستی ڕووناکیە: دیارە هەر کەسێ نەی بێت ئەوە لە تاریکی و شەوەزەنگیدایە . خۆشەویستی تەندروستیو لەش ساغیە: هەر کەسێ نەی بێت ئەوە تەواوی ژیانی لە نەخۆشی و تاداری و بەدبەختیە . وە جێگەی سەرسووڕمانیش نییە ، کە تەواوی ڕاکێشانی خۆشەویستی دڵ لەسەرخۆشەویستی چاکترین کەسێك کە چاکەی لەگەڵدا کردووە.

## گیان فیداکردن و تێکۆشان لە ڕێبازی خودا و پێغەمبەرەکەی

## التضحية في سبيل الله ورسولة

دەگێڕنەوە موسعەبی کوڕی عەمیرﷺهاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەریﷺ خودا ڕۆیشتەلای کۆمەڵێك لەبرایانی دینی کە لەلای پێغەمبەرﷺ دانیشتبوون کۆڕیان بەستبوو: کە چاویان بەمصعب ﷺکەوت سەریان دانەواند و چاویان تروکاند و فرمێسك لەچاوەکانیان دەڕژا. لەبەر ئەوەی بەرگێکی شڕو، دڕاو، پینەکراوی

لەبەردابوو: لەكاتێكدا كە لە پێشی موسڵمان بوونی كامە بەرگو، پۆشاكی جوانو، نایابە لەبەری دابوو: لەبەر ئەوەی كاتێ باوەڕی هێنا: دایكی زۆری لەگەڵ كرد كە پاشگەزو پەشیمان ببێتەوە: بەڵام چونكە موسعەب﷛ تامی باوەڕی چێشتبوو: هەرگیز تازە پەشیمان نابێتەوەو ، ناگەڕێتەوە سەر كوفرو بێباوەڕی.بەو بۆنەوەدایكی هەرچی نیعمەتو خۆشیو خۆشگوزەرانی هەیە، كە لەبەر دەستیدا بوو بێبەشی كرد .بەڵام، موسعەب ﷛لەدوای ئەو نەبوونیو هەژاریەی تازە هەستی بەخۆشی و شادی دەكات: چونكە وازی لە دار و بەرد پەرستن هێناوەو، گەڕاوەتەوە بۆلای پەروەردگار و بەدیهێنەری: بۆیە هەرچی سەروەتو ژیانی دونیا هەیە، بەلایەوە سوكو بێنرخو پوچە.

## ئەگەر ئەو قسەیەم لەباوكمەوە ببیستبایە بۆ پێغەمبەرم دەگێڕایەوە

## لوسمعت ابی لـقـلـت ذالك لرسول الله

دەگێڕنەوە لە جەنگی هۆزی (موستەلەق) بەهۆی جەنجاڵیو تێك چرمانەوە لەسەر ئاو، ڕووداوێك لەنێوانی كرێگرتەی عومەری كوڕی خەتاب﷛و هاوپەیمانانی خەزرەج ڕویدا بەجۆرێك كە كرێگرتەی عومەر لە هاوپەیمانەكەی خەزرەجیداو، بریندراری كردئەویش هاواری لەهۆزی خەزرەج كردوو:بانگی یارمەتیدەران (ئەنصار)ی كردو، كرێگرتەی عومەریش هاواری لە كۆچكردوەكان كرد .لەهەر دووك هۆزەكەدا كۆمەڵێكی زۆرخەڵكان كۆبوونەوە:چەك و سیلاحیان لەیەك دەرهێناو، بەرامبەری یەكتر ڕاوەستان. پێغەمبەر ڕۆیشتە لایانو ، فەرمووی :ئەوە چیتانە ئەو گەلە كۆمەكیە لە یەكتری دەكەن بەڕاستی ئەوە ڕەوشتی نەزانی جاهیلیەتی پێشی ئیسلامو دوا كەو توییە وازی لێبهێننو، دووربكەونەوە، ئەوەی ئێوە دەیكەن داوایەكی پیسو بۆگەنە عبداللەی كوڕی ئومەییەی كوڕی سەلول تورەبوو كە سەرۆكی دووڕو دەغەڵەكان منافقین بوو بەهۆی ئەوەی كەكۆمەڵێكی زۆری هۆزی خەزرەجی لەلابوو لەگەنجو بەتواناكان وەكوزەیدی كوڕی ئەرقەم گوتی، من هەرگیز بێدەسەڵاتیو زەلیلیو, ڕیسوایی وەكو ئەمڕۆم نەدیتووە: سوێند بێت كەگەڕاینەوە بۆ مەدینە دەبێ گەورەو ڕێز دارەكان، لەگەڵ

ڕیسواو بێدەسەڵاتەكان جودابكرێنەوە: لەو قسەیەیدا مەبەستی بەڕێز و گەورەكان بۆخۆی‌وهاوڕێكانی بوو، ڕیسواو بێدەسەڵاتەكانیش پێغەمبەرو ﷺیارانی بوو: لەدواییدا زەیدی كوڕی ئەرقەم ڕۆیشت‌و، هەواڵەكەی بەپێغەمبەر ﷺڕاگەیاند :بەڵام پێغەمبەرﷺ ئەوقسەیەی زۆر بەگرنگ وەرنەگرت‌و فەرمووی : ئەی جەوان واهەست بكەم تۆلە عبدالله توڕەبی ، یان بەخەراپ لێی تێگەیشتووی بۆیە هاتوی وادەڵێی؟ زەید گوتی: بەخودا توڕەنیم و بۆخۆم لەوێبووم، گوێم لێی بوو كەوایگتوو. زۆرباشیش حاڵی بووم :بەڵام پێغەمبەرﷺ باوەڕی پێنەكردو، زەید گوتی: دوای ئەوەی كەپێغەمبەر ﷺباوەڕی پێنەكردم‌و بە درۆزنی دانام زۆر غەمبارو بێئارام بووم : مامم پێی گوتم ڕۆڵە هیچ شتێكیتر نەبوو بیكەی، درۆلەگەڵ پێغەمبەردا نەبێ . زەید لە وەڵامدا گوتی : بەخودا درۆم نەكردووەو، ئەو قسەیەشم لەدەمی خۆی بیست : وەئەگەر باوكیشم ئەو قسەی بكردبایە بە پێغەمبەرم ﷺدەگوت :ئێستاش من ئومێدەوارم لەخودای گەورە كەشتێك بۆ پێغەمبەر ﷺبنێرێ ، ڕاستی قسەكەی منی بۆ دەركەوێ .لەدواییدا پێغەمبەر ﷺجێگۆڕی بە خەڵك‌وئامادەبوان كرد، بۆ ئەوەی لەو گوتەو ووړتە ورتانەو، قسەو باسانە دووریان بخاتەوە .ئینجا لەدوای ئەوە زۆری نەبرد كەخودای گەورە سوڕەتی (المنافقين)ەی ناردە خوارەوەو، پێغەمبەرﷺبە بناگوێی زەیدی داچرپاندو فەرمووی : ئەی جەوان بەڕاستی تۆ گوێت لە قسەكانی عبدالله بووەو بیستوتەوە خودا قسەكانی بەڕێزتی بەڕاستگێڕاوەو، دووڕو دەغەڵەكان درۆیان كرد.

## سوهەیب قازانجی كرد

## ربح صهيبﷺ

دەگێڕنەوە كاتێ (سوهەیب)ﷺی ڕۆمی ویستی كۆچ بكات: بێ باوەڕانی قوڕەیش پێیا گوت: ئەی سوهەیب ﷺكە تۆ هاتی بۆ ئێرە ڕیسواو هەژارو گەدابووی هیچت نەبوو .لەلای ئێمە سەروەت‌و سامانت زۆر بوو دەوڵەمەند بووی، گەیشتیە ئەوپلەو پایەی كەپێی گەیشتووی: ئێستاش تۆ دەتەوێ بەو هەموو سەروەت‌و سامانەتەوە بڕۆیی‌و، بەسەلامەتی بۆیدەرچی؟ سوێند بەخودا ئێمە ناهێڵین ئاوا

بەئاسانی بۆی دەربچی؟ سوهەیب گوتی ئەگەر هەموو سەروەتو سامانەکەم بۆ ئێوە بێ، ڕێگەم پێدەدەن بڕۆم؟ ئەوانیش گوتیان: بەدڵنیاییەوە ڕێگەت پێدەدەین. سوهەیب ﷺگوتی: باشە با هەموو ماڵ و سامانەکەم بۆ ئێوە بێت: بەو شێوەیە سوهەیب ﷺهەموو ماڵو سامانەکەی بۆ بەجێهێشتن و کۆچی کردوو ڕۆیشت . کاتێ ئەو هەواڵە گەیشتەوە بە پێغەمبەرﷺ .فەرمووی: بەڕاستی سوهەیب ﷺ قازانجی کرد بەڕاستی قازانجی کرد.

## پیاو لەگەڵ ئەوکەسەدایە کەخۆشی دەوێت

## المرء مع من أحب

پێغەمبەریﷺخودا هەموو کاتێك لە نزاو پاڕانەوەکانیدا دەیفەرموو :اللهم ارزقني حبك وحب من يحبك وحب من يقربني إلى حبك، وجعل حبك أحب إلى من الماء البارد.

پیاوێکی عەرەبی بیابان گوتی :ئەی پێغەمبەریﷺ خودا کەی ڕۆژی قیامەت دێت؟ پێغەمبەرﷺلەوەلامیدا فەرمووی:چیت بۆ ئەو ڕۆژەی ئامادەکردووە؟ کابرای دەشتەکی گوتی: بەخودا هیچ کردەوەیەکی باشم ئامادە نەکردووە و نییمەو، نەڕۆژو نوێژیشم زۆرکردووە:تەنهائەوەی کەمن بۆئەوڕۆژەئامادەم کردبێت، خوداو پێغەمبەریﷺ خودام زۆرخۆش دەوێت.پێغەمبەر ﷺزەردەیەکی پێکەنینی کردو، فەرمووی:ئینسان حەشرو کۆبوونەوەی لەگەڵ ئەو کەسەدایە کە خۆشی دەوێت.

رواه البخاري ، ومسلم، واحمد في مسنده

## بوکی ژێر پەردەی بوکێنی دەڕواتە بەهەشت

## زفاف إلى الجنة

دەگێڕنەوە سعدی سەلیمیﷺبەندەیەکی ڕەشپێست بوو: باوەڕێکی تەواوی هەبوو، بەردەوام بۆ نوێژەکانی دەڕۆیشتە مزگەوتو، لەخزمەت پێغەمبەردا ﷺ دەنیشتو کۆڕیان لە دەورەی دادەبەستو، گوێیان لە ووتارو فەرمایشتەکانی دەگرتو، لەبارەی دینەوە پرسیاریان لێدەکرد، جارێکیان سەعدﷺ هەستاو گوتی: ئەی پێغەمبەریﷺ خودامن پیاوێکی ڕەشپێستم و ڕوخسار بەرز و نزمی

ناشیرینم، ئایاڕێگەی چونە بەهەشتم لێناگرێت ؟پێغەمبەرﷺفەرمووی: سوێند بەوكەسەی كە گیانمی بەدەستە، تۆ چۆن خۆیا ڕێزیت كردووە و خودات پەرستووەو، باوەڕت بە بەرنامە هێناوە كەخودا بۆ محمدیﷺ ناردووە، ئەویش گوتی: دانم بەوەدا هێناوەكە هیچ خودایەك نییە تەنها خودای بە توانا و دەسەلاَت نەبێتو، وە محمدیش ﷺبەندە و نێردراوی خودایە، وەئامادەی ڕووداوی تێكۆشان لەپێناوی خودادابووم:چیم بۆ هەیە ئەی پێغەمبەری ﷺخودا؟ پێغەمبەر ﷺفەرمووی : ئەوەی بۆ ئەوگەلە هەیە لە خۆشیان و لەدژیان بۆ تۆش هەیەو، ئەتۆش برای ئەوانی.

سەعد ﷺووتی :ئەی پێغەمبەری ﷺ خودا من لە تەواوی ئەوانەی كە لێرە دانیشتوون یان لێرەش ئامادەنین داخوازیم لێیان كردوە. لەبەر ڕەنگی ڕەشو روخساری سوراویم وەلاَمیان نەداومەوەو ژنیان نەداومیّ. وە بەڕاستی منیش لە پیاوە وەجاغزادەو ڕەسەنەكانی هۆزی بەنی سلیمم. پێغەمبەرﷺپێی فەرموو: هەستە برۆ بۆ لای عەمری كوڕی وەهەب ﷺلەدەرگای بدە و ئاگاداریان بكەوەو، سەلامیان لێبكەو، لە دوای فەرموو كردن برۆ ژورەوەو، پێیان بلّیّ پێغەمبەریﷺ خودا منی ناردووە كە یەكێك لە كچەكانتانم لێمارە ببڕن : سەعدیش ﷺوەكو پێغەمبەر ﷺفەرمانی پێكردبوو ڕۆیشتو, گەیشتە مالّیانو زۆریان بەخێر ێناو فەرمانەكەی پێغەمبەری پێڕاگەیاندن .كە یەكێك لە كچەكانی لێمارە ببڕن. بەلاَم عەمر زۆر بە شێوەیەكی ناشیرین وەلاَمی دایەوە :بۆیە سەعدیش ﷺلەمالّ هاتەدەرو بەرە و لای پێغەمبەرﷺ گەڕایەوە : كچەكەی عەمر كە لە پشتی دەرگاوە ڕاوەستابوو گوێی لەووتو وێژەكان بوو، كە باوكی توورەبوو، سەعدیش ﷺ گەڕایەوە هەر خێرا بەنهێنی باوكی لەژوور هاتەدەر و بە دوای سەعددا بەڕاكردن ڕۆیشتو، بانگی لەسەعد كردوو گووتی: ئەی عبدالله ڕاوەستەو بگەڕێوە دواوە : مادام پێغەمبەر ﷺتۆی ناردووە من ڕازیمو، لەسەر ڕەزای خوداو پێغەمبەرﷺ مارەم ببڕە؟ لەدوای بیركردنەوەیەكی تەواو، سەعد گوتی: بەڕاستی ڕەزابوونی ئەو كچە بەبیّ ڕەزابوونی باوكی هیچ توانا و سودێكی نییە :بۆیە نەگەڕایەوەو بەرە و لای پێغەمبەرﷺ ڕۆیشت .ئەمجار كچەكە بەخێرایی ڕۆیشتەوە لای باوكیو پێی

گووت: ئەی بابە خێرا کە برۆ بگە ئەو گەنجەو، برۆ بۆ لای پێغەمبەرﷺ بە داوایەکەی ڕازیبەپێشی ئەوەی فەرمان و پەیامی خودا لەو بارەوە دابەزێ و لەناو هەموو عەرەبدا ئابڕوت بچێ ، چونکە خودا دەفەرموێ:{وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَـٰلًا مُّبِينًا}الاحزاب/٣٦ واتە: هەرگیز بۆ هیچ ئادەمیزادیکی موسڵمانی پیاو بێت یان ژن، بۆیان دروست نیە لە بڕیارەکانی خودا و پێغەمبەری خودادا سەر پشکی بکات لە بەجێهێنانی فەرمانەکانی، وە هەر کەسێکیش سەر پێچی لەفەرمانەکانی خوداو پێغەمبەریﷺ خودا بکات ئەوە بەڕاستی گومڕاو سەر لێشێواوە.

ئینجا لەدوای ئەوەی کە عەمر بۆی ئاشکرا بوو کەکچەکەی لەو بارەوە بۆچونەکەی باشتر و ڕێکە، هەر خێرا هەستاو بەرەومالی پێغەمبەر ﷺکەوتە ڕێگا بۆئەوەی داوای چاو پۆشی لێبکات و فەرمانەکەی بەجێبهێنێ .بەڵام سەعد زووتر گەیشتەوەلای پێغەمبەروﷺ هەواڵەکەی پێڕا گەیاند .کاتێکیش عەمر گەیشتەلای پێغەمبەرﷺ پرسیاری لێکرد کەبۆچی وەڵامی سەعدیان بەباشی نەداوەتەوە؟ عەمر ﷺگوتی :ئێمە بۆیە بەرهەڵستیمان کرد لەوەترساین کە خەبەرەکەی بەڕاستی نەبێت !ئێستاش من بۆیە هاتووم بزانم و دڵنیابم ئایا داوایەکەی ڕاستە، یان نا .ئێستاش کە دڵنیابووم داوایەکەی ڕاستە، ئەوا کچەکەم لێی مارە بڕی، پێغەمبەریش ﷺپیرۆزبایی مارە بڕینەکەی لێکردوو فەرمووی :بڕۆبۆلای هاوسەرەکەت و چی پێویستە بیکەن و بڕۆنە پەردەوە .سەعد بەو هەواڵە زۆرخۆش حاڵبوو، بەخۆشیەوە ڕۆیشتەبازاڕ بۆئەوەی هێندێك کەل و پەلی پێویست بۆخۆی وسازدانی ئاهەنگی ژن گواستنەوەی ئامادە بکات .لەوکاتی دڵ خۆشی و شادیەی کەزۆرلەمێژە چاوەڕێی دەکات.لەناکاو گوێی لەدەنگێك دەبێت هاوار دەکات و دەڵێ ئەی سوارچاکانی ڕێبازی خودا ئەوانەی خۆشی و مزگێنی بەهەشت مەستی کردوون، ئامادەبن بۆ جیهاد و تێکۆشان بۆ شەڕلەپێناوی پارێزگاری لە ئاین و بەرنامەی خودا .سەعدی باوەڕدار بەبێ سڵەمینەوەو سستبوون ، کە ئایا خەریکی گواستنەوەی هاوسەرەکەی بێت کە چەندین وەختە چاوەڕێی دەکات، یان بڕوا بۆ جەنگ لەپێناوی بەرزبوونەوەی بەرنامەی خودا، هەر خێرا ڕووی

سووڕاندوو بەرە و مەیانی چەك و ولاّغ ڕێگەی گرتەبەر، ئەو پارەیەی کە ئامادەی کرد بوو بۆ ژن گواستنەوە بەولاّغ و چەك و زرێیداو خێرا خۆی گەیاندە هاوڕێیەکانی جەنگاوەری و ، هەتا مەیدانی جەنگ ڕانەوەستاو لەگەڵ بێباوەڕاندا دەستی کرد بەشەڕ و کوشتار، زۆر بەباشی وەك و سوارچاکێکی باش شەڕی کرد: لە دواییدا لەولاّغەکەی دابەزی و بەپیادە شەڕی دەکرد هەتا تەواو بێ هێزوپەکی کەوت، بەبێ هێزیەکی زۆرەوە ڕووی کردە شوێن و خەیمەکەی پێغەمبەرو ﷺ سەری لەسەر وەتاغەکەی پێغەمبەر ﷺ ناو گوتی: ئەوە ولاّغ و شیرو چەکەکەم بۆ هاوسەری دەزگیرانم بێت و، پێیان بڵێن بەڕاستی خوداهاوسەرێکی باشترو جوانتری پێبەخشیم لە کچەکەی ئێوەو، ئەوەش میرات و بۆ ماوەکانیەتی بۆ ئێوەو لە کۆتاییدا ئەوئایەتەی خوێندەوە کە خودا دەفەرموێ :{إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى مَقَامٍ أَمِينٍ. فِى جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ. يَلْبَسُونَ مِن سُندُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ مُّتَقَٰبِلِينَ. كَذَٰلِكَ وَزَوَّجْنَٰهُم بِحُورٍ عِينٍ}الدخان/٥١-٥٤ واتە: بەڕاستی ئەوانەی کە تەقواکار و خۆپارێزن لە ڕۆژی دواییدا لە جێگەیەکی زۆر خۆش و ئارامیدا ژیان دەبەنەسەر، لەناو باخ و باخاتی بەهەشتدا لەسەر کانی و کانیاوو تاڤگە و سەرچاوەی خۆش بەختی دەبەنەسەر و پۆشاك و بەرگی ئاوریشمی گران بەهاو تەنك و ئەستوور و جوان لەبەر دەکەن و، بەرامبەر بەیەك دادەنیشن وخۆشەویستی بەرامبەر بەیەکدەردەبڕن نوکتەو قسەی خۆش و نایاب لەگەڵ یەکتردا دەکەن و، کات بەسەر دەبەن.

## ئەی سەواد چشتێك پاڵی پێوەنای ئەوبکەی

## ماحملك على هذا ياسواد

جارێکیان پێغەمبەری ﷺخودا لە ڕۆژی بەدردا تیرێکی بەدەستەوە بوو یارەکانی بۆ خۆپیشاندان ڕیزدەکرد ئەگەر یەکێك لە ڕیزەکەدا خواریەکی تێدابایە بەو تیرە پاڵی پێوە دەنان و ڕاستی دەکردنەوە لەو کاتەدا پێغەمبەر بەلای سەوادی کوڕی غەزیەی هاوپەیمانی هۆزی (عودەی)کوڕی نەجاردا ڕۆیشت لەڕیزەکەیدا زۆر هاتبووە پێش وناڕێکی کردبوو، پێغەمبەریش ﷺبەو تیرە لەسکی داو پاڵی پێوەناو فەرمووی : ئەی سەوا دبڕۆدواوە ڕاستبە لەگەڵ ڕیزەکەدا، سەواد گوتی :

بەخودا ئەی پێغەمبەری ﷺ خودا زۆرئازارت پێگەیاندم، ئەدی تۆ بەڕەحمو ڕاستو دادگەر خودا نەی ناردووی! بەخوا كە دادگەربیت ئەمن دەمەوێ تۆڵەی خۆمت لێ بكەمەوە: بەڵێ بەڕاستی پێغەمبەری ﷺ خودا بەڕاستو میهرەبان و دڵسۆز و دادگەربووە و خاوەنی هەموو ڕەوشتێكی جوانو تەواو بووە . بۆیە هەر لەو كاتەدا پێغەمبەر ﷺسكی ڕووت كردوو فەرمووی: ئەی سەواد وەرە تۆڵەی خۆتم لێبكەوە؟ سەواد هەر خێرا پەلاماری پێغەمبەری ﷺداو باوەشی پێداكردو و سكی ماچ كرد، پێغەمبەرﷺفەرمووی: ئەی سەواد بۆچی وات كرد؟سەوادیش گوتی: بەخودا ئەی پێغەمبەری ﷺخودا ویستم لەو دواكاتانەی ژیانم پێستو لاشەم بەلاشەی تۆوە بنوسێ بۆ ئەوەی ڕەحمو میهربانی خودام بەركەوێ، پێغەمبەریش ﷺدوعای چاكە و خێری بۆكرد.

## ئەی خودایە لە ڕۆژی دواییدا ئەبوبەكر بگەیەنە پایەی من
## أللهم إجعل أبابكرفي درجتي يوم القيامة

دەگێڕنەوە كاتێ پێغەمبەرﷺویستی كۆچ بكاتبەرەو مەدینە بهاوڕێیەتی ئەبوبەكری ڕاستگۆی خۆشەویستی، لەڕۆیشتنیان پەنایان برد بۆ ئەشكەوتی سەور پێغەمبەر ﷺزۆربەباشی توانای ڕۆیشتنی بۆ ئەو ئەشكەوتە نەبوو چونكە زۆر بەرزو بەرداوی تیژ بوو، بەقاچی پێپەتی وڕووتی ڕۆیشتنو هەموو قاچەكانیان قەڵشو بریندار‌بوو، كاتێ ئەبوبكر ﷺچاوی بە پێغەمبەرﷺكەوت تواناو هێزی تێدا نەماوە، ئەبوبكر ﷺڕۆیشتە بن شانی پێغەمبەرو ﷺیارمەتی دەداهەتا گەیشتنە بەر دەركی ئەشكەوتەكە، پێغەمبەر ﷺویستی خێرا بڕواتە ناو ئەشكەوتەكە بەلاّم ئەبوبكرﷺ نەی هێشت لە پێشەوە بڕواتە ژوور هەتا بۆ خۆی لە پێشەوە نەڕوات، ئینجا ئەبوبكر ﷺڕۆیشتە ژوور بەتەواوی ئەشكەوتەكەی پشكنیو چەند كونو كاژێرێكی تێدابوو كراسەكەی پارچە پارچە كرد ، كونەكانی پێگرت، دوو كون لەلای یەك مابوونەوە، بەلاّم هیچ نەما پێیان بگرێ بۆیە دانیشتو، بەهەردووقاچەكانی كوونەكانی گرت، لەبەر ئەوەی نەبادا زیندەوەری زیان بەخشی تێدا بێتو زەرەرو ئازار بە پێغەمبەر ﷺبگەیەنێ، ئینجا

لەدوای ئەوە بانگی پێغەمبەریﷺ كرد فەرموو: وەرە ژووری؟ پێغەمبەرﷺ زۆر هیلاك و ماندووبوو سەری لەسەر ڕانی ئەبوبكر داناو خەوی لێكەوت .وەبەڕاستی ترسی حەزرەتی ئەبوبكرﷺلەزیندەوەران ڕاستبوو، زۆری نەبرد لە یەكێك لەودوو كونانەوە مارێك بە قاچی ئەبوبكرﷺیەوەداو، زۆری ئازار پێگەیاند بەڵام ئەبوبەكر قاچی نەجوڵاند بۆ ئەوەی پێغەمبەرﷺبەخەبەر نەبێتەوە، هەم مارەكەش لەو كونە نەیەتە دەرەوە، بەڵام ئێشو ئازار زۆری بۆ هێنا و فرمێسكی چاوی هاتە خوارو بە بەر ڕووخساری پێغەمبەرﷺكەوتو، بەئاگا هاتەوە فەرمووی: ها ئەبوبكرﷺ چی ڕوویداوە؟ ئەبوبكریشﷺ فەرمووی: دایكم و باوكم بەفیدات بێ مار پێوەیدام پێغەمبەرﷺبەتف دەرمانی جێگای پێوەدا نەكەی كردوئازاری نەما. ئینجا كاتێ ڕۆژ بۆوە و تیشكی ڕۆژ لەناو ژووری ئەشكەوتەكەیدا، پێغەمبەرﷺ سەیری ئەبوبەكری ﷺكرد ئەوكراسەی كەدوێنی لەبەری كرد بوو هیچی لەبەردا نەمابوو، فەرمووی: ئەبوبەكر كوا كراسەكەی لەبەرت دابوو، فەرمووی: ئەی پێغەمبەری ﷺ خودا شەو هەموویم كەرت كەرت كردوو، ئەوكونانەی ئەشكەوتەكەم پێگرت.پێغەمبەرﷺدەستی بۆ ئاسمان بەرزكردەوە و فەرمووی: خودایە ئەبوبكرﷺ بگەیەنە دەرەجە و مەرتەبەی من لە دوا ڕۆژدا.

## من وماڵەكەم بۆ خوداو پێغەمبەری خودایە

## أنا ومالي لله ولرسوله

دەگێڕنەوە كاتێ پێغەمبەری ﷺخودا كە دەڕۆیشتە سەفەر كۆتا كەسێك كە پەیوەندی پێوە دەكرد فاتمەی زەهرابوو، وەلەدوای گەڕانەوەی لە سەفەرەكەشی یەكەمین كەس كە پەیوەندی پێوە دەكرد هەر فاتمەی زەهرابوو كەزۆری خۆش دەویست و بەزەیی زۆرپێدا دەهاتەوەو، بەبێ فاتمە تواناوئارامی لێ هەڵدە گیراو، هێزی تێدا نەدەماو، هەردەم لەیاد و بیریدابوو .ئینجا لەدوای شوكردن و دەرچونی لەماڵی پێغەمبەرﷺدا هەموو ڕۆژێك پێغەمبەرﷺدەڕۆیشت سەری لێدەداو، پێیدەوت بەخودا فاتمە بەبێ تۆ بێئارامم دەت هێنمەوە لای خۆم : فاتمە گوتی : لەو بارەوە لەگەڵ حارسەی كوڕی نەعمانﷺ قسە بكە بۆ گەڕانەوەم

پێغەمبەرﷺ فەرمووی :حارسە لە ئێمە جیاواز بۆتەوە بۆیە بەخودا من شەرم دەکەم پێی بڵێم :ئەوقسەیە گەیشتەوەبەحارسە، ئەویش هەستاو بەرەولای پێغەمبەر ڕۆیشتو، گوتی: ئەی پێغەمبەری ﷺخودا بیستومە کەفاتمە دەهێنیەوە لای خۆت، ئەو جێگەو خانوەی نیشتەجێی خۆم، کە باشترین و نزی ترین خانوی هۆزی بەنی نەجارییانە لەماڵەکە ئێوە، بۆ تۆ بێت فاتمە بێتەناوی، بەڕاستی من خۆم و ماڵکەشم بۆ خوداو پێغەمبەری ﷺخودایە، وەسوێند بەخودا هیچ دڵم پێوەی نییە :وە ئەو شتەی کە تۆ لێم وەردەگری زۆر لەو ماڵە پێخۆشترە کە لە لای خۆم دەمێنێتەوە و تۆناتەویٚ! پێغەمبەر ﷺزۆردڵخۆش بووبەوفەرمانەیو، فەرمووی: ڕاست دەکەی ئەی حارسە خودا خێر و پیرۆزیت بە سەردا بڕێژیٚ، پێغەمبەر ماڵی فاتمەی گێڕایەوە بۆ خانووی حارسە.

## کیٚ هەیە بۆ ئەو شەهیدانە بگریا لە دوای ئەو مزگێنیە گەورەیە؟

## ومن يبكى عليهم بعد هذا

دایکی سەعدی کوڕی موعازﷺلەدوای جەنگی ئوحود بەدوای پێغەمبەرﷺدا دەڕۆیشت وغاری دەدا کوڕە بچکۆلەکەشی سەعد بەجەڵەو و هەوساری ولاغەکەی داکرد بوو، سەعد گوتی: ئەی پێغەمبەری ﷺخودائەوەدایکمە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: سەلاٚو لەدایکت ، دایکی ڕۆیشتە پێشەوە هەتا لە پێغەمبەرﷺ نزیك بۆوە وبۆی دەرکەوت کەبەڕاستی پێغەمبەرﷺسەلامەتە و تەندروستی زۆرباشە ، گوتی:بەڕاستی ئەی پێغەمبەری ﷺخودا کەتۆم بە ساغ و سەلامەتی چاوپێکەوت سوپاس بۆخودا هەموو ناخۆشیو کارەساتەکانم لە بیرچۆوە، لەدوای سەلامەتی تۆ هەموو کارێك سوكو اسانە، پێغەمبەرﷺدڵی ئەو ئافرەتە بەڕێزەی دایەوەو، پرسەو سەرەخۆشی شەهید بونی عەمری کوڕی سەعدی ﷺهاوسەرییو، کوڕەکەی لێکرد. ئینجا فەرمووی : ئەی دایکی سەعد مزگێنییو شادمانی بێت بۆ خۆت و خزمو خانەوادە کەشت بە ڕاستی هەموو شەهیدو کوژراوەکانت لە بەهەشتدا پێکەوە کۆبوونەوە کە ژمارەیان(١٢) دوانزە شەهیدبوون، بۆ کەسو کارو خانەوادەیان دەپاڕێنەوە. ئینجا دایکی سەعدﷺگوتی:ئێمە بە پێغەمبەرا یەتی پێغەمبەری خودا ﷺقایل و ڕازین، کیٚ هەبێت لەدوای ئەو موژدە گەورەیە بۆ کوژراو شەهیدەکان بگریا؟!

# ئەی ئەبا بەکر مەگریە

# لا تبك یا أبابكر

لەئەبی سەعیدی خودریەوە ﷺ دەگێڕنەوە فەرموویەتی: پێغەمبەری ﷺ خود لەکاتی نەخۆشی مردنیدا بووسەری پێچابوو، ڕۆیشت هەتا سەرکەوتە سەر مینبەرەکەی و، فەرمووی: من لەو ساتانەدا دەڕۆمە سەر کانیا و حەوزەکەی کەوسەرم ڕادەوەستم .بەندەیەك کە لە هەموو خۆشیو ڕابواردنی دونیای بۆ ئامادەکرابوو، سەرپشك بوو لەو ژیانەدا بەلام، ڕازی نەبوو پێ و دوا ڕۆژی هەڵبژارد، وە هیچ کەسێك بۆ ئەو شتە هوشیار و بە ئاگا نەبوو تەنها حەزرەتی ئەبوبەکر ﷺ نەبێت فەرمووی :بە دایکم و باوکمەوە بە قوربانت بین ئەی پێغەمبەری ﷺ خودا، بەڵکو بە باوك و بەدایك و بە گیان و بەماڵ و سەروەتمان بەفیدات دەبین، ئەی نێردراوی خودای بە بەزەیی: لەدوایدا دەستی کرد بەگریان!. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: مەگریە ئەی ئەبابکر، بەڕاستی باشترین ئادەمیزادی باوەڕپێکرا و جێگەی متمانەو دڵنیای لە لای من و لە هاوڕێیەتیم و لەماڵ و دارایيمدا ئەبوبەکر تۆ بووی :ئەگەر هەرکەسێکم بکردبایە تەنها هاوەڵ و خۆشەویستی خۆم لە ئادەمیزادەکان ، ئەبوبەکر ﷺ ئەوە تۆ بووی هەڵم دەبژاردی بەلام، ئەبوبەکر ﷺ تاکەبرامە لەدین و ئایندا . هەموو دەرگاکانی مزگەوت دابخەن، تەنها دەرگای ئەبوبەکر ﷺ نەبێت دای مەخەن. ئەبوبەکر ﷺ یش دەستی کرد بەگریان و فەرمووی: ئەمن بۆخۆم وسەروەت و سامان وتەواوی ماڵم پێشکەش بە تۆبێ ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ .

# خۆشەویستی لێپرسراوی بۆ ژێردەستەكانی
# محبة الراعی لرعیتة

ەگێڕنەوە لەكاتی فەرمان بەرایەتی پێشەواو سەردارمان حەزرەتی عومەری كوڕی خەتاب ﷺقەیسەری ڕۆم لەقوستەنتەنیە مرد و كۆچی كرد بەوهۆیەوە ئیمپرا تۆریەتی ڕۆم سستو لاوازو بێتوانا بوو بەو هۆیەوە گەورەترینو ، ەوڵەمەند ترین وولاتی كەوتە ژێر دەستی موسڵمانان.بەو هۆیەشەوە موسڵمانان بوونە لێپرسراوو بەڕێوە بەری ولاتی میصرو، لەگەڵ دەسەلاتیان بەسەردوڵەتی شام :وەدەسەلاتی ئیسلام درێژەی دەدا بەرەوكەناری ڕۆژهەلاتی دەریای ناوەڕاست بۆدەرفەت وەرگرتنو قۆزتنەوەی ئەوهەلە پادشاگەردانیەو بێ یاساییەی كە هەر كەسە بۆ خۆیەتیو، بۆتە ئاخۆرانو بخۆران لەناو دەوڵەتی ڕۆمدا. موسڵمانان باش تێگەیشتن كەئەوكارە كۆتایی پێنایا هەتا لە دەریادا نەپەڕنەوە و دەسەلاتی تەواو بەدەست نەهێنن.

موعاویەی كوڕی ئەبوسوفیان ﷺكاربەدەستو فەرمان ڕەوای دیمەشق بووداوای لە سەركردەی موسڵمانان كرد كەڕێگەی پێبدا لەڕێگای دەریاوە بڕواو لەگەڵ ڕۆمدا بجەنگێ چونكە ئەو ڕێگایە نزیكترین ڕێگایە بۆ بەرەنگار بوونەوەی ڕۆم . حەزرەتی عومەریش ﷺبۆئەو مەبەستە داوای لە عەمری كوڕی عاص ﷺكرد كەفەرمان ڕەوای میصر بوو :كە ڕونكردنەوەیەكی تەواو بەرامبەر بەدەریاو دەریاوانان بكات :بەهۆی ئەوەی كە دانیشتوانی ولاتی میصرلەدەریاو دەریاوانان شارەزانو ئەزموونی سواریو فێربونی هونەری ناو دەریایان هەیە .عەمری كوڕی عاصیش زۆربەجوانی ڕونكرنە وەیەكی تەواوی بە حەزرەتی عومەرﷺداوبۆی نوسی:ئەی پێشەوای موسڵمانان ، بەڕاستی من دەریام دیوە كەبەڕاستی بەدی هێنراوێكی زۆر گەورەیە، لە كاتێكدا كەبەدی هێنراوێكی بچوك سواری دەبێت، وەلەڕاستیشدا هیچ شتێك نابینی تەنها ئاسمانو ئاونەبێت .ئەگەر ئاو مەنگو ڕاوەستاو بێت، دڵەكان خەفەت باروبێئارام دەكات، وە ئەگەر ڕۆیشتو خشا دڵەكان وەردەگێڕیو لەناویان دەبات :لەوناو ئاوەدا ئینسان وەكو كرمێك وایە لە

سەردار و چیلکەیەك ، ئەوەی لەناوی دایە بزر و ونە و ئەوەی لە دەرەوەشە تازەو لەدایك بووە، ئەگەر خوار ببێتەوە نوقم بووەو ئەگەر ڕزگاریشی ببێت خۆش حاڵو درەوشاوەیە .کاتێ حەزرەتی عومەر ﷺئەونامەیەی بەدەست گەیشت، ڕێگری لە چونی ناودەریاوە لێگرتنو فەرمووی :ئەی مەعاویە ﷺسوێند بەو کەسەی کەمحمدی بە حەق ناردووە هەرگیز نەهێڵن هیچ موسڵمانێك بڕواتە ناودەریاوە .هەروەك و بیستومانە دەریای شام بەتەواوی لەدرێژترین دەریاو شتی سەرئەوزەمینەیە شەووڕۆژدەم بەدوعایە بۆئەوەی وەك‌و لۆفاو یکی بەهێز تەواوی سەر زەوی دابپۆشیو ژێری بخات .ئینجا بەڕاستی دەریایەك ئەوە هیواوئاواتی بێت چۆن هاوڕێ و دۆستانمان لەو دەریایە خۆپەرستە بدەن، سوێند بە خودا گیانی یەك موسڵمان بەلامەوە خۆشەویست ترە لە هەموو سەروەتو سامانو نەهەنگی ڕۆم. بۆیە تکاتان لێدەکەم دورە پەرێزو خۆپارێز بن لەو کارەی کەپێشنیارم کرد بۆتان.

## لە خۆشەویستی خودا - محبة الله

هێندێك لە پیاوچاکان دەگێڕنەوە دەڵێن: لەسەر ڕێگای مەککە لە جێگایەکی چۆڵ گەنجێکی جوان کاری لێبوو بەتەنها، چوینەلایو پرسیارمان لێکرد کە ئایا بەو تەنیایە لەو جێگەدا بێتاقەت نابیت؟ لەوەڵامدا گوتی بەڕاستی وا لەگەڵ خودای خۆم تێکەڵ بووم بەخوداپەرستیو یادکردنی، هەرگیزاو هەرگیز بیر لەتەنیاییو بێتاقەتی ناکەمەوە ، دەڵێ پیم گوت :ئێمە لە کوێ چاومان بەیەکتر بکەوێتویەکتر بدینینەوە ، ئەویش گوتی لەو دونیایە چاوەڕوانی دیتنی من مەکە، وە بۆ دیتنی دواڕۆژیش، ئەوە جێگەی خودا پەرستو تەقواکارانە، ئەو کابرایە گوتی :ئەمن لەکوێ داوات بکەمو بەیەك بگەینەوە لە دواڕۆژدا؟ گوتی : لەگەڵ کۆمەڵی تەماشا کا رانی خودا، پێم گوت :چۆن ئەوەت زانی لە ئێستاوە؟ گوتی بەداپۆشینی چاوم لە هەموو نارەواویو قەدەغە کراوێکو، خۆپاراستنم لە هەرچی شتی نادروست و ناپەسندو تاوان باریەك، وە لە خوداشم داواکردووە کەبمخاتە ئەو بەهەشتەی کە هەر دەم سەیری خودای لێدەکرێ .

# خۆ بەكەم گرتن بەرامبەر خەڵكانی تر- الإثار

{وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ }الحشر/٩ واتە: كۆمەڵی ئەنصارەكان بەباوەڕێكی باشەوە یارمەتی كۆچكەرانیان زۆربەباشی دەدا بە جۆرێك هەرچی هەیان با لەگەڵیان دابەش دكردن و هیچ ئێرەیی و حەسودیشیان پێ نەدەبردن لە كاتێكدا كە ئەو ئەنصارانە زۆریشیان پێویستیان بەو شتە هەبوو بێت ، ئینجا هەر كەسێ خۆپارێزی لە ڕژدی و ڕەزیلی بكات ئەوە بەڕاستی ئەوانە سەركەوت وسەر فیرازن.

خۆ بەكەم سەیر كردن لە جوانترین ڕوشتە تایبەت مەندیەكانی پلەی بەرزییە كە دینی سەربەرزی ئیسلام داوای دەكات بۆ خۆ جوانكردن و ڕازاندنەوەی دڵەكان هەروەك و خودا دەفەرموێ:{ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ }الحشر/٩. واتای ئەو ئاتە لە پێشەوە كراوە.

بەڕاستی بەخشندەیی ودڵ فراوانی لەخودی خۆیداچاكەو پیاوەتیە بەڵام، خۆ بەكەمزانین و بەبەرز سەیركردنی خەڵكانی تر، زۆر گەورەتر و سەربەرزی ترە لەدڵ فراوانی :چونكە خۆبەكەم سەیر كردن نیشانەی سەربەرزیو، جوامێریو، پیاوەتی تەواوی مرۆڤایەتیە .وە بەڕاستی دەست گرۆیی مرۆڤایەتی هێزێكی شاراوەیە لە ئادەمیزاد دا بەو سیفەت و ناونیشانەی كە ئادەمیزادە:كاتێ دەجوڵێتەوەو دەبینیۆ، دەر دەكەو یۆ ، ئینجا گەشەو، نەشو نوما دەكات و گەورە دەبێت:كاتێ خۆیناسیو، هەست و گیانی بزواو، نەرم و نیان بوو:ویژدانی بەهێزبوو، بیروفكری بزواوهەستی بیر كردنەوەی زۆر بوو، دڵو هێزو سینگی فراوان و گوشاد بوو، بەجۆرێك هەست و ناخی جێگای هەموو كەسێكی تێدا دەبۆوە و، دڵ نەرم و ناسك بوو ، لەگەڵ دەروو پشتیدا ئەو كاتە لایەنی گیانی مرۆڤایەتی سەربەرزو سەركەوت و دەبێت بەسەرلایەنی مادی ئاژەڵ و حەیوانیدا : لەبەر ئەوەی كەباوەڕی تەواوی هەیە كە ئادەمیزادێكی تەواوە بەگیان و ڕوح و لاشەدا، نەك هەر بەلاشەیەكی هەستەكان و بەبێگیان:بۆیە ئەو ئینسانە هەموو هیواو ئاواتەكانی دەخاتەكارو، هەوڵ دەدا گیان و ڕوحی بەكار بهێنێ بۆ

پێگەیاندن و خزمەت كردنیو ، خۆهیلاكو ماندوو دەكات، ئاواتەكانی بێتەدی.
بەلاّم بۆلایەنی لاشەی بەو جۆرەی گیان ، خۆی هیلاكو ماندوناكات تەنها بەگوێرەی پێویست نەبێت كەپارێزگاری لەمانو ژیانی دەكات، بۆئەومەبەستەش تەنها ئەوەندە دەخوات كە بژیات، ئەوەندەی مەبەستی زۆر ژیانی نییە، بۆئەوەی بخوات، ئینجا هەر كاتێك بیركردنەوەی مرۆڤایەتی تەواو تێكەڵو پێكەڵ بوو لەگەڵ گیانو ژیانی ئینساندا، ئەوكاتە هەستوزانینی نەرمونیاندەبێتو، هەستوهۆشی تەواوی بەرامبەر بە پێویستیەكانی ئادەمیزادی دەروبەری دەكاتو، ئازارو ناخۆشیەكانیان دەچێژێ: بەو هۆیەوە دەبێتە پاڵنەری خێر و چاكە بۆیانو، بە هەموو هێز و توانایەوە تێدەكۆشێ بۆ گەیشتن بە پێش بڕكەی ژیانوگەیشتن بە ئادەمیزادە كانی پێشی خۆیو، هەوڵ دەدا ئیشو كاری پێویست كاران بە جێبهێنێو یارمەتی تەواوی بێتوانایان بكاتو، ئێشو ئازارو مەینەتیان لێكەم بكاتەوەو فرمێسكی قەتیس ماوی ناوچاویان بسڕێتەوە و، هیواو ئومێدی تەواو بخاتەوە ناودڵو دەروونی ئەوانەی كەهیوا بڕاو بوون لە ژیانیاندا . ئینجا بەو بۆنەیەوە ئینسانی ژیر و تەواو هەست بەچێژ و خۆشی ژیان دەكات و، گیانو ڕوحیشی خۆش بەختوئاسودە دەبێت . وە هەر بەو هۆیانەوە هەستی خۆبەكەم گرتنو، بەرامبەرەكە شی بەڕێزو گەورە تەماشاكردنی زۆرو زیاد دەبێت، ئەوەش وای لێدەكات كە ببێتە چاكترین شێوەو ڕەوشتی مرۆڤایەتی لەژیانداو، نرخو ڕێزی ئەو جۆرە ئادەمیزادانە، لەناو ئەوانی تری بێهەست كردن بە لێپرسینەوەو ، بە هەستانی ئەو كارە بەڕێزە زۆرترو، دیارترەو لەبەرچاوان ترە، ئەنجامی چاكەی ئەوەش بۆدەرو بەری دەگەڕێتەوەو، بەشێوەیەك ناوی بەچاكە دەبەن، نەوەك و تەنها وەكو ئەوانەی كە دەربارەیان دەڵێن (ماإستحق أن يولدمن عاش لنفسه فقط) واتە :بەڕاستی مافی لەدایك بوونیان نییە ئەوانەی كەتەنها هەر بۆخۆیان دەژیەن.بەڵێ بەڕاستی ئەوانەی كە خاوەنی گەورەییو ڕێزی خۆبەكەم گرتنو، هیوای كردنی كرداری چاكەیان هەیەو، ئاواتە خوازیشن كە ئادەمیزادەكانیی تریش هەمان هەڵوێستو ڕەفتاری چاكەیان ببێت :بۆئەوەی

ئەوانیش بەژیانێکی خۆش بەختانەو، ئاسودە بژیەن دوورلە قین و کینەو خەراپە.
وە هەرگیز حەزو ئارەزووی ئەوە نەکات کە ئادە میزادەکانی دەورووبەری تووشی
خەراپەوکاری و ناڕەوابن: وە ئەگەر لێشیان ڕووبدات ئەوا زۆردڵتەنگ‌و
خەمخۆریان بن‌و، وە هەردەم دەست بەنزاو پاڕانەوە بن کە خودای گەورە چاکەو
باشی بەسەر خۆی‌و، دەرو بەریدا بڕژێنیٚ کەببێتە مایەی خۆشبەختی بۆ خۆی و
هەموو ئادەمیزادەکان .بەڕاستی هەر ئەو هۆیەشە کە دینی سەر بەرزی ئیسلام
گرینگیەکی زۆری بەگیانی خۆنەویستی‌و، بەکەم گرتنی داوەلەناو کۆمەڵدا ، وە
دیاریشە کەئیسلام هەرلەخۆڕا ئەوەی نەگوتوە، بەڵکوله بنەوان و سەرچاوەیەکی
پاك‌و خاوێنەوە، بەهێز و تینێکی باشەوە هەڵی هەنجنیوەو، بە گیانێکی بەخت
کارانە هەوڵ بدات :هەتا زۆر لە یارە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خودا کەسانی تریان
زۆرلەخۆیان بەڕێزترو گەورەتر سەیر کردووەو ڕێزیان لێناون.ئینجا لەو بارەشەوە
زۆر نمونەی ئاشکرامان هەیە کەباسیان دەکەین.

## خۆبەکەم گرتنی ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح
## إيثار أبو عبيد بن الجراح

لەکاتێدا کە نەخۆشی تاعون و ڕشانەوەی (عەمواس)لەشام لە نێوانی موسڵماناندا
ڕویدا: پێشەوای موسڵمانان عومەری کوڕی خەتاب‌ﷺ بەدوای لێپرسراوی سوپای
شامی دانارد. کە ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح ﷺبوو .بەو جۆرە هاتە ئاخاوتن‌و
فەرمووی: ئەباعوبەیدە کارێکی تایبەتی تۆ کەوتۆتەلامان ، بەبیٚ ئامادەبوونی تۆ
کارەکەمان بۆ بەجیٚ نایات :هەرکاتیٚ ئەونامەو نوێنەرەی من گەیشتە لاتان
دڵنیام کەشەو بگات ڕۆژنابێتەوە، سواردەبی وبەرەولامان دەکەویە ڕێگا .کە
ڕۆژیش بگات ، ناهێڵی ئێوارە بێت و سوار دەبیت و، خێرا بەرە و لامان دەکەویە
ڕێگا. کاتێك ئەو پەیامە گەیشتە لای ئەبو عوبەیدە ﷺپێکەنی‌و، بڕیاریدا کە ئەو
ئارەزوەی عومەر نەهێنێتەدی‌و، وەڵامی نەداتەوە :فەرمووی: من کارەکەی دەزانم
چییە؟ خودا بەزەیی بە عومەردابێتەوە دەیەویٚ شتێك بهێڵێتەوە کەپێویست
بەمانەوە ناکات :وەڵامی دایەوەو فەرمووی:ئەی پێشەوای موسڵمانان هەر کە

هەواڵەكەم پێگەیشت :لە مەبەست و نیازی هەواڵەكەت گەیشتم :ڕێگەم پێبدە لەسەر نیازو سوور بوونی خۆت :من وەك و سەربازێكم لەناو سەربازەكانم و ئارەزوی داوایەكەت ناكەم ئەبا عوبەیدە لە تاعون و ڕشانەوەكەی (عەمواس) كۆچی دوایی كرد ئەوداوایەی حەزرەتی عومەری پوچ كردەوە كە سەربازەكانی بە جێبهێڵێ و خۆی لەو فەتاو نەخۆشیە گەورەیە ڕزگار بكات.

## ئەوانە هێندێكیان برای یەكترن

## إنهم إخوة بعضهم من بعض

حەزرەتی عومەری كوڕی خەتاب(٤٠٠) چوار صەد دیناری لە كیسەیەكدا بۆئەبو عبیدەی كوڕی جەڕاحی ﷺنارد كە پێویستیەكانی خۆی پێ بەجێبهێنێ دایە دەستی پیاوێكی ئیشكاری خۆی،و، پێی گوت كەپارەكەت دایە دەستی ماوەیەك لەماڵیان بمێنەوە بزانە ئەو پارەی چی لێدەكات پیاوەكەی حەزرەتی عومەر ﷺ ڕۆیشت پارەكەی دایە دەستی ئەبو عوبەیدەوﷺ پێی گوت :حەزرەتی عومەر ﷺ ئەوپارەیەی بۆناردووی كەپێویستیەكانی خۆتی پێبەجێبهێنی.ئەبو عوبیدە ﷺپارەكەی وەرگرت فەرمووی: خودا پاداشتی عومەر بداتەوە. لەدواییدا بانگی كەنیزە، كارەكەرەكەی كردو، پێیگوت :هەستە ئەوحەوت دینارە بۆفلانە كەسە ببەو ئەو پێنجەش بۆفلانە ببەو بەو جۆرە هەتا هەموو پارەی ناو كیسەكەی دابەش كرد .لە دوای ئەوە پیاوەكەی حەزرەتی عومەر گەڕایەوە بۆلا حەزرەتی عومەر ﷺهەواڵەكەی پێڕاگەیاند .لەدواییدا حەزرەتی عومەرﷺ كیسەیەكی (٤٠٠) چوار صەد دیناری كەی دایەدەستی پیاوەكەی،و فەرمووی :بڕۆ ئەوپارەیەش بۆموعازی كوڕی جەبەل ﷺببەبەلام بەهەمان جاری پێشو فەرمووی :ماوەیەك لەماڵیان چاوەڕان بكە بزانە ئەوپارەیە چی لێدەكات! .موعازیش ﷺبەشێوەی ئەبو عوبەیدە هەمووی دابەش كرد بەسەر هەژاراندا .لە كاتێكدا خێزان،و هاوسەری موعازكەزانی لەلایەن عومەرەوە پارە هاتووە بۆموعازو ئەویش دابەشی دەكات هەر خێرا خۆی گەیاندە موعازو گوتی :ئەی موعاز سوێند بەخودا هیچ شتێكمان لەماڵدانیەوخواردنیشمان دەست ناكەوێ نەختێك لەو پارەیەم بدەیە

خواردنی پێ بكڕم موعاز ﷺدەستی لەناو تورەكەكە هاویشت تەنها دوو دیناری تێدا مابوو ئەویشی دایەدەستی هاوسەرەكەی، ئینجا كابرا گەڕایەوە بۆلای حەزرەتی عومەرﷺ هەواڵەكەی پێدا حەزرەتی عومەرﷺزۆرخۆشحاڵ بوو بە خۆشیەوە فەرمووی : بەڕاستی ئەوانە هێندێكیان برای یەكترین.

## لەوەی بخۆ ئەوەلە كولێرەكەی تۆ باشترە

## كلي من هذا فهذاخيرمن قرصك

جارێك هەژارێك داوای شتی لەحەزرەتی عائیشەكرد ئەو ڕۆژە بە ڕۆژو بوو، لەماڵیشیاندا تەنها یەك كولێرە هەبوو، بەكەنیزەو كارەكەرەكەی گوت :ئەو كولێرە بدە بە ئەو هەژارە ، ئەویش گوتی :یاعائیشە بەخودا لەو كولێرە زیاتر هیچ خواردنێكی ترمان نیە بەربانگی پێبكەیتەوە :بەڵام حەزرەتی عائیشە فەرمووی : ئەو كولێرەی بدە بەو هەژارە .كولێرەكەیان دابە هەژارەكە .بۆ ئێوارە بەرخێكی تەواویان بەدیاری بۆهێنا بەشێوەی داپۆشەری (كفن الشاه) واتە :باوونەریتی عەرەب وابوو كەحەیوانیان سەر دەبڕی كەوڵیان دەكردو و بەهەویری گەنمی دایان دەپۆشی و، ئینجا لەناو ئاگری تەندووریان دەهاویشت هەتا زۆر باش دەبرژا هەرچی ڕۆن و چەوری هەیە هەویرەكە هەڵی دەمژی :ئینجابەوجۆریان دەگوت (كفن الشاه) حەزرەتی عائیشە بە كارەكەرەكەی دەگوت: دەبخۆ لەو گۆشتە خۆشە :بەڕاستی ئەوە زۆر باشتروخۆشترە لە كولێرەكە.

## لەخۆیان بەگەورەتردەزانی

## فلأوثرنه على نفسي

لەو كاتەی كە لە نوێژ شیریان لەحەزرەتی عومەرﷺدابەعبداللەیﷺ كوڕی فەرموو: هەستە بڕۆ بۆلای دایكی موسڵمانان حەزرەتی عائیشەو پێی بڵێ عومەر سەلامت پێدە گەیەنێ: لەدواییدا پێی بڵێ، عومەر دەڵێ لەلای هاوڕی خۆشەویستەكانی حەزرەتی محمد و ئەبوبەكر بیشارنەوەو تەسلیم بەخاكی بكەن :حەزرەتی عائیشەش فەرمووی :منیش ئەوداوایەم دەویست لەئەو.بەوجۆرە ئەوانە خۆیان زۆر بە بچوك و

کەمی سەیر دەکرد لەسەر ئەوانی تردا.کاتێ عبدالله گەڕایەوە بۆ لای حەزرەتی عومەرﷺپێیگوت: عبداللهحەزرەتی عائیشە چۆن وەڵامی دایەوە؟ عبدالله ﷺ فەرمووی: ئەی پێشەوای موسڵمانان ڕێگەی پێداوی کە لەلای هاوڕێکانت بت شارنەوە.

# خۆبەکەم گرتن هەتا مردن
# ألإيثارحتى الموت

لە جەنگی(یەڕموك) حوزەیفەی عەدەوی ﷺهەواڵی پێکەیش کە کوڕی مامی لەناو جەنگاوەراندا بریندا بووە: ئەویش بەشەر بەیەك ئاوەوە بەرەو مەیدانی جەنگو ، بۆناو بریندارەکان ڕۆیشت بەنیازەی ئەگەرزیندوبێت ئاوی بداتێ:کاتێك دۆزیەوە سەیری کردبریندارەو، لەنێوانی ژیانومردن دایە، پێی گوت هانێ ئاوبخۆوە؟ بە ئیشارە ئاماژەی بۆکرد گوتی :باشە ئاوم بدەیە تینومە لەوکاتەدا لە تەنیشتی ئەوەوە گوێی لێ بووبریندارێکی تر بەئاخ و ئۆفەوە هاواری ئاوی دەکرد :هەر بەئیشارە گوتی:ئاوەکە ناخۆمەوە بڕۆ بیدە بەو بریندارەی تەنیشتم بیخواتەوە کە هوشامی کوڕی عباس ﷺبوو :ئینجاکاتێ هوشامیش ویستی ئاوەکەبخواتەوە یەکێکی تر لەلایەکی ترەوە بە ئاخو ئۆفەوە داوای ئاوی دەکرد هوشام گوتی: ئاوەکە بۆ ئەو برایەم بەرە با بیخواتەوە .ئەو لە منی تینوترە بەهەمانشێوە ئەویش گوێی لەیەکێکی تربوو، داوای ئاوی دەکرد: ئەویش نەی خواردەوە گوتی : بڕۆ بۆ فلانەکەسەی بەرە لەمنی تینوترە .بەو جۆرە کەڕۆیشتە لای گیانی دەرچوو بوو خێراگەڕایەوە بۆلای هشام ئەویش گیانی دەرچوو بوو .ئەمجار گەڕایەوەلای کوڕەمامەکەی ئەویش گیانی دەرچوو بوو. یەك بەیەك بە سەریاندا گەڕایەوە هەموویان گیانیان دەرچووﷺبوو. کەسیان لەبەر یەکتری لەوکاتی گیانەلآیەشدا لەبەر خۆبەکەمی خۆیانو، بە گەورەزانینی هاوڕێ و، کەسەکانیان ئاوەکەیان نەخواردەوە.

# بە ڕاستی ئەوە لەمن بە خشندەترە

# إن هذا لأسخى منی

دەگێڕنەوە: عبداللەی کوڕی جەعفەرﷺبۆ شتێکی وون بوو دەگەڕا ڕۆیشتە ناو باخێکی دارخورما کە بەندەیەکی ڕەشپێست سەرپەرشتی ئەو باغەی دەکرد وەختێك سەگێکی دیت هاتە ناو باخەکەوە برسی بوو !کابرا خورجێنی نانی دەرهێنا سێ کولێرەی تێدا بوو کولێرەیەکی لەبەردەمی سەگەکە داناو خواردی. دوایی کولێرەی دووەمو سێ هەمیشی لەبەر دەمی داناو خواردی: عبداللەش ﷺبەسەر سامیەوە سەیری ئەوکابرا ڕەشەی دەکرد بەلایەوە زۆر سەیر بوو، بۆیە بە کابرای ڕەشەی گوت: براکەم تۆ ڕۆژانە خواردنت چەندە؟ ئەویش گوتی :براکەم بۆچی وا دەڵێی چیت دیوە !عبداللەﷺگوتی: من بەوە سەرسام بووم کە تۆ خواردنی ڕۆژانەی خۆت دایە ئەو سەگەو، بۆ خۆت بێخۆراك مایەوە؟ کابرای ڕەشە گوتی: براکەم ئەوشوێنەی ئێمە جێگەی سەگان نییە, واهەست دەکەم ئەو سەگە لە شوێنێکی دوورەوە برسیەتی ڕێگای پێ بڕیوە منیش حەزم نەکرد بەبرسییەتی دەری بکەمو خواردنی نەدەمێ.عبداللەﷺگوتی:باشە ئەمڕۆ چیدەکەی بەوبرسیەتیە؟ کابرا گوتی: ئەمڕۆ ئەوها بەڕێدەکەم. عبدالله ﷺگوتی :سوێند بەخودا ئەو پیاوە زۆر لەمن باش ترو بەخشندە ترە .دوای ئەوە عبداللەﷺ باخەکەو بەندەکەی کڕیو، بەندەکەی ئازادکردو باخەکەشی پێشکەش بە بەندەکە کرد.

# زەینەب لەلایەن حسێنەوە سەر بەستو ئازادکراوە

# إن زینب طالق من الحسین

دەگێڕنەوە زینب کچی ئیسحاق هاوسەری عبداللەی کوڕی سەلام ﷺبوو ئافرەتێکی هەتابڵێی جوانو شۆخو شەنگ بوو سەرنجی یەزیدی کوڕی مەعاوییەی بەلای خۆیدا ڕاکێشا بوو یەزید بە تەواوی هۆشی لێسەندرابوو، هەوڵو کۆششی زۆریان خستە کاربۆ سەربەستیوتەڵاقو ئازاد بونی لەلای هاوسەری عبداللەی کوڕی سەلامەوەﷺ بۆئاسان کردنوگونجانی هاوسەریو ماڕە بڕینی بۆیەزید .لە ئەنجامی هەوڵدانی زۆری ساختەوفریودانی پیاوەکانی

یەزیدو تەنانەت بە هاوکاری باوکیشی، ئەو ئافرەتە ئازادو ڕەها کرا .لە دواییدا ئەبودەرداءی مامیان ئاگادارکردەوە بۆ ڕازیبون‌و قەناعەت پێکردنی ئافرەتەکە بۆ هاوسەرگیری‌و، مارەبڕینی لە یەزید، وە ئەو خەبەرە شیان بەپێشەوا حسین ڕاگەیاند کە ئەو کاتە لەکوفە بوو :بەڵام حسێن ﷺئەوکارو ڕووداوەی زۆر بەلاوە ناحەزو، ناشیرین بوو: بۆیە حسێن وای نیشانی ئەبو درداءدا کە بۆ خۆی ئارەزووی هاوسەرگیری لەگەڵ زەینەبدا هەیە، وە بەناوی ئەویشەوە بەزەینەب ڕابگەیەنن. زەینەبیش بۆخۆی ئازاد و سەر پشکە، کەکێ بۆ خۆی هەڵدەبژێری؟ زەینەبیش بەئارەزو ی خۆی حوسەینی هەڵبژاردو، مارەیان بڕی‌و بوو بە هاوسەری حوسەینﷺ. بەڵام لەگەڵ ئەوشدا حوسەین زەینەبی سەرپشك کرد کە بۆ خۆی ئیختیاری هەیە کێ هەڵدە بژێری: لەولاشەوە عبداللەی کوڕی سەلام ﷺ هاوسەری پێشوی ئازادکراوی زەینەب کەوتە ناوغەم و ئازار و پەژارەی زۆرەوە بۆ دووری و لەدەست دان‌و جیابوونەوەی زەینەب :عبدالله دەم بەدەم لەڕ و لاوازو بێ هێز دەبوو، سیس‌و کزهەڵگەڕا، چاوەکانی تاریك‌و لێڵ بوو بەدبەختی و چارەڕەشی بەتەواوە تی لێی دیاری دا ئەستێرەی بەختی ئاوابوو، بەبێ هیچ سودو قازانجێك کەوتە ناو دەریای غەم و هیلاکیەوە . بەڵام ئەو غەم‌و پەژارەش هەتاسەرنەبوو .ڕۆژێك عبدالله ﷺڕۆیشتەلای پێشەواحسێن‌وﷺسکاڵاودەردی دڵی بۆحوسەین هەڵڕشت‌و گوتی: کەزەینەب سپاردەیەکی تایبەتیەو بەوی بەخشیوەو ، ئێستاش ئەو سپاردە یەی بۆبگێڕێتەوە؟ پێشەوا حوسەینیش زۆربە پێ خۆشحاڵیەوەداوایەکەی وەرگرت‌و ڕووی لەزەینەبە کرد کەلەلای حوسەین سپاردەیەو پێویستە بگەڕێتەوە بۆلای عبدالله، ﷺلەوکاتەدا کەئەو دوو ڕووخسارانە بەیەکگەیشتنەوە هەردووکیان خۆشحاڵ و شادمان بوون و چەندین ڕووداو و بەسەر هات‌و بیرەوەری شادی‌و، دڵتەزێن لەو دوو ڕووخسارانە دەخوێندرایەوە ، چاوەکان گەشانەوەو بێدەنگی و خامۆشیەکی زۆر لەوکاتەدا ڕوویداو، نورو ڕووناکی لە چاوەکاندا دەخوێندرایەوە .بەڕاستی لەو کاتەدا پڕسام و غەمناکەدا :پێشەوا حوسەینﷺ ئازایی‌و خۆڕاگری‌و، سۆزو ئاوازی

میهرەبانی جولاو، جوامێری‌و پیاوەتی‌و، گیانی خۆنەویستی هەڵقولاو، ئەمارگیری فرێداو، جوانترین شێوەی مەردی‌و ئازایی لەسەردوو لێوەکانی دەرچوو، گەورەترین زام و برینی سەختی پێ تیمارو ساڕێژ کرد: فەرمووی: زەینەب لەلایەن حوسەینەوە ئازاد و ، سەربەست‌و بەرەڵا کراوە : بۆ ئەوەی جارێکی تر بڕواتەوە باوەشی گەرم و سۆزو، خۆشەویستی هاوسەرە بەڕێزەکەی پێشووی :عبداللەی کوڕی سەلام‌ﷺ.

# کراسی بوکێنی

# قميص الزفاف

پێغەمبەری ﷺخودا کراسێکی نوێی جوانی بۆ فاتمەی کچی کڕی لەشەوی بوکێنیدا .کە لەو کاتەدا کراسێکی دڕاوی پینەکراوی لەبەردابوو: دەرۆزەکەرێك لەسەردەرگاوە هاواری کردو و گوتی:داوا لەخانەوادەی پێغەمبەرﷺدەکەم : کە کراسێکی شایان‌و گون جاو بەبەری خۆم پێبدەن، ئەوانیش خەریکبوون ئەو کراسە کۆنە پینەکراوەی پێبدەن، بەڵام لەدواییدا ئەو فەرموودە خوداییەیان کەوتەوە بیر کەدەفەرموێ: {لَن تَنَالُواْ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ ۚ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيْءٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ }العمران/٩٢ واتە: ئێوەبە هیچ جۆرێ ناگەنە پلەی بەرزی چاکەکاری هەتا ئەو شتە کەزۆرخۆشتان دەوێت لەپێناو خوادا نەیبەخشن، وەهەر شتێك کەدەیبەخشن بێگومان بن کەخودا پێی دەزانێ‌و ئاگادارە.

ئەوانیش کراسە نوێیەکەیان پێبەخشی کاتی نزیکبوونەوەی زەماوەندی :حەزرە تی جبرائیل هاتەلای‌و بەدیاری کراسێکی ئاوریشمی نەرمی سەوزی بۆهێنا، کەهیچ ئافرەتێکی جولەکەش ئەو جۆرە کراسەی لەبەردا نەبووە، بۆیە هەرئافرەتێکی جولەکە ئامادەی ئەو زەماوەندەبوو، باوەڕیان هێناو موسڵمان بوون، لەدوای ئەوانیش هاوسەرەکانیشیان باوەڕیان هێنا.

# ئەوە پاداشتی دینارە

# هذا جزاء الدينار

دەگێڕنەوە ڕۆژێك پێشەوا عەلی﵁پرسیاری لە فاتمە کرد :ئەی فاتمە برسیمە هیچ خواردنمان هەیە بیخۆین؟ فاتمە فەرمووی :سوێند بەو کەسەی کەڕێزی لەباوکم ناوە بە پێغەمبەرایەتی ﷺهیچ شتێکمان لەماڵ دانیە بیخۆین :ئەوە بەڕاستی دوو ڕۆژە هیچ شك نابەم کە زگمانی پێ نەرم بکەینەوەو، منداڵەکانمی پێ تێربکەم . حەزرەتی عەلی ﵁فەرمووی :ئەی فاتمە بۆچی ئاگادارت نەکردوومەوە؟ هەتا شتێکتان بۆ پەیدا بکەم؟ فاتمە فەرمووی :بە خودا شەرم لە خودا دەکەم کەداوای شتێکت لێبکەم کە توانات بەسەریدا نەبێت. حەزرەتی عەلی بەمتمانەو دڵنیاییەوە پشتی بەخودا بەست‌و، هەستاو ڕۆیشت(١)یەك دیناری بەوام (قرض) وەرگرت‌و ڕۆیشت خواردەمەنی‌وشتی پێ بکڕێ ، لەوکاتی تین‌و گەرمایەدا چاوی بە میقداد کەوت زۆر شپرزە و پەشۆکا بوو، هیلاك‌و ماندوو، هەموو گیانی سەرتاپا باڵای لەئارەقە دا بوو، کەچاوی بە ئیمامی عەلی ﵁کەوت، ویستی خۆی هەڵبکات‌و نەی بینێ: بەڵام ئیمامی عەلی ﵁فەرمووی:ئەی میقداد بۆچی وا هیلاك و ماندودیاری چی بووە ئێستا لەو کاتەدا لەماڵ هاتویەدەر؟ ئەویش گوتی :ئەی باوکی حەسەن ڕێگەم بەردەو بەکاری خۆتەوە بڕۆو هیچ پرسیارم لێمەکە، کە خەریکی چیم و بۆچی هاتومەدەر. حەزرەتی عەلی ﵁فەرمووی : ئەی کوڕی برام پێویست ناکات, تۆ پێویستی خۆتم لێ بشاریەوە؟ ئینجا میقداد ﵁گوتی:ئەی پێشەوا مادام تۆ ڕێگەم پێنادەی واپێت دەڵێم:سوێند بەوکەسەی کەڕێزی لەمحمدناوە بە پێغەمبەریەتی ﷺ، ئەوەی کەمنی لەوکاتە لەماڵ بێزار کردووەو هاتومەدەر تەنها برسیایەتیە، ئێستا منداڵەکانم لەماڵەوە لەبەر نەبوونی هیچ خواردن‌و خۆراکێکمان لەماڵدا نەبوو، هاوسەرەو هەموم منداڵەکانم لەبرسان دەگریان‌و، دەیان ناڵاند، منیش لەبەرگریانی منداڵەکان خۆم بۆ نەگیراو، زەمین بەخۆی نەگرتم‌و، سەری خۆم هەڵگرتوو بەئاخ و دڵتەنگیەوە لەماڵ هاتمەدەر .ئەوە بوو بەسەرهات‌و چیرۆکی لەماڵ دەرچونم .لەوکاتەدا حەزرەتی عەلی ﵁فرمێسکی تەواوی

لەچاوەکاندا دەباراند، بە جۆرێك کە هەموو ڕیشی تەڕبوو: ئینجا فەرمووی: سوێند بەو سوێندەی کە تۆ سوێندت پێ خواردمنیش هەر ئەو شتەی کەتۆی غەمبار و بێتاقەت کردووە و لەماڵ هێنا و یەتیەدەر، منیش بەهەمان شێوەی تۆ هاتومەتەدەر. ئێستاش من دینارێکم بەوام (قرض) وەرگرتووە بیدەم بەتۆ حەزرەتی عەلی ﷺ لەسەر ئەو هەموو پێویستیەی خۆی پارەکەیدابە میقداد. بۆ خۆشی ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەر، ﷺنوێژی نیوەڕ و عصر و غریبی لەدوای پێغەمبەرﷺکردو، تائەوکاتە نەگەڕا یەوە بۆماڵ کە لە نوێژبوونەوە، پێغەمبەرﷺهەستاو بەلای ئیمامی عەلی دا ڕۆیشت ، کەلە ڕیزی پێشەوە بوو ئاماژە یەکی بۆ عەلی کرد :ئەویش بەدوای پێغەمبەر دا ﷺڕۆیشت :لەسەر دەرگا بەیەك گە یشتن, پێغەمبەر ﷺفەرمووی :ئەی باوکی حەسەن هیچتان خواردن هەیە بێم لەوێ شتێك بخۆین؟ عەلیﷺ سەری داخستو لەبەر شەرمو خەجاڵەتیان هیچ وەڵامی پێنەدرایەوە .پێغەمبەرﷺ فەرمووی :عەلی یان بڵێ خواردنمان هەیە هەتا بێم ، یان بڵێ نیمانەو بڕۆمەوە :حەزرەتی عەلیش ﷺزۆربە خۆش حاڵیەوە فەرمووی :لەگەڵم وەرە دەڕۆینەوە .پێغەمبەرﷺدەستی حەزرەتی عەلی گرتو ، بە جوتە ڕۆیشتنەوە بۆماڵ، لەوکاتەدا حەزرەتی فاتمە نوێژی دەکرو ، مەنجەڵێکی گەورەی لەسەر ئاگار دانا بوو دەکوڵا :فاتمە کە هەستی کردپێغەمبەرﷺ هاتووە خێرا لەنوێژەکەی بۆوەو، سەلامی لە پێغەمبەرﷺکرد، کەبەڕاستی فاتمە خۆشەویستترین و ئازیزترین کەس بوو لە لای پێغەمبەر، ﷺپێغەمبەر وەڵامی سەلامەکەی دایەوەو، دەستی بەسەرسەری فاتمەدا هێناو، فەرمووی :چۆنت ئێوارە کردەوە؟ فاتمە فەرمووی:شەومان بەڕێکرد، خودالێت ببورێ.ئینجافاتمە قابلەمەکەی هەڵگرت ولەبەردەستی پێغەمبەری داینا: حەزرەتی عەلی سەیری کردبۆنێکی زۆر خۆشی لێدەهات .حەزرەتی عەلی ﷺزۆر بەسەر سامیەوە چاوەکانی بڕیبووە فاتمە. ئەویش فەرمووی: پاك وخاوێنی تەنها بۆ خودایە ئەی عەلی بۆچی وابەسەرسامیەوە سەیرم دەکەی چی ڕوویداوە؟ ئایاهیچ تاوانێك لەنێوانی ئێمەوئێوە ڕویداوە کەشایانی سەرسامی و ناڕەزایی بووبێت؟ حەزرەتی

عەلیش ﷺفەرمووی :ئەی فاتمە چی تاوانێك لەوتاوانەی ئەمڕۆ گەورەترە، کەمن پەیمانم پێدای خواردنت بۆ پەیدابکەم .تۆ سوێندت بەخوداخوارد کەبرسیتەو دوو ڕۆژە خواردنت نەخواردووە؟ !فاتمە ڕووی لە ئاسمان کردوو فەرمووی: ئەی پەروەردگارم بەڕاستی هەرچی لەوبونەوەرەدا هەیە زاناو پێی ئاگاداری ، وەمنیش هەرچی ڕاستی نەبێ نەم گووتوە .حەزرەتی عەلی ﷺفەرمووی :پێم بڵێ ئەو خواردنەت لەکوێ هێناوە بەڕاستی من شتی وا خۆشم نەخواردووەو بۆنی واخۆشیشم نەکردووە !!لەدوای ئەو گوفتوگۆیەیان.پێغەمبەرﷺدەستی پیرۆزی لەنێوانی هەر دووك شانی عەلی داناوڕای وەشاندو فەرمووی: ئەی عەلی ئەوە پاداشتی دینارەکە یە .ئەوە قازانجی دینارەکەیە .ئەوە لەلایەن خوداوەیە هەرچی حەزو ئارەزوو ی لیێبێ ڕزق‌و ڕۆزی بەبێ ژمارە پێدەبەخشێ.لەوکاتەدا پێغەمبەرﷺدەستی کرد بە گریان‌و فرمێسی چاوی هاتە خوارەوەی فەرموو:
(الحمد لله الذی یخرجکما من الدنیا حتی یجریك یا علی فی المجری الذی فیه زکریا، ویجریك یا فاطمة فی المجری الذی فیه مریم) وەخودای گەورە دەفەرموێ:
{ كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيۡهَا زَكَرِيَّا ٱلۡمِحۡرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزۡقٗاۖ قَالَ يَٰمَرۡيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَٰذَاۖ قَالَتۡ هُوَ مِنۡ عِندِ ٱللَّهِۖ إِنَّ ٱللَّهَ يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيۡرِ حِسَابٍ }ال عمران/٣٧ واتە: هەر کاتێ حەزرەتی زەکەریاعلیه السلامدەڕۆیشتە لای مەریەم بۆشوێنی خودا پەرستیەکەی‌و سەر دانی دەکرد، تەماشای دەکرد میوەو ڕزق‌و ڕۆزی زۆری لەلایە، زەکەریا پێی دە فەرموو: ئەی مریەم ئەو هەموو ڕزق‌و میوەت لەکوێ بوو، ئەویش دەی فەرموو: ئەوە لەلایەن خوداوەیەو، خودا ڕۆزی دەبەخشێ بە هەر کەسێك ئارەزووی لێبێ.

## دەعوەت‌و میوانداری بکە بابە مەڕێکیش بێت

## أولم ولو بشاە

کاتێ عبدالرحمن ی کوڕی عەوف ﷺکۆچی کرد بۆ مەدینە هەموو ماڵ و سەروەت و سامانەکەی بە جێهێشت:کاتێ گەیشتە مەدینە ڕۆیشتە خزمەت پێغەمبەر .پێغە مبەرﷺ پرسیاری لێکرد ئەی عبدالرحمن بۆچی هەمووماڵ‌و سامانت بەجێ

لەچاوەكاندا دەباراند، بە جۆرێك كە هەموو ڕیشی تەڕبوو: ئینجا فەرمووی: سوێند بەو سوێندەی كە تۆ سوێندت پێ خواردمنیش هەر ئەو شتەی كەتۆی غەمبار و بێتاقەت كردووە و لەماڵ هێنا و یەتیەدەر، منیش بەهەمان شێوەی تۆ هاتومەتەدەر. ئێستاش من دینارێكم بەوام (قرض) وەرگرتووە بیدەم بەتۆ حەزرەتی عەلی ﷺ لەسەر ئەو هەموو پێویستیەی خۆی پارەكەیدابە میقداد. بۆ خۆشی ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەر، ﷺنوێژی نیوەڕ و عصر و غریبی لەدوای پێغەمبەرﷺكردو، تائەوكاتە نەگەڕا یەوە بۆماڵ كە لە نوێژبوونەوە، پێغەمبەرﷺهەستاو بەلای ئیمامی عەلی دا ڕۆیشت ، كەلە ڕیزی پێشەوە بوو ئاماژە یەكی بۆ عەلی كرد :ئەویش بەدوای پێغەمبەر دا ﷺڕۆیشت :لەسەر دەرگا بەیەك گە یشتن، پێغەمبەر ﷺفەرمووی :ئەی باوكی حەسەن هیچتان خواردن هەیە بێم لەوێ شتێك بخۆین؟ عەلیﷺ سەری داخست و لەبەر شەرم و خەجاڵەتیان هیچ وەڵامی پێنەدرایەوە .پێغەمبەرﷺ فەرمووی :عەلی یان بڵێ خواردنمان هەیە هەتا بێم ، یان بڵێ نیمانەو بڕۆمەوە :حەزرەتی عەلیش ﷺزۆربە خۆش حاڵیەوە فەرمووی :لەگەڵم وەرە دەڕۆینەوە .پێغەمبەرﷺدەستی حەزرەتی عەلی گرت و ، بە جوتە ڕۆیشتنەوە بۆماڵ، لەوكاتەدا حەزرەتی فاتمە نوێژی دەكرو ، مەنجەڵێكی گەورەی لەسەر ئاگار دانا بوو دەكولا :فاتمە كە هەستی كردپێغەمبەرﷺ هاتووە خێرا لەنوێژەكەی بۆوەو، سەلامی لە پێغەمبەرﷺكرد، كەبەڕاستی فاتمە خۆشەویستترین و ئازیزترین كەس بوو لە لای پێغەمبەر، ﷺپێغەمبەر وەڵامی سەلامەكەی دایەوەو، دەستی بەسەرسەری فاتمەدا هێناو، فەرمووی :چۆنت ئێوارە كردەوە؟ فاتمە فەرمووی:شەومان بەڕێكرد، خودالێت ببورێ.ئینجافاتمە قابلەمەكەی هەڵگرت ولەبەردەستی پێغەمبەری دانا: حەزرەتی عەلی سەیری كردبۆنێكی زۆر خۆشی لێدەهات .حەزرەتی عەلی ﷺزۆر بەسەر سامیەوە چاوەكانی بڕیبووە فاتمە. ئەویش فەرمووی: پاك وخاوێنی تەنها بۆ خودایە ئەی عەلی بۆچی وابەسەرسامیەوە سەیرم دەكەی چی ڕوویداوە؟ ئایاهیچ تاوانێك لەنێوانی ئێمەوئێوە ڕویداوە كەشایانی سەرسامی و ناڕەزایی بووبێت؟ حەزرەتی

عەلیش ﷺفەرمووی :ئەی فاتمە چی تاوانێك لەوتاوانەی ئەمڕۆ گەورەترە، کەمن پەیمانم پێدای خواردنت بۆ پەیدابکەم .تۆ سوێندت بەخوداخوارد کەبرسیتەو دوو ڕۆژە خواردنت نەخواردووە؟ !فاتمە ڕووی لە ئاسمان کردوو فەرمووی: ئەی پەروەردگارم بەڕاستی هەرچی لەوبونەوەرەدا هەیە زاناو پێی ئاگاداری ، وەمنیش هەرچی ڕاستی نەبێ نەم گووتوە .حەزرەتی عەلی ﷺفەرمووی :پێم بڵێ ئەو خواردنەت لەکوێ هێناوە بەڕاستی من شتی وا خۆشم نەخواردووەو بۆنی واخۆشیشم نەکردووە !!لەدوای ئەو گوفتوگۆیەیان.پێغەمبەرﷺدەستی پیرۆزی لەنێوانی هەر دووك شانی عەلی داناوڕای وەشاندو فەرمووی: ئەی عەلی ئەوە پاداشتی دینارەکە یە .ئەوە قازانجی دینارەکەیە .ئەوە لەلایەن خوداوەیە هەرچی حەزو ئارەزوو ی لیێبێ ڕزق‌و ڕۆزی بەبێ ژمارە پێدەبەخشێ.لەوکاتەدا پێغەمبەرﷺدەستی کرد بە گریان‌و فرمێسی چاوی هاتە خوارەوەی فەرموو:

(الحمد لله الذی يخرجكما من الدنيا حتى يجريك يا علی فی المجری الذی فيه زكريا، ويجريك يا فاطمة فی المجری الذی فيه مريم) وەخودای گەورە دەفەرموێ:

{ كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيۡهَا زَكَرِيَّا ٱلۡمِحۡرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزۡقٗاۖ قَالَ يَٰمَرۡيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَٰذَاۖ قَالَتۡ هُوَ مِنۡ عِندِ ٱللَّهِۖ إِنَّ ٱللَّهَ يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيۡرِ حِسَابٍ }ال عمران/٣٧ واتە: هەر کاتێ حەزرەتی زەکەریاعليه السلامدەڕۆیشتە لای مەریەم بۆشوێنی خودا پەرستیەکەی‌و سەر دانی دەکرد، تەماشای دەکرد میوەو ڕزق‌و ڕۆزی زۆری لەلایە، زەکەریا پێی دە فەرموو: ئەی مریەم ئەو هەموو ڕزق‌و میوەت لەکوێ بوو، ئەویش دەی فەرموو: ئەوە لەلایەن خوداوەیەو، خودا ڕۆزی دەبەخشێ بە هەر کەسێك ئارەزووی لێبێ.

## دەعوەت‌و میوانداری بکە بابە مەڕێکیش بێت

## أولم ولو بشاه

کاتێ عبدالرحمن ی کوڕی عەوف ﷺکۆچی کرد بۆ مەدینە هەموو ماڵ و سەروەت و سامانەکەی بە جێهێشت:کاتێ گەیشتە مەدینە ڕۆیشتە خزمەت پێغەمبەر .پێغە مبەرﷺ پرسیاری لێکرد ئەی عبدالرحمن بۆچی هەمووماڵ‌و سامانت بەجێ

هێشت و هاتی بۆلامان؟عبدالرحمن گوتی: ملك ومالم تەنها لەبەر خۆشەویستی خوداو پێغەمبەرەکەی بەجێهێشت .پێغەمبەریش، ﷺعبدالرحمانی لەگەڵ یەکێك لەهاوڕێ یانی ئەنصار کردە برا:کاتێ ڕۆیشتنەوە بەرە و ماڵ ئەنصارییەکە بە عبدالرحمنی گوت:ئەی عبدالرحمن پێغەمبەریﷺ خودا من وتۆی کردووە بەبرا: ئێستاش من دوو فرۆشگاو دووکانم هەیە، یەکیان بۆ تۆ و ئەوی تریش بۆمن، وە پارچە زەویەکی باشیشم هەیە لەنێوانی خۆماندا دابەشی دەکەین، وە دوو هاوسەر و خێزانم هەیە دەیان هێنمە پێشەوەو، بیان دینە کامەیانت بەدڵ بوو تەلاقی دەدەم لە دوای تەواوبوونی مۆڵەتی ئافرەتی تەلاق درا و تۆ بیخوازە و مارەی ببڕە :عبدالرحمن هاتە وەلام و فەرمووی:خودا خێرو بەرەکەت و پیرۆزی بەسەر خۆت و ماڵو خێزانتدا بڕێژێ : ئەمن بۆ خۆشەویستی خێزان و، سەروەت و، سامان و، ماڵ کۆچم نەکردووە! من تەنها لەبەر خۆشەویستی خوداو پێغەمبەری ﷺخودا کۆچم کردووە .تۆ تەنها چەند درهەمێکم بە قەرز پێبدەو، بازارم پیشان بدەو ، هیچی تر.عبدالرحمن لەسەرەتاوە بەشیر فرۆشتن دەستی پێکردو سامانێکی باشی پێکەوەنا .هەتا هاوسەرێکی باشی دۆزیەوە و مارەی بڕی ڕۆژێك عبدالرحمن بەجل و بەرگێکی سەوزی جوان و بەزەعفەران ڕەنگ کراوی لەبەردا بوو خۆشی و شادی هاوسەرگیری پێوە دیاربوو :بەو شێوەیە دەسوڕایەوە پێغەمبەرﷺچاوی پێکەوت فەرمووی: ئەی عبدالرحمن هاو سەرت مارە بڕیوە؟ عبدالرحمن گوتی :بەڵێ ئەی پێغەمبەری ﷺخودا مارەم بڕیوە . پێغەمبەرﷺفەرموو: کێیە مارەت بڕیوە؟ ئەویش فەرمووی: ئافرەتێکی ئەنصارییە. پێغەمبەر ﷺفەرمووی: مارەیەکەی چەندە؟ گوتی بە ئەندازەی ناوکە خورمایەك لەزێڕ. ئینجا پێغەمبەر ﷺپێیفەرموو: دەعوەت و میوان داریەك بکە با بەمەڕێکیش بێت.

# ترسان لەزاتی خودا: مخافه الله

{وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ. فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ }النازعات:٤٠-٤١

واتە: هەر كەسێك لە پایەو مەقامی پەروەردگار بترسی‌و خۆی لەكرداری خەراپ دووربكاتەوە و لەكرادری هەواو هەوەسی گیان خۆپارێزی بكات ئەوە بەڕاستی جێگا و مانەوەی هەتا هەتایە لەبەهەشتی خۆشیدا دەبێت.

ترس‌و، بیم: خۆپارێزی و سنوردیاری دەكات‌و، خوێندنگەیەكی گیانی بەرهەم دەهێنی بۆ گەیشتن بەشورەو پەرژینی چواردەورەی تەلارێك لە كەوتنە ناو هەڵەو ناتەواوی‌و، كەو تنە ناوچاڵی لەناوبەر وفەوتێنەر .ترسان: چەند جۆری هەیە. چاكترو گەورەو بەهێزیان ئەوەیە، كە جێگە و شوێن لەناودڵدا دروست دەكات . ترسان لەخودای بەدەسەڵات :ئەو جۆرە ترسان لەخودایەیە كەوا لەئینسان بكات ئەو ئادەمیزادە بگەیەنێتە پلەی بەرزی‌و نمرەی تەواو، لەگەڵ ئەوانەی كە لە پێناوی خۆشەویستی خوداو، پێغەمبەری‌ﷺ خوداو، بەرزبوونەوەی بەرنامەی خودا: كاردەكەن‌و تێدەكۆشن .وە بەو هۆیەوە دەبنە باشترین‌و چاكترین چاكە كارو، دوورلە هەموو خەراپە و ناڕەوایی، وە بە هۆی ترسەوە ببێتە ئادەمیزادێكی تێگەیشتوو دوور لە كەمتەرخەمی و بەرەڵایی وبێموبالاتی، وەی ببێتە ئادەمیزادێكی ڕاست‌و دروست‌و بە ئابڕوو داوێن پاك‌ومەرد.وە ببێتە ئینسانێكی دڵ تێرو بەقەناعەت‌و دەوڵەمەند.دوورلەڕاستەڕێ لادان‌و، دەستبڕین و ساختەیی وەببێتە ئادەمیزادێكی ڕاست‌و ماف‌و حەق ناسی وەها تێكەڵاوهەست بەلێپرسراوی‌و مافی ئادەمیزادەكانی تردا بكات دەم پاك‌و دەست پاك‌و دادگەربێت و، تەواوی حەق‌و مافەكانی خودای تێدا بناسی‌و بەگوێرەی تەوانا بەجێگەی بهێنێ .وە مافی دایك‌و باوكی تێبگات‌و خزمەتیان بكات‌و خەراپە و تاوانیان بەرامبە ئەنجام نەدات .وە سەرەڕای ئەوانەش دەبێ فەرمانەكانی خوداو واجب‌و پێویستیەكانی ئاین بزانی‌و، وریاو ئامادەبێ بۆ هەموو ئەوماف‌و فەرمانانەی بەسەریدا دراوەو هەموو كاتێكیش ئامادەی پێویستیەكانی بێت كەلێی داوادەكات، هەتا دەبێتە پاك‌و خاوێن ترین ئادەمیزاد یك‌و، بەرزترین

تەرمو مەرتەبەی بەرزو بالاّی پێدە بەخشرێ .كە ببێتە یەكێك لەوانەی كەخودا خۆشەویستی و، دڵسۆزی خۆی بەسەردا ڕشتوون: بەوجۆرە دەبێتە ملكەچی بەندەی خوداو ، دوور لە خودپەرستی و بەندایەتی بەندەكان.وە لەڕاستیشدا تەواوی جۆرەكانی ترس كارو، هۆن، بۆ خۆپاراستن و دووركەوتنەوە لە خەراپە و ناڕەوا .خۆپاراستنیش هۆكارە بۆ داواكردنی تەواوی كار و فەرمانەكان: لەكەمو كوڕی و ناتەواوی .ترس و، بیم :خۆڕاگری و تێگەیشتنە لەئاین، بەرگ و كالاّیەك نییە لەبازار بەئارەزووی خۆت بەبەداوای دامەزراوی بیكڕی و تەواو. وە بەڕاستی ترس هۆی تێگەیشتنە لەبەرنامەی ئاین بۆتەواوی بەرەی ئادەمیزاد. وە پێویستە لەو سەرچاوەوە چاكسازی و خۆشبەختی تەواوی مرۆڤایەتی وەربگرین و، ڕێزو گەورەیمان و، هیزو دەسەلاّتمان و، خواردن و خۆرا كمان و ، چاك وباشی كردارمان.هەر لەوێ وەر بگرین و هەڵهێنجین .بەلاّم ئەوانەی لەو سەرچاوەو ڕێبازە دووردەكەونەوەو پەیڕەوی ناكەن و گوێی نادەنێ هەرگیز ئاسودەو دڵگوشادنین و، خەراپ كارولەڕێ لادەرو، ترسنۆك و بێهزن.ئەوانەی بەشوێن ڕێبازی دین و پێغەمبەرﷺدانارۆن:لاسارو، ڕوخاو لەرزۆكن و، بەهیچ كلۆجێ ناتوانن جەڵەوی ئارەزوبازی و، شەڕەن گێزی خۆیان بەرەلاّنەكەن و بیان گرنەوەو، دەسەلاّت و توانایان بەسەریانداهەبێ. بۆیە بەپێچەوانەی فەرمانەكانی خودا و پێغەمبەرﷺدادەڕۆن و، چونكە هونەری فێركاری نەگریس و لاوازیان بەخەراپە بەرێدەكەن: لەبەر ئەوەشە كە خودا دەفەرموێ ( وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ) الرحمن/٤٦ وەلە ڕێگەو ڕێبازی یارە شیرینەكانی پێغەمبەری ﷺخوداش باشترین وگەورەترین نمونەی ڕاستی و، سەركەوتنمان بۆ ڕوون دەبێتەوە لەڕێگای ترس و بیمەوە، بەرامبەر بە بە دیهێنە ریان و، هەڵسوكەوتیان بەرامبەر تەواوی مرۆڤایەتی.

## ئەی پەروەردگار بە هۆی ڕەزابونت خۆمان لە خەراپەو تاوان دەپارێزین
## اللهم إنانعوذ برضاك من سخطك

لە حەزرەتی عائیشەوە دەگێڕنەوە :پێغەمبەری ﷺ خودا هاتەلام‌و، جلەكانی دانا بەلأم، زۆر لەلام نەمایەوە :هەستاو خێرا جلەكانی لەبەركردەوەو ڕۆیشت : بەڕاستی منیش غیرەیەكی زۆر بەهێز بەبیرمدا هات‌ودڵم زۆرتێك چوو، بیری خەراپم كرد بەرامبەری پێغەمبەر ﷺ:وام هەست كرد كە من بەجێدەهێڵێ‌و، دەڕواتە لای هاوسەرەكانی تری :ئەمنیش لەداخان بەدوایدا ڕۆیشتم، لێی نزیك بوومەوە سەیرم كرد لەناو گۆڕستانی (بەقیع) سكالاّ و داوای لێخۆشبوونی بۆ موسڵمانان‌و شەهیدان دەكرد .منیش چومە پێشی‌و گوتم :ئەی بەدایك و باوكمەوە بە قوربانت بین : ئەتۆ خەریكی بەجێهێنانی كار و فەرمانی خودای و، ئەمنیش لەگەڵ كاروفەرمانی دونیادا خەریكم. ئینجا بەدڵ خۆشیەكی زۆروگیانێكی بەرزەوە گەڕامەوە ژوورەكەی خۆم. لەدواییدا پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە فەرمووی: ئەی عائیشە ئەو دڵەگەورەییە چییە هەتە ؟ دەفەرموێ :منیش گوتم:بەدایك‌و باوكمەوە بەفیدات بین ، ئەی پێغەمبەری ﷺ خودا تۆ ئەو كاتەی كە هاتیە ژوورەكەی من كاتی نوستنبوو ، بەرگی شەوت داناو، هاتیە سەر جێگەی نوستنت‌و دوایی زۆرلەلای من نەمایەوە هەستای و بەرگت لە بەركردەوە و ڕۆیشتی :بەڕاستی منیش غیرەو دڵپیسیم لێكردی ، وام بە بیرداهات كەتۆ من بەجێدەهێڵی‌و دەڕۆیەلای هاوسەر و خێزانەكانی ترت :بۆیە منیش خۆم بۆ نەگیراو بە دواتدا هاتم بەلأم ، لەناو گۆڕستانی (بەقیع)داچاوم پێتكەوت چیت دەكرد. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی :ئەی عائیشە تۆ لەوە دەترسای من فێڵ لە خوداو، پێغەمبەرو ﷺ، لە تۆ بكەم؟ بەلأم دەرچونەكەم لەبەر ئەوەبوو :حەزرەتی جبرائیل ئەو كات هاتە لام و فەرمووی:ئەم شەو نیوەی مانگی شەعبانە :لەو شەوەدا خودای گەورە بە ئەندازەی مووی حەیوانەكانی هۆزی (كولەیب) كەدیارە ئەو هۆزە حەیوان‌ومالأتیان یەكجار زۆرهەیە ئادەمیزادەكان ئازاد دەكات ئەوانەی كەباوەڕیان بەخودا هەبووە: بەلأم كرداری خەراپەیان كردووە: وەلەو شەوەدا

خودای گەورە سەیری هاوبەش پەیدا کەران و، ئەوانەی دوژمنایە تی وناخۆشیان لەگەڵ یەکترداهەیە ناکات و، وەسەیری ئەوانەش ناکات کەسەردان و سیلەی خزمایەتی و دۆستایەتی بەجێناهێنن و، خەراپەکارو بەدڕەوشتن و، ئەوانەش کەئازاری دایك و باوکیان دەدەن و ، وە ئەوانەی مادەبێهۆشکەرەکان دەخۆنەوە . ئینجالەدوای ئەو ووتوێژە پێغەمبەرﷺ جل و بەرگەکانی دانایەوەو، پێی گوتم : ئەی عائیشە ئەم شەو ڕێگەم پێدەدەی نوێژو خوداپەرستی بکەم؟ منیش گوتم : بەدایکم و باوکمەوە بەفیدات بین بەڵێ، ڕێگەت پێدەدەم .پێغەمبەر ﷺئەوجار هەستا کڕنۆشێکی زۆر دوور و درێژخایەنی برد:بەجۆرێك من وام هەست کرد کە پێغەمبەر ﷺگیانی تێدا نەمابێ بۆیە سەری بەرز نەکردەوە: منیش هەستام و چومەلای دەستی لێبدەم بزانم ماوە یان نەماوە:دەستم لەبن قاچی پێغەمبەرﷺ داقاچی جوڵاند، بەڕاستی بەو جوڵاندنەی زۆر کەیف خۆش بووم و دڵم گەشایەوە . چونکەبۆم دەرکەوت کە پێغەمبەرﷺماوە، وەگوێم لێبوو لە کڕنۆشەکەیدا دەیفەرموو: (اللهم أعوذ بعفوك من عقابك، وأعوذ برضاك من سخطك، واعوذ بك منك جل نفسك، لاأحصی ثناء علیك انت كما أثنیت علی نفسك) بۆ بەیانی کە ڕۆژ بۆوە، ئەو ڕوداوەم بۆ پێغەمبەر ﷺگێڕایەوە ئەویش فەرمووی :ئەی عائیشە فێری ئەو دووعایە بووی؟ گوتم :بەڵێ، پێغەمبەر ﷺفەرمووی : ئەی عائیشە فێری بە:ئەودوعایە حەزرەوتی جبرائیل فێری کرم و، فەرمانیشی پێکردم کەلە کڕنۆشەکەمدا دووبارەی بکەمەوە .

## ترس لەزاتی خودا

## مخافة الله

دەگێڕنەوە سەعلەبەی کوڕی عبدالله ﷺزۆر بەغەم و تەنگی پێغەمبەرەوەﷺ بووە : هەردەم لەلای بوو خزمەتی دەکرد: واڕێکەوت ڕۆژێك بەلای ماڵە ئەنساریەکدا ڕۆیشت سەیری حەوشەکەیانی کردچاوی بەئافرەتێکی ڕووتکەوت خۆی دەشوشت :هەر بەچاو پێکەوتنی یەکەم وازی نەهێناو ڕاوەستا هەرسەیری دەکرد، هەتا ترس و بیمێکی زۆری کەوتە دڵەوە و لەرزی لێهات، بیری کردەوە

ئارامی لێ هەڵگیراو، لەوە ترسا کەبە هۆی ئەو هەموو تەماشاکردنە ڕەفتار ناشیرینەی، خودای گەورە ئایەتی دەربارە بنێریو، ئابڕوی سەعلەبەبات لەناو باوەڕداراندا بۆیە گوتی: واچاکە هەتا پێغەمبەرﷺپێی نەزانیوم و خودا ئایەتی بۆ نەناردووە لێرە بڕۆم: هەڵات و ڕێگای دەشتو دەری بریو، لە نێوانی مەککەو. مەدینەدا ڕۆیشتە ئەشکەوتێکەوە ماوەی(٤٠)چل ڕۆژ سەعلەبە بزر بوو هەواڵی نەبوو: بەردەوامیش پێغەمبەرﷺهەواڵی دەپرسی بەڵام، کەس نەبوو بزا نێ لەکوێیە؟ هەتا حەزرەتی جبرائیل عليه السلامهاتە خزمەت پێغەمبەروﷺفەرمووی: ئەی محمد خودای گەورە سەلامت لێدەکات و هەواڵی سەعلەبەت پێڕادەگەیەنێ کە لەناو گەلە کەت ڕای کردووەو، لەفڵانە شوێنە لە ئەشکەوتێك دایە بەردەوام لە خودادەپاڕێتەوە کە خوالێی خۆشبێتو لە ئاگری دۆزەخ بیپارێزێ: پێغەمبەری ﷺ خوداش بۆ مەبەستی ئەو هەواڵە عومەری کوڕی خەتابو، سەلمانی فارسی ﷺناردوو فەرمووی بڕۆن سەعلە بەی کوڕی عبدالرحمانم بۆ بهێننەوە لە فڵانە جێگە :ئەوانیش بەناو دۆڵ و شیوەکانی مەدینەدا ڕۆیشتن بۆ هەواڵ پرسین گەیشتنە شوانێکی مەڕ لەوەڕێن بە ناوی(زەفافە) عومەر ﷺفەرمووی :ئەی زەفافە هیچ هەواڵت بە گەنجێك هەیە لەوناو شاخانەدا؟ زەفافە گوتی : ئومێد دەکەم ئەو گەنجە بڵێی کە لە ترسی دۆزەخ هەڵاتووە؟ حەزرەتی عومەر ﷺفەرمووی : چۆن دەزانی لەترسی دۆزەخ هەڵاتوە! زەفافە گوتی :کە نیوەی شەودا دێت لەناو ئەودۆڵەوە بۆ لای ئێمەدێت، هەردووك دەستی لەسەرسەری دادەنێت و هاوار دەکا و دەگریاودەڵێ: ئای خودایە خۆزگە گیانت دەکێشام و لەناو گیاندارەکانتدا نەدەهێشتم خۆزگە لاشەکەمت لەناو لاشەکاندا نەدەهێشتو، بەڕووتی بۆ لێپرسینەوەو جیاوازی لە ئادەمیزادەکانم ڕانەکێشی: حەزرەتی عومەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ ئەوەمان دەوێت؟ زەفافە لەگەڵیان ڕۆیشتە ئەو شوێنەی کە هەموو شەوێك دەهات: ئەو شەوەش لەنیوەی شەودا گوێیان لێبوو بەناڵەو هاوارێکی زۆرەوە بەدەرکەوت بەرەو لایان دەهات دەیگوت:ئەی خودایە خۆزگە گیانمت لەناو گیانەکاندا دەردەکرد و لاشە کەشمت لەناو لاشەکاندا نەدەهێشت. کەنزیك

بۆوە حەزرەتی عومەرﷺ شاڵاوی بردە سەری پەلاماری داوگرتی:دوای ئەوەی کە هەستی بەعومەرﷺکرد گوتی: داوای ئارامیت لێدەکەم ئارامی:ئەی عومەرکەی من لەئاگرپزگارم دەبێت:حەزرەتی عومەرﷺفەرمووی: من عومەری کوڕی خەتابم، سەعلەبەﷺ گوتی: توخوداعومەرﷺ پێغەمبەر ﷺبە تاوانەکەی منی زانیوە؟ عومەر ﷺفەرمووی :من هیچ زانیاریەکم لەو بارەوە نیە! تەنها دوێنی پێغەمبەر ﷺ زۆر بە هێمنیەوە باسی تۆی بۆ کردین،و، بۆلای تۆی ناردین بتبەینەوە ، سەعلەبە ﷺگوتی: تو خودا عومەر کەدەم بەیتەوە لای پێغەمبەرﷺ یان لەکاتی قامەتی بیلال دابێت یان لەکاتی نوێژ دابەستنی پێغەمبەرﷺدابێ: عومەر ﷺ فەرمووی: باشە بەڵێنەکەت بە جێدەگەیەنم .ئینجا ئەو کاتەی کە حەزرەتی عومەر ﷺگەیشتەوە مەدینەو ڕۆیشتە مزگەوت پێغەمبەرﷺ نوێژی دەکرد سەعلەبە کە گوێی لەدەنگی قورئان خوێنی پێغەمبەر ﷺبوو بێهۆش کەوت، بۆیە سەعلەبەیان داناو عومەرو سەلمان ﷺلەگەڵ پێغەمبەرداﷺ نوێژیان دابەست : کەپێغەمبەر ﷺسەلامی دایەوە بە عومەرو سەلمانی فەرموو:سەعلەبەی کوڕی عبدالحمنتان چی لێکرد؟ عومەر فەرمووی: ئەوەتە لێرەیەئەی پێغەمبەریﷺ خودا، پێغەمبەر ﷺڕۆیشتەلای و ڕایوەشاندو بەهۆش و ئاگای هێنایەوە، دوای پێغەمبەر ﷺفەرمووی: ئەی سەعلەبە هۆی چیبو تۆ وا لەمن جیاواز بوویەوە:سەعلەبە ﷺگوتی: بەڕاستی هۆی گوناهو تاوانم بوو :پێغەمبەر ﷺ فەرمووی :شتێکت فێرکەم کە گوناهو تاوان ڕەش دەکاتەوە؟ ئەویش گوتی :بەڵێ، ئەی پێغەمبەریﷺ خودا :فەرمووی :بڵێ ﴿اللهم ربنایَتنافی الدنیاحسنه وفی الآخرەحسنه وقناعـڗاب النار﴾ سەعلەبە ﷺ گوتی: یارسول اللهﷺ بەڕاستی گوناهو تاوانی من زۆرگەورەیە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی : نا سەعلەبە بەڵکو فەرمانی خودا زۆر لەگوناهو تاوانی تۆ گەورەترە .ئینجا لەدوای ئەوەپێغەمبەر ﷺ ڕێگەی بەسەعلەبەدا بڕواتەوە ماڵ،و پشویەك بدا ئەویش ڕۆیشتەوە ماڵ،و نەخۆش کەوت سێ ڕۆژ لەجێگەدا کەوت سەلمان ڕۆیشتە لای پێغەمبەر و ﷺ هەواڵی نەخۆشی سەعلەبەی بە پێغەمبەرﷺ ڕاگەیاند پێغەمبەر ﷺفەرمووی:

هەستن بابڕۆین بۆدیدەنی سەعلەبە پێغەمبەرﷺ ڕۆیشتە ژوورەوە بۆلای سەعلەبە ﷺئەویش سەری لەوشوێنەی پێغەمبەریﷺ لێبوو لابرد :پێغەمبەر ﷺ فەرمووی :ئەی سەعلەبە بۆچی سەرت لادەبەی؟ گوتی :ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ مێشكو سەرم پڕیەتی لەگوناه و تاوانو ، حەزناكەم لەبەر ئەو گوناه و تاوانانەوە لەلای تۆبێت؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی:سەعلەبە ئێستا هەست بەچی دەكەی؟ سەعلەبەﷺگوتی :هەستدەكەم لە نێوانی پێستو ئێسقا نمدا وەكو مێروولەدێتو دەڕوات .پێغەمبەرﷺ فەرمووی :حەز و ئارەزووی چیدە كە یت؟ ئەویش گوتی :حەزو ئارەزوی لێبوردنی خودادەكەم. پێغەمبەرﷺفەرمووی بەهۆی ئەو تەوبە ڕاستەقینە و پەشیمانبوونەوە خودا لێت دەبووریٚ، لەو كاتەدا سەعلەبە ﷺهاوارێكی بەهێزی كردوو گیانی دەرچوو .لەدوای ئەوە پێغەمبەروﷺ یارانی شوشتیانو كفنیان كردو نوێژی لەسەركردو بەرە و گۆڕستان هەڵیان گرتو پێغەمبەر ﷺلەسەر پەنجەی پێیەكانی زۆر بەهێواشی دەڕۆیشت. گوتیان : یارسول الله بۆچی وا بەسەر پەنجەی پێیەكانت بە هێواشی دەڕۆی؟ لەوەلآمدا فەرمووی: لەبەر زۆری ئامادەبوانی فریشتە كان بۆ بە خاكسپاردنو شاردنەوەی سەعلەبە نەم دەتوانی قاچەكانم لەسەر خاكدابنێم.

## لەناو كفنەكەم بهاون هەتا بەخزمەت خودای خۆم دەگەم

## أجعله فى كفنى ألقى به ربى

لە كاتێكدا حەزرەتی عومەرﷺلەشام گەڕایەوە بۆ مەدینە: لەناو خەڵكدا جیاواز بۆوەو لەناوشاری مەدینەدا دەگەڕا بۆ ئەوەی هەواڵی شوێن كەوتوانی بپرسیٚ چییەو چۆنن : ڕۆیشت تا گەیشتە لای ماڵی ئافرەتێكی پیر، ڕۆیشتە ژوورەوە و:لە شوێنو جێگەو پەناگەی ماڵی خۆیان :عومەرﷺ ڕۆیشتە لای و: ئافرەتەكە پرسیاری لێكرد برام عومەر چی لێهات؟ عومەریش ﷺگوتی: خوشكم عومەر بە تەندروستیەكی باشەوە گەڕاوەتەوە لەشام. ئافرەتە پیرەكە گوتی: یاڕەبی خودا باشی بۆ عومەر نەكات. عومەرﷺ فەرمووی: لەبەرچی خوشكم خودا چاكی بۆ نەكا؟ ئافرەتە پیرەكە گوتی :سوێند بە خودا لەوەتی عومەر بۆتە پێشەواو

فەرمانداری دەوڵەتی وەرگرتووە، هەرچی خێرو پاداشتە لە عومەرەوە بەمن نەگەیشتووە :عومەریش ﷺگوتی:خوشكم بۆی هەیە عومەر لە بارەی تۆوە هیچ زانیاریەكی پێنەگەیشتبێت لەبەر ئەوەی ماڵەكەت لە شوێنێكی بزرو نادیاردایە؟ ئافرەتە پیرەكە گوتی :پاكو بێلەكەیی بۆخودا .سوێند بەخودا من وا هەست ناكەم كەسێك كە فەرمان ڕەوای وڵات بێتو، نەزانێ لە نێوان و، سنوری خۆر هەڵاتو، خۆر ئاوای وڵاتی فەرمان ڕەواییەكەی چی هەیەو چی ڕودەدا .حەزرەتی عومەرﷺ دەستی كرد بەگریان فەرمووی :ئەی عومەر هەموو كەس لە تۆ زاناو دلناترە تەنانەت پیرو پەككەوتەكانیش. ئینجا عومەرﷺبە پیرەژنەكەی گوت: ئەی خوشكی بەڕێزم ئەوستەمو تاوانەی كەعومەرلەتۆی كردووەبەچەندی پێم ئەفرۆشی تالێت بكرم، دەمەوێ بەرامبەر بەعومەر بە بەزەیی و مهرەبانبم ولە ئاگر ڕزگاری بكەم. پیرەژنەكە گوتی: ڕەحمەتی خودات لێبێ گاڵتەم پێ مەكە. عومەر ﷺفەرمووی :بەخودا گاڵتەت پێناكەم و من گاڵتە جاڕنیم. عومەرﷺوازی لێنەهێنا هەتا دڵی ئافرەتەكەی ڕازی كرد بەگەردەن ئازادیو (٢٥) بیستو پێنج دیناریشی بداتێ .هێشتا عومەرﷺ لەلای پیرەژنەكە بوو كە حەزرەتی عەلی كوڕی ئەبی تالیبو، عبدالله ی كوڕی مەسعود ﷺگەیشتنە لای و گوتیان :سەلامی خودات لێبێت ئەی پێشەوای موسڵمانان: كاتێ پیرەژنەكە زانی ئەوە پێشەوای موسڵمانانەو حەزرەتی عومەرە بە هەردوو دەستی بەسەری خۆیدا دەداو، دەیگوت: بەدبەخت و چارە ڕەش بۆ خۆم، ئای چیم كرد خۆ ئەمن بەرامبە پێشەوای موسڵمانان قسەی ناشیرین و جنێوم پێدا ئێستا من چیبكەمو بڵێم چی؟ حەزرەتی عومەر ﷺپێی گوت:خوشكم هیچ دڵتەنگ مەبە هیچ نەبووە خودا ڕەحمت پێبكات.لەدواییدا حەزرەتی عومەر ﷺداوای پارچەیەك شتی كرد ئەو گەردەن ئازادیو، ڕێككەوتنەی تێدا بنوسێ : بەڵام هیچی دەست نەكەوت:دوایی هەر لە عەبایەكەی خۆی پینەیەكی لێكردەوەو تێیدانوسی: بەناوی خودای گەورەو میهرەبان :ئەوا عومەر زوڵمو ستەم لێكراوی فڵانە پیرەژنەی لە ڕۆژی دەست بە كاركردنی پێشەوایەتی هەتاكو ئەمڕۆ بە(٢٥) بیستوپێنج دیناركڕی .

هەرشتێك لەرۆژی دوایی لەبەردەستی پەروەردگار لەعومەر داوا بكات ئەوا عومەر ئازادو سەر فیرازە. ئینجا لەدوای ئەوداوایە حەزرەتی عەلی كوری ئەبوتالب و. عبداللەی كوری مەسعود ﷺبوونە شاهید لەسەر داوایەكەو، لەكۆتایشدا حەزرەتی عومەرﷺ نوسراوەكەی دابە كورەكەی و پێیگوت: هەر كاتێ مردم ئەوكتاب و نوسراوەم بۆ لە ناوكفنەكەم بهاون بۆ ئەوەی بەو كتابەوە بگەمە لای پەروەردگاری خۆم.

## بەراستی من لەگوناهو تاوانم دەترسم

## إنی أخاف ذنوبی

دەگێرنەوە جارێك پێغەمبەریﷺ خودا رۆیشتە سەردانی كابرایەكی نەخۆش كە لەگیانەلادا بوو: پێی فەرموو: چی دەبینی و چیت دێتە پێش چاو؟ گوتی: بەراستی زۆر لە گوناهەكانم دەترسێم، بەلام هیوای زۆریشم بە لێبوردن و میهرەبانی خوداهەیە پێغەمبەری ﷺخوداش فەرمووی: لەو كاتەدا هەرچی ئادەمیزاد بەبیری دابێت و داوای بكات خودا پێی دەبەخشیو بێ هیوای ناكات : وە هەرچی شتێكیش كەلێی بترسێ، خودا هێمنیو ئارامی پێدەبەخشێ.

## لەخۆتان بپرسنەوە پێشی ئەوەی لێتان بپرسنەوە

## حاسبوا أنفسكم قبل أن تحاسبوا

كابرایەكی هۆزی (مراد)جارێك بەلای وەیسی قەرەنیدا ﷺرۆیشت پێی گوت :ئەم شەوت چۆن بردەسەرو رۆژت كردەوە؟ وەیس گوتی : بەسوپاس و شوكری خودا رۆژم كردەوە، پێیگوت كات و سات چۆن لەگەڵتدا دەروات؟ وەیس گوتی برای موورادیم : كات و سات لەم سەر رووی زەمینە هەرگیز خۆشی بۆ باوەرداری تێدا نیە .وەئەگەر ئادەمیزاد هەوڵی فێر بوونی زانستی قورئان و فەرمانەكانی خودا بدات با باش بزانێ لەماڵیدا زێر و زیو جەواهیر نابینێ .وە ئەگەر بەراستی و حەق و داد گەری بجولێتەوە، ئەوە دۆست و هاورێو خۆشەویستی نابێت .كابرا گوتی: قسەیەكم بۆ بكە كە لە پێغەمبەرت ﷺبیستووە؟ وەیس ﷺگوتی :برام من پێغەمبەرم ﷺنەدیتووە هەتا قسەت بۆ باس بكەم :بەلام بەو جۆرە كردارو رەفتار

بكە كە پێغەمبەر ﷺفەرموویەتی :﴿حاسبوا انفسكم قبل ان تحاسبوا فان الله جعل الدنیا قنطرة للآخرة فاعتبروها﴾.بەڵێ بەڕاستی خودا ئەو دونیایەی كردووە بە پرد بۆ پەڕینەوەی دواڕۆژ ئێوەش پەندی لێوەر بگرن.

# تۆ كەوتەو بەد بەختبووی خودا بەرزی كردیەوە

# كنت وضیعا فرفعك الله

كابرایەك هاتەلای عومەری كوڕی خەتاب‌ﷺ پێی گوت:ئەی عومەر فلانەكەس ستەمی لێكردوومو، حەق و تۆڵەم بۆ وەربگرەوە؟ حەزرەتی عومەر ﷺ عەسایەكەی بەرز كردەوەو، بە سەری خۆی دادا و فەرمووی :ئێوەداوای تۆڵە لەمن دەكەن لەكاتێدا كەمن سەرقاڵی بەجێهێنانی كاری موسڵمانانم، دێن‌ودەڵێن تۆڵە، تۆڵەمان بۆ وەربگرەوە: كابرا لەلای عومەر هاتە دەر و هاواری دەكرد و دەنگی بەرز كردەوە :حەزرەتی عومەرﷺفەرمووی :ئەو پیاوە ئامادە بكەن! كاتێ ئامادەیان كرد ، حەزرەتی عومەرﷺدار عەسایەكەی دایەدەست‌و پێیگوت : هەستە تۆڵەی خۆتی لێبكەوە؟ كابرا گوتی:لەبەرخوداو لەبەرتۆوازی لێدێنم: حەزرەتی عومەرﷺ فەرمووی: بەو جۆرەی تۆ دەڵێی نابێت :یان لەبەر خوداوازی لێ بهێنەو، بەویست‌وخواستی ئەوەی لەلایەتی :یان لەبەر من وازی لێبهێنە .! كابرا گوتی :لەبەر خودا وازی لێدەهێنم: ئەوەی گوت‌و ڕۆیشت.لەدوای ئەوە حەزرەتی عومەرﷺ ڕۆیشتەوە شوێنی خۆی‌و، دوو ڕكات نوێژی سوكی كردوو، ڕووی لە خۆی كردوو بەخۆی گوت :ئەی كوڕی خەتاب تۆ لەزەرەر و زیان‌و فەوتان دابووی، خودا بەرزی كردییەوە. تۆ سەر گەردان‌و، بەدبەخت بووی، خودا شارەزاو، ڕێنمونی كردی ، تۆ زەبوون‌و لاواز بووی، خودا بەرز و گەورەی كردیەوە.كەچی ئێستا كەوتویە وێزەو ئەس تۆی خەڵكی ، كابرایەك دێتەلات و داوای یارمەتیت لێدەكات‌و، تۆش تۆڵەی بۆ دەكەی تەوە: ڕۆژی دوایی چی دەڵێی و چۆن وەڵام دەدەیەوە ؟ ئینجا دەستی كرد بەگریان.

# ئایا بۆچی بەزەییتان پێدا نەهاتەوە

# هلا رحمتموها

دەگێڕنەوە ئەحنەفی کوڕی قەیس ﷺ لەجەنگی ئازادی گەورەدا: هاتە خزمەت حەزرەتی عومەری کوڕی خەتاب ﷺ بەئەحنەفی فەرموو: ئێوە لەکوێ کۆچ و بارگەتان خستووە؟ ئەحنەفیش گوتی :لە فلانە شوێنەدا، حەزرەتی عومەر لەگەڵمان هات هەتا گەیشتینە شوێن و جێگەی بارگەکەمان و، ناو وڵاغەکان کە بەڕاستی زۆر هیلاك و ماندوو بوون بەهۆی بارووڕێگەی دوورمان. فەرمووی: بۆچی لە خودا نەترسان وڵاغەکانتان زۆربرسی کردووەو هیچتان پێنەداون، ئەدی نازانن ئەوانەش حەقیان بەسەر تانەوە هەیە؟ بۆچی بەزەییتان پێدا نەهاتوونەوە بۆ ئەوەی پوش وگیای ئەوخاك و زەمینە بخۆن؟ ئەحنەف گوتی: ئەی پێشەوای موسڵمانان بەڕاستی ئێمە لە جەنگی ئازاد کراوێکی زۆرگەورە گەڕاوینەوە و حەزمان کردزوو بگەینەلای بەڕێزتان و موسڵمانان کە هەواڵی دڵخۆشی سەرکەوتنتان پێ بدەین، ئینجالەدوای ئەوە حەزرەتی عومەر ﷺ گەڕایەوەو ئێمەش گەڕاینەوە.

# لەترسی تۆ خودایە

# خشیتك یارب

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی :لە گەل و نەوەکانی پێشی ئێوە کابرایەك زۆر لەناو گوناه و تاواندا ڕۆچوو بوو :ڕۆژێك کوڕەکانی کۆکردەوەو پێی گوتن ڕۆڵەکانم : بەڕاستی من زۆر گوناه و تاوانم کردووە ئەگەر مردم زۆرباش بم سوتێنن ووردوخاشم بکەن و بمهاڕن و، دوایی فڕێم بدەنە ناو دەریاوە، سوێند بەخودا ئەگەر خودا دەسەڵاتی بەسەرم دابێ سزاو ئازارێکی وام دەدات هیچ کەسێك وائازار نەدرابێت چونکە هێندەم تاوان زۆرە.کاتێ ئەو پیاوە مرد کوڕەکانی ڕاسپاردە و وەصیەتەکەی باوکیان بەجێهێنا .لەدواییدا خودای گەورەو بە دەسەڵات فەرمانی بەزەویدا ئەوەی کەلەناو خۆت شاردووتەوە بۆمان بگێڕەوە دەرێ: لەو کاتەدا ئەو کابرایە بەلاشەیەکی تەواو لەبەر دەستی بە توانا و

بەدەسەلاتی خودا ئامادەبوو:خودا فەرمووی :چی هۆیەك بوو پاڵی پێوەنای ئەو
هات لێبکەن: ئەویش لەوەڵام دا گوتی :بەخودا لەبەر زۆری تاوانم لە ترسی
ئازاری تۆ بوو: بەهۆی ئەو باوەڕو ترسەی لەخودا لێی خۆش بوو.

## زانیم کەخودا پرسیارم لێدەکات

## علمت أن الله سائلی

دەگێڕنەوە عومەری کوڕی خەتاب ﷺ ڕۆیشتەلای ئەبوبەکری صدیقﷺ سەلامی لێکرد ئەبوبکر وەڵامی نەدایەوە: عومەر، بەعبدالرحمنی کوڕی عەوفیﷺ گوت: بەڕاستی دەترسێم لەخەلیفەوپێشەوای موسڵمانان لێم عاجزو زویر بوو بێت:عبدالرحمن لەوبارەوە ڕۆیشتەلای ئەبوبکرقسەی لەگەڵداکرد ئەبوبکر ﷺلەوەڵامدا فەرمووی: عبدالرحمنﷺ بەڕاستی لەوکاتەی کەعومەرﷺهات ئەمن دووکەسی نەیار و ناحەزم لەلا دانیشت بوون چاو و گوێم بەتەواوی بۆئەوان کرد بووەو گوێم لە قسەکانیان گرتبوو زۆرباش دەمزانی کەخودا پرسیاری ئەوانەو ئەوەی کە گوتویانە لێم دەکات و دەپرسێتەوەو، ئەوەی کەتۆش گوتت.

## خودا لەکوێیە ئەی برای عەرەب؟

## وأين الله يا أخا العرب؟

دەگێڕنەوە: پێشەوا عومەری کوڕی خەتابﷺ بەڕۆژدا دادوەری دەکردوو بەشەویش دەگەڕاوکارو باری موسڵمانانی بە سەردەکردەوە: جارێکیان زۆر هیلاك و ماندوو بوو خەوەنوچکە وەنەوزەی دەبردەوە ماوەیەك بەو جۆرە مایەوە : کابرایەك بەگەلە مەڕێکەوەبە بەردەمی عومەردا ڕۆیشت:حەزرەتی عومەر ﷺبە ئاگادێتەوە :ئینجا بۆ ئەزموون و تاقیکردنەوەی ئەو کابرایە پێی دەڵێ :براکەم یەکێك لەومەڕانەم پێ بفرۆشە؟ کابراش دەڵێ :ئەمن بەندەم و شوانی ئەو مەڕانەم و، ئیخۆم نیەو خاوەنیان هەیە خاوەنی گەورەو لێپرسراوەکەمە: عومەر ﷺفەرمووی باشە قەیدی چییە تۆ مەڕێکم پێ بفرۆشە؟ لەوکاتەدا کەس ئاگای لێنیەو خاوەنەکەشی نازانێ و، لەلای ئەویش بڵێ گورگ خواردوویەتی :لەوکاتەدا

ئەو بەندەیە ڕاچەنی و هاواری كردوو گوتی :ئەدی خودا لەكوێیە ئەی برای عەرەب!؟ دوایی عومەرﷺناونیشانەی ئەومالەی وەرگرت و، بۆ بەیانی كەڕۆژ بووە ڕۆیشتەلای خاوەنی ئەو بەندەیەو لەكابرای كڕی و ئازادی كرد ئینجا عومەرﷺپێیگوت: برام تۆبەیەك وشە، خودا لەدونیا ئازادو ڕزگاری كردی لە بەندایەتی وژێر دەستەیی، وە هیواداریشم لە دوا ڕۆژیشدا لەئاگری دۆزەخ ڕزگارت ببێ.

## لەوڕۆژەدا پرسیاری ئەو خۆشی و نیعمەتەتان لێدەكرێ
## لتسألن يومئذ عن النعيم

(ئەبوحازم)ﷺدەفەرموێ:جارێك لە(عومەری كوڕی عبدالعزيز)ﷺ چومە پێش :كە تەماشای كردم ناسیمیەوە ، بەلام من ئەوم نەناسی :پێی گوتم: ئەبوحازم وەرە پێشم لێم نزیك ببەوە كەلێی نزیكبوومەوە منیش ناسیمەوە. پێم گوت :عومەرﷺ ئەوە تۆی ئێستا پێشەوای موسڵمانانی؟ فەرمووی:بەڵێ، گوتم: دوێنێ كەس لەمەدینە لێپرسراو نەبوو گوتی:بەڵێ، وابوو:منیش گوتم: بەڕاستی جێگەی سواربوونت نەرم و نیانەو، بەرگ و پۆشاكەكەت پاك وجوانەو، ڕوخسارت گەشاوەو ڕازاوەیەو، خواردنەكەت بەتام و خۆشەو، پاسەوانەكانت زۆرن و، چی شتێك وای لێكردی ئاوابگۆڕێی:خۆ تۆ پێشەواو سەرداری موسڵمانانی :عومەرﷺ دەستی كرد بەگریان ودوایی فەرمووی :ئەی باوكی حازم ئەگەرتۆلەدوای سێ ڕۆژ لەناوگۆڕدابم بینی چیم پێدەڵێی كەئەوكاتە گلێنەی چاوەكانم بەسەرگۆنا و كوڵمەكانمدا ڕژاون و، هاتوونەخوارو، سكم توێ توێ و، قاش قاش بووەو، كرم لەگیان و لاشەم بەربووە: ئەو كاتە هەرگیز لە ئەمڕۆ خەراپتر نامناسیەوە؟ دەئێستاش ئەوحەدیسەی كە لە مەدینەدا بۆت باس كردم ئێستاش بۆم دووەبارە بكەوە:منیش گوتم :باشە بە چاوان ئەی پێشەوای موسڵمانان ﴿ سمعت ابا هريرة يقول :سمعت رسول الله يقول إن بين أيديكم عقبة كؤودا مضرسة لن يجوزها إلا كل ضامرمهزول ﴾. عومەر ﷺدەستی كرد بەگریان و، گوتی: تۆ سەر زەنشتی من دەكەی ئەی باوكی حازم دەتەوێ گیانی خۆم بۆ ئەودونیای دواڕۆژ و شوێنە

بشارمەوە : ئومێدەوارم كە لە ناخۆشی ئەوڕۆژە پزگارم بێت :بەلاّم بەخودا هەست ناكەم پزگارم بێت چونكە ئەوڕۆژە پرسیاری هەموو خۆشی و نیعمەتێكت لێدەكرێتەوە.

## داوات لێدەكەم بۆ ئەو كارانەی كە لە تۆم نزیكدەخاتەوە

## أسألك من الامور أقربها

زوننونی میصری‌ﷺدەفەرموێ :شەوێك بەدەوری (بەیت)دا دەسوڕامەوە تەوافم دەكرد:چاوەكانم لەپشو حەسانەوەدا بوون: واتە: زۆر ئاگادار ووریابووم: لەو كاتەدا كابرایەك گەیشتە تەنیشتم و گوێم لێی بوو دەیگوت: ئەی پەروەردگارم من بەندەیەكی هەژارودەركراو، نەویستراوم: دەربەدەر و پەرتەوازەم لەنێوانی دروست كراوەكانت :داوات لێدەكەم بەوكارانەی كە لە تۆم نزیك دەكاتەوە. وە دووبارەداوات لێدەكەم بە هەڵبژێر دراوانی بەڕێز لە پێغەمبەران ، شەربەتی پیاڵەی خۆشەویستی خۆتم پیّ نۆش بكەی‌و، پەردەی تاریكی‌و نەزانیش لەسەر دڵم لابدەی، هەتا بە باڵی شەوق‌و خۆشەویستی بۆلات بفرم.داوات لێدەكەم بەستون و پایەكانی حەق‌و ڕاستی لەنێوانی ڕووناكی‌و ڕازاوەییدا.لەدوای ئەوە دەستی كرد بە گریان‌و زۆرگریا: دوایی هەر لەو كاتەدا دەستی كرد بە پێكەنین و گەڕایەوە (زەننون)ﷺبەدوای داڕۆیشت هەتالە (بەیت) ڕۆیشتەدەرو، شیو دۆڵ‌و، وێرانگەكانی مەككەی گرتەبەر، دوایی ڕووی لە زەننون كردوو گوتی :بۆچی لە دوواوەمی بگەڕێوە تۆ ئیشوو كاری خۆت نییە؟ زەننون ﷺگوتی :پێم بڵیّ ناوت چیە ڕەحمەتی خودات لێبیّ؟ گوتی :ناوم عبداللەیە و كوڕی عبداللەم زوننونیش گوتی :دەزانم هەموودروست كراوو بەندەكان، بەندەی خودان‌وكوڕی بەندەی خودان :بەلاّم ئەوناوەی خۆتی پێدەناسرێیەوە چییە؟ گوتی:سەر پەرشتیارم ناوی لێناوم باوكی سعدون.زوننون گوتی :ئەوگەلە كێن كەتۆ بەناوی ئەوانەوە داوا لەخودا دەكەیت؟ گوتی :ئەوانە هۆزو گەلێكن بە تەواوی بۆلای خودا ڕۆیشتون :وەكو ئەوانەی كە خۆشەویستی لەنێوانی چاوەكانیاندا دیارو چەسپاوە. وەبە جۆرێك لە خودا ترساوە، وەك‌و كەسێكی كار گوزاروئاگر خۆشكەری دۆزەخ دڵی گرتبێت.

# هەر کەس لە خودا بترسێ هەمووشتێکی لێدەترسێ
# من خاف الله خاف كل شيء

هەر کەسێ بەتەواوی لە خودا بترسێ:هەموو شتێکیش لەو دەترسێ تەنانەت درندەو شێر و پڵنگ. هەر لەبەر ئەوە بوو حەزرەتی عومەری کوڕی خەتاب ﷺ لەگەڵ ئەو هەموو تەوازعو مل کەچیو خۆبەکەم زانینەی، هەموو دەروبەر و ئادەمیزادەکان لێی دەترسان تەنانەت دەیان گوت: داردەستەکەی حەزرەتی عومەر ﷺ زۆر ترسناکترە لە شیری حەجاج. بەجۆرێك خەڵکان لەعومەر دەترسان دڵیان دەتۆقی، دەگێڕنەوە: جارێك عومەر ﷺ بەدوای ئافرەتێکیدا نارد کەزۆربێشەرم بوو :لەگەڵ پیاواندا دەدواو لێدوانودەم بەدمەی دەکرد :کاتێ نوێنەری عومەر گەیشتەلای ئافرەتەکە ترساو ڕاچەنیو دڵی تۆقا :ئەو ئافرەتە منداڵی لە سکی دابوو بەرەکەی فرێدا لەترسان :کاتێ ئەوهەواڵە بە عومەر ﷺ گەیشتەوە زۆری پێناخۆش بوو :بۆ ئەو مەبەستە زۆربەی یارەکانی پێغەمبەر :ﷺ ئەوانەی کەخاوەنی پرسو ڕان کۆکردەوەو، ئەوڕوداوەی بۆ باسکردنو، تێی گەیاندنو، ڕاوێژی تەواوی لەگەڵدا کردن، کە عومەر پێویستە چیبکات؟ ئەوانیش لەگفتوگۆیەکانیاندا گوتیان :تۆ لەو بانگ هێشتنەدا مەبەستت ئامۆژگاری بوو بۆ چاکە، بۆیە تۆ لەوبارەوە هیچت لە سەرنیە .بەڵام حەزرەتی عەلی ﷺ هیچ لێدوانێکی نەدا، عومەر ﷺ ڕووی لە عەلی کردوو فەرمووی :ئەی عەلی تۆش لەوبارەوە لێدوانی خۆت دەربڕە؟ عەلی ﷺ فەرمووی :گوێبیستی لێدوانی هاوڕێکانم بووم کەچییان گوت :بەڵام عومەر ﷺ فەرمووی:دەمەوێ لێدوان و قسەی تۆش لەو بارەوە بزانم؟ عەلیش ﷺ فەرمووی :هەر ئەوەی ئەو کۆمەڵە فەرموویان.بەڵام حەزرەتی عومەر ﷺ دڵی لەترسان دانەدەمە ز را بۆیە زۆر بەدڵنیاییەوە فەرمووی:عەلی سوێنت دەدەم بەخوا دەبێ تۆش لێدوانی تەواوت هەبێو، چیت لەدڵدایە پێم بڵێی؟ حەزرەتی عەلی ﷺ فەرمووی :ئەگەر بەڕاستی خزمو کەسەکانت لەلات کۆبوونەوە و پشتیان گرتووی، ئەوە بەڕاستی هەڵیان خەڵەتاندووی، ئەگەر لێشت دووربکەونەوە ئەوە دووبارە کەمتەرخەمیان کردووەو

گوێیان پێ نەداوی: عومەرﷺ کوشتنی ئەومنداڵە بەکوشتنی غەڵەت (خطأ) نەردەچێو پەیوەندی بەتۆوەیە !بەگوێرەی یاسای شەرع خوێنەکەی لەسەرخزمە نزیکەکانی تۆیە .حەزرەتی عومەرﷺفەرمووی: سوێند بەخودا عەلی ئەتۆ یەکەم کەسم بووی لەناو ئەو هەموو کۆڕە جەماوەریەدا ئامۆژگاریت کردم .ئێستاش بەخودا لێرەناڕۆم هەتا خوێنی ئەو منداڵە بە هۆزی عودەی نەدەم.

## بەڕاستی خودا لە ڕۆژی دواییدا پرسیارم لێدەکات

## إن ربى سيسألنى يوم القيامة

کاتێ عومەری کوڕی عبدالعزیزﷺلەدوای بەخاکسپاردنی تەرمی برای هاوسەری خەلیفە سلیمانی کوری عبدالملكﷺبوونەوە :زۆر بەماتەم و غەمباری بەرەوماڵ گەڕایەوە. دۆست و براو هاوڕێیانی لێیان پرسی ؟بۆچی ئەوەندە ماتەم و غەمباری دایگرتوون؟ عومەرﷺفەرمووی: بۆ ئەو هەموو کارو فەرمانەی کە بەسەرمندا کەوتۆتەوە .کە بە تەنها لەسەر من پێویستە: ژیان و خۆشی و ئارامی و ئاسایش بۆ ئەو هەموو کۆمەڵەی کە لەژێر فەرمان ڕەوای دەسەلاتی مندایە بۆیان دابین بکەم :بەبێ ئەوەی کەمن هیچ نوسراو داواکاریەکم لێداوا بکرێ. لەدوای ئەوە عومەرﷺدەستی کرد بەگریان. خێزانە کەی فاتمەی کچی عبدالملك ڕۆیشتەلای و پرسیاری لێکرد بۆچی واپەژارە دایگرتووی و دەگریەی؟ فەرمووی : فاتمە چۆن نەگریەم؟ !من لێپرسراوی ئەو گەلەمو ئیش و کاری ئەو گەلە هەمووی کەوتۆتە سەرشانی من دەبێ بۆیان بەدیبهێنم .بەلام ئێستا بیردەکەمەوە لەهەژارێکی برسی، لە نەخۆشێکی وێڵو سەرگەردان، لەڕووت و شڕەیەکی ماندو تێکۆشەر، لەهەتیوێکی تێك شکاو ، لە بێوەژنێکی تەنهاو بێلانە، لەستەم لێکراوێکی بەزیو تێشکاو، لەئاوارەیەکی نامۆ، لە دیلێکی بێچارەو بێ ئومێد، لەپیرێکی چەماوە و بیکەس، لەخاوەن خێزانێکی بەد بەختو هەژارو نەدار، شێوەی ئەوانەش لەدەرەوەو ناوەوەی ولات:وە زۆر باشیش دەزانم کەخودای گەورە پرسیاری هەموو ئەوانەم لێدەکاتەوە لە ڕۆژی دواییدا. ئینجا بیری ئەوانەدەکەمەوەو دەگریەمو پەژارەدام دەگرێ.

# پەشیمانی
# التوبة

{وَإِنِّي لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ثُمَّ ٱهْتَدَىٰ }طه/٨٢ **واتە: بەڕاستیو دڵنیاییەوە بزانن کەمن زۆر لێخۆش بوو مهرەبانم بۆ ئەوکەسانەی کە باوەڕ دەهێنن و کرداری ڕێکوپێکو باش ئەنجام دەدەنولەدوای ئەوەش زۆر بە باشی لەسەر ئەو ڕێبازەد ەڕۆن خودای گەورە دەفەرموێ:** {إِنَّمَا ٱلتَّوْبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٍ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٍ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا. وَلَيْسَتِ ٱلتَّوْبَةُ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ إِنِّي تُبْتُ ٱلْـَٰٔنَ وَلَا ٱلَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُمْ كُفَّارٌ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا }النساء/١٧-١٨

**واتە: بەڕاستی خودای بە دەسەلآت تەنها تۆبەو پەشیمانی لەو کەسانە وەردەگرێ کە گوناهو تاوان بەنەزانی دەکاتو لەدواییدا زوو دەگەڕێتەوە بۆ لای پەروەردگارو لە کردارەکانی پەشیمان دەبێتەوە، ئەوە بە ڕاستی خودای بەدەسەلآت ئەو پەشیمانیە لەو کەسانە وەردەگرێ وە خودای گەورەش زۆر زاناو دانایە بەو کردارانەی کە دەکات. تۆبەو پەشیمانی بۆ ئەوکەسانەی کەبەر دەوام لەسەر خەراپەو تاوانن هەتا ئەوکاتەی مردن یەخەیان پێدەگرێوخەریکی کۆتایی ژیانیانە ئینجا ئەوکاتە هیچ ڕێگە چارەیەکی ژیانیان نەماوە هاوار دەکەنو دەڵێن ئێستا خودایە بۆ لای تۆ دەگەڕێینەوەو پەشیمانین یان ئەوانەی کە هەر بەبێ باوەڕی دەمرنو کۆچ دەکەن بەڕاستی بۆ ئەوانە سزاو ئازارێکی زۆر ناخۆشمان بۆ ئامادەکردوون.**

**پەشیمانی بەمانای گەڕانەوەی بەندەکان و بەخۆداچونەوەیانو، پەشیمانبوونەوە لەو کردارو گوناهو تاوانا نەی کەکردوویانە، وەبڕیاری ڕاستیوسووربوون بدات لەسەر نەگەڕانەوەی بۆسەر ئەو کردارە ناڕێکو تاوان بارییەی کە کردوویەتی لەدوای تەمەنی ژیانیدا ، ببنە تۆبەکارێکی ڕێکو تەواو و گەڕانەوەیان بۆ لای**

خودا .پاكو بێگەردی بۆئەو خودایەی كەدەستی قودرەتی ڕاخستووە بە ڕۆژ بۆ گەڕانەوە و پەشیمان بوونە وەی لەو تاوانانەی كە بەشەو كردوونی و، بەشەویش ڕای خستووە بۆ ئەو تاوا نانەی كە بە ڕۆژ كردوونی بۆ ئەوەی ئادەمیزاد هەردەم خودای لەیاد بێتو هەموو كاتێ بەپاكیو بێتاوانی ئامادەبێت بۆ گەڕانەوەی بۆ لای زاتی پەروەردگاری .

گەڕانەوە و پەشیمانبوونەوە دووجۆری هەیە، یەكەمیان :پەشیمانبوونەوەیەك كە خودای بە بەزەیی و میهرەبان ڕێز و خۆشەویستی بەزەیی بە بەندەكانی دەبەخشێ.

دووەمیش :پەشیمانبوونەوەی بەندەكانە بە گەڕانەوە بۆ لای خودای بە بەخشندەو بەزەییو داوای لێبوردن و هیوای بەختەوەری لەخودا. پاك و بێگەردیش بۆ ئەوخودایەی كە میهرەبانیەكەی هەموشتێكی گرتۆتەوە .ئینجا بەو هیوایەی كە ڕەحمەتو میهرەبانی خودا زۆر و فراوانە بۆ ئەوانەی دەگەڕێنەوە بۆ لای خودای خۆیان و پەشیمان دەبنەوە .ئەوەش هەموو تاوانبارێك دەگرێتەوە هەر چەند تاوانەكەی زۆر گەورەو فراوان بێت .خوداش حەق و مافی هیچ ئینسانێك بە فیڕۆنادا و میهرەبانی بەسەردا دەڕێژێ كە تۆبە بكا و پەشیمان بێتەوە: هەر لەبەر ئەوەشە من لەو پەڕاوەدا تایبەتم كردووە بە گێڕانەوەی چەند چیرۆك و ڕووداوێك بۆ ئەوە ببێتە بەڵگەو چاو ڕوونیەكی تەواو بۆ ئێمە، كە گەورەیی و پەشیمان بوونەوەی تەوبە چەندە گەورەیەو پاداشتەكەشی چەندە زۆرە لە لایەن خوداوە :كە بابای تەوبەكار پێی دەگات خودای گەورەش لەوبارەوە لە فەرموودەی قودسیدا دەفەرموێ﴿یاإبن آدم خلقتك بیدی وربیتك نیعمتی وأنت تخالفنی وتعصینی وإن رجعت إلی تبت علیك فمن أین تجد لك ربا مثلی وأنا الغفور الرحیم﴾

## حەدم كەوتەسەر تۆڵەم بۆ لێ بستێنە

## أصبت حدا فأقمة علی

جارێكیان ئافرەتێكی هۆزی (جوهەینە) هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺگوتی: ئەی پێغەمبەری ﷺ خودا تۆڵەی شەرعیم كەوتۆتە سەرو: ئەو تۆڵەم لێبستێنەوە! ئەو ئافرەتە داوێن پیسی زینای كرد بوو منداڵیشی پەیدا ببوو: پێغەمبەری ﷺخودا

ناردی بۆ لای سەرپەرشتیارەکەی و بەڵێنی لێوەرگرت کە لەگەڵی باش بێت و ژیانی بپارێزن هەتا منداڵەکەی دادەنێ و، لەدوای ئەوەش هەتاچل ڕۆژەی منداڵ بوونی تەواو دەبێ و دوای ئەوەش هەتا دووساڵی شیردانی بەمنداڵەکە تەواو دەبێ ئینجا، بێتەوە لای پێغەمبەر .ﷺ لەدوای تەواوبوونی ئەو ماوەیە ئافرەتەکە هاتەوە بۆ لای پێغەمبەروﷺهەر سوور بوو لە سەر تۆڵە لێوەرگرتنەوەی: پێغەمبەریش ﷺ فەرمانیدا بەرد بارانیان کرد هەتا وەفاتی کرد: ئینجا پێغەمبەر ﷺ ویستی نوێژی مردووی لەسەر بکات: حەزرەتی عومەر ﷺفەرمووی: ئەی پێغەمبەریﷺ خودا ئەو داوێنپیسەی زیناکەرە نوێژی لەسەر دەکەی؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی : ئەی عومەر ﷺبەڕاستی ئەوە تۆبەیەکی وایکردووە ئەگەر دابەشی بکەی بەسەر(٧٠)حەفتا پیاوی مەدینەدا بەشی هەموویان دەکات .چونکە تۆبەیەکی وای کردووە کە گیانی خۆی کردە قوربانی لە پێناوی ڕەزابوونی خودادا.

## هێندێك لە سەروەت و سامانەکەت بهێڵەوە

## أمسك عليك بعض مالك

دەگێڕنەوە پێغەمبەری ﷺخودا یارەکانی قەدەغە کرد کە لەگەڵ ئەوانەی کە بۆ جەنگی (تەبوك) نەهاتبوون بە تەواوی ئەو ڕۆژانەی کە لەو جەنگەدا دواکەوتبوون لەگەڵ پێغه مبەرداﷺ، بەبێ بەهانەی شەرعی قسەبکەن .کە (کەعبی کوڕی مالك و، مەرارەی کوڕی ڕەبیع و، هیلالی کوڕی ئومەیەﷺ)بوون: ئینجا (کەعبی کوڕی مالكﷺ)بۆ خۆی ئەو بەسەر هاتەمان بۆ دەگێڕێتەوە: دەڵێ بەڕاستی گۆڕانکاریەکی تەواو بوو بۆ ئێمە :خەڵك هەموو خۆیان لێدەشاردینەوە، تەنانەت ئەو خاك و زەویەش لەبەر چاوم گۆڕابوو. هیچ شتێکم نەدەهاتە بەر چاوم، دڵی پێخۆش بکەم و بیناسم (٥٠) پەنجا ڕۆژ بەو شێوەیەماینەوە .تەنانەت بۆمان نەبوو بڕۆینە لای هاوسەرە کانیشمان .هاوڕێکانم لەو ماوەیەدا لەماڵ مانەوەو نەدەهاتنە دەرەوەو بەردەوام هەر دەگریان:بەڵام من نەم دەتوانی لەماڵ دابنیشم، دەڕۆیشتم و دەگەڕام و ، دەچومە ناوخەڵك و لەبازاڕ دەسوڕامەوەو، دەڕۆیشتمە مزگەوت نوێژم دەکرد:بەڵام هیچ کەسێك قسەی لەگەڵدا نەدەکردم وەکو کەڕولاڵ

دەهاتم و دەچوم: تەنانەت لەکۆڕو دانیشتنەکانی پێغەمبەریشﷺ ئامادە دەبووم‌و سەلامیشم لێدەکرد:بۆ خۆم لەگوماندا بووم دەمگووت دەبێ پێغەمبەرﷺلێوەکانی جولاندبێ بۆ وەڵام دانەوەی سەلامەکەم؟ وە لە نوێژەکانمدا لە نزیکی پێغەمبەرەوە ﷺ نوێژم دا دەبەست‌و بەدزی‌و خێسەی چاوم لەپێغەمبەرمﷺ دەڕوانی دەمگووت دەبێ پێغەمبەر ﷺ سەیرم بکات ؟کاتێ پێغەمبەر لەمنی دەڕوانی منیش سەیرم دەکرد ئەویش خێرا چاوەکانی لێدەسوڕاندم : ئەوکارە وای لەخەڵکانیش کردبو کە هەموویان لێم لالوت بوون‌و فەرامۆشیان کردم. ڕۆژێك ڕۆیشتمە باخچەی ئەبو قەتادە کە کوڕی مامم بوو بەبێ ئەندازە زۆرمان یەکتر خۆشدەویست: لەسەر دیواری باخچەکە سەرکەوتم‌و ڕۆیشتمە ناوباخەکە بۆلای باوکی قەتادە چووم سەلامم لێی کرد، سوێند بەخودا وەڵامی سەلامەکەی نەدامەوەمنیش گوتم: ئەبوقەتا دەسوێندت دەدەم بەخودا فێری خۆشەویستی خوا و پێغەمبەری ﷺخودام ناکەی؟ ئەبوو قەتادە ﷺبێدەنگ بوو: دووبارە بەخودا سوێندم دایەوە هەر بێدەنگ بوو، سێبارەم کردەوە هەر بێدەنگ بوو، لە دواییدا گوتی : خوداو پێغەمبەر ﷺدەزانن. ئینجا هەر خوداو پێغەمبەر ﷺدەزانن چەندە بێتاقەت بووم و چاوەکانم ئاویان لێدەهات‌و، تەنها گیانم دەرنەدەچوو، بەدڵ ساردیە کەوە بەرەولای دیوار و شورەی باخچەکە ڕۆیشتم‌و، بەسەر دیوارەکە کەوتم و ڕۆیشتمەوە خوارو گەڕامەوە بۆماڵ لەدوای تێپەڕبوونی (٥٠) پەنجا شەو بەو جۆرە :ڕۆژێکیان لەلای بەیانی لەسەر سەربانی ماڵمان یادی خوداو نوێژم دەکرد کە بەڕاستی لەو غەمو پەژارانەدا بووم دڵتەنگ و بێئارام بووم‌و ئەو خاك و زەویەم لەلا بەیەك هاتبۆوە .لەو کاتەدا گوێم لە هاواری دەنگێك بوو لەدوورە دەهات، یان دەنگەکە لەسەر کێوی (سەلع)ەوە دەهات‌و بە هەموو دەنگیەوە دەیگوت ئەی(کەعبی کوڕی مالك)ﷺ مزگێنی بێت منیش کە گوێمراگرت‌و دڵنیابووم لە خۆشیان کڕنۆشی سوپاس گوزاریم بردبۆخوداچونکە زانیم کە خۆری ڕووناکیم لێدەرکەوت: پێغەمبەرﷺ لە نوێژی بەیانیدا موسڵمانانی ئاگادار کردەوە کە خودا ئایەتی قبوڵ کردنی تەوبەی لەو سێ کەسە وەرگرتووە خەڵکان

كۆمەڵ كۆمەڵ دەهاتنە لام و مزگێنیان پێدەدام لەپێشی هەموویانەوە مزگێنیان بەمن ڕادەگەیاند یەكەمین كەسێك بەسواری وڵاغەكەی بەغار دەهات مزگێنی پێدەدام هەر یەكە هەوڵی دەدا زووتر بگاتەلام، بەڵام ئەوەی كەلەسەر كێوەكە بەهاواری دەنگی هەواڵەكەی زووتر پێدام چونكە دەنگ زووتر دەگات هەر كە گەیشتە لام تەنها بەرگەكەم هەبوو خێرا دام ناو، پێشكەشم كرد سوێند بەخودا لەو كاتەدا هەر شتێكم هەبایە دەمكردە دیاریو مزگێنی .لەدواییدا پۆشاكێكم لەبەركردوو، بەرەولای پێغەمبەرﷺ ڕۆیشتم هەرخودا دەزانێ ئەوكاتە چی خۆشی و شادیەكم لەدڵدا دەگەڕا.خەڵك كۆمەڵ، كۆمەڵ پێشوازیان لێدەكردمو پیرۆز بایی وەرگرتنی تۆبەكەیان پێدەگەیاندم كە گەیشتمە مزگەوت سەیرم كرد پێغەمبەر ﷺ دانیشتبوو كۆمەڵێك خەڵكی بەدەورەوە بوو، لەناو هەموو یاندا بەتەنها (تەلحەی كوڕی عبداللهﷺ) هەستاو بەغار بۆ لام هاتو باوەشی پێدا كردمو، پیرۆزبایی لێكردم. بەڕاستی هەرگیز ئەو هەڵوێستەی تەلحەم لەیاد ناچێتەوە. كە لە پێغەمبەرﷺنزیكبوومەوە وسەلامم لێیكرد ڕوخساری پێغەمبەرﷺ لەخۆشیان وەك و ڕۆژ دەدرەوشایە وە فەرمووی: ئەی كەعب مزگێنیت لێبێت بۆ باشترین ڕۆژی ژیانت لە كاتی لەدایك بوونتەوە .منیش گوتم :ئەی پێغەمبەریﷺ خودا ئەو وەرگرتنی تۆبەیەم لەلای تۆوەیە ، یان لە لای خوداوەیە؟ پێغەمبەرﷺفەرمووی لە لای خوداوەیە ئینجا بە ڕوویەكی گەشاوەوە ئەو ئایەتەی خوێندەوە{وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُواْ حَتَّىٰٓ إِذَا ضَاقَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَرۡضُ بِمَا رَحُبَتۡ وَضَاقَتۡ عَلَيۡهِمۡ أَنفُسُهُمۡ وَظَنُّوٓاْ أَن لَّا مَلۡجَأَ مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيۡهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيۡهِمۡ لِيَتُوبُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ} التوبة/١١٨

واتە:خودای بە سۆزو بەزەیی تۆبەو پەشیمانی ئەو سێ كەسەی كەلە جەنگی تەبوك دواكەوتبوون قبوڵ كرد لەدوای ئەوەی كە هەموو دونیایان لێهاتبوە یەك و لە بوونی خۆشیان بێزاربوونو بەتەواوی دڵنیا بوون كە هیچ ڕێگاو چارەیەك نیە تەنها و تەنها خودای پەروەردگار نەبێت تەوبەی لێوەر گرتن هەتا تەوبە بكەن بەڕاستی خودا میهرەبانو تۆبە وەرگرە بۆ ئەوانەی كەتەوبە دەكەن.

(کەعب) دەفەرمویٚ :کاتیٚ لەلای پێغەمبەرﷺ دانیشتم گوتم : ئەی پێغەمبەری ﷺ خودا لە پاداشتی وەرگرتنی تەوبەکەم هەرچی ماڵ و سەروەتم هەیە ئەوا کردمە خێرو سەدەقە لە پێناوی خودادا. پێغەمبەر ﷺفەرمووی: ئەی کەعب هێندێك لەماڵت بهێڵەوە بۆخۆت باشترە. کەعبیش ﷺ فەرمووی: ئەی پێغەمبەریﷺ خودا ئەو بەشەی کە لە خەیبەر بەدەستم گەیشتووە بۆ خۆمی هەڵدەگرم. خودا لێی خۆش بێت هەمووجۆرە دوژمنایەتیەکی بەرامبەرمان کردووە.

## خوا لەسەر هەر دوژمنایەتییەك بەرانبەرم دەیکات، لێی خۆشبێت

### غفرالله له كل عداوة عادانيها

دەگێڕنەوە ئەبوسفیانی کوڕی حارس ﷺکوڕی مامی پێغەمبەرو برای شیری کە حەلیمەی سەعدیە شیری پێدابوو: بە بچوکی پەیوەندی زۆرباشی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺهەبوو، بەڵام کاتیٚ پەیامی پێغەمبەرایەتیﷺ بۆ هات جۆرە دوژمنایەتیەکی لەگەڵ پێغە مبەرﷺدادە کرد کە هەرگیز هیچ کەسێك دووژمنایەتی بەوجۆرەی لەگەڵ نەکردووە .جنێو و قسەی ناشیرینی بەخۆی و هاوڕێکانی دەگوت: ماوەی بیست ساڵ ئەو دووژمن کارییەی بەردەوامبوو: وەبۆ هەر شەڕو کوشتارێك بێباوەڕانی قورەیش بڕۆیشتبانایە ئەبوسوفیان سەرقافڵە بوو قەت دوانەدەکەوت ، بەڵام لەکۆتایی تەمەنی خودای گەورە هیدایەتو ڕێنمونی کرد. کە پێغەمبەرﷺ خوێنی بەخشی بوو، نەزری کردبوو :ڕۆژێك ئەبوسوفیان لەدێی (ئەبواء) کە لە نێوانی مەککەو مەدینەدایە هاتە لای پێغەمبەرو ﷺگوتی :محمد بە جۆرێك سەیری دەکردم وەك و بەچاو بمترسێنیٚ وەهابوو، لەدوای ماوەیەك ڕووی لیٚ سووڕاندم، منیش هەستامو ڕۆیشتمە بەرامبەری، دووبارە پێغەمبەرﷺ ڕووی لێوەرگێڕامەوە، بەو جۆرە چەند جارێك محمد ڕووی لێوەردەگێڕامو منیش دەچومەوە بەرامبەری :کاتیٚ موسڵمانان هەستیان پێکرد کە پێغەمبەرﷺ نایەویٚ دەموچاو و ڕووخساری بدینیٚ، ئەوانیش هەموویان

ڕوویان لیٚ وەرگێڕامو، کەسیان نەیان دەویست چاویان پێم بکەویٚ .ئینجا لە دوای ئەوە منیش ڕووم بۆلای حەزرەتی عومەرﷺ دەسوڕاندو تەماشای ئەوم دەکرد، کابرایەکی ئەنساری هاتە نزیکمەوە و ڕای کێشامو گوتی: ئەی دووژمنی خودا دووژمنکاری تۆ بۆ پێغەمبەریﷺ خودا زۆری خایاندوەو، جیهانت لیٚ پڕکردووەو ، ئێستاش وازناهێنی؟ منیش لەدوای ئەوە لەویٚ هەستامو ، ڕۆیشتم بۆ لای عەباسی مامەو، گوتم :ئەی مامە من هیواو ئومێدم بوو، کە موسڵمان دەبمو پێغەمبەریشﷺ زۆرخۆشحالٚ دەبێت بەموسڵمان بوونی من: یەکەم :لەبەر ئەوەی کە خزمایەتیمان هەیە. دووەمیش: ئەمن خاوەنی پلەو پایەی بەرزی‌و شکۆمەندیم :بەڵام، وەك‌و سەیر دەکەم بەپێچەوانەی ئەوەیە؟ بۆیە ئەی مامە تۆ بڕۆ بۆ لای‌و، لەو بارەوە قسەی لەگەڵدا بکەو، قەناعەت‌و ڕازیبکە؟ مامە عەباسیشم گوتی :بەخودا هەرگیز من لەو بارەوە لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ ووت‌و وێژناکەم :بەتایبە تی لەوکاتەوە کە ڕووی لێوەر دەگێڕای :چونکە بە خودامن شەرم لە پێغەمبەرﷺ دەکەمو، لێی دەترسێم! ئینجا گوتم: ئەی مامەچارەیەکم بکەو، بەکێم دەسپێری کەیفی خۆتە؟ گوتی :بەخوامن هیچ ڕێگەچارەیەك نازانم . لەدوای ئەوە ڕۆیشتمە لای حەزرەتی عەلی‌و، ﷺقسەم لەگەڵدا کردو ئەویش هەروەك‌و مامم وەڵامی دامەوە. ئەبو یوسف دەگێڕێتەوەو دەڵیٚ : ئەبو سوفیان گوتی : ڕۆیشتمە بەردەرگای پێغەمبەر دانیشتم، هەتا پێغەمبەر ﷺهەستا و ڕۆیشت بۆ (جوحفە) و پێغەمبەرﷺ هیچ گوتەیەکی لەگەڵمدا نەکرد تەنانەت هاوڕێیەکەشی قسەی نەکرد منیش بەدوایاندا ڕۆیشتمولەسەر ڕێگا کەی دادەنیشتمو، جەعفەری کوڕیشم لەگەڵدا ڕاوەستابوو: لەهەر شوێنێك چاویان بەمن دەکەوت ڕوویان لێوەر دەگێڕام منیش لەگەڵیان دەرچوم و ئامادەی ڕزگاربوونی مەککە بووم، لەگەڵ ئەو کۆمەڵە سوارانەی کە لەگەڵیدا دەڕۆیشتن هەتا گەیشتینە (ئەبتەح) ڕۆیشتمە پێشەوە تا نزیکی گومبەزەکەی بوومەوە، پێغەمبەرﷺبە جۆرێك تەما شای کردم کەجیاواز بوو لە تەماشاکردنەکانی پێشو: زۆر ئاواتەخواز بووم زەردەیەکی بەرە و ڕووم بکات. لەو جێگەیە ئافرەتانی

هۆزونەوەی عبدالمتلب ڕۆیشتنەلایو، هاوسەرەکەی منیشیان لەگەڵدا بوو: ئەو کاتە بەلامەوە زۆر نەرمونیان بوو :لەدوا پیدا ڕۆیشت بۆمزگەوت منیش هەر بەدوایانەوە بوومو، لێیان جیاواز نەدەبومەوە بەهیچ جۆرێك. هەتا پێغەمبەرﷺ ڕۆیشتە (هەوازن) جەنگی (حونین) پێغەمبەرﷺلەسەر ولاغەکەی کەناوی (شەهباء) بوو خۆی ڕاگرتبوو شمشێری لەکالان هێنابووە دەر ئەمنیش ڕۆیشتمو ولاغەکەم لەگەڵ ئەودا جووت کردو، شیرم بەدەستەوەبوو سوێند بەخودا ئەو کاتە حەزم دەکرد لە شوێنی پێغەمبەردا ﷺبمردبمایەو، ئەوهیچی لێ بەسەر نەیات :پێغەمبەر ﷺهەر سەیری دەکردمو هیچ قسەی نەدەکرد، عەباس لایەکی جڵەوی ولاغەکەی پێغەمبەر ی ﷺ گرتو، منیش لایەکیم گرت:پێغەمبەر ﷺفەرمووی : ئەی عەباس ئەوە کێیە؟ عەباس ﷺگوتی: ئەوە براتە و کوڕەمامتە (ئەبو سوفیانی کوڕی حارس)ە لێی ببورەو , بیبەخشە ئەی پێغەمبەری خودا !پێغەمبەر ﷺفەرمووی: ئەوامن لێی بوردم خودا لێی خۆشبێت لەسەر ئەو هەموو دووژمنایەتیەی کە بەرامبەرمانی کردووە. هەر بەسواریەکەیەوە قەدەمێکی بۆ پێشەوە داو ڕووی لەمن کردوو، گوتی : ئەی برام بەگیانم :ئەوەندەی گوتو هێرشی دووژمن و تێکڕژانی بەرامبەری دەستی پێکرد.بەڕاستی کەچاوم بەو هێرشە کەوت زۆر لە پێغەمبەر ﷺدەترسام لەو هەموو شیر و تیرانەی ئاڕاستەی دەکرا:بۆیە بەهەرچواردەورەی پێغە مبەرﷺدا دەسووڕامەوە بۆ ئەوەی هیچ شتێك بەرپێغەمبەر ﷺنەکەویٚوهەرچی ئاڕاستەی ئەودەکریٚ بەمن بکەویٚو، بەتەواوی چاوم بڕیبووە پێغەمبەرﷺ:ئەویش هاواری لێکردم وفەرمووی: بڕۆ پێش‌و، لەگەڵ ئەو گەل و هۆزە بجەنگە. منیش پەلامارم دانو لە شوێنی دامەزراوی خۆیانم دەرپەڕاندنو پێغەمبەریشﷺ لەگەڵم دەهاتە پێش هەتا لەهەر چوار لاوەدەرمان پەڕاندنو، توانای خۆڕاگرتنیان نەبوو هەتا بە ئەندازەی یەك فەرسەخ دوورمان خستنەوەو پەرتەوازەمان پێکردن لەهەموولایەك.دواییی ئاگام لێبوو پێغەمبەرﷺ مشتیٚ خۆڵی هەڵگرتەوەو بەرەوڕووی بێباوەڕانی هەڵداو فەرمووی: چاوەکان کوێرو نابینابن.دوایی گوتی: سوێند بەخودای کەعبە وا دۆڕانو تێکشکان هەر خۆیان نەگرتەوە.

# خودای بە بەزەیی لەکفل خۆش بوو

# إن الله غفر للكفل

لە (عبدالله ی کوڕی عومەر)ەوە دەگێڕنەوە دەفەرموێ: گوێم لە پێغەمبەرﷺبوو دەیفەرموو: کابرایەك بەناوی کفل لەناو هۆزی بەنی ئیسرائیلیاندا بوو هەرگیز دوور کەوتنەوە و خۆپارێزی لەگوناه نەدەکرد ، بەردەوام خەریکی تاوان بوو. جارێکیان ئافرەتێك هاتە لای و داوای پارەی لێکرد ئەویش نەیدایە : لەدواییدا بە (٦٠) شەست دینار ڕازی کرد کە داوێنپیسی لەگەڵدا بکات. لەوکاتەی کە هەر دووکیان ئامادەباشی خۆیان کردوو باوەشیان بەیەکدا کرد .ئافرەتەکە ڕاچەنی و، بە ئاگا هاتەوەو ترسی لێنیشت و، دەستی کرد بەگریان: کفل بە ئافرەتەکەی گوت باشە هۆی چیە دەگریەی! خۆمن و تۆ بەخۆشەویستی یەکتری ئەوکارە ئەنجام دەدەین و، هیچمان تۆبزیمان لەیەکتر نەکردووە؟ ئافرەتەکە گوتی: بەڵێ ڕاستە بەڕەزامەندی هەردووك لامانە بەڵام، هەتا ئێستا هەرگیز من کاری واناشیرینم نەکردووە .ئێستاش لەبەر پێویستی و کاری ناچاری و، برسیایەتی وای لێکردم کەلەبەر پارەکەو پێویستیم ڕازیبم، کیفل بەردەوام لەخۆش ڕابواردنی کاری خەراپ کاری هۆشی هاتەوەو بەزە ییوسۆزی جوڵاو گوتی :ئافرەتێکی پاکداوێن کە هەگیز کاری واتنەکردبێ و، پێویستی ناچاری کردبێت :منیش ویژانی خۆم ئازار نادەم :دوورکەوتەوە و گوتی :هەستە بڕۆو باپارەکەش بۆ خۆت بێت و، گەردەنت ئازاد بێت .سوێند بە خوداش لەسەردەستی تۆمنیش تۆبەبێت لەکاری خەراپەوناڕەوا، هەرگیز جارێکی تر نا فەرمانی خوداوکاری ناڕەوانەکەم.ئەو پیاوە لەتاوان ڕۆچووە لەدوای ئەوشەوەی کەددانی پەشیمان بوونەوەی خۆی داهێناو جارێکی تر کاری واندکات هەر ئەو شەوە بەچەند ساتێك لەگەڕانەوەی بۆلای خودا گیانی دەرچوو! بۆ بەیانی لەسەر دەرگای ماڵەکەیان نوسرابوو . بەڕاستی خودای گەورە بەهۆی ترسانی لەخوداو دوور کەوتنەوەی لەو ئافرەتەو، گەڕانەوەی بۆ لای خودا: خودای بەبەزەیی لێی خۆش بوو عەفوی کرد.

# پەیمانت پێدەدەم بۆ ئەوەی لێم خۆش بی
# أبایعك علی أن تغفرلي

گێڕنەوە جارێك كابرایەك بە (عەمری كوڕی عاصﷺ)ی گوت: كە تۆ ئەوەندە ژیرو هوشیاری بۆچی وا زۆر بە درەنگەوە موسڵمان بووی؟ لەوەڵام دا گوتی:ئێمە لەگەڵ گەل و هۆزێك دەژیاین كەئەوان گەورەو پێشەوامانن: هیوا و ئاواتیان ئەوەندە زۆر بوو لەگەڵ كێوەكاندا بەرزو هاوسەنگ بوون، كە پێغەمبەر ﷺپەیامی پێگەیشت ئەوان دڕدۆنگ و ناڕازیبوون و، باوەڕیان پێینەهێنا، ئێمەش بە شوێنی ئەوان كەوتین و باوەڕمان نەهێنا .كاتێ ئەوانیش ڕۆیشتن و كارو باری وڵات هاتە دەستی ئێمە، بیرمان كردەوەكە حەق و ڕاستی بەدەستی ئەوانەوەیە و ئێمە هەڵەین: ئیسلامم كەوتە دڵەوەو كە پێویست بوو هەر لە زووەوە باوەڕمان بكردبایەو، هەوڵ و تەقەلای تەواومان لەگەڵ پێغەمبەرﷺداكردبایە، كە بەڕاستی ئەوەمان بەهەڵەو سستیەكی تەواو زانی :لەوبارەوە گەنجێكی شارەزا لەئاینیان بۆلا ناردم، كەهەرچی سەرنج و تێڕوانینێكم لەو بارەوە هەبێت منیش لەو بارەوە بڕیاری تەواومدا كە باوەڕ دەهێنم ئەوەی كە لە بارەی زیندووبوونەوەی دوا ڕۆژ باسی دەكەن كە هەموو چاكەكاران بەحەق و پاداشتی خۆیان دەگەن و، تاوانبارانیش سزاو ئازاری تاوانەكانیان دەچێژن ڕاست و تەواوە .بە پێچەوانەشەوە، پێچەوانەی یاسای ئەم جیهان و گەردوونەیە .بۆیە لێرە بەدواوە هیچ دەرفەت و مەبەستێك بۆ كردنی چاوەڕوانی چاكەو، دوور لە ساختەو نارەواییدا چاوەڕوان ناكرێت ئینجا، عەمر لەدوای ئەوە لە ماڵ هاتەدەر و بەرەو ماڵی پێغەمبەرﷺ ڕێگای گرتە بەر بۆ موسڵمان بوونی :لەڕێگا توشی خالیدی كوڕی وەلیدو، عوسمانی كوڕی تەلحەی سەرپەرشكارو خزمەت كاری ماڵی خودا لە هۆزی عبدالدار بوو:عەمر بە خالیدی گوت هاباوكی سولەیمان لەو كاتەدا بۆ كوێ دەڕۆی ؟ خالید گوتی:سوێند بە خودا، شنەبای فێنكی شەماڵ هەڵیكردووە. ئەو پیاوەی كەداوای پێغەمبەریەتیﷺ دەكات بەڕاستی پێغەمبەری ﷺخودایە ؟! هەتاكەی ئێمە دووژمنكاری و بەرهەڵستی بكەین؟ بەخودا دەڕۆم موسڵمان دەبم؟

عەمریش گوتی :دەبەخودا منیش هەر بۆیە لەماڵ هاتوومە دەربڕۆم موسڵمان ببم !كاتێ گەیشتینە لای پێغەمبەرﷺ سەیرێكی كردین و بە هاوڕێكانی فەرموو:بەڕاستی ئێوە مەككەتان بەنرخ ترینی پارچەی دڵو جگەرتان ئاوەدان كردەوە، ئینجا عەمر فەرمووی: خالید ڕۆیشتە پێشەوە و موسڵمان بوو پەیمانی ڕاستی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دابەست .لەدوای ئەویش من چومە پێشەوە و گوتم : ئەی پێغەمبەری ﷺخودا بە مەرجێك پەیمانی موسڵمان بوونت لەگەڵ دەبەستم كەداوای لێخۆش بوونی هەموو تاوانەكانم بۆ بكەی ؟ پێغەمبەر ﷺفەرمووی :ئەی عەمر تۆ موسڵمان بە تەنها بە موسڵمان بوونەكەت هەموو گوناه و تاوانەكانت ڕەش دەبنەوە، كۆچ كردنیش هەموو گوناه و تاوانی پێشوی خۆت لادەبات .لەدوای باوەڕهێنانی عەمر، پێغەمبەرﷺ لەبەر زیرەكی‌ودانایی عەمری زۆر لە خۆی نزیكدەكردەوە و، زۆر ڕێزی بۆ دادەناو جار بەجاریش دیكردە نوێنەرو، بریكاری خۆی: تەنانەت لەشكانو ڕوخانی بتی گەورەی (سواع) كە خودای هێندێك لە نەوەی هۆزی هوزەیل بوو.خوداش لە قورئاندا باسی دەكات. سەرپەرشتیار و خزمەت كاری ئەو(سواع)ە زۆرعەمری ترساند و گوتی: ئەو كارەی كەتۆ ئەنجامی دەدەی عەمر، ئەوە زۆر ترسناكە و، ئەنجامی باشی نابێت : دوای ئەوە عەمر بە خزمەت كارەكەی گوت: دەبێ بۆ خۆت و بەدەستی خۆت ئەو(بت)ە بشكێنی و بیڕوخێنی، چونكەئەوكارەی تۆ كارێكی بێسودو بایەخە. لە دوای شكان وتێكدانی ئەوبتە: كە هیچ ڕووداوێك ڕووی نەدا، عەمرﷺ بەسەرپەرشتیارەكەی گوت : ئێستا هەست بەچی دەكەی؟ ئەویش گوتی: بە خودا ئێستا هەست بە خۆشیو ئاسودەیی دڵم دەكەم :سەری نەوازشی بۆ خودا نەوی كردو بە تەواوی ڕەزابوونی دڵی گوتی: باوەڕم هێنابە پەروەردگارو، خاوەنی ئەوبوونەوەرە.

## بۆ لەدانیشتوانی دۆزەخ نیت

## لست من أهل النار

دەگێڕنەوە: (ئەنەسی کوڕی مالیك)ﷺپێش خزمەتی ماڵی پێغەمبەری ﷺخودا بوو دەفەرموێ: جارێکیان پێغەمبەر ﷺویستی بڕواتە دیدەنی(سابتی کوڕی قەیسﷺ) نەریتو ڕەوشتی پێغەمبەریﷺ خودا وابوو کەسێك پلە و پایە و نمرەی باشی لەلای خودا نەبوایە و، لەلای جەماوەریش نرخو بەهایەکی باش و خۆشەویستی و دڵسۆزی لە ناویاندا نەبایە نەدەڕۆیشتە لای ، بۆ ئەو مەبەستە پرسیاری کردوو فەرمووی: کێ هەیە؟ خەبەر و هەواڵی سابتم پێدەگەیەنێت؟ هاوڕێیەکی پێغەمبەر ﷺ گوتی: من پێت ڕادەگەیەنم ئەی پێغەمبەری ﷺخودا: هاوەڵی پێغەمبەرﷺ ڕۆیشتە ماڵی سابت کابرا سەیری کرد(سابت) لەماڵەوە زۆر بە مەلولو غەمباری دانیشتووە و سەری نەویکردووە: کابراگوتی: ئەوەچیە سابت بەو جۆرە بە ماتی دانیشتووی؟ لە وەڵامدا گوتی: برام بەڕاستی هەرچی چاکە و باشی هەمە هەموویم بەباداوەو پوچ بۆتەوە چونکە دەنگم بەسەر دەنگی پێغەمبەرداﷺ بەرزکردۆتەوەو، بەهێز هاوارم کردووە: بەو بۆنەیەوە دەرگای بەهەشتم لێداخراوەو دەڕۆمە دۆزەخەوە. ئینجا چۆن شیننەگێڕم و غەمبار نەبم!! لەدوای ئەوە کابرا ڕۆیشتەوە بۆ لای پێغەمبەروﷺ هەواڵەکەی پێڕاگەیاند: پێغەمبەرﷺ بە کابرای ڕاگەیاندەوەو فەرمووی: هەر ئێستا بڕۆوە بۆ لای سابت پێی بڵێ مەترسێ! ئەی سابت تۆ لە دانیشتوانی بەهەشتی کابرا بە ڕاکردن ڕۆیشتەوە لای سابتو پێی گوت ئەی سابت خۆشیو مزگێنی بێت پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: تۆ لەبەشی ئاگر نیت.

## لە سۆز و بەزەیی خودابێ هیوا مەبن

## لاتقنطوا من رحمة الله

لە دوای کۆتایی هاتنی جەنگی (ئوحود)و شەهید کردنی(حمزەی کوڕی عبدالمتلب ﷺ) بەدەستی وەحشی وبەهۆی هاندانی (ئومەیەی کوڕی خەلەف) پێغەمبەرﷺ بە کوژرانی حەمزە زۆربێ ئارامو ناڕەحەت بوو. فەرمانی دەرکرد هەر کەسێ بتوانێ

وەحشی بكوژێ خوێنەكەی بە هەدەر دەڕوات: وەحشی لەترسی كوشتنەوەی هەلاَت و بۆی دەرچو ڕۆیشت بۆ (قەفار) كەجێگەیەكە، لەدوای تێپەڕبوونی ماوەیەكی زۆر بەسەر ئەوڕوداوە: ڕۆژێك لەڕۆژان وەحشی بیری كردەوە كە ژیانی بێباوەڕی ژیانێكی بەدبەختی و بێمایەیە ویستی باوەڕ بهێنێ و بگەڕێتەوە بۆ لای خودا و موسلَمان ببێ: بۆ ئەو مەبەستە بیری كردەوەو لێی بوو بە ماخۆلان كەچۆن بڕوا و موسلَمان ببێ چونكە گەورەترین و خۆشەویست ترین كەسی پێغەمبەری ﷺ شەهید كردووە: بۆیە لە پێشەوە نامەیەكی بۆ پێغەمبەر ﷺ نوسی وگوتی:ئەی محمد من دەمەوێ موسلَمان ببم، بەلاَم ئەو ئایەتە ڕێگەم پێنادا كەدەفەرموێ:

﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا. يُضَٰعَفْ لَهُ ٱلْعَذَابُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِۦ مُهَانًا﴾

الفرقان/٦٨-٦٩ واتە: ئەوانەی كە هیچ كەسێكی تر بێجگە لە خودا ناپەرستن و كەسی تر بەخودا نازانن، وە دەست درێژی تاوانی كوشتن بۆ هیچ كەسێك درێژ ناكەن كە خودا بەناڕەوای دانابێ تەنها كە ماف و حەقی كوشتنی لەسەر بێت، وە بە هیچ جۆرێكیش دەستدرێژی و نزیككەوتنەوەی كاری نامەردانە و تاوان باری ناكەن، ئەوانە بەبەندەی خودا دەناسرێن و ناسراون، بەلاَم هەر كەسێ ئەو تاوانانە ئەنجام بدات ئەوە بەڕاستی ئەوانە توشی ڕیسوایی وسزاو ئازاری ناخۆش دەبن..

منیش سەیردەكەم ئینسانێكی هاوبەش پەیداكەرو، بكوژو، داوێنپیسیم كردووە: بۆیە جێگای تۆبە بۆمن نییە. ئینجا لە دوای ئەوە خودای بەبەزەیی بۆ ڕێزلێنان لەئادەمیزادەكان هەرچەندە گوناه بارو شەرمەزاربن ئەگەر بیانەوێت بگەڕێنەوە بۆلای خودای خۆیان خوداڕێزیان لێدەگرێت و نائومێدیان ناكات بۆیە ئەوئایەتەی ناردە خوارەوە كە دەفەرموێ:﴿ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾الفرقان/٧٠ واتە: تەنها ئەوانەی تۆبە و پەشیمان دەبنەوە لەو كردارە ناپەسندانە و باوەڕی تەواو بە خودا بهێنێت و ئینجا كرداری

باش‌و چاکیش ئەنجام بدات دوای ئەوە خودای میهرەبان کردەوە خەراپەکانیشیان بۆبە چاکەدەگێڕێ چونکە خودا هەردەم لێخۆش بوو میهرەبانە.

لەدوای دابەزینی ئەو ئایەتە پێغەمبەری ﷺخودا بۆ وەڵامدانەوەی وەحشی ئەو ئایەتەی بۆ ڕەوانکردەوە: کاتێ وەحشی ئەو ئایەتەی خوێندەوە قەناعەت‌و دڵنیایی نەهات بۆیە دوبارە نامەیەکی تری نووسی و گوتی: ئەی محمد ئەو ئایەتە مەرجی تێدایە کە دەفەرموێ بەمەرجێك تۆبە بکەی و باوەڕ بهێنی‌وکرداری چاکەش بەئەنجام بگەیەنی.کەبەڕاستی ئەوە مەرجێکی قورس و گرانە، من دەمەوێ موسڵمان ببم بەبێ هیچ مەرجێك. ئینجا خودای گەورە ئایەتێکی تری بۆ دڵنیایی تۆبەکاران بەبێ مەرج نارد کە دەیانەوێ بگەڕێنەوە بۆ لای خودا فەرمووی:( إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ ) النساء/١١٦ واتە: خودای بەدەسەڵات هەرگیز لەو کەسانە نابوورێ کە شەریك‌و هاوبەشی بۆ بڕیار دەدەن بەڵام بۆ هەر کەسێکی تر کە ئارەزوی لێبێت خۆش دەبێت بێجگە لە هاوبەش بڕیاردەران.

پێغەمبەر ﷺبۆ وەڵامی دووەمی وەحشی ئەو ئایەتەی ناردەوە: کاتێ وەحشی ئەو ئایەتەی خوێندەوە: دیسان نامەیەکی تری بۆ پێغەمبەرﷺ نوسیەوە گوتی:ئەی محمد ئەو ئایەتەش تایبەتمەندی پێوە دیارە کە دەفەرموێ: میهرەبانی من تایبەتە بۆ ئەوانەی کە بۆ خۆم حەزم لێیەتی، بۆی هەیە من لەناو ئەو ئایەتە تایبەتمەندیاندا نەبم. ئینجا خودای بە سۆزو بەزەیی بەرامبەر بەندەکانی ئایەتێکی تری ناردوو فەرمووی:( قُلۡ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسۡرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ لَا تَقۡنَطُواْ مِن رَّحۡمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ )الزمر/٥٣ واتە: خودا بە پێغەمبەرمان دەفەرمێت بەو خەڵکانەی کەتاوانیان کردوە ئەگەر ئارەزو دەکەن بۆلای خودا بگەڕێنەوە لە سۆزو بەزەیی خودا مەئیوس‌و نائومێد مەبن چونکە خودا لە هەموو تاوانەکانتان خۆش دەبێت کە پەشیمان ببنەوە بەڕاستی خوداش لێ خۆش بەرو میهرەبانە.

ئینجا لەدوای ئەوەی کەپێغەمبەرﷺ ئەوئایەتەی بۆ وەڵامە نامەی سێهەمی وەحشی نوسیەوە: وەحشی لەدوای خوێندنەوەی نامەکە خێرا هەستاو ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەرو موسڵمان بوو:. ئەو وەحشیە لەدوای موسڵمانبوونی لەچەندین جەنگو غەزادا لەگەڵ پێغەمبەر ﷺبەشداری کردووە: وەهەر بەدەستی وەحشی بوو کە موسەیلەمەی درۆزن لەجەنگی هەڵگەڕاوەکاندا کوژرا. ئینجا وەحشی دەی گوت: لەکاتی نەزانیو بێباوەڕیم دا گەورەترین ئادەمیزادی باوەڕدار کەحمزەی کوڕی عبد المتلیب ﷺ بوو کوشتم: وەلەدوای هیدایەتو ڕۆشەنیو موسڵمان بونیشدا گەورە ترینو خەراپترین ئادەمیزادی بێباوەڕو کوشت.

## سۆز و بەزەیی خودا بۆ تۆبەکاران

## رحمة الله بالتائبين

لە (ئەبو سەعیدی خودرییەوەﷺ) دەگێڕنەوە کە پێغەمبەریﷺ خودا فەرموویەتی:لە پێشینانی پێشی پێش ئێوەدا کابرایەك (٩٩) نەوەتو نۆ کەسی کوشتبوو ویستی تۆبە بکات ئینجا بۆ داوای تۆبەکەی ویستی چەند پرسیارێ لە زاناو دانایەك بکات بۆ ئەو مەبەستە دەستی کردبە گەڕانو پرسیارو بەدواداچونی زۆر: کابرایەکی ڕاهیبو خودا پەرستیان بۆ دەست نیشان کرد پرسیاری لێبکات : ئەویش بەرەو لای کابرای خوداپەرست و ڕاهیب ڕۆیشت و پێی گوت: من(٩٩)نەوەت و نۆ کەسم کوشتووە بەڵام ئێستا دەمەوێ تۆبە بکەم ئایاپەشیمان بونەوەم بۆ هەیە و تۆبەم لێوەر دەگیرێ لەدوای ئەو هەموو کوشتارانە؟ ڕاهیبەکە گوتی: نەخێر تۆ تۆبەت لێوەرناگیرێ چونکە تاوانەکانت زۆرە بۆیەکابرای پیاو کوژ ڕقی هەستاو ئەو کابرا ڕاهیبەشی کوشت بووبە (١٠٠) سەد کوژراوی تەواو. ئینجا دووبارە دەستی کردەوە بە گەڕانو پرسیار لە زانا و دانایانی تر ئادەمیزادێکی زانایان بۆ دیاری کرد ڕۆیشت بۆلایو پرسیاری تۆبەو گەڕانەوەی لێکردکە (١٠٠)سەد کەسی کوشتووە ئایا بۆی هەیە تۆبە بکاتو، تۆبەی لێی وەردەگیرێ ؟ ئەویش فەرمووی: بەڵێ دەتوانی تۆبە بکەیت و هیچ کەسێك ناتوانێ ڕێگەی تۆبەت لێبگرێت. بەڵام بەمەرجێك لەو شوێنەی کەتاوانت لێ ئەنجام داوە

مەمێنەوەو برۆ بۆ فلانە شوێنە کەکۆمەڵە خەڵکێکی موسڵمانو خودا پەرستی لێیە لەگەڵ ئەواندا خوداپەرستی بکەو مەگەڕێوە بۆ ئێرە جێگەی تاوان کردنەکەت. کابرا بەدڵێکی پاکەوەملی ڕێگەی ئەو شوێنەی گرت کەبۆی دیاری کرابوو: بەڵام مردن پێشی پێگرتو مۆڵەتی پێنەدا بگاتە ئەو شوێنەو لە نیوەی ڕێگادا گیانی دەرچوو.ئینجا لەنیوانی فریشتەی میهرەبانیو ، فریشتەی لێپرسراوی شەڕ بوو بەکێشە، کەئایا ئەوکابرایە لەبەر ئەوەی نەگەیش تۆتە جێگای دیاری کراو تۆبەی لێوەرگیراوە یان نا؟ فریشتەی میهرەبانی دەی فەرموو: تۆبەی لێوەرگیراوە چونکە بەنیەتێکی پاکەوە تۆبەی کردووە: فریشتەی لێپرسراوی سزاو تاوانیش دەی فەرموو: تۆبەی کردووە بەلام لەبەر ئەوەی هیچ چاکەیەکی نەکردووەو سوجدەیەکی بۆ خودا نەبردووە تۆبەی لێوەرنەگیراوە. بۆیە بۆ ناوبژی کردنی ئەو دوانە فریشتەی سێهەم بەڕەنگو ڕوخساری ئادەمی هات بۆ چارەسەری کێشەی ئەو دوانە و فەرمووی: وەرن ئێوە هەردووکتان پێوانەی نێوانی ئەو دوو شوێنە بکەن کە لەکوێ هاتووەو بۆکوێ دەچێ، بزانن نێوانی کامەیان نزیکترە بە هەرلایەك نزیك تر بوو ئەوە قسەی ئەوڕاستو تەواوە، لەدوای پێوانەی بەفەرمانی خودا ڕێگای چونی بەرەو خودا پەرستەکان بە ئەندازەی بستێکنزیك تر بۆ لەڕێگای لێی هاتبوو. خودا لێی خۆش بوو عەفوی کرد لەکاتێدا کە سوجدەو کڕنۆشێکی بۆ خودا نەبردبوو .

## دادگەری

## العدالة

(إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَـٰنَـٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا وَإِذَا حَكَمۡتُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحۡكُمُواْ بِٱلۡعَدۡلِۚ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعَۢا بَصِيرًا )النساء/٥٨ . **واتە: بەڕاستی خودای بەدەسەڵات فەرمانمان پێدەدات کەماڵی سپاردە بدەینەوە بەدەستی خاوەنی پێشویان، وە ئەگەر کرانە دادوەر لەنێوانی خەڵکیدا ئەوە زۆرباش بەدادوەریانە**

فەرمان ڕەوایی بكەن چونكە بەڕاستی خودای بەدەسەلات زۆربە ڕێك و پێكی فەرمانتان پێدەدات، وە بەڕاستی خوداش هەردەم بیسەرو بینایە.
ئیسلام بانگەوازێكی چاكساز و شیاوە بۆ پەروەردە و فێربوونی تاك بۆ بەهێزی نرخاندنی و، ببێتە هۆی ڕێنیشاندانی بۆ ڕێگەی چاكە، وە ببێتە هۆی هاندانی ئینسان بۆ ئەوەی دادگەربێت لەگەڵ پەروەردگاریداو، وە بە ڕوحێكی دادگەرانە لەگەڵ گیان و هەستو هۆشیو، تەواوی ئادەمیزادەكان و كۆمەڵگادا دادگەرانە ڕەفتار بكات وەلەسەر بنەمایەكی دادگەریانە خۆی دابمەزرێنێ بۆ ئەوەی ببێتە مایەی ڕازیو قایلبوونی خودا لێیو هەم قایل بوونی كۆمەڵانی ئادەمیزادەكانیش بۆئەوەی لەژیانی دونیاو دواڕۆژ سەر بەرزو بەختەوەر بێت. وەخودای گەورە فەرمانمان پێدەدات بەدادگەری و دەفەرموێ:{ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُونُوا۟ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلْقِسْطِ ۖ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُوا۟ ۚ ٱعْدِلُوا۟ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ}المائدة/٨ واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە لەبەر ڕەزابوونی خودا زۆربەباشو ڕاستی بە كاری شاهیدی دادپەروەرانە هەستن وە بەهیچ جۆرێك ڕقو دوژمنایەتیو ناخۆشیتان واتان لێنەكات كە دادپەروەرانە نەجوڵێنەوە. دادپەروەربن بەڕاستی داد پەروەری نزیكە لە تەقواو خۆپارێزی، وە تەقواو خۆپارێزبن چونكە بەڕاستی خودا ئاگادارە بە هەموو كردەوەیەكی كە ئێوە دەیكەن.وە لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێ{۞ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَٱلْإِحْسَـٰنِ وَإِيتَآىِٕ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَيَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ وَٱلْبَغْىِ ۚ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ النحل/٩٠ واتە: بەڕاستی خودا هەر دەم فەرمان دەكات بە چاكیو دادپەروەرانە، وە فەرمان بە بەخشندەییو یارمەتی بۆ خزم و دۆستان دەكات و بەرگری لە خەراپەو تاوانوداوێنپیسیو دەستدرێژی و گوناه دەكات، وە ئامۆژگاریمان دەكات بۆ ئەوەی تەواو بیر بكەینەوەلە كرداری باشەو خۆپاراستن لە خەراپە.

چۆنیەتی دادگەری ئادەمیزاد لەگەڵ پەروەردگاریدا دەبێت باوەڕێكی ڕاستو تەواوی هەبێت لە خوداترسانو، خۆپارێزی لەبەرامبەر هەموو هەڵسوكەوت و گوفتارو كردارەكانی و، بەسەر هات و گۆڕان كاریەكانی هەیبێت. وە ئامادە باشیوهەست بە لێپرسراوی تەواوی بەرامبەر هەموو ئەو ئەركو واجباتانەی كەخودا دایناوە هەیبێت.وەكو عیبادەت و خوداپەرستیو، كرینو فرۆشتنو بازرگانیو، ڕەوشت و هەڵسوكەوتی پاكو جوانو، دوور كەوتنەوە لەهەموو ئەو كارانەی كە نەهی لێكراوەوبەخەراپەوتاوانو شەڕەنگێزی سەیر دەكرێت، وە بەپێچەوانەشەوە هەموو كات سوپاس گوزار و شوكرانەبژێری زۆری دەستكەوتو نیعمە تەكانی خودابێت ، وەزۆر بەوردی هەوڵبدات دادگەری لە گوفتارو كردارو هەڵسوكەوتیدا بەكاری بهێنێ، وەهیچ گومانی تێدانیە كەداد گەری ولەخودا ترسان ئینسان والێدەكات كە بە تەنها لە دەسەڵاتو توانای خودا بترسێ وهیچی تر، ئەوكاتەی دادگەری دەبێتە پێشەواو لێپرسراوی، بە ئەنجام گەیاندنی پێویستو مافەكان حەتمیوبەجێدەبن، ئەوكاتەیە كە خودای گەورە زۆردارو ستەمكاران دەترسێنێو پەیمانی سزاو ئازاری زۆر بەهێزی بۆ ستەمكاران دیاری كردووە هەروەكو خودا دەفەرموێ: { وَسَيَعْلَمُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ أَىَّ مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ }الشعراء/٢٢٧ واتە: لە دواییدا ئەوانەی كە ستەمو زوڵمیان كردووە بۆیان دەر دەكەویو دەزانن كەچۆن بەدۆڕاو تێكشكاوی دەگەڕێنەوە بۆ لای خودا.وە پێغەمبەری خوداش دەفەرموێ﴿ إن الناس إذا أراد الظالم فلم يأخذوا على يديه أوشك أن يعمهم الله بعذاب من عنده ﴾، بەڵام دادگەری ئادەمیزاد لەگەڵ گیانو نەفسی خۆیدا دەبێ ئەو هۆیانەی كە پارێزگای لەگیانو لاشەو ئەندامەكانی دەكات بەكاریان بهێنێت و بیانپارێزێ ئەوەش بەڕێكوپێك ڕەفتاركردن و میانە ڕەوی و هەستان بە هەموو جۆری هەڵسوكەوت و جوڵانەوەیەك چونكە میانەڕەویوباش ڕەفتاركردن لە ڕەوشتی بەرزی گەورەی مرۆڤایەتیە ، گەورەیی ڕەفتاری جوانە لەنێوانی دوو چروكی و ملكەچیدا، وەزیادە ڕۆییش خۆش ڕابواردنێكی زیادەڕۆییوكامەرانیەكە سەر دەكێشێ بۆ خۆهەڵكێشانو خۆدەر خستن ،

سەرەڕای ئەوەی كە دەبێتە هۆی تێك شكان و زەرەری لاشەوسامان بە فیڕۆدان.
هەر لەبەر ئەوەشە كەدینی سەر بەرزی ئیسلام بەحەرامو نارەوای داناوەكە ئادەمیزا دزیادە ڕۆیی‌و ئیسراف بكات‌و بەرگی ئاوریشمی گران بەهاو ڕازاندنەوەی بەزێرو زیوو بكات كەدەبێتە مایەی خۆ بەمێینە پیشاندان‌و هەردەم حەزو ئارەزوی لە ڕابواردن‌و خۆبەدەرخستن بێت، هەروەك‌و خودا دەفەرموێت:
{ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ}الاعراف/٣١ واتە: ئەی نەوەكانی ئادەم لە كاتی چونەناو مزگەوت‌و دەست پێكردنی هەموو نوێژەكانتان خۆتان پاك‌و خاوێن ڕابگرن‌و جل‌و پۆشاكی پاك لەبەر بكەن، وە لەو نازو نیعمەتەی كە خودا پێی داون بخۆن‌و بخۆنەوە بەلاّم زۆرو زیادەڕەوی بەكار مەهێنن چونكە بەڕاستی خودای میهرەبان زیادەڕۆیی خۆش ناوێت.وەخودا لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێ {وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُواْ لَمۡ يُسۡرِفُواْ وَلَمۡ يَقۡتُرُواْ وَكَانَ بَيۡنَ ذَٰلِكَ قَوَامٗا}الفرقان/٦٧ واتە: بەندەكانی خودا ئەوانەن كاتێ ماڵ‌و سامانیان دەبەخشن هیچ زیادەڕۆیی ناكەن‌و زۆرباشیش دەیبخشن و ڕەزیلی‌و چروكی‌و دەست نوقاوی ناكەن بەڵكو بەمامناوەندی كاری خێر ئەنجام ئەدەن .
ئەمجارەیان دادگەری ئادەمیزاد لەگەڵ كەسانی دەورو بەردا كە بەڕاستی بۆمان دەر دەكەوێ كە ئیسلام واقعێكی گونجاوەبۆ خۆشەویستی‌و یەك ڕیزی و پێكەوەژیانی هەموو ئادەمیزادەكان وە دەستەبەرو زامنی تەواوی بەرەی ئادەمیزادە لە موسڵمان‌و ناموسڵمان زەخت‌و تۆبزی لە هیچ ئادەمیزادێك ناكات لەسەر ئاینەكەی و هەموو مافەكانیشی، تەنانەت لەكاتی بەهێزترین كاتی سەركەوتن‌و سەربەرزیدا. تەنها مەگەر لە پێناوی تەندرستی‌وبیروهۆشی تەواو سەربەرزی ئادەمیزا دەكاندا وەدینی سەربەرزی ئیسلام فەرمانی بەشوێنكەوتوانی كردووەكەداد گەری تەواوبەكاربهێنن لەگەڵ تەواوی ئادەمیزادەكان تەنانەت لەگەڵ ئەوانەشدا كە دوژمنایەتی‌و ناخۆشیان لەناو یەكتر داهەیە، هەروەك‌و خودا لەو بارەوە دەفەرموێ:

﴿ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُوا۟ ۚ ٱعْدِلُوا۟ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴾المائدة/٨ واتە: خودای بەدەسەڵات دەفەرموێ: ئەی باوەڕداران نەکەن بەهۆی ناڕێکیو دووژمن کارانەتان ڕقو قین لەیەکتر هەڵگرن و دادپەروەرنەبنو، مافی یەکتر داگیر بکەن، پێویستە تەواودادگەربن، چونکە دادگەری لە تەقوا و خۆپارێزی زۆرنزیکە، دە ئێوەش تەقواکارو خۆپارێز بن چونکە بەڕاستی خودا ئاگاداری هەموو کردەوەیەکتانە کە دەیکەن.

دینی سەربەرزی ئیسلام داوا لەتەواوی شوێن کەوەتوانی دەکات کە بەگوێرەی تواناو لێهاتوی خۆیانبەرامبەر بە شوێنکەوتوانی خۆیانوئادەمیزادەکان بۆ کاروفەرمان ڕاپەڕاندندادگەروبەوەفابنو، چاودێری تەواوی هەڵسوکەوت و بە جێهێنانی فەرمانەکانی خودابکەن و وەفەرمانی تەواویش بە هەموو تاکەتاکەکانی کۆمەڵی ئادەمیزادەکانیش بکات بۆ بە جێهێنانی تەواوی دادگەریو شێوازەکانیو، بەرامبەری وبە گژداچونەوەی زۆرداریو نەهێشتنی ستەم هەتا تەواوی ئادەمیزادەکان هەست بە ئاسودەییودڵنیایی دەکەن، وە لە ژیانێکی ئاسودەییدا دەتوانن وڵاتبەرەو ئاوەدانی و پێشکەوتن ببەنو، پارێزگاری لە خاکو نیشتمان و ئاینیان بکەنو، بەبیرو باوەڕێکی تەواوگیان لەسەردەست و ئامادەی قوربانیدان بن بۆ سەرکەوتن و پێگەیاندنی و بنچینەی دەبەست و ئاوەتەکانیان.

هەروەکو خودا دەفەرموێ:﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا۟ ٱلْأَمَـٰنَـٰتِ إِلَىٰٓ أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحْكُمُوا۟ بِٱلْعَدْلِ ۚ ﴾النساء/٥٨واتە:خودای گەورە فەرمانمانپێدەدات کە هەرچی سپاردە و ئەمانەت هەیە بیدەینەوە بەدەستی خاوەنە ڕاستەکەی خۆی. وە هەر کاتێکیش دادوەریتان کرد لە نێوانی خەڵکیدا ئەوە زۆر بە دادوەرانە فەرمان ڕەوایی بکەن چونکە بەڕاستی خودا زۆربەچاکو جوانی فەرمانتان پێدەکات، وەبەڕاستی خوداش بیسەرو بینایە.﴿وقال عليه الصلاة والسلام:أشد الناس عذابا يوم القيامة من أشركه الله في سلطان فجار في حكمه.﴾ وە بە ڕاستی ئەگەر سەیری پێشەوا و لێپرسراوانی موسڵمانانی پێشو بکەین بە تەواوی دەتوانین بڵێین: نمونەی

بەرزی و پێشەوا لێی بوون بۆ بەدیهێنانی تەواوی دادگەری و یەك سانی لە نێوانی تەواوی شوێنکەوتوان و چین و توێژەکانی ناو کۆمەڵ. ئەوەش نمونەیەکە لەو ڕوداوە ڕاستیانەی کەلە نێوانی یەکێك لەسەربازو شوێنکەوتوانیەوە ڕوویداوەو، دەگێڕنەوە: سەربازێکی سوپای موسڵمانان سکاڵای لەلای پێشەوا عومەری کوڕی خەتاب ﷺدەکات کە سەرکردەیکی پێشەوای بەناوی (ئەبوموسای ئەشعەری ﷺ) لێی داوەوسەری تاشیوە: حەزرەتی عومەرﷺهەرخێرا نامەیە کی بۆ ئەبوموسا نوسی و فەرمووی: ئەی ئەبوموسا چۆن لەو سەربازەت داوە ئەبەو شێوە تۆش بۆئەومل کەچبە هەتا تۆڵەو حەقی خۆی دەستێنێتەوە:کاتێ نامەکەی پێگەیشت ئەبو موسا بەمل کەچی لەبەردەستی سەربازەکە لەبەرامبەری ئەو هەموو سوپایەدا دادەنیشێ بۆ تۆڵە لێسەندنەوەی، ئینجا لەو کاتەدا سەربازەکە سەر بەرز دەکاتەوە بۆ ئاسمان ودەڵێ: ئەی خودای بە بەزەیی و میهرەبان ئەمن والێی خۆش بووم بەو جۆرە دادگەری لە ئیسلام بەپێویستی دادەنێ لەسەر تەواوی موسڵمانان کە گرنگی بدەن بە سەرکەوتن و بە جێهێنانی دادگەری و ئازادی و سەربەستی: وە بجەنگن و قوەربانی بدەن بەدژی ستەمو دەست درێژی لەڕێگای بەدی هێنانی حەق و ڕاستی: کەبەڕاستی ئەوەش واجب و پێویستی تەواوی سەرشانی هەموو ئەوانەیە کە لێپرسراویان لە سەر شانەو هەست بەلێپرسراوی تەواودەکەن بۆئەوکارەی کە لەسەرخۆیان داناوەو وەریان گرتووەو، متمانەی تەواویان پێدراوە: وە ڕێزو گەورەیی دادگەریش بەڕق و کینە و دوژمنایەتی وسستی نایەتەدی. پێغەمبەرﷺلەوبارەوە دەفەرموێ : ﴿ يؤتى بالولاة يوم القيامة فيقول الله عزوجل:أنتم كنتم دعاة خليفتي وخزنة ملكي في أرضي، ثم يقول لأحدهم: لم ضربت عـبادي فوق الحد الذي امرت به؟ فيقول :يارب لإنهم عـصوك وخالفوك ثم يقول لإحدهم لم عاقبتم عـبادي أقل من الحدالذي أمرةبه؟ فيقول يارب إني رحمتهم. فيقول تعالى: كيف تكون أرحم مني؟خذواالذي زاد والذي نقص واحشو بهما زوايا جهنم﴾.

﴿وقال عليه الصلاة والسلام:ثلاثة لاترد دعوتهم، الإمام العادل، والصائم حتى يقطر، ودعوة المظلوم تحمل عـلى الغمام وتفتح لها أبواب السماء﴾.

ئینجا لێرە بەدواوە چەند چیرۆكو بەسەرهاتێك لە لێپرسراوانی دادگەری كە بۆمان ڕوون ودیاری دەكەن كە چۆن توێژینەوە و پشكنینیان كردوە بۆ ئەوەی نەكەونە ناو زوڵمو ستەمەوە، وە بۆ ئەوەش ئێمە ئەوانە بكەینە پێشەواو سەر مەشقی خۆمانو، بەشوێنی ڕێگەو ڕێبازی ئەواندابڕۆینو، بەشێك لە دەستكەوت و لێخۆش بوونی خودای بەبەزەیی و میهرەبانمان دەست كەوێت.

## ئەگەر فا تمەی كچی محمد دزی بكات دەستی دەبڕم

## لو أن فاطمة بنت محمد سرقت لقطعت يدها

لە حەزرەتی عائیشەوە دەگێڕنەوە: فەرموویەتی: هۆزی قورەیش بەلایانەوە كارێكی زۆر قورس وگران بوو: دەست بڕینی ئەو ئافرەتەی هۆزی مەخزومی كەدزی كردبوو دەستی ببڕن لەجەنگی ئازاد كردنی مەككەدا. بۆیە بیریان كردەوە گوتیان: كێ باشە بینێرین بۆ لای پێغەمبەرﷺ لەو بارەوە ووت وویژی لەگەڵدا بكات؟ بۆ ئەو مەبەستە (ئوسامەی كوڕی زەیدﷺ)یان دەست نیشان كرد ، كەهیچ كەس وەكو ئوسامە توانا و هێزی نیە بتوانێ لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺبدوێ: ئوسامە بۆ ئەو مەبەستە ڕۆیشتە خزمەتی پێغەمبەرﷺو، ووت وویژی لەگەڵداكرد: پێغەمبەرﷺلەبارەی ئەو قسانەوە ڕوخساری سوورهەڵگەڕاو فەرمووی: ئوسامە تۆ تكاوداوای لێخۆش بوون بۆ كەسێك دەكەی كەسنوری خودای شكاندووەو، پێویستە تۆڵە و حەقی خودای لێ بستەندرێتەوە: ئوسامە گوتی:ئەی پێغەمبەریﷺ خودا داوای لێخۆشبوونم بۆبكە.ئینجا پێغەمبەرﷺ لەدوای بەجێهێنانی نوێژی خەوتنان (عشا)لەدوای سوپاس و ستایشی پەروەردگاری مەزن فەرمووی: زۆر باش بزانن ئەوانەی كەلە پێشی ئێوە هیلاك و لەناوچوون هەمووی بە هۆی ئەوەبوو: هەر كاتێ ئینسانێكی دەست ڕۆیشتو لەناو جەماوەردا كارێكی دزیو، دزێوودژبە فەرمانەكانی خودای دەكرد، چاوپۆشیان لێدەكردولێی دەبووران. بەڵام كەهەژارو كەم دەستێك كاری دزیوناڕەوایی دەكرد هەرگیزلێیان نەدە بووریو تۆڵەو حەقی خودایان لێ دەستاندەوە: بەڵام ﴿وإني والذي نفسي بيده لوأن فاطمة بنت محمد سرقت لقطعت يدها﴾ واتە:من دەڵێم سوێندبەو كەسەی كە گیانی منی بەدەستە ئەگەر فاتیمەی كچم دزی بكات لێی نابوورمو دەستی دەبڕم.

# ئەوەکچی تۆیە ئەی پێشەوای موسڵمانان
# إنها إبنتك يا أمير المؤمنين

(زەینەب)ەی کچی(ئیمام علی کوڕی ئەبوتالیب﷜)ویستی بەزێڕو، زیوو، گەوهەرو. خشڵو، جلوبەرگی ئافرەتان خۆی جوان و بڕازێنێتەوە: بۆ ئەو مەبەستە لەناو خەزێنەو (بیت المال)ی موسڵمانان دا(خەناکەو، گەردانە)مرواریەکی زۆربەنرخو جوانی تێدا بوو: (زەینەبە) ڕۆیشت بۆلای (کوڕی ئەبوڕافع﷜)ی لێپرسراوی خەزێنەی موسڵمانان داوای لێکرد کە ئەو گەردانەی پێ ببەخشێ، بۆخۆجوان کردنو ڕازاندنەوە، بۆماوەی سێ ڕۆژی جەژن لەدوای ئەوە دەیگێڕێتەوە بۆ خەزێنە، کوڕی ئەبی ڕافیعیش گەردانەکەی پێدەبەخشێ زەینەبەش دەڕواو خۆی پێدەڕازێنێتەوە: باوکی کەچاوی پێی دەکەوێت بەملوانکەو گەردانەیەك خۆی ئارایش و ڕازاندۆتەوە ڕوخساری سورهەڵدەگەڕێتو تورە دەبێ: بە تورەییەوە دەڵێ، کچێ تۆ ئەو گەردانەت لەکوێ بووە؟وەکێ پێی داوی؟ زەینەبەش زۆر بەترسو سامەوەگووتی: بەسپاردە لەخەزێنەی موسڵمانان، لەکوڕی ئەبوڕافعم وەرگرتووە، تەنها بۆ مەبەستی خۆڕازاندنەوەی سێ ڕۆژەی جەژنو دوایی وەك و خۆی بیگێڕمەوە: ئینجاحەزرەتی عەلی جێنشینو دادگە ری بە تەنگەوەهاتوو، خەمخۆرو پارێزگاری ماڵی موسڵمانان.داوای کرد کە کوڕی ئەبوڕافع بێت بۆلای: کاتێ کوڕی ئەبوڕافع هات: بەتوڕەییەوە پێی گوت :کێ فەرمانی پێکردووی کە ئەوملوانکە بدەیە کچی من لەناو ئەو هەموو کچە موسڵمانانەی هەرێمەکەماندا، ئایا تۆ فەرمانت لەموسڵمانان وەرگرتوە کە چۆن ئارەزوبکەی لە خەزێنەدا ئاوا ڕەفتار بکەی؟ کوڕی ئەبو ڕافع زۆر بە پاڕانەوەو لێبوردنەوە گوتی: ئەی پێشەوای موسڵمانان ئەوە کچەکەی تۆیە! بەڵام ئەم پاڕانەوەو داوای لێبووردنە ڕق و تووڕەیی پێشەواعەلی سارد نەکردەوەو، بەزەیی بە کچەکەی دا نەهاتەوە و گوتی: ئەی کوڕی ئەبوڕافع ئایا کچەکەم ئازار و سزای خودام لەسەر لادەباتو، گوناهەکانم هەڵدەگرێ لەڕۆژی دواییدا؟ کوڕی ئەبو ڕافع گوتی: نەخێرئەی پێشەوای موسڵمانان هەڵی ناگرێت. ئینجاحەزرەتی عەلی ﷜ فەرمووی: هەر

ئێستا ئەو ملوانکەی لێوەر دەگریەوەو دەیبەیەوە ناو خەزێنەو، هاواربۆحاڵت جارێکی ترئەوکارە دووبارە بێتە وە، چی بەڵایەکت بەسەر دێنم!! کوڕی ڕافعیش هەر خێرا ملوانکەکەی لێوەرگرتەوەو، بردیەوە ناو خەزێنە بۆ شوێنی خۆی.

## بۆمن ڕەوانیە زیاد لە پێویستی خۆتانتان پێ ببەخشم

## لا یحل لی أن أزیدکم علی ماکان یکفیکم

دەگێڕنەوە کە پێشەوا(عەلی﵁) جێنشینی موسڵمانان هەموو ڕۆژێك ئەندازەیەك خۆراکی جۆی دیاری کراوی دەدایە (عەقیل)ی برای کەبەشی خۆی‌و خانەوادەی دەکرد.وە هەر بەهەمان شێوە ئەوخۆراکە دەدرایە خانەوادەی موسڵمانان. بەڵام عەقیل هەموو ڕۆژێك بەشێك لەوخواردنەی کەوەری دەگرت نەیان دەخواردو پاشە کەوتیان دەکرد:لەدوای ماوەیەك، کە پاشەکەوتەکەیان زیادی کرد ئەوزیادەیەی بردەبازاڕو، خورما و ڕۆن‌وشتی کڕی‌و (هەریسە)یەکی خۆشیان پێدروست کرد کە ئەوخواردنە لە چەند شتی جۆراوجۆردروست دەکرێ: زۆریش لە مێژە ئەو جۆرە خواردنەیان نەخواردووە، چونکە توانایان نەبووە. بۆ ئەو مەبەستەش حەزرەتی عەلیان بانگ کرد کەخواردنیان لەگەڵدا بخوات ، کاتێ ئەوخواردنەیان بۆ پێشەوا عەلی ئامادەکردو بۆیاندانا، فەرمووی: ئەو خواردنەتان لەکوێ بوو؟ ئەوانیش وەڵامیاندایەوە بەڕاستی لەو بەشە خۆراکەی بۆمان دیاری کراوەو، دەماندرێتێ کەمێکمان لێ پاشەکەوت دەکردوو، نەمان دەخوارد تا کۆمان کردەوەو ئەو خواردنە مان پێی ئامادەکرد.حەزرەتی عەلی﵁ فەرمووی: لەدوای ئەو بەشەی کەهەڵی دەگرن خواردنەکە بەشتان دەکات؟ ئەوانیش گوتیان: بەڵێ بەشمان دەکات. حەزرەتی عەلی﵁ داوای لە خەزێنە کرد ئەو بەشەی کەئەوان هەڵی دەگرن‌و، ئەوندەی کەبۆیان دەمێنێتە وە بەشیان دەکات لێیان بڕن‌و، هەر ئەوەندەیان بدەنێ کەدەی خۆن.عەقیل زۆری هەوڵدا کە ئەو بەشە خۆراکەی کەپێیان دەدرا بیان دەنێ‌و نەی بڕن: بەڵام بیسود بوو.چونکە حەزرەتی عەلی﵁ فەرمووی: بۆئێمە ڕەوانیە زیاد لە پێویستی خۆت‌و خانەوادەت پێبدەین، وە سەروەت و سامانی موسڵمانانیش تەنها لەبەر دەستی مندانیە چۆنم ئارەزو لێبێت

ببیەخشم! بەڵام عەقیل زۆر لالوتو توڕەبوو: حەزرەتی علیؓ ئاسنێکی بەئاگر سوورکردەوەی بە ڕوخساری عەقیلیەوە ناو سوتاندیو عەقیل هاواری کردو ناڵاندی: ئینجا حەزرەتی عەلیؓ بە عەقیلی فەرموو: بەڕاستی عەقیل شتێکی شەرم و بێئابڕوانەیە کەتۆ دەتەویٚ ئێمە فڕێبدەیە ناو ئاگری دۆزەخەوەبمان سوتێنن و بەزەییت بەئێمەدا نایەتەوە لە کاتێکدا کەتۆ بۆ کەمێك ئاگری دونیا هاواردەکەی.چونکە ئەگەر ئێمە ئەوزیادەی کەهەڵی دەگرن پێتان ببەخشین زیادەڕەویەو بەو هۆیەوە دەخرێینە ناو دۆزەخەوە.بەڵام عەقیل هەر بە توڕەییەوە گوتی: من لای تۆ بەجێدەهێڵم و دەڕۆم بۆلای کەسێکی تر کە بەر و میوەی خۆشو سەروەتو کانزای باشم پیٚ ببەخشیٚ هەر بەو جۆرە عەقیل ڕۆیشتو پەیوەندی بە معاویەوە کردو ماوەیەکی زۆر لەلای ئەو مایەوە: ئەو ڕۆیشتنەی عەقیل بۆلای معاویە، کارێکی زۆرباشی کردە سەر معاویە کە بەهەڵی قۆزتەوە لەناو کۆمەڵە جەماوەرێکی زۆرخۆی پێبەدەربخاتو هەڵبکێشیٚ، بە خەڵکەکە دەڵیٚ سەیربکەن عەقیل لە بەرزیرەکیودانایی خۆی ئێمەی بەباشترو بەحەقتر زانیوە لەسەر برایەکەی بۆیە هاتۆتە لای ئێمەولەلای عەلی نەماوەتەوە بەڵام، عەقیل هەر خێراوەڵامی معاویە دەداتەوەودەڵیٚ بەڕاستی بەلای منەوە عەلی لەبارەی دیانەتەوە زۆر لەتۆ باشترە بەڵام تۆلەبارەی دونیاوە بۆ من زۆرلە عەلی باشتری منیش دونیام هەڵبژارد بۆیە لەخودا دەخوازم کە دواڕۆژو عاقیبەتم بەخێر بگێڕیٚ.

## هەستەبڕۆ بۆ خەزێنەی بەرەوە

## قومی لبیت المال ردیها

ڕۆژێك (عومەری کوڕی خەتابؓ)دەڕواتەماڵەوەو، زۆری برسیە داوای خواردن دەکات هاوسەرەکەی خواردنێکی شیرینی نایابی بۆ دەهێنێت: حەزرەتی عومەرؓ بەهاوسەرە کەی دەڵیٚ:ئەوخواردنە نایابەت لەکویٚ هێناوە؟ هاوسەرەکەشی دەڵیٚ: ئەوبەشە خواردەمەنیەی کەڕۆژانە وەریدەگرین، هەرڕۆژەی شتێکی کەمی لیٚ پاشەکەوت دەکەم، ڕۆژێك ئاردوو، ڕۆژێك ڕۆنو، ڕۆژێك هەنگوین، هەتا ئەمڕۆ لە

پاشەکەوتی چەندین ڕۆژانە ئەوخواردنەی لێدروست بووە.حەزرەتی عومەرﷺ فەرمووی: بەوجۆرەی کەتۆ هەرڕۆژەی شتێك لە خواردنی ڕۆژانەمان هەڵدەگری کەمدەبێت، یان نا هاوسەرەکەشی گوتی: نەخێر کەمێکی لێ هەڵدەگرم بۆ ئەوەی پێیەوە دیار نەبێت حەزرەتی عومەرﷺ فەرمووی:مادام کەمنییە و پێوەی دیارنیە!!دیارە ئەو بەشەی کە هەڵی دەگری زیادەیەو، بۆئێمەدروست نیە بیخۆین: هەستە هەر ئێستا ئەوخواردنە بەرەوە بۆ خەزێنە. لێرەدا حافیزی ئیبڕاهیمی جوانی فەرمووەکە دەڵێ:

جوع الخليفة والد نيا بقبضته    فى الزهدى منزلة سبحان موليها

يوم إشتهت زوجه الحلوى فقال لها    من أين لى ثمن الحلوى فأ شـــريها

وأتت بعد خمس وهى حاملة    دريهمات لتقضى من تشتـهيها

ويلى على عمر يرضى بموفية    على الكفا ف وينهى مستزيديها

مازاد عن قوتنافالمسلمون به أولى    فـقومى لبيت الما ل رد يـــها

بەو جۆرەم کرد بەشعر:

پێشـەوایانی ئیسـلام خزمەت گوزار بوون تەواو

هەرگیز لەترسـی خودا تێریان نەخوارد لەپـــلاو

زوهدوخواپەرستی وان هەرگیز بۆت ناکرێ باسی

بەهێـز پلەو دەسـەلات وا مل کەچ لەخواناســـی

ڕۆژێ عومەرڕۆیشتەماڵ هاوسەرەکەی لێی پرسی

زۆر حەز لەحەلوا دەکەم بەزگی خاڵیو برســــــی

پێشەوا ســوێندی بۆ خوارد هیچ نیمە پوڵو پارە

لەکوێ بۆت پەیدا بکەم بەخـــوا هیچ نیمە چـــارە

دوای تێپـەڕ بوونی چەند ڕۆژ پێشەوا هاتەوەماڵ

چەنـد درهەمێکی پێ بووبەهاوســەری دا هـەوا ڵ

لە وخـــواردنەی خەزێنەشتێــکی لێ هەڵدەگـرت

چووە بــازاڕ فرۆشتـــی خواردنی لێ دروست کرد

پێشـــەوا زۆر توورە بـوو چۆن زیادە هەیەلێــرە
بیبـــەوە ناو خـــەزێنە بۆ ئێــمە ئەوها خێــرە
ئـــەو ئافرەتـــە بەرێـــزە ڕازی بوو بەبێ کێشـــە
بەبرسی ژیان بردنە ســەرنەک بۆ دوارۆژ سەر ئێشە

واتە: برسیایەتی خەلیفە بەڕاستی جێی سەر سوڕمانە، کە دونیای لەژێر دەستدایە خودا پەرستیو گوێنەدانی بەدونیا لەگەڵ ئەو هەموو پلەو پایە بەرزییەی لەدنیا پاکوچاکی تەواو بۆلێپرسراوی ئەوها دەبێت. ڕۆژێك هاو سەرەکەی ئارەزووی شیر ینی دەکات: حەزرەتی عومەرﷺ پێی دەڵێت بەخودا پارەی شیرینیم پێنییە چۆن بتوانم بۆت بکرم!!لەدوای پێنج ڕۆژلەداوای هاوسەرەکەی چەند درهەمێکی بێنرخی هێناهەتا ئارەزووەکەی خۆی پێبکڕێ بەوجۆرە عومەر و خانەوادەکەی بەو بەشە کەمە خۆراکە قایل بوونو، ئەوزیادەی کە لەبەشی ڕۆژانەیان پاشەکەوتیان دەکرد وەری نەگرنو لەخەزێنەدا بمێنێتەوە: چونکە ئەو بەشەی کە لە ئێمە زیادە موسڵمانان پێویستیان پێی هەیە .

# دادگەری بنەوانی خاوەنداریەتییە

# العدل اساس الملك

گەورەترین نمونە لەسەردادگەری دادوەری لەئیسلامدا، باس دەکەن کەدادوەر (شریکی کوڕی عبداللهﷺ)یە دەگێڕنەوە ئافرەتێك دەڕواتەلای ئەودادوەرە شکایەت لە فەرمانڕەوا (موسای کوڕی عیساﷺ)ی مامی پێشەوای موسڵمانان دەکات لەکاتێدا کە نێوانی باخەکەی بەباخی موساوەیەو، داوای فرۆشتنی باخەکەی لێدەکات، ئەویش پێینافرۆشێ، موساش لەداخان فەرمان بە گەنجو هەرزەکارەکانی دەکات ، کە سنورو نێوانی ئەو باخە لەگەڵ هەموو سەرچاوەی زانیاریەکانی تێکبدەنو بڕوخێننوتێکەڵی بکەن: دادوەریش پسولەی ئاگاداری بۆ موسا دەنوسێ کە لەلای دادوەر ئامادەبێت ، بەڵام موسای فەرمان ڕەوا دەنێرێتە

لای سەرۆكی پۆلیسی كوفەو داوای لێدەكات كەئەو داوایەی ئەو نوسیویەتی بۆ ئامادەبوونی لەگەڵ ئەو ئافرەتە هەڵبوەشێنێتەوە، بۆیە دادوەریش فەرمان بەگرتن‌و بەند كردنی سەرۆكی پۆلیس دەدات. كاتێ فەرمان ڕەوا ئەوهەواڵەی پێدەگات هێندێك لە پیاوە ماقوڵ و لێهاتوەكان دەنێرێ بۆلای دادوەرو سەر كۆنەو لۆمەی بكەن: دادوەریش بەنوێنەران دەڵێت:ئایا بۆچی سەركردەی فەرمان ڕەوا ئەوداوایەی ڕەدكردەوەو ئامادەی بەردەمی دادگا نەبوو؟ ئایا وا دەزانێ دادگایی تەنها بۆ هەژارو نەدارو بێنەوایانە و بەس؟ ناوانییە دادگایی جیاوازی هیچ چین‌وتوێژێكی ناو كۆمەڵ ناكات. ئێستا ئێوەش بەهۆی بەشداریتان لەڕێگری فەرمانی دادوەریدا پێویستە پاداشت‌و سزای خۆتان وەربگرن: فەرمانیدا هەموویان بەند بكەن!! لەدوای ئەوە پێشەوای فەرمانڕەوا بە كۆمەڵە سوپایەكی زۆرەوە ڕۆیشتە بەردەمی بەندیخانەو بە هێز هەموویانی بەرەڵا كرد. ئینجا شەریكی دادوەریش خۆی ئامادەی سەفەركردوو ویستی بڕوات بۆبغدا بۆلای جێنشینی موسڵمانان پێشەوا مەهدی: بۆئەوەی لەسەر ئەوكاری دادوەریە لای بدات، وە دەی گوت سوێند بەخودامن داوای دادوەریم نەكرد ووە لەناو گەل‌وهۆزی عەباس وەبەئارەزوی خۆم نەبووەبە تۆبزی كردویانمە دادوەرو ، پەیمانیش یان پێدام كە لە فەرمانڕەواییەكەمدا سەربەست ودادگەر بم بۆ بەئەنجام گەیاندنی هەموو فەرمانێك. بەڵام ئێستاهیچ ڕێگە یە كی فەرمانڕەواییی‌و، دادوەری، بەدادگەری‌و ئازادی بۆ من نەماوەتەوە بەڕێوەی بەرم بۆیە داوای لێبوردن دەكەم. كاتێ سەرۆكی فەرمانڕەوا ئەو هەواڵەی بیست خێرا هاتەلای دادوەری شەریك‌و داوای پەشیمانی‌و لێبوردنی كرد و گوتی: بەخودا بەس بۆخۆت بگەڕێوە بۆ فەرمانداریەكەی خۆت ئەوەی تۆ فەرمووتە بە جێگەی دەهێنم. هەموو گیراوەكان با بڕۆنەوە بەندیخانەو بۆ خۆشم ئامادەی دادگایی دەبم لەگەڵ ئەو ئافرەتەدا. ئینجادادوەری شەریكیش فەرمانیدا باغەكەو، هەموو پێویستی و زانیاری سنوری باغەكەوەك‌و پێشوی لێبكرێتەوەو بدرێتەوە خاوەنەكەی ، بەو جۆرە فەرمانەكە دامەزرا و جێبەجێ بوو.

## پێشەوا ئەبو حەنیفە ڕازی نەبوو پلەی دادوەری وەربگرێ
## ألإمام أبو حنيفة يرفض منصب القضاء

(ئەبو جەعفەری مەنصورﷺ)دادوەریو فەرمان ڕەواییدا بە(ئەبوحەنیفەی كوڕی نەعمانﷺ) بەڵام قبوڵی نەكرد: گوتی: ئەو پلەیە شایانی كەسێكە كەخاوەنی دەسەڵاتو توانای تەواوبێت لەلایەن پێشەوای موسڵمانانو دەستو پێوەندە كانی:منیش خاوەنی هیچ شتێك نیم. ماوەیەك ئەبوجەعفەر وازی لێهێنا بەڵام دوایی ڕۆیشتەوەلایو داوای لێكردەوە كە ئەو دادوەریەی لێ قبولٚ بكاتو، سوێندی بۆ خوارد كەتەنها دەبێ تۆوەری بگری. ئەبو حەنیفەشﷺ سوێندی خوارد كەمن ئەو پلەیە وەرناگرمو قبوڵی ناكەم. لەدواییدا بە ئەبو حەنیفەیان گوت: بۆچی كە پێشەوا سوێندی لەسەر خواردیو دوایی تۆش سوێندت خوارد: ئەبو حەنیفە ﷺفەرمووی: پێشەواو لێپرسراوی موسڵمانان لەمن بەتواناو بەدەسەڵات ترو، دەوەڵەمەندترە دەتوانێ كەفارەتو بارمتەی سوێندەكەی بدات. لەدوای ئەوە جەعفەری مەنصور گەڤو هەڕەشەی لە ئەبوحەنیفە كرد، كەدەبێت ئەو فەرمانە بگرێتەدەست ئەبوحەنیفە ﷺفەرمووی: من بەهێواشی و لەسەرەخۆییەوە ڕازی نەبووم ئەو فەرمانە بگرمە دەست چۆن بەهەڕەشەو ترسان ڕازی دەبم. بەڕاستی ئەگەر مەنسور هەڕەشەم لێبكاتو بمترسێنێ بەوەی كە فڕێم بداتە ناو دەریای فوراتوبم خنكێنێ، یان دەبێ ئەو پلەیە وەربگرم ، خنكان لەناو دەریای فورات هەڵدەبژێرم. پێشەوا مەنسور چەندین پیاوی بە تواناو شیاوی ئەو پلەیەیان هەیە كەپێیان بسپێری: بەڵام من توانام نییەو شیاوی ئەوكارەنیم.

## لەكوێ خواردنو ڕۆزی بەمنداڵو خانەوادەم بدەم
## فمن أين أطعم أولادي

ئەو كاتەی كە جێنیشینی بەحەزرەتی ئەبوبكرﷺ دراوكرا بە خەلیفە. بۆب ەیانی زوو ئەبوبكرﷺ بە كۆڵێكی گەورەی جلو بەرگەوە لەسەرشانی دانا بوو، لەماڵ دەردەچێت. لەڕێگا دەگاتە عومەری كوڕی خەتاب، ﷺئەویش پێی دەڵێ، ئەی

جێنشینی پێغەمبەرﷺ تۆبە و هەموو بارەگرانەوە بەکۆڵت داداوە بۆ کوێ دەچی؟ ئەبوبکرﷺ دەفەرموێ : بۆ بازاڕ دەڕۆم بۆپەیداکردنی ڕۆزی بۆخانەوادەم. عومەرﷺ دەفەرموێ:. ئەبوبکر بازاڕی چی تۆبویە فەرمان ڕەوای موسڵمانانو؟! ئیش‌وکاری موسڵمانانت لە سەرشانە، کەی تازە توانای ئیشکردنت هەیە؟ ئینجا ئەبوبکرﷺ فەرمووی: ئەی عومەر چۆنو لەکوێ ڕۆزیو خواردن بۆ منداڵەکانم پەیدا بکەم؟بەڕاستی ئەگەرمن خانەوادەم فەرامۆش‌و لەبیر بکەم ، ئەوازۆر بەئاسانی دەتوانم موسڵمانانیش لەیاد بکەم. حەزرەتی عومەر ﷺفەرمانی دا بابڕۆین بۆ مزگەوت بۆ ئەوەی خواردن و ڕۆزی خۆت‌و خانەوادەت لە خەزێنەدا دیاری بکەین، بۆ ئەوەی بۆئیش‌وکاری ماڵت دەست بەتاڵبیت‌وبەتەنها ساز و گونجاو بیت بۆ فەرمانی جێنشینایەتیت‌و، ئاوەدانی‌وخزمەتی نیشتمان.ئینجا بۆئەو مەبەستە لە مزگەوت کۆبوونەوەو، دانیشتنێکی تەواویان ئەنجامدا لەگەڵ عومەرو، ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاحﷺ:کە لێپرسراوی خەزێنەبوو، وەلەگەڵ چەندین گەورەو لێپرسراوی یارانی پێغەمبەرﷺ.ئیش‌وکارەکان پێشنیارکرانو خرانە دەنگدان و ڕاو بۆچون، بەگوێرەی پێویستی خۆیو، خانەوادەی بەجۆرێکی گونجاو، موچەیان بۆ دیاری کردن.

## هەر لاشەیەك لە حەرام پەیدا بێت ئاگر لەوە باشترە

## کل جسدنبت من سحت فالنارأولی به

حەزرەتی ئەبوبکرﷺغولام‌وپێش خزمەتێکی هەبوو ڕۆژێك خواردنێك دێنێتەوە بۆ ماڵ‌و ئەبوبکر پارویەکی لێهەڵدەگرێت‌ودەیخوات.پێش خزمەتەکەی پێی دەڵێ: ئەی پێشەوا تۆ هەموو ئێوارەیەك پرسیارت لێدەکردم ئەو شتەت لەکوێ هێنا؟بەڵام ئەمڕۆ هیچ پرسیارت لێنەکردم؟!حەزرەتی ئەبوبکرﷺ فەرمووی: ئەمڕۆ برسیایەتی ڕێگەی پێنەدام زۆرم برسی بوو، بۆیە پرسیارم نەکرد:بەڵام ئێستا پێم بڵێ ئەو خواردنەت لە کوێ و چۆن هێناوتە؟ پێش خزمەتەکە گوتی:لەدەوری نەزانیمدا جادوگەریم دەکرد بۆ کابرایەك ، بەڵام بەباشی جادووم نەدەزانیو، تەنها کابرام هەڵدەفریواند: ئەمڕۆ چاوی پێم کەوت‌و ئەوخواردنەی پێدام کە تۆش لێتخوارد.

حەزرەتی ئەبوبكر ﷺدەستی لەگەرووی خۆی نا بۆ ڕشانەوە، زۆری تین لەخۆی كرد، هەتا ڕشایەوە و هەرچی لەگەدەیدا بوو هاتەوەدەر، گوتیان: ئەی ئەبوبكرﷺ خودا میهرەبانیت لەگەڵدابكات، لەپێناوی یەك پارو ئەو هەموو ئازارەت بەخۆت گەیاند؟ فەرمووی: سوێند بەخودا ئەگەر لەگەڵ ئەو پاروەدا گیانیشم دەرچوبایە دەرم دەهێنا؟ چونكە گوێم لە پێغەبەر ﷺبووە دەیفەرموو:

﴿ كل جسدنبت من سحت فالنار أولى به﴾ واتە:هەر لاشەیەك لەحەڕام پەیدا بێت ئاگر لەوە باشترە ، منیش لەوەترسام شتێك لەلاشەم بەهۆی ئەو پاروە پەیدا بێت.

## لە كوشتنی ئەو پیاوە عومەر بێتاوانە

## بری و عمرمن قتل الرجل

دوو پیاو كێشەیان هەبوو چونە خزمەتی پێغەمبەروﷺ دادوەری لە نێوانیاندا كرد. ئەوەی فەرمانەكەی بەسەردا بڕاو دۆڕاندی قایل نەبوو. گوتی ئەی پێغەمبەری ﷺخودا بمان نێرە بۆلای عومەر باەو دادوەریمان لە نێواندا بكات. پێغەمبەریش ﷺبۆلای عومەری ڕەوانەكردن: كابرای براوە گوتی ئەی عومەرﷺ: پێغەمبەرﷺ دادگایی كردین بەڵام، بەرامبەرەكەم قایل نەبوو گوتی: بمان نێرە بۆلای عومەر: ئەویش بۆ لای تۆی ڕەوانەكردین:حەزرەتی عومەرﷺ بەكابرای بەرامبەری گوت: ڕاستە وابوو؟ كابراش گوتی: بەڵێ وابوو. حەزرەتی عومەرﷺ فەرمووی: ئێوە دانیشن تۆزێك كارم هەیەو ئێستا دەگەڕێمەوە بۆلاتان! حەزرەتی عومەر ڕۆیشت خۆی ئامادەكردوو بە شیرەوە گەڕایەوە بۆلایان، حەزرەتی عومەرﷺ لە ئەستۆی ئەو پیاوەی دا كە بەدادوەری پێغەمبەری ﷺخوداڕازی نەبوو كوشتی. كابرای براوەش لەترسان هەڵات و ڕۆیشتەوە بۆ لای پێغەمبەرﷺوگوتی:ئەی پێغەمبەریﷺ خوداحەزرەتی عومەر هاوڕێیەكەمی كوشت. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هەرگیز من واگومان نابەم عومەر ئادەمیزادێكی موسڵمان بكوژێ. لەدوای ئەوە خودا ئەوئایەتەی نارده خوارەوە كەدەفەرموێ:{فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا }النساء/٦٥ واتە: سوێند

بەخودا ئەوانەی لافی باوەڕداری دەكەن، هەرگیز باوەری تەواویان نییە هەتا لە هەموو ڕووداو بەسەر هاتێكدا تۆ نەكەنە دادوەرو گوێڕایەڵیت نەكەن وە دەبێ بە قەناعەتی دڵیان گوێ ڕایەڵبن و هیچ ناڕازاییەك لەدڵیان دانەبێت بەرامبەر بەداد وەریەكەت و بەتەواوی تەسلیم بەتۆبن و ڕازیبن. پێغەمبەر ﷺ خوێنی كوشتنی ئەو پیاوەی بە خۆڕاییدا و حەزرەتی عومەریشی ﷺ بێتاوان كرد لەكوشتنی.

## منت بەگەورەتر دانا

## فضلتني عليه

جولەكەیەك شكایەتی لە حەزرەتی(علیﷺ)كرد لە لای حەزرەتی(عومەری كوڕی خەتاب) ﷺ لەكاتی جێنشینیدا كاتێ هەردووكیان لە بەردەستی عومەری كوڕی خەتابﷺ ڕاوەستان حەزرەتی عومەرﷺ قسەی لەگەڵ جولەكە كە دەكرد بەناوی خۆیەوە بانگی دەكرد.بەڵام كە بانگی عەلیﷺ دەكرد دەیفەرموو (ئەباحەسەن) هەر بەشێوەی پێشی دادگەریەكەیان بانگی دەكرد( ئەباحەسەن)یش كونیەیەو ئەوبانگ كردنە بۆڕێز لێنانە حەزرەتی عەلی ﷺبەوجۆرە بانگ كردنە تووڕەیی لە ڕوخساریدا دیاری دەدا لەدوای دادگایەكە حەزرەتی عومەر بە عەلی فەرموو:ئەی ئەباحەسەن ئاگام لێ بوو تۆ تووڕە بووی لەكاتی دادگایی كردنت ، ئایا پێت ناخۆشبوو لەگەڵ ئەو جولەكەیە بەرامبەریەك ڕاوەستا بوون؟حەزرەتی عەلیﷺ فەرمووی: نەخێر من بۆیە غەمبار و نائارام بووم تۆفەرق و جیاوازیت لە نێوانماندا دەكرد ناوی منت بە گەورە دەبرد بە ئەباحەسەن و جولەكەكەش بەناوی سادەی خۆیەوە بانگت دەكرد بۆیە پێم ناخۆش بوو.

## كەی ئەوخ ەڵكەتان كردووە بە كۆیلە

## متى إستبعتم الناس

دەگێڕنەوەكە كوڕی عەمری كوڕی عاصﷺ لەكاتی فەرمان بەری و لێپرسراوی وڵاتی میصردا لەكاتی كێبەركێدا كەكابرایەكی ئاسایی پێش دەكەوێ لێیدەدا :كابراش سوێند دەخوات كەدەبێت لەلای خەلیفەی موسڵمانان عومەری كوڕی

خەتاب‌ﷺ سکالاو شکایەتی لێبکات کوڕی عەمریش زۆر بە سەربەستو دڵنیاییە وە دەڵێ بڕۆ چیدەکەی بیکە من کوڕی لێپرسراوی میصرم عومەر هیچم پێناڵێت واقەدەر هات لەکاتی بەجێهێنانی واجباتی حەج عەمری کوڕی عاص‌وکوڕەکەی‌ﷺ لەگەڵ خەلیفەی موسڵمانان حەزرەتی ﷺعومەردا بوو ئەو پیاوە میصریەش کە پێکەوەیان دەبینێ بەفرسەتی دەزانێ‌و دەڕواتە لای حەزرەتی عومەر و سکالای لەکوڕی عەمر دەکات‌و دەڵێت بەبێ هیچ تاوانێك لێیداوم و منیش بەڵێنم دا کەلەلای تۆ شکاتی لێبکەم ئەویش زۆر بە بێمنەتانە گوتی: بڕۆ چیدەکەی بیکەمن کوڕی گەورە پیاوانم‌و هیچم لەگەڵدا ناکرێ! حەزرەتی عومەرﷺ توڕەبوو ڕووی لە عەمر کردووفەرمووی: کەی ئەوخەڵکەتان کردووە بە کۆیلە لە کاتێکدا بەسەر بەستی لەدایك بوون؟ لەدواییدا ڕووی کردە کابرای هەژاروو فەرمووی: ئەوداردەستە بگرەو لەکوڕی باب گەوران بدە هەروەك‌و لەتۆی داوە.

## خۆت لەنزای ستەم لێکراوانبپارێزە

## إتقوا دعوة المظلوم

دەگێڕنەوە (ئەڕوای کچی ئووەیس) لەسەردەمی معاویەی کوڕی ئەبوسوفیان لەلای مەڕوانی کوڕی حەکیم ﷺکەفەرمان ڕەوای مەدینە بوو شکاتی لەسەعیدی کوڕی زەیدﷺ کرد کە یەکێك بوو لەودەکەسەی خودا لە دوونیا مزگێنی بەهەشتی پێدابوو، وە لەوانەبوو کەخودا دوعاونزای قبوڵ ولێوەردەگرت. ئەڕوا گوتی: سەعید زەویەکی لێداگیر کردوومو ستەمی لێکردووم:مەڕوان بەدوای سەعیدی دانارد کاتێ ئامادەبوو گوتی: ئەی فەرمان ڕەوای موسڵمانان تۆ گومان دەبەی کەمن ستەمم لەو ئافرەتە کردبێ؟ من گوێم لە پێغەمبەری ﷺخودا بووە دەیفەرموو:﴿ من ظلم شبرا من ارض طوقه الله يوم القيامة من سبع ارضين ﴾ سەعد ﷺفەرمووی: خودایە ئەگەرئەو ئافرەتە درۆدەکات نەی مرێنی هەتا چاوەکانی کوێر دەبێت‌و ، گۆڕەکەشی ناو بیرەکەی خۆیان دەبێت!! بەو جۆرەچەند ڕۆژێك تێپەڕی چاوەکانی کوێربوو، لەماڵەوە لە حەوشە هاتو چۆو پیاسەی دەکرد کەوتە ناوئەوبیرەی کەلەماڵی خۆی لێیدابوو هەر لەوێشدا مردوو بوو بە گۆڕی هەتاهەتایەی.

## ئەی عومەر ئایا دادگەریت پێكاوە؟
## هل حققت العدل یاعمر؟

پێشەوا حەزرەتی (عومەری كوڕی خەتاب‌ﷺ) لەكاتێكدا كە ڕەعیە و شوێنكەوتووەكانی بە سەردەكردەوە لەكۆچەیەكی مەدینەدا گوێی لەگریانی منداڵێك بوو لە ماڵێكەوە دەهات ماوەیەك ڕاوەستا بەڵام گریانەكە هەر زیادی دەكردوو، كۆتایی پێنەهات بۆیە ڕۆیشتە بەردەرگای ماڵەكەو لە دەرگایداو ئافرەتێك دەرگای كردەوە: حەزرەتی عومەر ﷺفەرمووی : خوشكم بەڕاستی گریانی ئەو منداڵە زۆر ئازاری پێگەیاندم پێم بڵێ بۆ دەگریا تاك‌و یارمەتیتان بدەم ئافرەتەكە گوتی: زۆرسوپاست دەكەم برای بەڕێزم لەسەر ئەو هەڵوێستە جوانەت، بەڵام حەزرەتی عومەرﷺ هیچ شتێكی دیاری نەكردووە بۆ منداڵی شیرە خۆرە، منیش لەبەر هەژاری‌و نەداریم دەمەوێ ئەو منداڵە لەشی ربڕمەوە كە هێستا كاتی شیربڕینەوەی نییە بۆیە دەگریاو بێدەنگ نابێت. حەزرەتی عومەرﷺ ڕووخسەتی خواست‌و گەڕایەوە بەرەو مزگەوت‌و هەتا بەیانی زیكر و یادی خودا و داوای پەشیمانی لەخودا دەكردودەی فەرموو:ئای بەدبەخت عومەردەبێ هەتا ئێستا چەند منداڵی موسڵمانانت كوشتبێ؟ ئینجا ئەو كاتەی كە خودا پرس یارت لێدەكات تۆ وەڵامت چییە؟ ئایا بەو شێوە تۆدادگەریت پێكاوە ئەی عومەر لە ناو گەل و هۆزێكدا كە تۆ فەرمان ڕەواییان دەكەیت‌و كار و فەرمانیان لەدەستی تۆدایە: لەوەڵامیاندا دەڵێی بەخوا هێشتابەش‌و (حسەم) بۆ ئەو منداڵە شیرەخۆرانە دانەناون. ئینجاهەر لەگەڵ سپێدەی بەیان‌و بەجێهێنانی نوێژی بەكۆمەڵ: هەر خێرا فەرمانێكی سەرۆكایەتی دەركردو بەڕاگەیەندراوانی ڕاگەیاند كەبە هەموو خەڵكان ڕابگەیەنن هیچ ئافرەتێك منداڵە شیرە خۆرەكەی خۆی لەپێشی هاتنی كاتی شیربڕینەوەی كە دووساڵە لەپێناوی موچەی منداڵەكەی نەبڕێتەوە چوونكە هەرلەگەڵ كاتی بوونی منداڵەكە موچەودیاری كراوی خۆی هەیەو بۆی دەبڕدرێتەوە لە ئێستاوە.

# دادگەری لە ئیسلام

# العدالة فی الإسلام

دەگێڕنەوە (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص)لەپێشی هەڵگیرسانی جەنگی (قادسیە)(ڕەبیعی کوڕی عامر)ی ناردبۆلای (ڕوستم)ی سەرۆك و لێپرسراوی سوپای فارس، تەماشای کرد کۆڕی دانیشتنیان ڕازاوەتەوەو، (ڕۆستەم) لە سەر کورسیە کی زێڕ دانیشووە (ڕبیعیش) بەبەرگێکی ئەستورو، زرێو قەلغانێکی سەرنج ڕاکێش بە تێڕوانینێکی زۆرکەم، ڕووی لەڕۆستەم کردو و بەڕمبەکەیەوە کەلە سەر فەڕشەکەی دادەنا هەموو جارێك جێگەی لەسەرفەڕشەکەی دیاری دەکردوو کونی دەکرد، بەو شێوە سەیرەوە ڕۆیشتە پێشەوەو، لەنزیکی ڕۆستەم خۆی بەسەر ڕمبەکەی دا هێنا وڕاوەستا ڕۆستەم پرسیاری لێکرد بۆچی هاتوون بۆلامان؟ ڕەبیع فەرمووی:خودای گەورە پێغەمبەرێکی بۆناردووین بۆئەوەی بەندەکانی لە بەندایە تی بەندەوە ڕزگار بکات بۆ عیبادەتو بەندایەتی خودای گەورە، وەلەناخۆشیو تەنگەتاوی ئازاری ئە ودونیایە بۆفراوانو گەورەیی دونیا، وەڕزگار کردنیان لە زوڵمو ستەمی ڕێبازی ئاینەکان، بۆ ناو دادگەری بەختەوەری ئیسلام.

# کۆمەڵێك بوون بەگاور لەبەر نەنگی و عەییەی شەقازلەیەك

# تنصرت الأشراف من عارلطمة

دەگێڕنەوە جارێك (جیبلەی کوڕی ئەیهەم)یەکێك لە پادشایانی (غەساسنە) لەدوای موسڵمان بوونی:لەدەوری کەعبەدا دەسووڕایەوەو تەوافی دەکرد. یەکێك لە تەواف کاران دەستی بەخاولیەکەی کەوتو، ڕایکێشا، ئەویش زۆر بەتوڕەییەوە ئاوڕی لێدایەوەو شەقازلەیەکی لەکابرادا: کابراش گوتی:بەخودا لەلای پێشەوای موسڵمانان عومەری کوڕی خەتاب شکایەتت لێدەکەم: لەوکاتەدا حەزرەتی عومەرلەوێ ئامادە بوو ، سکاڵای ئەو کابرایەیان پێڕاگەیاند:حەزرەتی عومەریش جیبلەی بانگ کردوو پێی فەرموو: ئەی جیبلە ئەوەی ئەو پیاوە دەیڵێ ڕاستە؟ جیبلە گوتی: بەڵێ ڕاستەو، ئەگەر لەدەورەی کەعبەش نەبام بەشیر لوتیم دەپەڕاند، حەزرەتی عومەر فەرمووی: بۆچی وات کرد؟!جیبلە گوتی:من

تەوافم دەکردوو ، ئەوکابرایەش خاولیەکەی ڕاکێشام، حەزرەتی عومەر فەرمووی: ئەی جیبلە لەدوو پێشنیار یەکیان هەڵ بژێرە ؟ یان داوای لێبووردن لەوکابرایە بکە ، یان داوای لێدەکەم شەقازلەکەت لێبداتەوە.جیبلە پادشای غەساسنە لەگوتەکەی عومەر سەرسام بوو: گووتی: ئەی عومەرﷺ چۆن تۆ منی پادشاو گەورەو، ئەو پیاوە بازاڕییە وەك‌و یەك سەیر دەکەی؟! حەزرەتی عومەرﷺ فەرمووی: دینی سەر بەرزی ئیسلام هیچ فەرق‌و جیاوازی لە نێوانی هەژارو، دەوڵەمەند، پادشاو، گەدا، ناکات و بەیەك چاوی دادپەروە رانە تەماشایان دەکات. ئینجا جیبلە گوتی: ئەی عومەر مۆڵەتێکم پێبدە بابیرێك بکەمەوە تابزانم کامەیان هەڵ دەبژێرم حەزرەتی عومەرﷺ مۆڵەتی پێدا:بەڵام جیبلە شەو بڕیاریاندابە هەموو دەست‌و پێوەندە کانیانەوە بڕۆن.ئەوەبوو لە ئاین هەڵگەڕانەوە و ڕۆیشتن بۆوڵاتی ڕۆم‌و، بوون بەگاور. لەدوای ماوەیەك جیبلە لەهەڵبژاردنی گاور بوونی‌و هەڵاتنی بۆ وڵاتی ڕۆم پەشیمان بۆوە لەوەی کە کردوو یەتی‌و لەوچەند دێرە هەڵبستەیدا پەشیمانی خۆی دەربڕی: کەدەڵێ:

تنصرت الأشراف من عارلطمة  وما كان فيها لوصبرت لها ضرر

تكنفنى فيها لجاج  ونخوة  فبعت لها العين الصحيحة بالعور

فيا ليت أمى لم  تلدنى  وليتنى  رجعت إلى القول الذى قاله عمر

بەوشێوەکردمە شعر:

پێش ئەوەی پەشیمان بی ئاگات لەخۆت بیّ برام

باش بـــزانە من بوتـــوڕووناکی نوورو چرام

ســـەیرکەن لەوجیهانە لەســـەرشتی بێبایەخ

لەسەر قەنەفەو سیسەم دەکەویە خـوار بیّ ڕایەخ

کـاتیّ بەڵاهـاتە ڕێت بابت بیّ ســـەبـروئارام

ڕق‌و کین بەلاوەنیّ دەگەی بەهیـــواو مـــەرام

بەڵام کەئارام نەمـاچاوی ڕوون دەبـیّ تاریـــک

ژیانت گشـــت لیّ دەشێویڕۆژگارت دەبیّ تاریک

هاواردەکەی ســـەد هەزار بە قسەی تۆم بکردبایە

نـــەک وەک‌و ئێســـتا تەواولەژین بێـــزار بومایە

واتە:من ئەو پیاوە بەڕێزانەم کردە گاور لەشەرمو نەنگی شەقازلەیەك: ئەگەر دانم بەخۆمدا بگرتبایەچی زەرەر و نەنگێکی تێدابوو.بەڕاستی هیچ نەنگیەکی تێدا نەبوو تەنها خۆ بەگەورەزانی وفیز و هەوانەبێت، ڕق و کینەم وای لێکردم کەچاوی ساغ و ڕۆشەن بەچاوی کوێر بگۆڕمەوە. خۆزگە دەخوازم کە هەر لەدایك نەبومایە، وەخۆزگە بە فەرموو دەکەی عومەرم بکردبایەو ئەوهام نەکردبا یە.

## عومەر و لێپرسراویەتی فەرمانڕەوایی

## عمر ومسؤلية الحكم

لە سەردەمی جێنشینی دووەم(عومەری کوڕی خەتاب)دوو ساڵی پڕ ئازار و ناخۆشی وبێبارانی زۆربەتین بەسەر نێوەدوورگەی عەرەبیدا و بەتایبەتی تەواوی موسڵماناندا هات و، سەوزو وشکی پێکەوە سوتاندولەناوی برد، شین‌و سەوزایەتی نەما، باخ‌و باخات لەناوچوو، گیاندارومالآت شیریان تێدانەما، زۆر پیاووئافرەتی بەڕێزو، سەر بازو جەنگاوەری ئازا و بوێر مردن و لەناوچون (٩) نۆ مانگی تەواوباران نەباری گڕکان‌و تەبەقاتی زەوی دەستی بە لەرینەوەوجوڵەکرد ، سەرزەوی بەتەواوی ڕەق‌و، وشك بوو سوتا، وەك خۆڵەمێشی لێهات، ئەوساڵە ناونرا ساڵی خۆڵەمێشی (الرماد) حەزرەتی عومەر هاواری خێرخوازان‌وشوێن کەوتوانی لە عێراق‌و، شام کرد:کەبە فریای دانیشتوانی گەل‌و هۆزی برایان‌و، دورگەی عەرەبییەوە بێن‌و، دانیشتوانەکەی لەو بەلآو ئافاتە لەناو چوانە بپارێزن. وە نامەیەکیشی بۆ(عەمری کوڕی عاس)نوسی لەفەلەستین: لەدوای سەلام و ڕێز: بەڕاستی ئێمە وا بەرە و مەرگی کۆتایی دەڕۆین و نامێنین. ئێوەش ساغ‌و تەندورستن:بۆیە داواتان لێدەکەین: هاوارە، هاوارە، هاوارە بۆ ئێوە؟! بەهانامان بگەن. ئینجالەدوای ئەو بانگەوازەوە لە زۆربەی ولآتانەوە بەدەریاداو، بە دەشتیدا بەبارو بەلەم‌و، کەشتی:لەئاردو، ڕۆن‌و، پێویستی بەرە و مەدینە هات‌و وڵات ئاوەدان بۆوە.حەزرەتی عومە بەدەستی پیرۆزی خواردنی دروست دەکردو، دەرخواردی خەڵکانی دەداو تێری دەکردن. بەوجۆرە نوێنەرانی حەزرەتی عومەر بەدەورو بەری ناودوورگەی عەرەبیدا دەگەڕان‌و ئەو خواردەمەنیانەیان بەسەر

خەڵكاندا دابەش دەكردو، ئێش‌وئازارو ناخۆشیان لەسەر خەڵكی كەمدەكردنەوە. حەزرەتی عومەرﷺ لەوساڵی گرانیەدا سوێندی خواردكە گۆشت و چەوری و خواردنی خۆش نەخوات هەتا هەموو خەڵك دڵنیاو ئاسودە نەبنەوە. وە بەڕاستی لەسەر بەڵێن‌و پەیمانەكەی خۆی بەردەوام بوو، بردیەسەر: هەتا خودای گەورەش بەتەواوی بارانی باراندو خۆشی‌و ئاسودەیی گەڕایەوە بۆ وڵات. حەزرەتی عومەرﷺ دەفەرموێ: چۆن هاوپەیمانان‌و شوێنكەوتوانمان یارمەتی‌و كۆمەكیمان لەگەڵدا دەكەن لەكاتێك دا كەئەوان چیان بەسەردابێت، بەڵام پێشەواو سەركردەكانیان بەسەریاندا نەیات.

## مزگێنی بە هاوڕێكەتان بدەن كوڕیان بووە

## بشر صاحبك بغلام

حەزرەتی(عومەری كوڕی خەتابﷺ)شەوێكیان بەناو شاری مەدینەدا بۆ هەواڵ پرسین‌و ژیان‌و گوزەرانی موسڵمانان دەسوڕایەوە: لەدوورەوە ماڵە ڕەشماڵێكی چاو پێكەوت ڕۆیشتە پێشەوە، گوێی لەناڵەناڵی ئافرەتێك بوو، كەسەیری كرد كابرایەكیش لەلایە كی ڕەشماڵەكە دانیشتبوو: عومەرﷺ لێی پرسی براكەم چییە؟، ئەو ئافرەتە بۆچی دەگریاو دەناڵێنێ ؟ كابرایەكە گوتی:برام ئەو ئافرەتە خەریكی منداڵبوونە. حەزرەتی عومەرﷺ فەرمووی: كەسی لەلایە: كابرا گوتی: نەخێر كەسی لەلانییە. عومەرﷺهەرخێراگەڕایەوە بەرەوماڵ‌و، بەئوم كەلسومی هاوسەری فەرموو: ئایا ئارەزووی پاداشتێكی گەورە دەكەی كەخودا بۆی ناردووی؟ هاوسەرە كەی گوتی: ئەو خێرە چییە خودا ناردوویەتی؟ فەرمووی: ئافرەتێكە خەریكی ژانی منداڵ بوونەو كەسیشی لەلانیە هاوسەری فەرمووی: مادام تۆ حەزدەكەی بابڕۆین، وە هەرچی بۆ منداڵ بوون پێویست بوو، لەگەڵ خۆیاندا ئامادەیان كردو، مەنجەڵێك‌و، هێندێك ئاردو شیرینی‌و، دانەوێڵەیان لەگەڵ خۆیاندا هەڵگرت‌و، بەدوای یەكدا ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە بەر دەركی ماڵی كابراو، بەهاوسەرەكەی فەرموو: ئەتۆ بڕۆ ژوورەوە بۆلای ئافرەتەكەو، حەزرەتی عومەریشﷺ بانگی پیاوەكەی كرد وەرە تۆش ئاگرم بۆ بكەوە عومەریش

ئاگرەكەی خۆش دەكردوو لەناو چڕەی دوكەڵدا نوقم ببوو: مەنجەڵەكەی لەسەر ئاگردانا هەتا ئەوشتەی كەدەیان ویست ، حەلوا یان هەرشتێكی تربوو، تەواو كولا، تا ئەو كاتەش ئافرەتەكە منداڵەكەی بوو.ئوم كەلسوم سەری بەرز كردەوەو. هاواری كرد ئەی پێشەوای موسڵمانان مزگێنی بە هاوڕێكەت بدە كوڕێكیان بووە؟ كاتێك كابرا گوێی لەو ئافرەتە بوو گوتی: پێشەوای موسڵمانان ڕاچەنیو، سەرسام و خەجاڵەتی پیشانداو، گوتی:ئەی شەرمەزاریو، خەجاڵەتی بۆ ئێمە ئەی پێشەوای موسڵمانان ئەتۆ هاتووی و یارمەتی و ئیش بۆ ئێمە دەكەیت حەزرەتی عومەر ﷺفەرمووی: برای عەرەبم هەركەسێ ئیش‌وكاری موسڵمانانی بەدەستەوە بێت دەبێت بەتەواوی، ئاگای لە كاری بچوك و گەورەی فەرمانبەرانی بێت ، چونكە ئەوكەسە لە هەموو ئیش‌و كاروباریان لێپرسراوە ئەگەر لەكارو فەرمانیان خافڵ‌و بێئاگابێ زەرەر مەندی دونیاو دواڕۆژە.

## هاوار بۆ تۆ عومەر لە ئاگری

## ویل لك یا عمر من النار

جارێكیان حەزرەتی عومەرﷺلەمزگەوت دانیشتبوو:كابرایەك بەلایدا تێپەڕیو گوتی: ئەی هاوار بۆ تۆ (عومەر) لە ئاگری دۆزەخ. عومەرﷺفەرمووی :وەرە پێشەوە پێم بڵێ ئەو قسەت بۆچی كرد؟ ئەویش گوتی: فەرمان بەر دارەكانت كارێكیان پێ دەسپێریو بۆیان دیاری دەكەیت‌و، بەڵام، لەدواییدا هیچ لێیان ناپرسیەوە بزانی ئەوكارەیان وەك‌و پێویست ئەنجامداوە یان نا؟ عومەرﷺ فەرمووی: بۆم ڕوون بكەوە وەك‌و چی؟ كابراگوتی: تۆ فەرمان ڕەواییت داناوە لە (میصر)وكاری تایبەتیت بۆدیاری كردوە بەڵام، لەدوای دەست بەكار بوونی ئەوەی كەتۆ بۆت دیاری كردوە بیكات ئەو وازی لەوكارەی تۆ هێناوەو، بەئارەزوی خۆی فەرمان ڕەوایی دەكات.حەزرەتی عومەرﷺ هەر خێرا دووپیاوی ئەنساری بەرەو وڵاتی میصر بەڕێدەكات بۆئەوەی سەیربكەن بزانن ئەوەی ئەوكابرایە دەیڵێت ڕاستە یان نا: كاتێ ئەو دووپیاوە گەیشتنە وڵاتی میصر: پرسیاریان كرد :قسەی ئەوكابرایە ڕاست بوو، ئینجا ڕۆیشتەنەلای فەرمان ڕەوای ئەووڵاتەوداوایان لێكرد

كەلەگەڵیان بێت بۆلای حەزرەتی عومەرﷺئەویش بەڵێنی پێدان‌ولەگەڵیاندا ڕۆیشت بۆلای حەزرەتی عومەربەڵام، عومەرﷺنەی ناسیەوە، چونكە كاتێ لەمەدینەوە ڕۆیشتبوو پیاوێكی گەنم ڕەنگی لاوازی بینمود، بەڵام بەهۆی دەسەڵات‌و فەرمان ڕەوایی بەهۆی داهات‌و دەست كەوتی شار و گوندەكانی ، گۆشتین‌و سوور هەڵگەڕابوو: بۆیە عومەر ﷺپرسیاری لێكرد تۆكێی؟ ئەویش گوتی:من فلانە كەسەم كە كردوتمە فەرمان ڕەوای وڵاتی میصر.عومەرﷺ فەرمووی: هاواربۆتۆ كەهەرچی فەمانم پێكردووی بیكەی نەت كردووە، وەئەوەی كە فەرمانم پێكردووی مەیكە كردووتە! هەمووكارەكانت بە پێچەوانەی فەرمانی ئێمەبووە: سوێندبە خودادەبێ ئازارێكت بدەم تەواو ئێشت پێبگات.لەدوایی عومەرﷺ هاواری كرد بەرگێكی خوری لەڕۆژێكی زۆر گەرماداو، دارعەسایەك‌و، (٣٠٠)سێ سەد سەر ئاژەڵی خێریان بۆ هێنا، ئینجا بەوكابرا فەرمان ڕەوایەی میصری فەرموو: ئەوبەرگە خوریەی كەوەك لێفەوایە لەبەری بكە؟ چونكە باوكیشت بەرگێكی ئەوهای لەبەر بوو، بەڵام ئەوبەرگە لەئی باوكیشت نوێترو چاكترە، وە ئەو داردەستەش بەدەستەوە بگرە، كە زۆر لەداردەستی باوكت باشترە، بڕۆ ئەو ئاژەڵانە لە فلانە شوێنە باش بلەوەڕێنە. وە هیچ كەسێك لە شیر و داهاتی ئەو ئاژەڵانە مەگێڕەوە؟ تەنها خزم‌و خانەوادەی عومەری نەبێت.ئەویش زۆر بەشەرمەزاری‌و لاوازیەوە هەستا و ڕۆیشت:حەزرەتی عومەرﷺ بانگی كردوو گێڕایەوەو، پێی گوت: تەواو تێگەیشتی من چیم پێ گوتی؟ ئەویش ڕاوەستاو، گوتی:بەڵێ باش تێگەیشتم، بەڵام بەخودا ئەی پێشەوای موسڵمانان هەرگیز من توانای شوانیم نییە: ئەگەر حەز دەكەی وەرە لەملم بدەو پێم خۆشە بمكوژەو ڕزگارم بكە: حەزرەتی عومەرﷺ فەرمووی: ئەگەر بتگێڕمەوە سەر كار و فەرمان ڕەواییەكەت دەبیە چی پیاوێك؟ كابرا سوێندی خوارد ئەگەر ئەم جارە بمگێڕیەوە بۆ سەركارەكەی خۆم هەرگیز جارێكیتر كاری خەراپەت گوێ لێ نابێت و نایبیستیەوە، تەنها ئەو شتەی كەخۆت پێت خۆشە:ئینجا حەزرەتی عومەرﷺ كابرای گەڕاندەوە سەركارەكەی خۆی بۆ وڵاتی میصر.ئەویش لەدوای ئەوە بوو بە پیاوێكی زۆرباش‌و چاك.

# ئێوە لە ئێمەن و بۆ لای ئێمەن خانەوادەی بەیت

# أنتم منا والينا أهل البيت

دەگێڕنەوە(كسرا)نامەیەكی بۆفەرمان ڕەوای وڵاتی(یەمەن)كە ناوی بازان بوو نارد: كە هەواڵم پێدراوە كابرایەك لەمەككە لەهۆزی قوڕەیش پەیدا بووە ، واهەست دەكات كەپێغەمبەرەﷺ : بڕۆبۆلای داوای لێبكە وازبێنێ لەوداوایەی كەدەیكات : ئەگەر وازی هێنازۆرباشە، ئەگەر وازیشی نەهێناو بەردەوام بوو: ئەوەسەری لەلاشەی جودا بكەوەو بۆمی بنێرە؟ بازانیش نامەكەی بۆ پێغەمبەرﷺ ڕەوانەكرد: هەر لەگەڵ گەیشتنی نامەكەی : پێغەمبەرﷺوەڵامی نامەكەی بۆبازان نوسیەوەو فەرمووی: ئەی بازان خودای گەورە فەرمانی پێدام كە(كسرا)پادشای فارس لەمانگی فلان و ڕۆژی فلان دا كوژراوە: بازان كەئەو هەواڵەی پێگەیشت كەنوسراوە كسرا كوژراوە سەری سوڕماو گوتی:چۆن شتی وابووە!! بۆیە چاوەڕوانی هەواڵ گەیشتن بوو لەو بارەوە، گوتی: ئەگەر ئەوهەواڵە ڕاست بێت ئەوە بەڕاستی پێغەمبەرەوﷺ باوەڕی پێدە هێنم بەڵام، ئەگەروانەبوو: دیارە خەراپ ڕوودەدات. كاتێ بازان هەواڵی كوشتنی كیسرای پێگەیشت لەچی ڕۆژێكدا پێغەمبەر باسی كرد بوو وا بوو: بازان لەگەڵ كۆمەڵێك لەدارو دەستەكانی باوەڕیان هێناو، موسڵمان بوون: لەدوای ئەوە بازان هەواڵی موسڵمان بونی خۆیو كۆمەڵەكەی بە پێغەمبەر ﷺ ڕاگەیاند. ئینجا ئەو كۆمەڵەی كەنامەكەیان پێگەیاند، لەدوای موسڵمان بوونیان گوتیان: ئەی پێغەمبەریﷺ خودا ئێستا ئێمە لەكێین؟ فەرمووی: ئێوە لەئێمەن و خانەوادەی لای ئێمەن.

# لێبگەڕێن ئەوە بۆ ناو ئاگریە

# دعه إلى النار

دەگێڕنەوە كەقەیسی كوڕی (مەتاتیە)ی هاتە ناوكۆڕو كۆمەڵك لەموسڵمانان كە سەیری كرد سەلمانی فارسیو، سوهەیبی ڕۆمیو، بیلالی حەبەشی، ﷺ تێدایە گوتی: بەڕاستی لام سەیرە ئەوانە لێرەن: هۆزی ئەوسوخەزرەج یارمەتی

وهەوڵدانی سەركەوتنی محمدیان داوە:چونكە ئەوانە لەهۆزی پێغەمبەرﷺوعەرەبن بەهۆی نەتەوایە تیەوە یارمەتی دەدەن :بەڵام ئەمن نازانم ئەوفارسیو ڕۆمیو حەبەشیە چین لێرەو بۆچی داوای یارمەتیان لێكراوە؟ لەناو كۆڕەكەدا معازی كوڕی جەبەل هەستاو بەرۆكی قەیسی گرتو بەرەولای پێغەمبەری ﷺبرد:بۆ پێغەمبەری گێڕایەوە كە قەیس چی گوتوە: پێغەمبەرﷺ زۆر توڕەبوو: هەستاو بەرۆكی قەیسی گرتوڕای كێشا ، هەتا بردی بۆ مزگەوتو، بانگی ڕاهێشت(إن الصلاه جامعه) بەڕاستی نوێژ كۆكەرەوەیەو، جەماوەری كۆكردەوەو فەرمووی:

﴿ يا أيها الناس إن الرب واحد والاب واحد وإن الدين واحدوليست العربيه بأحدكم من أب وأم وإنماهي اللسان فمن تكلم العربيه فهوعربي﴾ ئینجا موعازی كوڕی جەبەلﷺ هەستاو فەرمووی: یارسول الله چی فەرمانێكمان پێدەدەی بەرامبەر ئەو دووڕووەی؟ پێغەمبەر ﷺفەرمووی: لێیگەڕێن ئەوەبۆ ئاگریە. بەوجۆرە قەیس لە هەڵگەڕاوەكانو مرتد بوو وە بەپاشگەزیو مرتدییەوە كوژرا.

## پێ لەسەر كوڵمەم دابنێ بۆئەوەی ببێتە دا پۆشەری تاوانەكەم

## دس علی خدی تكفیرا لذنبی

گوفتار قسە وابو لەناو یارەكانی پێغەمبەرداﷺ كە (ئەبوزەڕی غەفاریﷺ)چاك ترینو خۆ پارێز و بە تەقواترین لەهاوڕێیانی پێغەمبەرﷺبووە:جارێكیان ئەبوزەڕ لەگەڵ بەندەیەكی ڕەشداتێك دەگیرێن و لێیان دەبێت بە دەمەدەمی و قسەگوتن بە یەكتری: ئەبوزەڕﷺتوڕەبوو بەبەندەكەی گوت: كوڕی ڕەشەی: پێغەمبەر ﷺ لە ئەبوزەڕ تووڕە بووپێی فەرموو: (طف الصاع، طف الصاع)واتە: پێوانەكە پڕ بوو پێوانەكە پڕبوو بەڕاستی كوڕی سپیان هیچ ڕێزو گەورایەتیان بەسەركوڕی ڕەشانەوە نیە تەنها تەقواو خۆپارێزی و كرداری باش نەبێت: ئینجا هیچ ڕێگە چارەیەك بۆ ئەبوزەڕ نەمایەوە تەنها ئەوەنەبێ كەداوای گەردن ئازادی و لێبووردن لەبەندەكە بكات: بۆیە سەرو ڕوخساری لەسەر زەوی داناو بەبەندەكەی گوت:وەرە پێت لەسەر سەرو ڕوخسارم دابنێ بۆئەوەی ببێتە ڕەش بوونەوەی تاوانەكەم .

## ئەگەر درۆزنبی ئازارت دەدەین

## إن كنت كاذبا عاقبناك

کابرایەك هاتە لای (سلێمانی کوڕی عبدالملك)گوتی:ئەی پێشەوامن ئامۆژگاریەکم هەیە: ئەویش گوتی: ئەو ئامۆژگاریە چییە؟ کابرا گوتی:فلانە کەس فەرمانبەری یەزیدو، وەلیدو، عبدالملك بووە: بەڵام، من دەزانم نا پاکی لەکاری هەموویاندا کردووەو بە پێچەوانەی فەرمانی ئەوان جوڵاوەتەوە و، ماڵوسامانێکی زۆری لەوپێناوەدا بەفیڕۆ داوە:فەرمان بدە کە ئەو هەموومالە بەفیڕۆچووە بگەڕێنێتەوە. پێشەوا سلێمان گوتی:بەڕاستی ئەتۆش زۆر لەوی شەڕەن گێزترو، ناپاكو، خەراپ تری، ئەتۆ جاسوسی و ، چاودێریت بەسەر کار و ئیشی ئەودا کردووەو، شتت لێ ئاشکراکردووە: شتێکی واکەخودا شاردویەتیەوەو، دایپۆشیوە: ئەگەر لەوە نەترسابام لەدواییدا هاوڕێیانی ئامۆژگاری کار بەخەراپ و ناپەسندی ناوزەدبکەن، ئازارێکی زۆربەهێزم دەدای:بەلام ئێستا لەوسێ ڕەوشتانە یەکیان هەڵدەبژێری؟ کابراگوتی:ئەی پێشەوای موسڵمانان فەرموون:بزانین چین؟ فەرمووی: ئەگەر حەزدەکەی دەڕۆیین لێی دەکۆلینەوەو ، هەموو شتەکان دەخەینە ڕوو، ئەگەر ڕاستت گوت ئەوەدەبیە جێگەی ڕقوقین لێداگرتن، وە ئەگەر لە گوتەکانیشتدا درۆت کرد ئەوە سزا و تۆڵەت لێدەستێنین، ئەگەر حەزیش دەکەی لەسەر کارەکەت لات دەدەینو. کابرا گوتی:لەسەر کارەکەم لام بدەن ئەی پێشەوای موسڵمانان؟پێشەواش پێی گوت: دەتنێرینەوە سەر کارەکەی خۆت بەلام جار یکی تر ئەو کارە دووبارە نەبێتەوە.ئادەمیزادی خاوەن ڕێز و شکۆ مەشکێنەو، شتێك کە خودا لێی داپۆشیوەو شاردویەتیەوە ، تۆبەدەری مەخەو، بەسەر کاری خەڵکیەوە هەڵمەوەستە .

## مافی خۆت وەربگرە چونکەددانی پێدا هێنا

## خذ بحقك فقد أ قـَـر

دەگێڕنەوە کابرایەك هێندێ ماڵی بە سپاردە(امانه)لەلای یەکێك دانابوو:لەدوای ماوەیەك داوای ماڵەکەی کردەوە: ئەو کابرایەی کەماڵەکەی لەلاداندرابوو، ئینکاری

کردوو، گوتی: هیچ ماڵی تۆم لەلانییە! کێشەیان لێپەیدابوو:داوایەکەیان ڕۆیشتەلای دادوەری(ئیاسی کوڕی معاویەﷺ)کابراداوای ماڵەکەی کردەوەکە لەفلآنە شوێنو جێگە ئەوەندەماڵەم لەلای ئەوپیاوە داناوە. (ئیاس)گوتی: ئەو شوێنەی کە ئەو ماڵەت دا بەوکابرایە چی لێبوو؟ کابرا گوتی:دارێکی لێبوو. ئیاس گوتی:بڕۆ بۆلای ئەودارە: بەوهیوایەی ئەوماڵەت لەلای ئەودارە شاربێتەوەو، لەیادت نەمابێتو، لەوێ بەچاو پێکەوتنی دارەکە بەبیرتبێتەوە و بیدۆزیەوە. ئەوکابرایە بەرەو ئەو شوێنە ڕۆیشت کەدارەکەی لێیە: ئیاس بەکابرای داوا لێکراویشی گوت : تۆ لێرە دانیشە چاوەڕێبکە هەتا ئەو پیاوە دێتەوە: ئەو کابرایە دانیشتو، چاوەڕێی دەکرد.ئیاسی دادوەریش لەگەڵ دادگایی کردنی داهەموو سەرە سەعاتێك سەیری کابرای داوالێکراوی دەکرد. لەدواییدا پێی گوت:بۆی هەیە ئێستا هاوڕێکەت گەیشتبێتە ئەوشوێنی دارەی کەباسی کردووە؟ بەڵام کابرای داوا لێکراو گوتی: نەخێر هێشتا نەگەیشتوە: ئینجا ئیاس گوتی:ئەی دووژمنی خودا تۆ ناپاك و خائنی! کابرا گوتی:ڕێگەم پێبدە بڕۆم خودا باشت بۆبکا، ئیاس داوای کرد ئەو پیاوە بهێڵنەوەو، پارێزگاری لێبکەن هەتا هاوڕێکەی دێتەوە، کاتێ هاوڕێکەی هاتەوە پێی گوت: ماڵەکەی خۆت وەر بگرەوە چونکە دانی بە ماڵەکەت دا هێنا.

## ئێمە بۆ دادگەری پێویستترین لەکسرا

## نحن أحق بالعدل من كسرا

جارێك یەکێك لە ئافرەتەکانی هۆزی (قبتی)ڕۆیشتەلای عومەری کوڕی خەتابوﷺ شکایەتی لەفەرمانڕەوای میصر:عەمری کوڕی عاصﷺ کرد.کە پارچەیەك لەزەوی ماڵەکەی بە بەرمزگەوت کەوتوە، کە ئێستاش بەمزگەوتی (عەمری کوڕی عاصﷺ) بەناو بانگە، پێشەوا عومەر نامەیەکی بۆ فەرمانڕەوای میصر عەمری کوڕی عاصﷺ لەسەر پارچەیەك گۆزەی شکاو نوسی: ئەی عەمرئێمە زۆر پێویسترو شایان ترین بۆدادگەری لە(کیسرای ئەنەو شیرەوان) مەبەستی پێشەوا عومەرﷺ ئەوەبوو کە عەمر بیر لەوڕووداوە بکاتەوە کاتێك ئەنەوشیرەوان ویستی کۆشك و

باڵەخانەی کسرا دروست بکات زەویەکەی چوارگۆشە نەدەوەستا لەبەر خانوماڵێکی بچوکی پیرە ژنێك، داوایان لەو پیرەژنەکرد کە ئەو خانوەیان بەهەر شتێك دەیەوێ پێیان بفرۆشێ! بەڵام ئافرەتە کە گوتی:من هاوسێیەتی پادشا ناگۆڕمەوە پڕ بەپڕی ئەندازەی خانوە کەم بەزێڕ. ئینجا ئەگەر ئەو شیرەوان خانوەکەم لێداگیر بکات ئەوە زۆر بە ئاسانی دەتوانێ و دەسەلاتی هەیە:چۆنی بۆخۆی ئارەزوبکات.کسرا گوتی:وازلەوخانوە کەلاوەی ئەوپیرەژنە بهێنن‌و، کۆشك‌و باڵەخانەکە دروست بکەن.لەدوای دەست بەکار بوون‌و تەواوبوونی کۆشکی پادشایی، زۆر لە ئەندازیاران‌و پسپۆڕانی خانو بەرەو ڕەخنە گران بۆ جوانی‌و ڕێك‌و پێکی سەیرکردنی ئەو خانوە هاتن، هەرچی سەیری دەکرد لە جوانی‌و گەورەیی بیناسازیدا سەر سام دەبوو: تەنها ڕەخنەیان لەو تۆزە خوارییەی هەبوو، کەلەلای خانوی ئەوپیرە ژنەوە دیار بوو:دەیان گوت ئەگەر ئەو خواریەی تێدا نەبایە هیچ شتێکی نەدەگەیشتێ؟ بەڵام کسراله‌وەڵامیاندا گوتی:منی ش دەڵێم بەمانەوەی خانوی ئەوپیرەژنەوخواربونی باڵەخانەی نەوشیرەوان ڕازاوەتر و ڕێك و پێك و جوان تربووە.ئینجا ئەو ئافرەتە میصرییە نامەکەی لە پێشەواعومەر وەرگرت‌وگەڕایەوە.نامەکەی گەیاندە دەستی عەمری کوڕی عاص‌وﷺ، ئەویش زۆر ڕێزی لەنامەکەی عومەرگرت‌و، ئەوبەشە زەویەی خانوی ئەو ئافرەتەی بۆگەڕاندەوە. لەبەرئەوە ئەندازیاری نەخشەی مزگەوتەکە کاتی دروست کردنی ڕاست‌و تەواو نەبوو، بەڵام بەهۆی گەڕاندنەوەی ئەو بەشە خانووە، ڕێك‌و باش‌و تەواو بوو.

## سوێند بەخودا دادوەریم بەحەق‌و ڕاستی کردووە

## والله لقدقضيت بالحق

موسڵمان‌و جولەکەیەك بۆ چارەسەری کێشەیەکیان ڕۆیشتنە لای حەزرەتی عومەرﷺ: کەسەیری کێشەکەیانی کرد، ڕاستی‌وحەق بە جولەکەکە بوو: پێشەوا عومەریشﷺ حەق ومافی بە جولەکەکەدا. ئینجا جولەکە کە گوتی: والله دادوەریەکی ڕاستت کرد. عومەرﷺفەرمووی: چیت پێگەیشتوە؟جولەکەکە گوتی: سوێند بەخودا ئێمە لەتەوڕاتدا پێمان گەیشتووە هەر دادوەرێك دادوەری

بەڕاستیو ڕەوانی بكات فریشتەیەك لەلای ڕاستیو یەكێك لەلای چەپی ڕێنمونیو یارمەتی دەدەن بۆحەقو ڕاستی مادام لەگەڵ حەق دایە.ئینجا هەر كاتێكیش وازی لەحەق هێنا ئەو فریشتانە دەڕۆنو بە جێی دەهێڵن.

## لە ئەمڕۆوە تۆبووی بە ستەمكار

## صرت جائرامنذ اليوم

دەگێڕنەوە جارێكیان عومەری كوڕی خەتابو‌ ، ئوبەیەی كوڕی كەعب ‌ كێشەیەكیان لەنێواندا ڕوودەدات: بۆ دادگایی نێوانیان دەڕۆنەلای (زەیدی كوڕی سابیت ‌ كەدادوەر و فەرمان ڕەوای حەزرەتی عومەر بوو لەمەدینە. كە ڕۆیشتنە لای زەید: لە پێشەوە سەلام لە عومەردەكاتو، زۆرڕێزی لەپێشەوا عومەر دەگرێتو: بۆ خۆش ترین شوێن ئامارەو فەرمووی لێدەكات لەكۆڕی دادگاییدا.لەدوای خستنە باسی كێشەكەیان: ئوبەیە داوای لە عومەر كرد سوێند بخوات: زەید ڕجای لە ئوبەیە كرد، كە پێشەوا عومەر سوێند نەداتو ، لێی ببورێ.حەزرەتی عومەر تووڕەبوو، گوتی: ئەی زەید تۆ لە ئەمڕۆوە بوویە ستەمكار چونكە تۆ سەلام لەمن دەكەیو، بەپێشەوا بانگم دەكەیو، جێگەی خۆشم بۆ چۆڵ دەكەیو، داوای لێبوردنیشم بۆدەكەی.

## بەڕاستی من ئینسانێكم

## إنما أنا بشر

دوو پیاو كێشەیان لەبارەی میراتەوە لێ پەیدا بوو بۆ چارەسەری چونە لای پێغەمبەر ﷺ ئەو دوو پیاوە هیچیان شاهیدیان نەبوو:پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەبێ شاهید هاتونە لام: منیش وەكو ئێوە ئادەمیزادم: ئادەمیزادەكانیش هێندێكیان لە هێندێكیان زیكرەك تروداناترن دەتوانن بەهۆی داناییانەوە بەڵگەوزانیاری باشتر بهێننەوەو بتوانن بەسەر بەرامبەرەكەیان سەركەوتووبن، منیش بە گوێرەی قسەو گوفتارەكەیان دادوەر ی دەكەم. بۆی هەیەدادوەری لەبەرژەوەندی كەسێكیان بێت بەهۆی قسە زانینیەوە كەحەق وانەبوو ئەوماڵە بدرێت بەئەو.ئینجا ئەوماڵەی

کەبەلێ زانی خۆی وەری دەگرێت: وەکو پارچەیەك ئاگر وایە بۆگیانیو، لەڕۆژی دواییش وەکو ئەڵقەیەك دەچێتەناو ئەستۆیو دەیگرێت، ئینجا هەردوو پیاوەکە دەستیان کرد بەگریانو هەریەکەیان بەوی تری دەگوت برام بەڕاستی ماف‌وحەق بەتۆیە: دوایی پێغەمبەر ﷺفەرمووی:مادام ئێوە بەو شێوەیە دەڵێن: بڕۆن ماڵکە لەنێوانی خۆتاندا بەحەقو ڕاستی بکەن بەدوو بەشەوە، وە بە شێوەی تیروپشك هاویشتن لە نێوانیاندا بکەنو، هەریەکەی بەشێکیان هەڵبگرنو، لەدواییدا هەریەکەتان گەردەنی ئەویترتان ئازاد بکات.

## پێمخۆش نیە خۆم لە ئێوە جیاواز بکەمەوە

## أكره أن أتميزعليكم

دەگێڕنەوە پێغەمبەرﷺلە گەشتێکدا فەرمانیکرد مەڕێکیان ئامادەکرد: یەکیان گوتی: من سەری دەبڕم: یەکیتر گوتی منیش کەوڵی دەکەم:یەکیتر گوتی منیش لێی دەنێمو دەیکوڵێنم: پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: منیش دار کۆدەکەمەوە: هاوڕێکانی گوتیان: یارسول اللهﷺ ئێمە ئیشەکەی تۆش دەکەین: پێغەمبەر ﷺفەرمووی: دەزانم ئێوە ئیشی من دەکەن بەڵام بۆ خۆم حەز ناکەم خۆم لە ئێوە جودا بکەمەوە: چونکە خودای گەورەش حەزناکا بەندەکانی خۆیان لەهاوڕێکانیان جودابکەنەوە .

## دادگەری عومەر لەگەڵ منداڵەکانی

## عدل عمر فى ولده

دەگێڕنەوە (عبدالرحمنی کوڕی عومەری کوڕی خەتابﷺ)لەگەڵ باوکی (سروعە)ی ڕۆیشتنەلای (عەمری کوڕی عاصﷺ)فەرمانڕەوای وڵاتی میصر: هەردوکیان ڕوخاوتێك شکابوون، گوتیان: ئەی عومەر تۆڵەو حەدی خودامان لێدەربکە ئێمە دوێنێ دۆڕاوین و توش بوین.عەمریش ﷺهەردوکیانی سەرزەنشت کردوودەری کرن. عبدالر حمنﷺ گوتی: ئەگەر تۆڵەمان لێنەستێنی کەڕۆیشتمەوە، لەلای باوکم شکایەتت لێدە کەم:عەمریش زانی ئەگەر تۆڵەو حەدیان لێدەرنەکات پێشەوا عومەرﷺلێی تورە دەبێت و، لەسەر کارەکەی لای دەبات: ئینجا هەر لەو، ووتو

وێژانەدا بوون کە عبداللەی کوڕی عومەرﷺهاتەژوورەوە، عەمر زۆر بەخێرهاتنی کردوو، ویستی عبداللەی لەسەرە وەی کوڕی دانیشتنەکەدابنێ، بەڵام عبدالله ئەوداوایەی ڕەت کردەوەو گوتی:باوکم داوای لێی کردووم کە لە سەرەوە دانەنیشم: تەنها لە کاتێکدا کەهیچ جێگەیەك نەبێت.براکەم عبدالرحمن لەبەر چاوی خەڵکی سەرناتاشێ، مەبەستی سەرتاشینی ئێرە ئەوەیە لەپێشی لێدانی حەدواباوبوو سەریان دەتاشین، بەڵام بۆلێدانی فەرمانی خوداچۆن دەکرێ‌و کوێ باشە ئاوای لێبدەن.عەمر هێنانیە ناو گۆڕەپانی حەوشەیماڵیان‌و، داری حەدی لێدان: عبدالله براکەی لەگەل باوکی سروعەی بردنیە ناو ژورێکەوەو سەری تاشین. عەمر دەڵێ بەخوا لەو ڕوداوە من بە هیچ جۆرێك پێشەوا عومەرم ئاگادار نەکردەوە، هەتا بۆخۆی نامەیەکی بۆناردم: تێیدا نوسرابوو:

﴿ بسم اللة الرحمن الرحيم: من عبداللة أمير المؤمنين عمرإلى العاصى إبن العاص، عجبت لك ياإبن العاص ولجرئتك علي وخلاف عهدى فماأرانى إلاعازلك فمسىء عزلك، تضرب ولدى عبدالرحمن فى بيتك وتحلق رأسه وقد عرفت أن هذا يخالفنى، إنما هو رجل من رعيتك تصنع به ما تصنع بغيره من المسلمين ولكن قلت هو ولدأمير المؤمنين وقد عرفت ألاهوادة لأحد من الناس عندى فى حق يجب الله عليه. فإذا جائك كتابىهذا فابعث به فى عباءة على قتب(للبعير) حتى يعرف سوء ماصنع﴾ واتە:بەناوی خودای گەورەو میهرەبان: لە بەندەی خودا پێشەوای موسڵمانان عومەری کوڕی خەتابﷺ بۆ عاصی کوڕی عاص ﷺمن سەرسام بووم لە تۆ ئەی کوڕی عاص لەوئازایی و بەتوانایەی تۆ کە پێچەوانەی بەڵێن‌وپەیمانی من کارت کردووە، لە عبدالرحمن ی کوڕمت داوەو، سەرت تاشیوە لەناو حەوشەی ماڵەکەت زۆرباشیش دەزانی کە ئەو ڕەفتارەت پێچەوانەی فەرمانی منە، کوڕی منیش یەکێکەلە هاوکارانی ژێر دەسەڵاتی تۆ، دەبێت چۆن لەگەڵ ئەوانی تردا ڕەفتار دەکەی دەبێت لەگەڵ ئەویشدا بەوجۆرە ڕەفتار بکەی: بەڵام تۆ گوتوتە ئەوە کوڕی پێشەوای موسڵمانانە بەڵام تۆباش دەزانی کەمن مەیل‌و ئارەزوو بەلای کەس داناکەم بۆ بەجێهێنانی فەرمانی خودا ئینجا هەرکاتێ نامەی منت بەدەست

گەیشت ئەوکرە لەناوعەبایەکی پێچراودا بەسواری حوشترێکدا بۆم ڕەوانە دەکەیەوە بۆئەوەی هەست بکات کەچی تاوانێکی کردووە) کاتێ نامە گەیشتە دەستی عەمری کوڕی عاص چۆن عومەر فەرمووو بووی عبدالرحمنی بەوشێوە ڕەوانەکردەوە. عبداللەی کوڕی عومەریش ﷺ نامەکەی باوکی خوێندەوەو، عەمریش نامەیەکی بۆپێشەوا عومەر نوسیو داوای لێبوردنی لە عومەر کردو، گوتی: بەڵێ من لەناو حەوشەی ماڵی خۆم داری حەدم لێداوە بەڵام سوێن بەخودا بۆ هەموو موسڵمانو، گاورێك هەر لەو حەوشە ی ماڵەدا ئەوکارە ئەنجام دەدەم بەبێ جیاوازی. عەمر نامەکەی بە عبداللەدا ڕەوان کرد. کاتێ گەیشتنە جێگا، عبدالرحمن بەرەولای باوکی ڕۆیشت بەڵام لەبەر ئەو عەبایەی کە تێوەی پێچرا بوو نەی دەتوانی باش بەسواریەکەی بڕوات: پێشەوا عومەر ﷺفەرمووی: عبدالرحمن ئەوئیشەت کرد؟ ئەویش نەی توانی وەڵام بداتەوە: عبدالرحمن ی کوڕی عەوف ﷺفەرمووی:ئەی پێشەوا داری حەدی لێدراوە، پێشەوا عومەرﷺ زۆری لۆمەکردوو ڕووی بەلایدا وەر نەگێڕا. عبدالرحمن هاواری دەکردوو دەیگوت: بەخوامن نەخۆشم و تۆش دەمکوژی ئینجا لێیداو بەندی کرد .

## دادگەری ئیسلام گاورێکی موسڵمان کرد

## عدالة الإسلام أسلمت يهوديا

جولەکەیەك لەگەڵ حەزرەتی عەلیداﷺ لەبەردەمی(شرەیح)ی دادوەردا دادوەری کرا: ئەوجولەکەیە زرێیەکەی حەزرەتی عەلیﷺ پێبوو، دەیگوت: ئەو زرێیە ئیخۆمە لەکاتێك دا کەدەیزانی درۆدەکات بەڵام ، کاتێ لەبەرامبەری دادوەر ڕاوەستان: جولەکەکە سەیری کردهەڵس و کەوتی دادوەر زۆر دادگەریانەبوو، وە بە یەکسانی ڕەفتاری دەکرد هیچ شێوەی خۆپەرستی لە نێوانی عەلی وﷺ جولەکەکەیدا نەدەکرد. وەتەنانەت شاهیدی حەسەنی کوڕی عەلیشیﷺ بۆ عەلی قبوڵ نەکرد و بەسوێندی جولەکەکە باوەڕی پێکردوو، زرێیەکەی پێشەوا عەلی ﷺدایەوەبە جولەکەکە، ئینجا لەو کاتەی کە جولەکەکە هەستی بە یەکسانی و دادگەری دادوەریەکە کرد: زۆربیری لەدادگەری ئیسلام دەکردەوەو ، دڵی کەوتە خورپەو

لێدان‌و ، لەرزینەوە.بۆیە لەبەر چاوی موسڵمانان زۆر بەدڵ خوشی‌و فارابجیكی زۆرەوە موسڵمان بوونی خۆی ئاشكرا كردو زرێیەكەشی دایەوەبە پێشەوا عەلی چونكە ماڵی خۆی بوو. وە دەگێڕنەوە لەدواییدا پێشەوا عەلیش ﷺئەو زرێیەی بە هەدیە دایەوە بە جولەكەكە.

## شاهید لەسەر داواكارە

## البينة على المدعى

دەگێڕنەوە خەلیفە ( معتەزید) نامەیەكی بۆدادوەر شەریك نوسی: من ماڵم لەسەر فلانە كەسەو، هەواڵم پێگەیشتووە كەهەموو قەرزارەكان لەلای تۆ قەرزەكەیان تۆمار كردووەو، ئەتۆش بە گوێرەی ماڵەكەیان بەشت بۆداناون، منیش قەرزم لەسەر ئەو كا برایەیە: داوات لێدەكەم بەگوێرەی قەرزی خۆم بەشێكم بۆ دابنێن، دادوەر بەنێر دراوی خەلیفەی گوت: بەپێشەوا بڵێت‌و، بەبیری بهێنەوە كەلەكاتی تەسلیم كردنی داددوەریدا: خوداپایەی بەرزوبەردەوامی بكات.ئەوكاتەی كەفەرمان ڕەوایی لە ئەستۆی خۆی كردەوەو بەمنی سپارد گوتی:دروست نیەدادوەری لەماڵی كەسێكدا بكەیت بۆكەسێكی داواكارتەنهابە شاهید نەبێت.دوای ئەوە نێردراوەكە گەڕایەوە بۆ لای پیشەواوشتەكەی پێڕاگەیاند دووبارە خەلیفە نێردراوەكەی بۆلای شەریكی دادوەر ڕەوەانە كردەوەو پێی گووت بەدادوەر بڵێ كە فلان و فلان بۆخۆی دەزانێ كەكوڕی باش و چاك و بەڕێزن ئەوان شاهیدن. دادوەر گوتی: پێویستە بێنەلاەو شاهی دی بدەن‌و، منیش پرسیاریان لێدەكەم ئەگەر بەباش‌و زیرەك شاهیدیەكەیاندا ئەوا شاهیدیەكەیان لێوەر دەگرم. بەلام كەبەباش‌و تەواوی شاهیدیان نەدائەوادەڵێم قەرزەكە لەلای من دیاری نەكرا:لەدواییدا شاهیدەكان لەترسان نەیان وێرا شاهیدی بدەن: بۆیە دادوەریش هیچ بەشێكی بۆ پێشەوادیاری نەكرد.

## سوێند بەخودا ئێمە دادگەریمان بەکار نەهێنا

## فو الله ما أنصفنا

دەگێڕنەوە پێشەوا عومەری کوڕی خەتاب ﷺچاوی بە پیاوێکی جولەکەی پیر ودامێ کەوت :لەبەردەمی ماڵێك سواڵ و دەرۆزەی دەکرد: پێشەوا عومەرﷺپێی گوت :ئەوە چی پاڵی پێوە ناوی بۆ ئەو کارە؟جولەکەکە گوتی:داوای پێویستی خۆمو باجو سەرانەو بەساڵ داچونی خۆم. پێشەواعومەرﷺدەستی گرتو، بردیەوە بۆ ماڵی خۆیو، پێویست ی خواردنی ئەوکاتەی بۆبەجێ هێناو، دوایی بردی بۆلای لێپرسراوی خەزێنەو فەرمووی:چاودێری ئەوە و شێوەی ئەوەش بکەو لەبیریان نەکەی، سوێند بەخودا ئێمە ویژدانمان ئاسودە نابێت و دادگەرنابین کەبە گەنجی باجوسەرانەیان لێ وەربگرینو، بەپیریش وازیان لێ بهێنینو، بەڕەلاّیان بکەینو. گوێیان نەدەینێ؟ خودا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ وَٱلۡمَسَٰكِينِ ﴾التوبة/٦٠ واتە: بەڕاستی زەکاتو خێرو چاکە بۆ هەژار و نەدار و گەدایانە.

خودا لە ئایەتەکەدا باسی هەژارونەداری موسڵمانان باس دەکات: ئەوەش لە نەدارانی خاوەن کتابە، هەر خێرا پێشەوا عومەر بەفەرمانێکی سەرۆکایەتی ، باجو سەرانەی لەسەر ئەوە و شێوەی ئەوەش، لەخاوەن کتابیەکان هەڵگرتو، لە خەزێنەی موسڵمانان یش بژێوی ژیانی پێبەخشین .

## ئایا سوێند دەخۆی ئەی پێشەوای موسڵمانان

## أتحلف ياأمير المؤمنين

کابرایەکی گاور هاتەلای دادوەر ئەبویوسفﷺ زەویەکی لێداگیر کرا بوو: واگومانی دەبرد کە هارونە ڕەشیدﷺ پێشەوای موسڵمانان لێی داگیرکردووە. دادوەر بەگاورە کەی گوت:ئەوزەویە لەدەستی کێدایە؟ کابرا گوتی: لە دەستی هارونە ڕەشید ﷺپێشەوای موسڵمانانە. لەدواییدا دادوەر گوتی: ویستم کارو فەرمانەکانی بەسەردا بدەم، پێم گوت:کێ بەروبوم و میوەکەی دەفرۆشێ؟ گوتی: پێشەوای موسڵمانان. دادوەر گوتی:پێم گوت: کێ دەست کەوتوداهاتی

كۆدەكاتەوە؟ گوتی:پێشەوای موسڵمانان.دادوەر گوتی: هەوڵمدا كە یەكێی تر بەغەیری پێشەوای موسڵمانان بێت بۆ ئەو داواكاریە ئامادەبێت: بەڵام داواییەكەت هەر ڕووی لەپێشەوابوو. ئینجا ەڕۆژوكاتی دادگایی كردندا لەكۆڕی دادگاییدا ، یەك بەیەك داوا كراوەكان هاتنە پێشەوە هەتاسەرەی ئەوگاورەهاتو، بانگ كرایە بەردەمی دادگاو، داوایەكەی ئەو گاورەم بەسەر پێشەوای موسڵماناندا خوێندەوە، پێشەوا گوتی: ئەوزوەویە ماڵی حەقی خۆمانەوبە میرات لە مەنصورەوە بۆمان بەجێماوە. دادەوەربە كابرای گاوری گوت: گوێت لێیە پێشەوا چیگوت: ئایائێستا تۆ شاهیدت هەیە لەسەر ئەو زەویەی كەداوای دەكەی؟ گاوەرەكە گوتی:من شاهیدم نیە بەڵام، با ئەو سوێندم بۆ بخوات: منیش گوتم: ئەی پێشەوا سوێند دەخۆی؟ پێشەوا فەرمووی:بەڵێ سوێند دەخۆم پێشەواسوێندی خواردو، گاورەكەش بە دەست بەتاڵی گەڕایەوە.لەدواییدا دادوەر گوتی:بەڕاستی ئەوەی ئەوەی من لێی دەترسام هەرئەوەبوو.پێشەواحەسەن گوتی: ئەبا یوسف ئەوەچی ترسێكی تێدایە ئەوەی كە تۆ ویستوتەو، پێویستە كردووتە؟ دادوەر گوتی: ترسەكەم ئەو بوو كێدیویەتی كەمن لەگەڵ هارون لەیەك كۆڕی دانیشتنندادا بنیشم.

## ئەوەت لەكوێ بوو

## من أين لك هذا؟

دەگێڕنەوە كاتێ عومەری كوڕی خەتابﷺ فەرمان ڕەوای میصری بە عەمری كوڕی عاص ﷺسپارد:لەدوای ماوەیەك هەواڵ بە پێشەوا عومەر ﷺگەیشت: كە عەمری كوڕی عاص ﷺماڵو سەروەتێكی زۆری پێكهێناوەو، زۆر دەوڵەمەند بووە پێشەوا عومەرﷺ نامەیەكی بۆ عەمر نوسی و فەرمووی: هەواڵم پێگەیشتوە ماڵێكی زۆرت پێكەوەناوە كەهیچ بەهەوڵ و تێكۆشانی خۆت نەبووەو، چاوم بەسەروەتی تۆ كەو تووە كەخواردنی ڕۆژانەشت نەبووە پێش ئەوەی ببی بە فەرمانڕەوای میصر هیچت نەبوو: ئەوماڵەت لەكوێ هێنا؟ ئەگەر پەیوەندیت بەخۆمەوە نەبا هەر كەس ناپاكی لەماڵی خودا بكات زۆر نائارام دەبووەو، فەرمانم دەر دەكرد. وەباش بزانە عەمرمن زۆر لەكۆچ كردوانی پێشوم لەلایەكەزۆرباشترن لەتۆبۆ فەرمان ڕەوایی

بەڵام ، من تۆم دانا ئێستاش بەخێرا پێم بڵێ ئەوماڵەت لەکوێوە پێکەوەنا. عەمری کوڕی عاصیش ﷺ:هەرنامەکەی پێگەیشت و خوێندییەوە هەر خێرا نامەیەکی بۆ پێشەواعومەرﷺ نووسی و گوتی: من لەناوەڕۆکی نامەکەت تێگەیشتم:ئەوماڵەی کەمن پێکمەوە ناوە لەبەرئەوەیە؟ئەووڵاتی ئێمە کە میصرە وڵاتێکی زۆر بە بەرەکەت و هەرزانییەو، جەنگ و جیهادیشی زۆرتێدایەو، ئەوماڵەش زۆری دەست کەوتی ئەو جەنگ وشەڕانەیە کە بەشی خۆما نەو پێمان دەدرێ: هەر ئەو هەواڵانەشە کەبەتۆ دەگات ئەی پێشەوای موسڵمانان. سوێندبە خودا ئەگەرناپاکی ڕەواش بایە ناپاکیم نەدەکرد:وە تۆمنت بە دەست پاک وباوەڕ پێکراوی خۆت داناوە: وە ئێمە چەندبنکەیەکی حیسابیمان هەیە:ئەگەر بۆ سەرچاوەکان بگەڕێینەوە دەوڵەمەندیمان لەوسەرچاوەو ڕێگایانەوەیە، دەنا سوێند بەخودا ئەی پێشەوای موسڵمانان نەلەهیچ دەرگای ماڵێکمان داوەو، نەهیچ قفڵێکیشمان کردۆوتەوە. پێشەوا عومەرﷺبۆ وەڵامەکەی فەرمان ڕەوای، نامەیەکی تری نوسی و فەرمووی:ئەی عەمرمن ئەو نامەیەم بەسادەیی نەنوسیوەو، هیچ زیادە ڕەوی شم تێدا نەکردووەو، لە کەسانی چەنەبازیشم نەبیستوە: بەڵام ئێوەی کۆمەڵی پێشە وایان وفەرمان ڕەوایان لەسەر سەرچاوەی ماڵ وسامانەوە دانیشتون وگرتوتانە، ڕێگای هیچ بیانو پاساوتان بۆ نییەو لێتان وەرناگیرێ: باش بزانن ئەوەی دەی خۆن لەودەست کەوتانەوە ئەوە ئاگر دەخۆن و، بەرەوناتەواوی و شورەیتان دەبات. ئێستاش ئەوا محمدی کوڕی مەسلەمەمﷺ بۆلاناردی نیوەی سەروەت و سامانەکەتی پێببەخشە! کاتێ محمد گەیشتە میصر عەمر پێشوازیەکی باشی لێکردو، خوانێکی شاهانەی بۆئامادەکردو بانگهێشتی سەر خوانەکەی کرا:بەڵام محمد قبوڵی نەکردو و گوتی: ئەوخواردنە پێشەکی ناخۆشی وخەراپەیە، ئەگەر خواردنێکی هاکەزایی میوانیت بۆ بهێنابامایە دەمخوارد ئێستاش ئەوخواردنە هەڵ بگرنەوەو، ماڵەکەتم بۆ ئامادە بکە: عەمریش هەستاو نیوەی ماڵەکەی بۆجیاواز کردەوەو ، کەچاوی بەزۆری ماڵەکەی کەوت گوتی:نەفرین لەکات و زەمان کە من بومە کرێکاری عومەر.

# زیرەكی عومەر

# فراسه عمر

دەگێڕنەوە جارێك تەرمی گەنجێكی تازە پێگەیشت و لەسەر ڕێگا فڕێدرابوو: هەڵیانگرت و بردیان بۆلای حەزەرەتی عومەرﷺ، ئەویش لێكۆڵینەوەی زۆری لەسەركرد بەڵام بێسود بوو هیچ زانیاریەك بەدەست نەهات، بۆدۆزینەوەی بكوژەكە، پێشەوا عومەرﷺ زۆردڵ گران وغەمگین بوو: لەبەدەست نەكەوتنی هیچ زانیاریەك. لەدوای بەسەرچوونی یەك ساڵ بەسەر ئەوڕوداوەدا: منداڵێكی ساوای شیرە خۆرە لەهەمان شوێنی تەرمی ئەوگەنجە دۆزرایەوە فڕێدرابوو:حەزرەتی عومەرﷺزۆر بەخۆش حاڵیەوە فەرمووی: ئەگەرخوداحەز بكات بكوژی كوڕە گەنجەكەم دۆزیەوە. فەرمانیدا ئەو منداڵە بدەن بە دایەن و، هەموو خەرجیەكیشی لەئێمەوە وەربگرێ، بەڵام منداڵەكەی باش بەخێو بكات و چاودێری تەواوی لێبكات. وەئاگادار بێت بەوكە سانەی كەدەچێتە لای و، كێ ئەومنداڵە دەلاوێنێتەوەو لەباوەشی دەگرێت و، ماچی دەكات هەركەسێكی بەوجۆرەی دیت، تەواوی ناو نیشانی ماڵ وشوێنی لێوەر بگرێ وئاشنای ماڵەكەیان بێت وهەواڵیش بەئێمە بگەیەنێ؟ كاتێ منداڵەكە گەورەبوو هەستی بەچاكی وخەراپی دەكرد: ئافرەتێك هاتە لای وبەشیردەرەكەی گوت: گەورەكەم هەواڵی ئەومنداڵەی بیستوەو، منی نارد بۆلای تۆ كەئەو منداڵەی بۆ ببەم چاوی پێ بكەوێت و، دوایی بۆتی دەگەڕێنمەوە؟ دایەنی ئەومنداڵە گوتی:باشە دەت دەمێ بەڵام بۆخۆشم لەگەڵ تدادێم، ڕۆیشتن تاگەیشتنە ماڵەكەیان لەباوەشی گرت وماچی دەكرد:شیردەرەكە بۆی دەركەوت كە ئەو كچە كچی پیاوێكی ئەنسارییە لەهاوەڵانی پێغەمبەرەﷺ:هەر ئەو كاتە ڕۆیشت و هەواڵی بە پێشەوا عومەرﷺدا ئەویش خۆی ئامادەكرد و شیری لە خۆی بەست و، ڕۆیشتن بۆلای ماڵی ئافرەتەكە، باوكی كچەكە لەبەردەرگای ماڵەوە دانیشت بووپاڵی دابۆوە: پێشەوا عومەرﷺ فەرمووی: ئەی برا فڵانە كچەت چی كردووە؟ كابرا گوتی: خودا پاداشتی خێری بەچاكە بداتەوە بەڕاستی ئافرەتێكی چاكە خوازو، خوداپەرست ولە خوداترس و نوێژ كەرو ڕۆژوگر و

لەفەرماندایە. حەزرەتی عومەر ﷺ فەرمووی: ئارەزوودەكەم چاوم پێی بكەوێتو هێندێكی ئامۆژگاری باشتر و چاكتری بكەم زیاترهانی بدەم بۆ چاكە كردن حەزرەتی عومەر ﷺ بەتەنها لەگەڵ ئافرەتەكەدا مایەوە شیرەكەی لەكالان هێنایە دەرو، فەرمووی:هەرچی ڕووی داوە ڕاستیم پێ بڵێ؟ ئافرەتەكە گوتی: سوێند بە خودا ڕاستیت پێدەڵێم: ئافرەتەكە دەستی بە گێڕانەوەی چیرۆكی بەسەر هاتەكەی كردوو گوتی:لێرە ئافرەتێكی پیر زۆرهاتوچۆی ماڵی ئێمەی دەكردو زۆرلەگەڵ یەكدا ئاشنابووین زۆرم خۆش دەویستو، لە جێگەی دایكی خۆم دانابوو: ئەویش منی بەكچی خۆی حساب كردبوو: ڕۆژێك پێی گوتم: كچەكەم سەفەرو گەشتێكم لە پێشە: بەڵام كچێكم هەیە تازە پێدەگات حەز ناكەم لەماڵەوە بەتەنها بە جێی بهێڵم: هیچ جێگەیەكیش لەلای تۆزیاتربە باش نازانم كەبەجێی بهێڵم بۆیە ئەگەر حەزدەكەی دەیهێنمە لای تۆ هەتا دەگەڕێمەوە، منیش ڕازی بوومو ، بەناو كچەكەی هێنا كەلەبنەچەو ئەساسدا كوڕبوو.بەڵام بەڕواڵەت هیچ گومانی تێدانەبوو كەئەوە كچەو كوڕنیە، منیش هەربە قسەی دایە پیرە وامزانی كچە چەند ڕۆژێك لەلامان مایەوە هیچ هەستم پێنەكرد كەئەوە كوڕە بۆیە ڕۆژێك بەتەواوی فەرا مۆشم كردبووخەوم لێكەوتبوو، ئەویش كەلەبنەڕەتدا كوڕبووەوكچ نەبوو: فرسەتی لێدیتمو لەگەڵمدا جوت بوو، كاتێ ڕاپەڕیمو بە خەبەر هاتم كار لەكار ترازا بوو منیش زۆربە خافڵ گیرانە دەستم بۆچەقۆیەك ڕاكێشاولە سەر دڵیم داو كوشتمو، لەوشوێ نەی كەتەرمەكەی دۆزرایەوە فڕێمدا.وە ئەنجامی تێكەڵ بوو نەكە شی ئەو منداڵەی لێ پەیدابوو: كاتێ منداڵەكەشم دانابردم لەهەمانشوێنی تەرمی كوڕە بەناو كچەكەم فڕێدا. پێشەواعومەر ﷺ فەرمووی:بەڕاستی ڕاستت گوت: لەدواییداچەندئامۆژگا رییە كی كردوومنداڵەكەی پێدایەوەو، نزاو دوعاشی بۆ كرد. دوایی بەباوكی كچەكەی فەر موو:بەڕاستی چاكتر و باشترین كچت هەیە! ئینجا پێشەوا: دوعا خوازی كرد و ڕۆیشت .

# سوێند بە خودا لە بیرم نەکردووی

# والله مانسیتها

دەگێڕنەوە ڕۆژێك(عومەری کوڕی خەتاب) بەناو بازاڕی مەدینەدا دەگەڕا چاوی بە (ئەیاسی کوڕی سەلمی)کەوت، لەسەر ڕێگایەکی تەنگەبەریدا ڕوەستابوو، بەر هەڵس تی خەڵکی دەکردو:ڕێگەی گرتبوو، پێشەواعومەرکەچاوی پێکەوت بەدار عەساکەی دەستی پاڵی پێوە ناودوری خستەوەو، پێی فەرموو:ئەی کوڕی سەلما لە سەر ڕێگا ڕامەوەستێو، خەڵکان ئازارمەدە.لەدوای بەسەرتێپەڕینی یەك ساڵ لەو ڕووداوە ڕۆژێك حەزرەتی عومەرچاوی بە ئەیاسی کەوتەوەخۆی ئامادەی ڕۆیشتنی حەجی دەکر د.پێشەوا عومەر فەرمووی: ئەیاس نیازی چونی حەجت هەیە؟ ئەیاس گوتی: بەڵێ ئەی پێشەوای موسڵمانان: پێشەوا دەستی ئەیاسی گرتو بردیەوە بۆماڵو(٦٠٠) شەش سەددرهەمی ئەوکاتەی دایەو فەرمووی: ئەیاس ئەوە کۆمەكو یارمەتیە بۆتۆ، لەبری ئەوپاڵ پێوەنانەی کەساڵی پارپێوەم نای! ئەیاس گوتی:بەخوائەی پێشەوای موسڵمانان من هەر لە یادیشم نەمابوو، کەئێستا تۆ بەیادت هێنامەوە، پێشەواعومەر فەرمووی:سوێند بەخودا هەرگیز لەیادم نەکردووەو لەبیرم نەچۆتەوە.

# ڕازی بوونت فەرمانڕەواییەو توڕەبونیشت سەربەرزیە

# رضاك حكم وغضبك عـز

لەکاتێکدا کە پێغەمبەرنوێژی دەکرد کابرایەکی موسڵمان بەلای دووڕوو منافقاندا ڕۆیشت دانیشتبوون ئەویش پێی گوتن وا پێغەمبەری خودا خەریکی نوێژەو، نوێژ دەکاتو، ئێوەش لێرە دانیشتون.ئەوانیش لەوەڵامدا گوتیان: کاکە تۆبە ئیشو کاری خۆتەوەبڕۆچی کارێکت بە ئێمە هەیە، کاتێ پێغەمبەر لە نوێژەکەی بۆوەو ئەو قسەیان پێگوت: ئەویش فەرمووی: بۆچی لەملیتان نەداو نەتانکوشت! حەزرەتی عومەرهەستا بۆ ئەوەی لەملی بدات پێغەمبەر فەرمووی: ئەی عومەر بەڕاستی ڕەزامەندیت فەرمانڕەواییەو، توڕەبوونیشت بەرزیو شکۆداریە.

# ئایا تۆ مەرجت لەسەر داناوە؟

# هل كنت إشترطت علیة؟

دەگێڕنەوە جارێكیان پێشەوا عومەری كوڕی خەتاب ﷺ چاوی بەكابرایەكی دەشتەكی كەوت شوانی كۆمەڵێك حوشتربوو: پێشەواعومەر ﷺ لێی پرسی ئەو مێگەلە دەفرۆشی؟ كابرا گوتی:بەڵێ پێشەوا عومەر ﷺ(١٤) چوارده سەری لێ هەڵوارد و جودای كردەوەو ، لێی كڕی. لەدواییدا پێشەوا عومەر ﷺ فەرمووی: ئەوە ئیخۆمەو ئەوەی تریش بەشی خۆتەو برۆ بۆ لایان؟ كابرا گوتی:بەڕێز دەبێت ڕەخت و بنزینەكەیانم بۆ لێبكەیەوە :ئەوانەم نەفرۆشتوە بەڵام پێشەوا فەرمووی: من بە هەموو شتێكەو لێم كڕیوی! لێیان بووبە كێشەو، ڕۆیشتنەلای حەزرەتی عەلی ﷺ بەسەر هاتوڕووداوەكەیان بۆ گێڕایەوە: ڕووی لە عومەر ﷺ كردوو فەرمووی: تۆبەمەرجت كردووە كڕینی حوشترەكان بەزین و، نەرمەزین و، ڕێشمەو شتەكانیەوە بێت، یان نا؟ حەزرەتی عومەر ﷺ فەرمووی: نەخێر هیچ مەرجمان دانەناوە بۆ كڕینیان: حەزرەتی عەلی ﷺ فەرمووی: مادام هیچ مەرجتاننەكردووە، ئەتۆ تەنهاخاوەنی حوشترەكانی و هیچی تر. ئینجا پێشەوا عومەر ﷺ بە كابرای فرۆشیاری فەرمووی:برۆ هەموو شتەكانی خۆتی لێبكەوە بۆ خۆتی بەرەوە.

# ڕووخسارتان نەگۆڕێ ئەی گەل

# لم تتغیر وجوهكم یا قوم

كۆمەڵێك لە بەڕێزان وپیاو ماقوڵانی هۆزی قوڕەیش كەلە نێویاندا(سوهەیلی كوڕی عەمری كوڕی عبدولشەمس، وتاربێژی قوڕەیش و، ئەبوسوفیانی كوڕی حەڕب)یان لەگەڵ دابوو، ڕۆیشتن بۆلای(عومەری كوڕی خەتاب ﷺ)داوای چونە ژورەوەیان كردبۆلای عومەر ﷺ. بەڵام هەر لەو كاتەدا كۆمەڵێك لە نوێنەرانی بەندە و كۆیلەكانی ئامادە بوانی جەنگی بەدربوو بوون ئامادەبوون وداوای چونەژورەوەیان كرد:بەڵام لە پێشە وە فەرمانی بانگ هێشتنی كۆیلەكان كرا بۆ ژورەوە كە پێكهاتبووله بلال و، سوهە یب و، عەمار و، سەلمان ﷺ پیاوەماقوڵ و بەڕێزەكانی

قورەیش دواخرا، ئەبو سوفیان تورەبوو گوتی: لە هەموو تەمەنی ژیانمدا سوکایەتی و بێڕێزی وەکو ئەمڕۆم نەدیتوە؟لە پێشی ئێمەوە ڕێگای بەندەو کۆیلەکان بدریو ئێمەش دوا بکەوین ؟ سوهەیل گوتی: برایان ئێوە مەشڵەژێنو دڵتان هیچ نەکات، وەکو ئەوانە ڕۆیشتنە ژورەوە ئێمەش سەرەمان دەگاتیودەڕۆینە ژورەوە، ئەوان پێشخرانو ئێمەش لەدوای ئەوانەوە دەڕۆینو، هیچ دڵ تەنگیەکی ناوێت. ئینجا ئەگەر ئێوە لێرە لەبەر دەرگای عومەر ئێرەییو حەسودی بەوبەرێزانە ببەن، ئەی چیدەکەن بۆرۆژی دوایی کەخودای گەورە ئەو هەموو نیعمەتو، خۆشی و بەخشیشەی لە بەهەشتدا بۆی ئامادەکردوون چیدەکەن ؟.

## ئەی برایانم لەوانەیە تورەم کردبن

## واخوتاه لعلي أ غضبتكم

دەگێڕنەوە لە جەنگی ڕزگاریدا: ئەبوسوفیان بە سێ نەفەری ئازای قورەیشیەوە : لەسەر ڕێگاکانی(زەهران)سیخوڕیان لەسەر سوپای ئیسلام دەکرد: دەستیان بەسەرداگیرا و گرتیانن. پێغەمبەری ﷺ خودا، پەلەی نەکرد لەبانگ هێشتنیان: ئیمامی عەباس برنیەلای خۆی هەتا بەیانی پێغەمبەر ﷺ بانگیان دەکات.ئینجا لەدوای ئەوەی کە (ئەبوسوفیان) موسڵمان بوولەگەڵ حەزرەتی ئەبوبکر دا بەناو ئاپۆرەی موسڵمانانندا تێپەری:لەوکاتەدا(سەلمانو، سوهەیبو، بیلال) گوتووێژیان دەکرد، یەکیان فەرمووی: بەڕاستی بەداخەوەم کە خودای گەورەئەو هەلو دەرفەتەی پێنەداین کەشیرو تیرەکەمان لە ئەستۆی دوژمنی خودابدەین. ئەبوبکر ڕاچەنیو ترسا لەوەی کە ئەبوسوفیان لەدین پاشە گەز بێتەوە: حەزرەتی ئەبوبکر خۆی لێیان نزیککردەوەو فەرمووی: ئەی هاوار ئێوە لەبارەی سەرۆکو گەورەی قورەیشەوە دەدوێن؟ هەرخێرا ئەبوبکر ڕۆیشتەلای پێغەمبەری ﷺ خوداو هەواڵەکەی پێڕاگەیاند، بەو هیوایەی کە پێغەمبەر ﷺ بانگیان بکاتو، لەسەرئەو گوتەی کەکردیان ئاگاداریان بکاتەوە: بەڵام پێغەمبەری ﷺ خودا بە پێچەوانەی بیروڕای حەزرەتی ئەبوبکربوو.پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی ئەبوبکر لەوە دەترسێم کە لێیان تورەو عاجز بوبیت؟ سوێند بە خودا

كەلێیان تورەبی خوداش لە تۆ توڕە دەبێت. ئەو فەرموودەیە وەك و هەورە تریشقەیەكی بەهێز بكەوێتە سەرسەری ئەبوبكر.هەر خێراهەستابەرەولای ئەو بەندە ئازاد كراوانەی كەبۆ خۆی بەماڵی خۆی ئازادی كردبوون. ڕۆیشت وداوای لێبوردنی لێكردن و فەرمووی: ئەی براكانم لەوانەیە من بە قسەكانم تووڕەم كردبن؟ ئەوانیش لەوەڵامدا گوتیان: بەڕاستی لە لایەنی ئێمەوە هیچ شتێك ڕووی نەداوەو، تورەنەبووین و هیچیشمان لە دڵ نەگرتوە خودا لێت خۆش بێت.

## ئایا ئەتۆ لەڕۆژی دوایی تاوانەكانم هەڵدەگری

## أأنت تحمل عنی ذنبی یوم القیامة

دەگێڕنەوە: كەدابونەریتی حەزرەتی عومەرﷺ وابوو: شەوانە لە ناو شارو كۆڵاناندا دەسوڕا ودەگەڕابۆئەوەی ئاگاداری ژیان و گوزەرانی هۆز وگەلەكەی بێت. شەوێكی زۆرساردو سەرما لەماڵ دەرواتە دەرو، یەكێك لەهاوڕێیانی بەناوی ئەسلەمی لەگەڵدا دەبێت: لەدوورەوە چاوی بەتروسكەیەك ئاگر دەكەوێ، ئەویش بەرەولای ئاگرەكە دەكەوێتە ڕێگا، لەنزیكەوە سەیردەكات مەنجەڵێك لەسەرئاگر داندراوەو چەند منداڵێكیش بەدەورەی مەنجەڵەكەدا دانیشتوون و، دەگریەن پێشەوا عومەرﷺ زیاتر دەڕواتە پێش و سەلامیان لێدەكات و، ئافرەتێك وەڵامی سەلامەكەی دەداتەوە: حەزرەتی عومەرﷺ دەفەرموێ: خوشكم وەرە پێشەوە؟ ئافرەتەكە دەڵێ برام ئەگەر خێرو چاكەت پێیە وەرەپێش! دەنا دووربكەوە: عومەر ﷺفەرمووی: خوشكم چیتانە وا ئەومنداڵانە دەگریەن و ژیریان ناكەیتەوە؟ ئافرەتەكە گوتی: بەڕاستی سەرماو سۆڵەی ئەمشەو بێتاقەتی كردین و، منداڵەكانیشم لەبەر برسیەتی دەگریەن. عومەرﷺ فەرمووی: ئەدی ئەوقابلەمەی سەر ئاگر چیتێدایە ؟ ئافرەتەكە گوتی: تەنها ئاوی تێدایە بۆ ئەوەی منداڵەكان فریو بدەم و خەویان لێبكەوێ:بەڵام باخودا لەنێوانی ئێمەو عومەردا بێت هەتاكاتی خۆی. پێشەوا عومەرﷺفەرمووی: خودا میهرەبانیت لەگەڵ دابكات دەبینی عومەرﷺ ئاگای لە ئێوە نیە؟ ئافرەتەكە گوتی : چۆن دەبێت ئاگای لە ئێمە نەبێت ، هەرگیز شتی وانابێت، ئەدی عومەرپێشەواو گەورەی ئێمە نیەچۆن دەبێت

لێمان بێئاگا بێت؟ ! حەزرەتی عومەرﷺ هەر خێرا راپەڕی و بەغاردان دەڕۆیشت و (ئەسلەم) یشی بەدواوەبوو: ڕۆیشت هەتا گەیشتە خەزێنەو ، بەتایبەت ئەو ژوورەی کە ئاردی تێدابوورۆیشتە ژورەوەو توورەکەیەکی پڕ لە ئاردکردو و لەگەڵ هێندێك ڕۆنشتی پێویست، فەرمووی: ئەسلەم ئەوەم بەكۆڵدا بدە ئەسلەمیش گوتی: ئەی پێشەوامن هەڵیدەگرم بەلام، عومەرﷺ فەرمووی: ئەی هاوارتۆلە ڕۆژی دواییدا گوناه و تاوانەکانی من هەڵ دەگری؟ خێراشتەکانی بەكۆڵی خۆی داداوبەرەو ماڵی ئافرەتە کە بەخێرایی گەڕایەوەو، فەرمووی: لێمگەڕێن و وازم لێبهێنن: ئێستا خواردنتان بۆئامادە دەکەم هەرخێرا ئاگرێکی کردەوەو، هێندێك ئاردو و ڕۆنی دەرهێنا و خواردنێکی خۆشی بۆ ئامادەکردن.پێشەوا عومەر ﷺداوای لە ئافرەتەکە کرد قاپێك ئامادە بکات و، خواردنەکەی تێبکات :ئینجا بەئافرەتەکەی فەرموو:وەرە خواردن بدە بە منداڵەکانت و منیش یارمەتیت دەدەم. بەوجۆرە بەردەوام بوون هەتا هەموویان تێربوون.ئینجا لەدوای ئەوە ئافرەتەکە گوتی بەخودا ئەتۆ باشتری کەببیە پێشەوای موسڵمانان نەوەك و عومەر، دوایی عومەربە ئافرەتەکەی گوت :قسەی باش بەرامبەربە عومەرﷺبکە ، چونکە ئەگەر بێیەلای خەلیفە عومەریﷺ پێشەوای موسڵمانان ئەوەمن لەلای ئەو دەبینی کەخودا حەزبکات. پێشەوا عومەر لەو جێگایە نەڕۆیشت بەو سەرمایە مایەوە هەتا منداڵەکان دەستیان کردبە گاڵتەو گەپ و پێکەنین. وە لەخەزێنەی موسڵمانان ڕۆزی و خواردنی بۆ ئەو خانەوادە بڕیەوەو، ئینجا هەستاو ڕۆیشت.

## خودا فەرمان بەدادگەری دەدات

## إن الله يأمر بالعدل

دەگێڕنەوە: عوسمانی کوری جەمەحی ﷺدەفەرموێ: ئەو کاتەی کەموسڵمان بووم: لەبەر ئەوەی کەزۆرشەرمم لە پێغەمبەرﷺدەکرد: نەمتوانی بەتەواوی باوەڕبچێتە ناخمەوەو، حاڵی ببم و، تێبگەم لە تەواوی بەرنامەی ئیسلام:واڕێکەوت ڕۆژێك لە کۆڕو دانیشتنی پێغەمبەرﷺئامادەبووم:قسەی بۆدەکردین منیش چاوم بڕیبوە پێغەمبەروﷺ، ئەویش چاوی بڕیبووە ئاسمان:لەدوای ماوەیەك چاوەکانی

ئەویکردەوە و سەیری لای ڕاستەی دەکرد. لەدواییدا چاوی بەرەو ئاسمان هەڵبڕیەوە: منیش بەخۆم نەوەستام‌و گوتم:ئەی پێغەمبەری‌ﷺ خودا بۆ وا چاوەکانت بڕیوەتە ئاسمان!پێغەمبەری ﷺخودا فەرمووی: لەو کاتەی کەمن قسەم بۆ دەکردن حەزرەتی جبرائیل ؑلەلای ڕاستمەوە هاتەخوارو، ئەوئایەتەی لەلایەن خوداوە بۆ هێنام‌و، فەرمووی: ئەی محمد خودا دەفەرموێ:

{إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَيَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡبَغۡيِۚ يَعِظُكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ}النحل/٩٠ واتە: بەڕاستی خودا فەرمان دەکات بەداگەری و بەخشندەیی‌و، یارمەتیدانی خزم‌و خوێش، وەهەروەها فەرمان دەکات بەدوورکەوتنەوە لە گوناهو تاوان و دەستدرێژیکردن بۆ خەراپەکاری‌و، کاری ناڕەوا، وە ئامۆژگاریتان دەکات بۆ ئەوەی بیربکەنەوەو هۆشتان لەخۆتان بێت. عوسمان ؓفەرمووی: لەو کاتەدا باوەڕی تەواو چووە ناو دڵمەوە و جێگیربوو خۆشەو یست ی پێغەمبەر ﷺچوەناودڵمەوەو زۆرم خۆش دەویست.

## بۆچی ئەو پیرەت لەماڵەوە بە جێنەدەهێشت

## هلا تركت الشيخ في بيته

ئەبو قوحافەی باوکی ئەبوبەکری صدیق‌ؓ جێنشینی یەکەمی پێغەمبەری خودا ﷺلەژیا ندا مابۆوە هەتا جێنشینایەتی حەزرەتی عومەرؓ.بەڵام ئەوپیاوە چاوەکانی کوێر ببوو، هەتاڕۆژی ڕزگاربوونی مەککە موسڵمان نەبووبوو، ئەوکاتە موسڵمان بوو. ئەوکاتەش حەزرەتی ئەبوبکرؓدەستیگرتبوو دەیبرد بۆلای پێغەمبەر ﷺموسڵمان بێت کاتێ پێغەمبەر ﷺ چاوی پێی کەوت، فەرمووی: ئەبوبکر ؓتۆ بۆچی ئەو پیاوە پیرە بێتاقەتەت هێناوە :باست بکردبا من دەچووم بۆ لای؟ ئەبوبکرؓفەرمووی: ئەی پێغەمبەر ﷺ باوکم زۆر پێویستتر بوو کەبێت بۆلای بەڕێزت. پێغەمبەرﷺ دەستی بەسەر سنگی داهێناو موسڵمان بووئینجاحەزرەتی ئەبوبکرؓلەسەر ئیسلام بوو نەکەی سزاو ئازارێکی زۆری لەدەستی(ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب)دیت بۆیە لەوکاتەی کەئەبو سوفیان

موسڵمان بوو ڕۆیشتە لای ئەبوبکر گوتی: بەخوامن زۆر ئازاری تۆم داوە و داوای لێبوردنو گەر دەن ئازادیت لێدەکەم: لەدوای وەڵام دانەوەی ئەبوبکر:کە ئەبو قوحافەی باوکی ئەبو بکر گوێی لەدەنگی ئەبوبکر بوو، ووردە ووردە هاتە پێش‌و بەئەبو بکری گوت:ئەی ئازاد کراو(عتیق)تۆ بەسەر ئەبوسوفیان گەورەی هۆزەکەی دەنگبەرزدەکەیەوەو هاوار دەکەی؟ بەڕاستی تۆ زۆر زیاد لە سنور دەرچوی‌و، سنورت بەزاندووە؟ ئەبو بکرﷺ پێکەنی‌و فەرمووی :ئەی بابە خودای گەورە بەبۆنەی دینی ئیسلامەوە کۆمەڵێکی بەرز کردۆتەوە و، کۆمەڵێکیشی ملکەچ وداماو کردووە. ئینجا ئەو کاتەی کەئەبوبکرﷺ کۆچی دوایی کرد هەمووخەڵکی مەدینەی شڵە ژاند و شپرزە بوون: کاتێ ئەبوقوحافە گوێی لەدەنگی گریان بوو، نەیزانی چی بووە بۆیە پرسیاری کرد ئەوگریانە چییە؟ گوتیان: کوڕەکەت ئەبوبکرﷺ کۆچی دوایی کردوەومردووە؟ ئەویش دەستی کرد بەگر یان‌و، گوتی: بەڕاستی نەهامەتی و کارە سات بەسەر گەورەو سەروەران‌وشکۆداراندا هاتووە. ئینجا لەدوای ئەوە گوتی: کێ لەدوای ئەو لێپرسراویەتی جێنشینایەتی وەردەگری؟ گوتیان: عومەری کوڕی خەتابەﷺ: گوتی: بەڵێ هاوڕێیەکەیەتی.

## لێپرسینەوەی عومەر لەکاربەدەستانی

## محاسبة عمر لعمالة

دەگێڕنەوە: کاتێ کە ئەبو هوڕەیرەﷺ لە بەحرەین گەڕایەوە بۆ مەدینە.عومەری کوڕی خەتاب ﷺپێی فەرموو: ئەی دووژمنی خوداو، کتێبی خودا تۆماڵی خودات دزیوە؟ ئەبوهوڕەیرەﷺ ووتی:من نەدووژمنی خودام‌و، نەدوژمنی کتێبی خودام: بەڵام دوژمنی ئەوکەسانەم کەدوژمنایەتیان دەکات. وەبەڕاستی ماڵی خوداشم نەدزیوە. حەزرەتی عومەرﷺفەرمووی:ئەدی باشە پێم بڵێ تۆ ئەو(١٠٠٠٠)دەهەزار درهەمەت لەکوێ هێناوە و کۆت کردۆتەوە؟ ئەویش گوتی:حەیوان و ئاژەڵەکانم زاوزێیان کردووەو ئەو بەخشیش‌ودەست کەوتانەی بەدەستم گەیشتووە، کۆم کردۆتەوە. ئەبو هوڕەیرە گوتی: لە نوێژی بەیانی داوای لێخۆش بوونم لە پێشەوای موسڵمانان عومەری کوڕی خەتاب کردوداوای چاوپۆشیم لەکارەکەم

کرد. عومەرﷺ فەرمووی: بۆ کارو ئیش ناکەی ئەبو هورەیرە؟ دەڵێ منیش گوتم ناتوانمو نایکەم، عومەر ﷺفەرمووی: ئەبوهورەیرە: کەسانی زۆرباشتر لە تۆ کارو فەرمان ڕەواییان کردووە کە حەزرەتی (یوسف)ە منیش گوتم: یا عومەر یوسف پێغەمبەرەو کوڕی پێغەمبەرە ﷺ، بەلأم من کوڕی ئومەیمەم و دووجارو سێجار زیاتر لە ئەو دەترسێم: حەزرەتی عومەرﷺ فەرمووی: بۆچی گوتت دووسێ جار بۆ نەتگوت پێنج جار؟ دەفەرموێ:منیش گوتم دەترسێم بەبێ زانیاری قسەبکەم وە دادوەری بکەم بەبێ ئارامیو لەسەرەخۆیی ، وەترسم هەیە لە پشتی خۆم بدەمو قسەی ناشیرینو بێ ئابڕویی بەکەسو ناموسی خۆم بدەمو بەو جۆرە ماڵ و حاڵی خۆم بەفیڕۆو هەدەر بدەم.

## بۆچی حەدت لێدەر نەکرد

## لم ترکت الحد

قودامەی کوڕی مەزعون ئارەقو مەی خواردەوە: حەزرەتی عومەرﷺ ویستی تۆڵەو حەدی لێ بستێنێ. قودامە بەحەزرەتی عومەری گوت: من تۆڵەم لەسەر نیە چونکە خودا فەرموویەتی:{ لَيْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوٓا۟ إِذَا مَا ٱتَّقَوا۟ وَّءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ثُمَّ ٱتَّقَوا۟ وَّءَامَنُوا۟ ثُمَّ ٱتَّقَوا۟ وَّأَحْسَنُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ } المائدة/٩٣ واتە: ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە بەخودا و کردەوەی باشیان ئەنجام داوە ، ئەوە خودا هیچ گوناه و تاوانیان بۆ نانوسێ لەسەر ئەو کارە خەراپو ناڕەوایانەی پێش موسڵمانبوونیان کردوویانە، لە خواردنو خواردنەوەی ناڕەوا و خەراپ، لەکاتێکدا لەدوای باوەڕیان بەتەقواو خۆپارێزبنو کردەوەی چاکەبکەنو، لەکارو ڕەفتاری خەراپ هەرگیز نزیکنەکەونەوەو نەیکەنو، هەردەم باوەڕەکەیان پارێزگاریان لێبکاتو کرداری چاکەبکەن، وە لە هەموو حەرامی و ناڕەواییەك خۆیان دووربگرن. ئەوە بەڕاستی خودای بەبەزەیی چاکەکارانی خۆش دەوێت.

**حەزرەتی عومەریش ﷺ وازی لەدار لێدانی هێنا. ئینجا کاتێ حەزرەتی عومەر ﷺ لەگەڵ حەزرەتی عەلی ﷺ بەیەکگەیشتن عەلی بە عومەری ﷺ فەرموو: ئەی عومەر بۆچی داری تۆڵەت لە قودامە نەدا لە سەر مەی خواردنەوە، عومەر ﷺ فەرمووی: بەخودا قودامە ئەو ئایەتەی بۆ خوێندمەوە کەلە پێشەوە خوێندمەوە بۆیە منیش تۆڵەم لێ نەستاند عەلی فەرمووی: بەڕاستی قودامە شایانو ڕێز لێنانی ئەوئایەتەی نیە. وە هەرکەسێکیش بەشوێنی ڕێگای قودامەدا بڕوات بەڕێگاداو، کاری خەراپەو نارەوا یی بکات و بە شوێنی فەرمانەکانی خودادا نەڕۆن و ئەو کارە خەراپانەی کەخودا حەرامی کردوە ئەوان ئەنجامی بدەن. ئەوە بەڕاستی ڕێزو پایەی ئەو ئایەتە نایان گرێتەوە: ئینجا ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەوکرداری چاکە دەکەن بەهیچ جۆرێك حەرام و نارەوایان بۆحەلاڵ نابێت. بڕۆ قودامە بانگ بکەوداوای تۆبەی لێبکە لە سەر ئەو گوفتار و کردارەی، ئەگەر تۆبەی کرد ئەوجا تۆڵەوداری حەدی لێدەر بکە: وە ئەگەر تۆبەی نەکردلەسەر ئینکاری خۆی مایەوە، ئەوە بیکوژە چونکە لەکۆمەڵی موسڵماناندا چۆتەدەر. حەزرەتی عومەر ﷺ لەسەر ئەوبیرو ڕایە کۆك بوون. ئینجا کاتێ قودامە ئەوهەواڵەی پێگەیشتو زانیەوە هەرخێرا تەوبەی کردووکوشتنی لەسەر خۆی لابرد، حەزرەتی عومەر ﷺ کوشتنی لەسەر هەڵگرت بەلام نەیدەزانی چۆن و بەچیی جۆرێك تۆڵەوداری حەدی لێدەر بکات:بۆ ئەو مەبەستە ووتو وێژو ڕاوێژی لەگەڵ پێشەوا عەلیدا کردەوە: ئەویش فەرمووی: هەشتاداری لێبدە. لەبەر ئەوەی مەی خۆر، کاتێ مەی خواردەوە، بێهۆش دەبێتو، کەبێهۆش بوو، وڕێنەو دەبزرکێنێو، کەوڕێنەشی کرد ، درۆ دەکات.**

## گوێنەدان بەدنیاو خوداناسی - الزهد

{وَٱبۡتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنۡيَاۖ وَأَحۡسِن كَمَآ أَحۡسَنَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَۖ وَلَا تَبۡغِ ٱلۡفَسَادَ فِي ٱلۡأَرۡضِۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُفۡسِدِينَ }**القصص/٧٧ واتە: خودا داوامان لێدەکات بە هۆی ئەو ماڵو سامانەی کەخودا پێی بەخشیوین بتوانین ڕەزامەندی خوداو ماڵی بەهەشتو دوا ڕۆژی پێ بەدەست بهێنینو، بەلام بەشی خۆشمان لەبیرو فەرامۆش نەکەین، پێویستە چاکە بکەین هەروەكو خودا چاکەی لەگەڵماندا**

كردووەومالْوسامانی پیْ بەخشیوین، وانەكەین بەهۆی ئەومالّەوەكەخودا پێی دلوی خەراپەوكاری ناڕەواوفەسادی ئەنجام بدەین لەوسەر زەویەدا، چونكە بەڕاستی خودای گەورە خۆشی لەو كەسانە نایات كەبەدیو خەراپەو فەسادی دەكەن. خوداناسی ڕێز و گەورەییەكە، كاری پێویست و دروستی تایبەت مەندی خۆی هەیە، وە بەتەنها ئامانجێكی ڕووت و نالەبار و بیْ ئەرك نیە، لەنێوانی خەلْك و دونیادا دوورت بخاتەوە ، یان لەنێوانی خەلْكو، ژیانو، دوونیادوورت بخاتەوە، ئەگەر وەك و دلْێن، وەهابووایە ئەوە بەڕاستی ڕەوڕەوەی ژیان بەهیچ جۆرێك بەرە و پێشكەوتنو ئاوەدانیو، گەشە كردنو، گۆڕان كاری ئیشی نەدەكردو ڕادەوەستا.هەروەكو پێغەمبەریش دەفەرمویْ:﴿ من احب دنیاةاضر بآخرته، ومن احبآخرتهأضر بدنیاه فآثرءا مایبقى على مایفني﴾ گوێنەدان بە دنیابە و مانایە نیە وەك و زۆربەی خەلْكان واتێگەیشتون كە ئادەمیزادەكان دوور بكەونەوە لەهەولْ و كۆشش و كاركردن بۆ دونیا:یان ببێتە ئادەمیزادێكی چاوچنۆكی پیسكە بۆ بژێوی ژیانی خۆیو، گرتنە وەو دەست قوچانی ئەومالْو سامانەی كەخودا پێی داویو، نەی بەخشی، وەهیچ مافوحەقێكی لێنادا، بەلاْم كەسەیری فەرموودەكانی پێغەمبەریﷺ ئازیزمان بكەین گوێنەدانی بەدونیاو، زوهدی چۆن بۆباس كردووین ، زۆرباش تێدەگەین: كەمەبە ستی پێغەمبەری خوداهەولْو كۆشش نەكردنو، هەلْپەی ژیانی ئەودونیایەیە لەڕێگای چەوتو چەوێلْو خەراپەو ناڕەواییە: بۆیە هەركاتیْ چاوت بە زەردوو، والاْو بریقەی ئەم دونیایە كەوت، كەخەلْكانی پیْ هەلْ خەلْەتاوە، ئەویش خێرا پەلامار نەداو هەولْی بەدەست گەیاندنی بكات: پێویستە لەسەری زۆربە جوانی سەیربكات ئایا ئەو ڕێگایەی كە بۆ هەولْدانی دەی گرێتە بەر، ڕاستو ڕەوایە ، یان حەرامو ناڕە وایە: ئینجا ئەگەر بۆی دەركەوت كەئەو ڕێگایە ڕێبازێكی حەرامو ناڕەوایە ، دەبیْ هەر خێرا بەگیانو ئەندامی لێی دوور بكەوێتەوە، وەئەگەر حەلاْلْو ڕەواش بێت ئەوە هەرچەندی هێزو توانای هەیە با هەولْبداو زیاتر بەدەستی بهێنیْ. ئینجا لەوبارەوە پێغەمبەرﷺ دەفەرمویْ: ﴿إزهد فی الدنیایحبك اللهوازهدفیما عند الناس یحبك الناس﴾ بەسوك سەیر كردنی دونیاو زوهدی ڕاستەقینە هەروەكو پێغەمبەرمانﷺ بۆمانی دیاری كردووەو ڕوونی كردۆتەوە و فێری كردوین پێویستە لەسەرمان گویْ نەدەینە ئەومالْو سامانە ی كەخودابە حەراموناڕەوای

داناوەو، دوور كەوتنەوە لەو ماڵ و سامانەی كە پەیوەندی بەتۆوە نیەوخاوەنی كەسانێكی ترن، وە دووركەوتنەوە لە هەموو ئەوشتانەی كە شەیتان ڕازاوەو جوانی كردووە، وەدووركەوتنەوە لەهەمووشتێكی ستەم كارو، تاوان باری. ئینجا پێغەمبەری ﷺخودا ئاوارەفتاری كردووەو، هەر ئەو ڕێباز و ڕەفتارانەشی بۆیارەكانیو هاوڕێیانی دوای ئەوانیشی دیاری كردووەكەدەست درێژی نەكەنە سەر ئەو ماڵ و سامانەی كە هەموو موسڵمانان تێیدا بەشدارن و بۆ هەموو گەلە بەڕاستی یارەشیرینە جێنشینەكانی ڕاشدون بەهەمان ڕێبازو ڕێگای پێغەمبەرداﷺ ڕۆیشتن ئینجا ئەو بەڕێزانە بۆ بەدیهێنانی ئەوڕێبازە نەخشە و هونەری خۆیان بەڕاستی لە هەموو نارێكیوناتەواویەك ڕاهاتنیان لەسەر قەناعەت و تێری و قایل بوون بەو بەشەی كەخودابۆی بڕیارداوە:وەبەڕاستی ئەو نەخشەو نیگارە زۆر بەهێز و كاری گەرەكە بیگرینە بەرئەوەی كەپەیوەندی بەتۆوە نیە لێی دووربكەویەوە و ئاهی بۆ هەڵمەكێشە وەدڵ نیاش بە لەو شتەی كەخودای گەورە پێی بەخشیوی ئەوبەشە هەرئیخۆتەو پێشت دەگات بۆیە بەتەواوی لەسەروەت و سامانی دونیادووربكەوە بەڕێگای خەراپەوناڕە وا، چونكە ئەگەرداوای ماڵی زۆربكەی لەڕێگای خەراپە، زۆرباش بزانە كە سەروەت و سامانیشت زۆربێت ئەوە تۆ زۆر سوك و بێهێزو پوچ دەردەچی. وە بەڕاستی زۆربەی زۆری جێنشینو لێپرسراوانی موسڵمانان بەوجۆرە بونە پێشەنگ و پێشەوای ئێمەو بە گوێرەی ئەو ئایەتەش ڕەفتاریان كردووە {وَٱبۡتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنۡيَاۖ وَأَحۡسِن كَمَآ أَحۡسَنَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَۖ وَلَا تَبۡغِ ٱلۡفَسَادَ فِي ٱلۡأَرۡضِۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُفۡسِدِينَ }القصص/٧٧ واتەی ئەو ئایەتەمان لە پێشەوە كردووە.

## نەكارم بۆ تۆ كردوە و نە بۆ كەسێكی تر

## لاعملت لك ولا لاحد

باوكی عەمیری كوڕی سەعدﷺپاڵەوان و ئازایەكی زۆربەغیرەت بوولە پێشەنگی پێشینان: وە هەرگیز لە هیچ شەڕ و جەنگێكدا كەڕووی دابێت دوانەكەوتووە، كەڕۆیشتۆتە جەنگ، هەتا كۆتایی بەجەنگ نەهاتوەو، یەكلانەبوویێتەوە مەیدانی جەنگی بەجێ نەهێشتوە، لەگەڵ پێغەمبەروﷺلەدوای پێغەمبەریشﷺ ڕۆیشتۆتە

بەرەکانی جەنگ، بۆ بەر زکردنەوەی ئاڵای ئیسلام و بڵاوبوونەوەی دینی سەربەرزی ئیسلام.بەوجۆرە بەردە وام بوو هەتا لە ڕووداوی جەنگی قادسیەدا شهید کرا.لەدوای خۆی عەمیری بەجێ هێشت ئەوکاتە تەمەنی زۆر منداڵ‌وبچوك بوو بەڵام زۆر بەغیرەت‌و پاڵەوانی جەنگ بوو ئەو بەڕێزەش چەندین جاربەشداری جەنگی کردووەولە زۆربەی کۆڕودانیشتنی پێغەمبەرداﷺ بەشداری کردووە. وە ئەو پیاوە بەڕێزەش لەکاتی جێنشینایەتی عومەری کوڕی خەتابداﷺ فەرمان ڕەوایی شاری (حمس)ی پێ سپێردراوە و لەو شارەدا کاری کردووە. لەدوای تێپەرینی کاتێکی زۆرهیچ دەستکەوت‌و واریداتێکی وای کۆنەکردەوە کەڕەوانەی شاری مەدینەی بکات: چونکە هەرداهات‌و دەست کەوتێکی بەدەست دەگەیشت، دەستی دەکرد بە خەرجکردنی ئەوداهاتەی بۆپێویستی موسڵمانان‌و وڵات‌و شارەکەی.ئینجا پێشەوا عومەرﷺنامەو نێردراوێکی بۆ عەمیرﷺناردو و فەرمانی پێدا بوو، هەرکەنامەی منت پێگەیش ئەی عەمیر چیت پێباشە کۆی بکەوە و خێراوەرە بۆلامان : کەعەمیر ﷺنامەکەی پێگەیشت هەستا شمشێرەکەی دەرهێنا لەگەڵ ئەوقاپەی کە خواردنی تێدادە خوارد و هەرچی پەیوەندی بەو شتانەوە بێت هەڵی گرت‌و بەشانی خۆی دادا و دار عەساکەی بەدەستەوەگرت‌و، بەرەو شاری مەدینە بە پێیان کەوتە ڕێگابەبێ ڕاوەستان و پشودان هەتا گەیشتە شاری مەدینەو، دەڕواتە شوێن‌و کۆڕی پێشەوا عومەروﷺ، لێی دەڕواتە پێشەوە و سەلامی لێدەکات: لەدوای وەڵامدانەوەی سەلام: فەرمووی: ئەی عەمیر کار و ماڵت چۆنە؟ عەمیرﷺفەرمووی: بەڕاستی تەندرستیم زۆر باشەو هەموو خەڵك‌و دنیام لەگەڵدایە: پێشەوا عومەرﷺوای زانی غەنیمەت و داهاتی لەگەڵ خۆی هێناوە: بۆیە پێشەوا عومەرﷺفەرمووی:ئەی عەمیر تۆبە پێیان ڕۆیشتووی هاتووی؟ عەمیر ﷺفەرمووی: بەڵێ.عومەرﷺ فەرمووی: کەس نەبوو وڵاغێکت پێ ببەخشێ؟ عەمیرﷺ فەرمووی: بۆخۆم هەوڵمنەداوەو ، داواشم لە کەس نەکردووە. عومەر ﷺفەرمووی: بەڕاستی موسڵمانی خەراپ بوون: عەمیرﷺ فەرمووی: ئەی عومەر خودا باس کردنی پاشەملەی حەرام‌و یاساغ کردوە. عومەرﷺ فەرمووی:عەمیر

چیت كردووە؟ عەمیرﷺ فەرمووی:چومە ئەو شارەی كەتۆمنت بۆئەوێ ناردووە: وە منیش هەموو پیاوە باش‌و چاكەكانم كۆكردۆتەوەو، كردو و منە فەرمانڕەوای كۆكردنەوەی داهات‌و ماڵیات هەتا هەمووی كۆكراوەتەوە، ئینجا لەو شتەی كەزۆر پێویستبووە خەرجم كردووە: وەئەگەر شتێكیش مابایەوە بۆ ئێوەم دەهێنا عومەرﷺ فەرمووی :هیچت بۆ نەهێناوین؟ عەمیرﷺ فەرمووی: نەخێر پێشەوا عومەر بەلێپرسراوانی دەورو بەری فەرموو:پەیمانی فەرمان ڕەواییەكەی بۆ نوێ بكەنەوە عەمیرﷺ فەرمووی:ئەی عومەرمن فەرمان ڕەوایی‌وكاری دڵسۆزانەم نەلەبەر خاتری تۆ كردووەو نەلەبەر كەسێكی تر.تەنها لەبەر ڕەزای خوداكردوومە.

# دونیا نەویستی‌وخودا پەرستی عومەری كوڕی عبدالعزیز

# زهد عمر بن عبدالعزيز

دەگێڕنەوە (فاتمەی كچی عبدالملكی كوڕی مەڕوان) كە هاوسشەری (عومەری كوڕی عبدالعزین)ﷺبوو، كاتی بەشودانی، باوكی داوای لە عومەر كرد بوو، كە زێڕ و خشڵێكی زۆری بۆ بكڕێ: ئینجا كاتێ كە عومەر بووبە خەلیفەی موسڵمانان، بە فاتمەی گوت: ئەی فاتمە من دووڕێگەت بۆدیاری دەكەم، كامیان هەڵدەبژێری سەر پشك بە: ئەو زێڕو خشڵەی كە هەتە نابێ لەلای تۆبێت: یان بیگێڕەوە بۆخەزێنەی موسڵمانان(بيت المال) یان فەرمانی جودابوونەوەی یەكتربدەین(طلاق) چونكە بەڕاستی من زۆردڵ تەنگ‌و بێزاردەبم لەماڵێك دابنیشین‌و، ئەو هەموو خشڵەت پێوەبێت: فاتمە فەرمووی: بەخوامن لەبەرامبەر تۆدا هەموو خشڵ و زێڕی دونیام بەلاوە هیچە و تەنها تۆ هەڵدەبژێرم: هەموو ماڵ‌و زێڕوپارەم لە پێناوی تۆدا بەخت دەكەم.هەستا هەموو زێڕو گەوا هیری كە هەیبوو بەحەزوئارەزوی خۆی بەخەزێنەی موسڵمانانی بە خشی. لەدوای مردنی عومەری كوڕی عبدالعزیزﷺ، یەزیدی كوڕی عبدالملك ﷺبووبە جێنشین یەزید بەفاتمەی گووت: ئەگەر حەزبكەی من هەموو خشڵ و گەوهەرەكەت بۆ دەگێڕمەوە وەری بگرەوە.بەڵام فاتمە فەرمووی: سوێند بەخودا كاتێ ئەو زێڕو گەوهەرەم بە فەرمانی عومەر بەخەزێنە بەخشی، لەژیانی عومەریشدا حەزوئارەزوی ئەو ماڵەم نەكردووەو ، دڵم بەلایەوە نەبووە، هەتا بڵێم ئێستا لەدوای مردنی وەری دەگرمەوە.

## دوا ڕۆژ بۆ خۆپارێزانە
## والعاقبة للمتقين

دەگێڕنەوە یەكێك لە خزمەكانی (عومەری كوڕی عبدالعزیز)ﷺ دەڕواتە لای عومەر: سەیر دەكات عومەرﷺلەبەربەڕۆچكەی سوچێكی ماڵی خۆیان بەرامبەربەخۆر دانیشت وەو، پۆشاكوشتێكی بەخۆی داداوە.ئەوخزمەی وای زانی نەخۆشە، پرسیاری لێكرد ئەی پێشەواچی ڕویداوە والێرەپاڵت داوەتەوە؟ عومەر ﷺفەرمووی: برام هیچ ڕووی نەداوە، بەڵام چاوەڕێ دەكەم جلەكانم شۆراوە، وشك ببنەوەو لەبەر یان بكەمەوە: دووبارە بەسەرسوڕمانێكەوە پرسیاری لێدەكاتەوەو دەڵێ:جلەكانت چین؟ ئەویش دەفەرموێ: كراسێكو، دەرپێیەكو، باڵاپۆشێك. كابراگوتی:ئەی پێشەوابۆچی كراسو، دەرپێو، باڵا پۆشێكی تر ناكڕی؟ عومەرﷺ فەرمووی:برام بەرگێكی ترم هەبوو، بەڵام كۆن بوو ڕزی. كابرا گوتی: بەرگێكی نوێ تر بكڕە؟ عومەرﷺ ڕاچەنیو دەستی كرد بەگریانو، هەر بە گریانەوەش ئەو ئایەتەی دەخوێندەوە:{تِلْكَ ٱلدَّارُ ٱلْءَاخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا ۚ وَٱلْعَـٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ }القصص/٨٣ واتە: دەبێ ئادەمیزادەكان باش بزانن كە ئەو بەهەشتە خۆش و بەرینەی ڕۆژی دوایمان ئامادەكردووە، بۆ ئەو كەسانەی كە خۆهەڵكێشو لوت بەرز نینولەوسەر زەویە خۆیان بەگەورە و بەنرخ دانانێنو، كردەوەی خەراپەو فەسادی ناكەنو بڵاوی ناكەنەوە، بەڕاستی سەر بەرزی و سەرفیرازیش بۆخۆپارێز و لەخودا ترسانە.

## نە پاسەوانی هەیە و نە پەناگەیەك
## لاحارس ولاحاجب

دەگێڕنەوە (عومەری كوڕی خەتابﷺ)جێنشینی موسڵمانان هەردەم بەرگو پۆشا كێكی زبر و ئەستور و دونیانە و یستانی لەبەردا بوو.كاتێ كەموسڵمانان هورمزیان بەدیل گرتبوو: بەبەرگ و پۆشاكی شاهەن شاهیوتاجی زێڕینی سەری:بردیانە شاری مەدینە، بۆلای پێشەوا عومەركەلە سوچێكی مزگەوت

بەوبەرگ و پۆشاكەوە بەبێ هیچ پاسەوانێك خەوی لێكەوتبوو. هورموز پرسیاری كرد كوا عومەر لەكوێیە؟ ئەوانیش گوتیان:ئەوە عومەرە﷛لێرە نووستووە هورموز سەرسام بوو.گوتی: ئەدی كوا پاسەوان و ئێشك چییەكانی، ئەوانیش گوتیان: عومەر﷛ نەپاسەوانی هەیەو نەپەنا گەیەك ، هورموز گوتی :بۆی هەیە ئەوە پێغەمبەر بێت ، گوتیان: ئەوە پێغەمبەرنیە بەلآم كاری پێغەمبەران﷤ ئەنجام دەدات. كاتێ عومەر﷛بەخەبەرهات گوتی: ئەوە هورموزیانە؟ گوتیان بەڵێ: ئینجا پێشەوا عومەر﷛دەستی بە گێڕانەوەی ناپاكیەكانی و، دەست درێژی و، تاوانەكانی دووژمن كاریانەی هورموزیان. ئەویش لەلای خۆیەوە دەستی كرد بە پاڕانەوەو، فێڵ و، تاكتیكی خۆپەنادان و، ماستاو ساردكردنەوەو، بەجۆرەهاقسەی پاساوولێ بووردەیی و، چاوپۆشی دەكرد، داوای مۆڵەتی پشودانی دەكرد.هەتا پێشەوا عومەر﷛چاوپۆشی لێكرد و، لێی بوورد: لە دواییدا هورموزیان موسڵمان بوو. لەشاری مەدینە ژیانی دەبردەسەر.

## من و ژیانی دوونیا

## مالی و للدنیا

جارێكیان پێشەوا(عومەر﷛)دەڕواتە خزمەت پێغەمبەروﷺ سەیر دەكات لەسەر حەسیرێك ڕاكشاوە، شوێنی حەسیرەكەش بەهەموو لاشەكە یەوە دیارە: عومەر ﷛ فەرمووی: ئەی پێغەمبەریﷺ خودا بۆچی ڕایەخێكی نەرم و نیانت بۆ دروست نەكەین؟ پێغەمبەرﷺ ڕەنگ و ڕوخساری گۆڕاو، بەڕوی عومەریدا ڕووانی و، بەتوڕەییەوە فەرمووی:عومەر وادەزانی پێغەمبەرایەتی ئێمە، شێوەی پادشاكان و، كیسرا وایە، كاری ئێمە پێغە مبەرایەتیەو، پادشایی نییە؟ ئێمەو سەروەتی دوونیا!! سامانی دونیا وەك وسوارو ڕێبوارێك وەهایە كە لە ڕۆژێكی سایەقەی گەرمدا سەعاتێك برۆیە ژێر سێبەری دارێك لەدواییدا بڕوات و بە جێی بهێڵێت.

# هەوڵدان و ئارەزوی شتێك بكەن كە بۆ لای دەڕۆن
# وأرغبوافيما أنتم عليه قادمون

دەگێڕنەوە: (كەسوەیدی كوڕی حارسﷺ)ڕووداوێكی گێڕایەوە فەرمووی: ئێمە (٧) حەوت كەس بووین بەنوێنەرایەتی گەلەكەمان ڕۆیشتین بۆلای پێغەمبەر ﷺ:پرسیاری لێكردین ئێوە كێن؟ ئێمەش گوتمان:موسڵمانین پێغەمبەرﷺپێكەنی و فەرمووی: بەڵێ ڕاستە، بەڵام هەموو شتێك حەقیقەت و، بنەمایەكی ڕاستی هەیە! بنەماو ڕاستەقینەی باوەڕی ئێوە چییە؟ ئێمەش گوتمان(١٥)پانزە شتە(٥)پێنج شت نوێنەرەكەت فەرمانی پێكردووین كەباوەڕی پێبكەین:وە(٥) شتیش بەرێزت فەرمانت پێ كردووین كەكاریان پێ بكەین وە(٥)پێنج شتیش نەریت وعادەتی دەوری نەزانی و بێباوەڕیمانە، كە ئێستاش ئەو ڕەوشتانە بەكار دەهێنین، هەتا فەرمانی پێناخۆشبوونتانمان بەسەردا دەسەپێنن. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەو پێنجەچین كە نوێنەرەكانمان پێیان ڕاگەیاندوون؟ گوتمان: فەرمانمان پێكراوە باوەڕ بەخودا بكەین، بە فریشتەكان بكەین، باوەربە كتێبەكانی خوداو، بە پێغەمبەران و(عليهم السلام)، بە زیندووبوونەوەی دوای مردن بكەین. لەدوای ئەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەو پێنجەی كەمن فەرمانم پێكردوون بیكەن چین؟ ئێمەش گوتمان :فەرمانت پێكردوین بڵێین (لاإله إلا الله) نوێژبكەین، زەكات بدەین، ڕۆژووی ڕەمەزان بگرین، ئەگەر توانای ماڵیمان هەبوو حەجی ماڵی خودا بكەین. ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەدی ئەو پێنجەچین، كە بۆ خۆتان لەكاتی نەزانی و بێباوەڕیدا كردووتانەو، ئێستاش هەڵتان بژاردووەو، دەیكەن؟ گوتمان: شوكرو سوپاس كردنی خودا، لەسەر نیعمەتی خۆش گوزەرانیدا، ئارام گرتن لەكاتی گرفتاری و، كارەسات داو، ڕازی و قایل بوون، لەكاتی بەخت و چارەنوسیدا، ڕاست گۆیی لەكاتی بەیەكگەیشتن و پێكدادان و، واز لێ هێنانی زیادە ڕۆیی لە دوژمنایەتیدا. پێغەمبەر ﷺفەرمووی:﴿أنتم علماء حكماء كدتم من فقهكم أن تكونا أنبياء﴾ واتە: ئێوەزاناو لێزانن وە نزیكە بەهۆی زانیاریتانەوە ببنە نێردراو. لە دواییدا پێغەمبەرﷺفەرمووی:پێم خۆشە پێنج شتی ترتان بۆ زیادبكەم كە هەمووی

دەبێتە (٢٠)بیست ڕەوشت، كەوەك و ئێوە دەیڵێن وابێت. ئەوەی كەبۆتان ناخوریٚ كۆی مەكەنەوە هەڵیبگرن، ئەوەی كە تێیدا دانانیشن، دروستی مەكەن، كیٚ بەركیٚ و موناقەسە لەشتێكدا مەكەن كەبەیانی لەدەستتان دەچیٚ، تەنها لەوخودایە بترسێن كە بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوەو، وە هەر بۆ لای ئەو كۆدەكرێنەوە، وە بەتەواوی مەیل و ئارەزوی ئەو شوێنە بكەن كەبۆی دەڕۆن و، هەردەم لەوێش دەمێننەوە.

## ئامۆژگاری گەلەكەت كردو خیانەتت لەباوكت كرد

## نصحت قومك وغششت أباك

لە دەورو وپێشەوایەتی (عومەری كوڕی خەتاب ﷺ)دادەسەلات و ئازادكردن و بەرەو پێشچونی موسڵمانان هەردەم بەرەو سەركەوتن و فراوانی و، گەورەیی و، بۆ پێشەوە دەڕۆیشت. سەرچاوەی داهات و داهێنان زۆر دەبوو، بەلام پێشەوا عومەر ﷺبۆخۆی هەردەم لەبرسیەتی و تەنگەتاویدا بوو ژیانی دەبردەسەرو، دەستی بۆ داهاتی ئەوخواردنە نەدەبرد.موسڵمانان ڕۆیشتنەلای دایكی موسڵمانان خاتو حەفصەی هاوسەری پێغەمبەر وﷺكچی پێشەواعومەرﷺ، گوتیان: خودادەروی خێری كردۆتەوە بەلام عومەر ﷺ نایەوێت، ژیانی بەتێری بەرێتەسەرو گەمارۆی تەواوی لەسەر خۆی داناوە، لەسەر ئەو هەموو داهاتەی كەخودا بەسەریدا ڕژاندووین ، دەبا عومەریشﷺ لەو داهاتەدا چۆنی ئارەزولێیە باهەڵی بگرێت و، خەرجی بكات ، بۆی ڕەوایە وەك و بۆموسڵمانان ڕەوایە. ئینجا خاتو حەفصە لەگەڵ بیروڕاو ئارەزوەكانی ئەوموسڵمانانە یەك بیروڕا بوون. كاتیٚ موسڵمانەكان ڕۆیشتن. پێشەوا عومەرﷺڕۆیشتەلای خاتو حەفصەی كچی، ئەویش هەرچی موسڵمانان دەریان بڕیبوو بۆ باوكی باس كرد.پێشەوا عومەرﷺ فەر مووی:ئەی حەفصەی كچی عومەرﷺتۆ ئامۆژگاری هۆزەكەت كردوە و خیانەتت لەباوكت كردووە.ئەی حەفصە گەلەكەم مافیان لەژیانم و داهاتمدا هەیە، بەلام هیچ دەسەلاتیان لەلایەنی دینی و دڵپاكی و ئەمانەتیمدا نیەو، من دوژمنایەتی و بەربەرەكانیان لە گەڵدادەكەم ئەتۆ بۆ بیر لە پێغەمبەرﷺناكەیەوە كە چۆن تەنگەتاوی ژیان تەنگی پێهەڵچنی بوو؟ پێشەوا عومەر هەردووبارەی دەكردەوە هەتاحەفصەی بەگریان خست.

## دەبم بە پێغەمبەرو بەندە

## أكون نبيا وعبدا

(عبدالله ی کوڕی عباس) دەگێڕێتەوە ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ لەماڵ دەر دەچێت و دەڕوات و حەزرەتی جبرائیلی لەگەڵدا دەبێت وسەر دەکەوێتە سەر تەپۆڵکەی (سەفا)ودەفەرموێ: ئەی جبرائیل سوێند بەو کەسەی کەتۆی بەحەق ناردووە ئەم ئێوارەیە لوێچێك ئارد لەماڵی پێغەمبەردا ﷺ نەبووە. هێستا پێغەمبەر ﷺ تەواولە قسەکەی نەبووە دەنگێکی زۆر بەسام وترس لە ئاسمانەوە هاتە گوێمان. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی جبرائیل! خودا فەرمانی هاتنی ڕۆژی دوایی داوە؟ جبرائیل فەرمووی: نا نەخێر بەڵام ئەوە ئیسرافیل بوو لەگەڵ قسەکەی تۆهاتە سەرزەوی:دوایی هاتە لای پێغەمبەرو ﷺ فەرمووی:ئەی محمد خودا قسەکەتی بیستو، منی بۆلای تۆ نارد بەخێرو بەرەکەتی سەرزەوی هەرچی ئارەزو بکەی بۆت بەدی بهێنم: ئەگەر حەز دەکەی کێوی (توهامەت) بۆ بکەم بەزێڕو، گەوهەرو، یاقوتو، زومەڕەد. وە ئەگەر حەز بکەی ببیە پێغەمبەرێکی فریشتە، یان پێغەمبەرێکی بەندە. چی ئارەزو بکەی بە کەیفی خۆتە. لەوکاتەدا حەزرەتی جبرائیل پێغەمبەری ﷺ تێگەیاند کە سەری نەوازشی بۆخودا بنەوێنێ، پێغەمبەر ﷺ سێ جارفەرمووی:حەزدەکەم پێغەمبەرێکی بەندەبم؟ بەندەبم؟ بەندەبم؟.

## ماڵی بە جێماوەی ئەبوبکر

## تركه سيدنا أبوبكر

لەدوای مردنی پێشەوا ئەبوبەکری ﷺ خوداپەرستو، ئاین خوازو، خۆپارێزی دونیانەویست. حەزرەتی عائشەی دایکی موسڵمانان: هەر خێرا لەدوای بەخاك سپاردنی هەستابە بەجێهێنانی سپاردە(وصیە)تەکەی باوکی کە پاشماوە و میراتەکەی بوو، بردی تەسلیم بەدەستی عومەری ﷺ کرد. کە بریتی بوو لە حوشترێك، کە ئاویان پێدەهێنا ، لەگەڵ قاپێك، کە شیریان تێدا دەدۆشی، وە لەگەڵ عەبایەك، کە نوێنەری وڵاتان دەهاتن، پێشوازی پێوە دەکرد. هەموو سامانی

خۆشەویسترین کەسی پێغەمبەری ﷺخوداو، جێنشینو، پێشەوای موسڵمانان ئەوەندە بوو، ئەو پێشەوایەی کەهەموو ماڵی لە پێناوی خودا بەخت ئەکردو، بۆخزمەتی بەرەی ئادەمیزادو، لەپێناوی ئازاد کردنی عەبدوبەندەکان خەرجی دەکرد.جارێکیان هەرچی لەماڵی دابوو (٤٠٠٠٠٠) چوار سەد هەزار درهەم بوو: بەخشی و هیچی بۆ ماڵەوە نەهێشتەوە، تەنها لە پێناوی سەرکەوتنی حەقو ڕاستی و بەرز بوونەوەی کەلیمەی (لاإله إلاالله) بەوامو، قەرز دەیبەخشی، بۆدەست کەوتی دواڕۆژی. ئینجا کاتیٚ کە پێشەوا عومەر چاوی بە سەروەتو سامانی ئەبوبکر کەوت. کەهەموو سامانەکەی هەر ئەوەندەیە کە هێناویەتی خۆی بۆ ڕانەگیراو دەستی کرد بە گریان. دوایی فەرمووی:ڕەحمەت و میهرەبانی خودای گەورە لەسەر ئەبوبکرﷺ بێت بەڕاستی هەموو ئەو کەسانەی کەلەدوای ئەویەوە دێن هیلاکو ماندووی کردن بەو ڕەوشتو کردارەی کە کردی.

## دووبازنەی لەزیو

## سوارین منفضة

دەگێڕنەوە: جارێکیان سەردار و گەورەی ئافرەتانی ئەو کاتە (حەزرەتی فاتمە) ڕۆیشتەلای باوکی ، پێغەمبەری خودا ﷺداوای لێکرد کە بەڕاستی زۆر ماندوە بە ئیشو کارەکانی ڕاناگات، داوای لێکردکە کارەکەرێك، پێش خزمەتێکی بۆ بگرێت. بەڵام پێغەمبەر ﷺهەر چەندە کەزۆری خۆش دەویست، ڕازی نەبوو بۆ بەجێگەیاندنی ئەوداوایەی. پێغەمبەر ﷺفەرمووی: بەخودا کچەکەم من ئەو داوایەت لێوەرناگرم و بەجێی ناگەیەنم. ئەتۆ بۆ سەیری ئەهلی(سوفەیە)ناکەی کەچەندە کۆمەڵێکی هەژارو نەداربوون. ڕۆژێکیان پێغەمبەرﷺ ویستی سەردانی فاتمەی کچی بکات ڕۆیشتو لەدەرگای داو، دەرگایان لێکردەوە، پێغەمبەرﷺ سەیرێکی فاتمەی کردوو، یەکسەر گەڕایەوە نەڕۆیشتە ژوور، فاتمە بەدوای پێغەمبەریﷺ داناردکەهۆی چی بوودەنگی نەکردو و گەڕایەوە.پێغەمبەرﷺ فەرمووی: کەسەیرم کردفاتمە دووبازنی زێڕی لەدەستدایە بۆیە گەڕامەوە، فاتمە کەزانی پێغەمبەریﷺ خودا لەبەر زێڕەکان نەهاتۆتە ژوور هەر خێرا بازنەکانی داکەندوڕەوانەی لای پێغەمبەریﷺ کردو، ئەویش ڕۆیشت هەر دووك بازنەکەی فرۆشتو پارەکەشی بەسەر هەژاراندا دابەش کرد.

# دادگەربووی، سەلامەتو دڵنیابووی، بێترس دەنوی

# عدلت فأمنت فنمت

كاتێ پادشای ڕۆم گوێ بیستی دادگەری و فەرمانڕەوای پێشەوا عومەر ﷺبوو كە چۆن كارو باری دەوڵەت بەڕێوەدەبات. نوێنەرێكی نارد بۆ ئەوەی لەنزیكەوە ئاگاداری هەڵسوكەوتو ڕەفتار وگوفتاری عومەرﷺببێتو، تاچەندە پەیوەندی عومەر ﷺ بەگەلەكەیەوە هەیەو یەكتریان خۆش دەوێت. نوێنەری پادشا گەیشتە مەدینە و پرسیاری لەشوێنو جێگەی عومەرﷺ كردو، گوتی: پادشاكەتان لەكوێدا دەنیشێ؟ وەڵامیان دایەوە ئێمە پادشامان نیە !!تەنها ئەمیر و پێشەوایەكمان هەیە ، ئەویش ئێستا بۆ پشودان ڕۆیشتۆتە دەرەوەی شار.نوێنەری پادشا بۆ ئەو شوێنەی كە هەواڵیان پێدا بوو ڕۆیشت. كە گەیشتە لای سەیری كرد واعومەرﷺ لەبەر خۆرەكە و لەسەر قومو لمی ئە وسەحرایە درێژبووە و، داردەستەكەی وەك و سەرین لەبن سەری داناوەوخەوی لێكەوتووە ئارەقەی گەرمی بەڕووخساریدا دێتە خوار.كاتێ نوێنەری ڕۆم عومەریﷺ بەوجۆرەدیت سامەوهەیبەتو ترسێكی لێنیشت. ئینجا گوتی:بەڕاستی پیاوێك كە هەموو پادشایان و دەسەڵات دارانی وڵات لێی بترسنوخۆیان لەبەرامبەریداڕانەگرن و، ئەوەش بارودۆخەكەی بێت. بەڕاستی دیارە ئەی عومەرﷺتۆدادگەرو دڵنیاو سەربەستی بۆیە بێترس لەو شوێنە بەبێ پاسەوانو چاودێر دەنوویت. شایەدی دەدەم كە ئەو ئاینەی ئێوە ڕاست و دروستە، ئەگەر ئێستامن نوێنەر نەبوومایە باوەڕی تەواوم دەهێنابە خودا و ئەو ئاینەتان.بەڵام ئێستا دەڕۆمەوە بۆلای پادشای ڕۆم و هەموو ڕاستی و واقعەكان بۆ پادشاباس دەكەمو دوایی دەگەڕێمەوە باوەڕدەهێنم ، بەوجۆرە گەڕایەوە بۆ لای پادشای ڕۆمو دوایی موسڵمان بوو.

# لەخودا بپاڕێوە کە خودا دەرووی خێرمان لێبکاتەوە

# أدع الله أن یوسع علینا

دەگێڕنەوە پێغەمبەری خوداﷺ نەخۆش دەبێت‌و، حەزرەتی عومەر‌ﷺسەردانی دەکات‌و دەڕواتە ژورەوە: سەیر دەکات پێغەمبەر ﷺ لەسەر حەسیرێکی زبرو خەراپ و کۆن درێژ بووەو، چەند ڕیشاڵێکی دارخورمای لەژێرسەری داناوە و کردوویەتی بەسەرین! عومەرﷺدەفەرموێ: لە ژوورەکەیدا چاوم گێڕا هیچ شتێکم نەکەوتە بەرچاو، تەنها جام‌و گۆزەیەکی ئاوخواردنەوەو، لوێچێك جۆو، سینگە دارێك بۆ هەڵواسینی جل‌و بەرگ عومەرﷺدەستی کرد بە گریان و فەرمووی: ئەی پێغەمبەری ﷺ خودا لەبەر خودا بپاڕێوە با گوزەرانی ژیانمان خۆش بکات‌ووەك‌و فارس‌و ڕۆمەکان ماڵ‌وداراییمان بەسەردا بڕژێنێ، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی عومەر ئەتۆش حەز لە سامان‌و دارایی‌و خۆشگوزەرانی دونیا دەکەی ، !! خۆزگە ئەو قسەیەم لەتۆوە نەبیستبایەو، لەیەکێکی ترم گوێ لێبایە. ئەو گەل و نەتەوانە گەلێکن هەبوونی ژیانی دونیایان هەر لە دونیادا پێیاندراوەو، بۆیان پێش کەوتوە. ئینجا ئەو ئایەتەی خوێندەوە.{ لَا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي ٱلْبِلَٰدِ. مَتَٰعٌ قَلِيلٌ ثُمَّ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۚ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ }ال عمران/١٩٦-١٩٧ واتە: خودا داوامان لێدەکات. ئەی باوەڕداران ئەوەندە ساویلکەوباوەڕ لاواز نەبن کەهەبوونی‌و دەسەڵاتی بێ باوەڕان کارتان تێ بکات‌و لە خشتەتان بەرێ. چونکە باش بزانن ئەو هەبوونی‌و دەسەڵاتە، ڕابواردنێکی زۆر کەمە لەودونیایەدا، ئەوانە شوێن‌و جێگەی مانەوەی هەتا هەتایە یان ناوئاگری بەتینی دۆزەخە، کە ناخۆشترین شوێن‌و جێگەیە. خودا بمانپارێزێ.

ئەوە سروشتی پێغەمبەرانە ﷺ لەژیانیانداو، هیچ میرات‌و ماڵی بۆ ماوەیان، بۆ منداڵ‌و خانەوادەیان لەدوای خۆیان بەجێ نەهێشتووە: بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ نحن معاشر الانبیاء لانورث، ماترکناه صدقة ﴾

# تەنها لەبەر خودا واز لەدونیا بهێنە

# الزهد فی الله

حامیدی کوڕی ئەسوەد ﷺدەفەرموێ:جارێکیان لەگەڵ خودا ناسی بە ڕاستی ئیبراهیمی خەواصﷺ لەبیابانێکدا شەو لەژێر دارێکداماینەوە. لەناکاوێکدا شێرێکمان لێ پەیدا بوو. بەرەو ڕوومان هات ئیبراهیمﷺ خەوی لێکەوتبوو منیش لەترسان بەدارەکە هەڵگەڕام‌و هەتابەیانی خەوم لێ نەکەوت.شێرەکە ڕۆیشتەلای ئیبراهیم و هەر لەسەریەوە بۆنی پێوەدەکرد هەتا لای قاچەکانی‌و، خۆی تێنەدەگەیاند، لەدواییدا شێرەکەڕۆیشت. بۆڕۆژی دوایی ڕۆیشتین چوینە گوندێک‌و، شەو چوینە مزگەوتێک ماینەوە، شەو مێشولەیەک ڕۆیشتە سەر ڕووخساری ئیبراهیم ﷺگەزێکی لێگرت ناڵەیەکی لێوەهات، ئەمنیش پێم گوت: بەڕاستی شتێکی سەرسوڕ هێنەرە، دوێنێ شەو لەبەر ئەو شێرە گەورەیە هاوارت نەکرد.کەچی ئەم شەو لەبەر ئەو مێشولە بچکۆلە هاواردەکەی؟ ئیبراهیم ﷺ فەرمووی: بەڕاستی دوێنێ شەو بە تەواوی لەباروودۆخێکی خودا پەرستی دا بووم‌و، پەیوەندیم بەخواوە بەستبوو. بەڵام ئەم شەو لە بارودۆخێکی سەر قاڵی ژیانی خۆم بووم.

# تەنها خودا پەرستی‌و وازهێنان لەدوونیا

# الزهد فی الدنیا

دەگێڕنەوە (سالمی کوڕی عبداللەی کوڕی عەمرﷺ) هەڵوێستێکی زۆر جوان‌و مەردانەی هەبوو.لە جووانی‌وپاک ڕاگرتنی گیان‌ونەفسی‌و، دوورکەوتنەوەی لە باق‌و بریقی خۆشی ژیان‌و ، زۆر کەم تەرخەم و گوێی پێنەدەدا. جارێک وارێکەوت لە تەوافی ماڵی بەیت چاوی بە (هوشامی کوڕی عبدالملکﷺ)پێشەوای موسڵمانان کەوت، بەسالمی گوت:داوای چی دەکەی پێم بڵێ پێت دەبەخشم.سالم هەر خێرا هاتە وەڵام‌و فەرمووی: ئەی هوشام ئێستا لەو کاتەدا کە لە خزمەت فەرمانی خودادام‌و، بە دەورەی کەعبەدا دەسوڕێمەوە شەرم دەکەم بێجگە لەخودا لەکەسی

تر بپاڕێمەوەو داوای شت بکەم.! لەدوای تەواوبوونی زیارەتو، پێویستیەکانی حەج. دووبارە هوشام پرسیاری لە سالم کردەوە و گوتی: ئێستا وا لە ناو بەیت هاتوینە دەرو، هیچ واجباتمان نەماوە پرسیارم لێبکە، چیت پێویستە پێت دەبەخشم.سالم بەباوەڕێکی پتەوبە هێزێکی پۆلاینو، گیانێکی خۆنەویستی فەرمووی: ئەی هوشام من کەداوای ماڵی دونیام لە کەسێك نەکردوەم کەخاوەنی هەموو جیهانو بوونەوەرە، چۆن داوای شت لەکەسێك دەکەم کەخاوەنی هیچ نییە؟.

## ئەو بەندە بەسەر منیش و تۆشدا سەرکەوت

## إن هذالعبد غلبني وغلبك

کاتێ(معاویەﷺ) پیرو بە ساڵداچوو.(عەمری کوڕی عاصﷺ)لەگەڵ بەندەکەی (وەردان) ڕۆیشتە لایوسەردانی کرد.تەنها ئەو سێ کەسە بوون دەستیان بە ووتوێژ کرد. عەمرﷺگوتی:ئەی پێشەوای موسڵمانان پێم بڵێ چی شتێکت لەلا ماوە کەچێژو خۆشیەکەی مابێت؟ معاویە ﷺگوتی:باشترین بەرگ و پۆشاکی نەرمو باشم لەبەرکردو، وە ئەگەر ئێستا لەگەڵ پێستمدا بەراوردی بکەین نازانم کامەیان نەرمو شلترە، وەخواردنی زۆرخۆشو بەتام و لەزەتم خواردووە، بەڵام بەخوا ئێستا نازانم کامەیان بەتام وخۆشە، وە بۆنو بەرامی زۆرخۆشم بۆن کردووە ، بەڵام ئێستاهیچ شتێك چێژو خۆشی لەلام نیە، تەنها ئاوی سارد لەڕۆژێکی گەرمای بەتینداو، سەیرکردنی نەوەو، نەوەی، نەوەم کە بەدەورەمدا دەسوڕێنەوە و دێنودەڕۆن.دوایی معاویەﷺ ڕوویکردە عەمر و گوتی:ئەی عەمرﷺتۆچیت لەلاماوە؟ عەمرﷺفەرمووی: ئەو بەروبوومەی کەچاند وومە، بەر هەموو میوەو قازانجەکەیم بەدەست گەیشتووە. ئینجا معاویە ڕووی بەلای (وەردان) داسوڕاندو فەرمووی: وەردان تۆچیت لەلاماوە؟ لەوەلامدا وتی:کارێکی پیرۆ زومەزن وەك و نیشانەیەك بەئەستۆی گەلێکی بەرزوبەڕێز هەڵبواسرێ، وە چەند کارێکی مەترسیدارپاداشتی لەسەروەر بگری هەتا بەخزمەتی خودا دەگەیەوە، وەئەو نیشانەو، ویسامانە لە دوای خۆی لە ئەستۆیاندا بێت بۆڕۆژی دوایی. ئینجامعاویەﷺ فەرمووی: یاخودا کوڕ و دانیشتنی ڕۆژانەمان بەربادبێت: بەڕاستی ئەو بەندە بەسەر منیشو تۆشدا سەرکەوت.

## بەڕۆژ تینو بوون و بەشەو نخونی و نەنوستن

## أظمأت نهاری وأسهرت لیلی

دەگێڕنەوە:جارێك (عومەری کوڕی عبدالعزیز)نەخۆش دەبێ‌و کۆمەڵێك لە دانیش توانی ژێر فەرمانڕەواییدا دەڕۆنە لای‌وسەردانی دەکەن. لەناویاندا گەنجێکی سیسی لاوازی تێکشکاویان تێدابوو.عومەر ڕووی لە گەنجەکە کردو و فەرمووی: بەڕاستیم پێبڵێ، بۆچی واسیس و لاوازی؟ گەنجەکە گوتی:ئەی پێشەوای موسڵمانان، شیرینی‌و خۆشی دونیام چەشت، بۆم دەرکەوت زۆر تاڵ‌و ناخۆش بوو.منیش گوڵ‌وگوڵزارو شیرنیەکەی لەلام زۆرسوك و بێنرخ و بێبایەخ بوو، بۆیە دار و بەردوو زێڕو زیوی ئەم دونیایەم لەلاوەك‌ویەکەو، هیچ بایەخێکی بۆ دانانێم. وە بە هەموو هەست و نەستمەوە دەڕوانمە عەرش وکورسی خودا کە بەڕاستی گەورە و فراوانە. وە بیرلە ئادەمیزادەکان دەکەمەوە کەهەموویان دەبەن و دەڕۆن، یان، بۆ بەهەشت، یان بۆ دۆزەخ، لە بەر ئەوەیە ڕۆژگارم تین‌وبێ ئاوەو، شەوگاریشم شەونخونی و بێخەوییە. وە هەرچی کەمن دەیبینم و دەیکەم لە بەرامبەر پاداشتی خوداداو، لە بەرامبەری سزا و ئازارەکەی سوك‌و بێنرخ‌و بێبایەخە. لەو کاتەدا عومەر دەستی کرد بەگریان و فەرمووی: بەڕاستی وتەیەکی ڕاست‌وباشت گوت.

## بەڕاستی کارمان کردووەئەی پێشەوای موسڵمانان

## انة عاملنا یاأمیر المؤمنین

پێشەوا (عومەری کوڕی خەتاب)بەفرسەتی دەزانی کەلە کاتی بە جێهێنانی واجبی حەجدا هەواڵی نوێنەرانی هەموو ناوچەکانی کەهاتوون بۆ حەج بپرسێ‌و، ئاگاداری ژیان‌وبارودۆخیان بزانێ.بۆ ئەو مەبەستە بەناو کۆڕ و کاروانی موسڵمانان دەسوڕایە وەو پرسیاری بارو گوزەران و ژیانیانی دەکرد. لەوگەڕان و هەواڵ پرسیانەیدا بۆی دەرکەوت کە نوێنەروکاروانی وڵاتی(حمص) هەژارترینی کاروانیەکانن و پێویستیان بەیارمەتی‌و کۆمەك هەیە، بۆیە یەکێك لە چاك

خوازانی(حیمص)ی بانگ کردوپرس یاری لێکردوپێی فەرموو: ناوی هەموو هەژارەکانی حمصم بۆ بنوسە! بەو هیوایەی کە لە خەزێنەی موسڵمانان شتیان بۆدیاری بکرێ. بۆ ڕۆژی دوایی ناوی هەموو هەژارەکانیان بۆپێشەوا عومەرﷺهێناله پێشی هەموو ناوەکان، ناوی(عەمیری کوڕی سەعیدﷺ)نو سرابوو، پێشەوا عومەرﷺفەرمووی: ئەوناوەکێیە؟ئەوانیش گوتیان:ئەوەپێشەواوکارگو زارو لێپرسراومانە: عومەرﷺفەرمووی:بۆچی فەرمانڕەوایەکەشتان هەژارە؟ گوتیان: ئەی پێشەوا هەژارترین کەس لەناوماندا کە هیچی نەبێ(عەمیری کوڕی سەعیدﷺ)ە پێشەوا عومەر دەستی کرد بە گریان و فەرمووی: سوپاس بۆ ئەو خودایەی کەیارمەتی عومەری داوەبۆ هەڵبژاردنی چاکترین ئادەمی زاد بۆ فەرمانڕەوای موسڵمانان.

## لێبوردن : العفو

{ خُذِ ٱلۡعَفۡوَ وَأۡمُرۡ بِٱلۡعُرۡفِ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡجَٰهِلِينَ }الاعراف/١٩٩ واتە: ئەی محمد چاو پۆشی و لێبوردن لە هەڵەو خەراپەی خەڵکی بکە و فەرمان بەکردەوەی باش و چاکە بکەو. واز لە نەزان وتێ نەگەیشتوان بهێنە. وە خودا لەئایەتێکی تردا دەفەرمویێ: {ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ }ال عمران/١٣٤ واتە: ئەوانەی لە خۆشی و ناخۆشیداو، لەهەرزانی و گرانیداسەروەت و سامان وماڵیان لە پێناوی خودادا دەبەخشن و خەرجی دەکەن، وەرق و قینی خۆیان دەخۆنەوە و لە تاوانی خەڵکان دەبوورن و خۆش دەبن، کە بەڕاستی خودای گەورەش چاکەی چاکەکارانی خۆش دەوێت.

لێبوردن دروستکاری بیناو ساختمانێکی بناغەو بنچینە جێگرو چەسپاوو پتەوی یەکگرتووە: وەدروست کارو دامەزراوی ڕەگ و ڕۆیشاڵی بەرزی هێزو پتەویە. وەبەرز کەرەوەی هێمای سەر بەرزی و ڕووسوورییە. وە جێگای تێرامان وسەر سوورمان نیەکەبڵێین نەهێشتنی تووڕەیی و ڕقخواردنەوە نیشانەی باوەڕ و بڕوایە، وەلێ بووردنیش میوەو بەرهەمی تێکۆشانە، وە لێبوردن و چاو پۆشی نوێنەر و

ڕابەری ئارامی و ئاشتیە. وەسەرکەوتن و یارمەتی گیان خۆهەڵ کێشانی گیانی بە هرەیەکی خۆڕسکیە لە شەخسیەتی ئینساندا، وە خۆشەویستیو هیوای تۆڵەکردنەوەی بەرامبەرت پەیامێکی ئارەزوانەوکەم ڕێزیوخواستی گیانو، دەرەنجامی خۆپەسندی کەسیوله خۆبایی بوونە. هەر لەبەر ئەو هۆیانەیە کە لەو کاتو ساتەماندا ئێمەی ئادەمیزاددەبینی ئەوکەسەی کەخەراپەو ناڕەوایی بەرامبەردەکریٚ، ئەگەر لە هێزو تینی خۆی ڕابدینیٚ دەیەوێت بەو هێزو تینە کە هەیەتی تۆڵە لەبەرامبەرەکەی بەهەر هۆیەکەوەبێت وەربگرێتەوە بە بیٚ ئەوەی هیچ بیر کردنەوەیەك لەدەرەنجامەکەی بکاتەوە چی ڕوودەدا ، یان ڕووناداو، هیچ گویٚ لە ئامۆژگاریو ڕەوشتو دین ناگرێت. ئەو هەڵوێستەی تۆڵەکردنەوەش بە لاوازیو بێهێزی و گرژیوهەڵقرچاوی بەئازارو ئێشەوەچاوەڕانی هەلێك دەکات کە بۆی بڕەخسێتو تۆڵەی لەکەسی بەرامبەری بکاتەوە بۆتێرکردنوبە جێهێنانی ئاوات و هیوا دڕندانەکەی کەئەوەش وەڵام دانەوەی بانگەوازوی شەیتانیە. و ەبەڕاستی خوداش زۆرباش دەزانیٚ ئەگەر کۆمەڵگا بەو جۆرەی کە دەبینین ژیان بەرێتە سەر ئەوە بنچینەی ئارامیوئاشتی دەهەژێتو تێك دەچیٚوبناغەویاسای کۆمەڵایەتی دێتەلەرزەو، ئەمن و ئاسایشوخۆشی نامێنیٚو ترسوسامودڵەڕاوکە زۆر دبێت و پەیوەندی خۆشەویستی نامێنیٚ و بەزینولەیەکترازان وتێشکان لەناو ڕیزی باوەڕداران دروست دەبیٚ.بۆیە خوداش لەوبارەوە دەفەرمویٚ: {خُذِ ٱلۡعَفۡوَ وَأۡمُرۡ بِٱلۡعُرۡفِ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡجَٰهِلِينَ }الاعراف/١٩٩ واتای ئەوئایەتەمان لەپێشەوەکرد وَأَن تَعۡفُوٓاْ أَقۡرَبُ لِلتَّقۡوَىٰۚ }البقرة/٢٣٧ بەو جۆرە خودای بەبەزەیی ئادەمیزادەکمان هان دەنیٚو غیرەتیان بۆدروست دەکات کە هەردەم لێبوردە و بە بەزەییبن و لەگەڵ گیانی شەڕەنگێزی بەرامبەری بکەنو ڕێگایله خۆبایی و گەورەزانینیان لێبگرن و لەوکارە خەراپو شەڕەنگێزانە دووریان بخەنەوەو لەو ڕێبازو ڕێگایانەی کەبۆی دروست کراوە بۆ بەختەوەریانو تەربیەتیان بدەن بۆ ئەوەی خودای گەورە گیانێکی لێبوردە و لێخۆش بوویان پێببەخشیٚوبەسۆزو بەزەیی خۆی بیان خاتە

بەهەشت. هەروەك و خودا دەفەرموێ: {وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ }ال عمران/١٣٣-١٣٤ واتە: پەلەو تاڵوکە بکەن هەتا دەگەنە لێخۆشبوونی پەروەردگارتان کە بەهەشتێکتان بۆ ئامادەکراوە کەپانایییەکەی ئاسمان و زەمینی گرتۆتەوە. بۆ تەقواکار و خۆپارێزان ئامادە کراوە.ئەوانەی کەلە خۆشی و ناخۆشی و لە هەبوونی و نەبوونی و لەهەرزانیو گرانیدا سەروەت‌وماڵ دەبەخشێ لە پێناوڕەزابوونی خودادا، وەرق‌وقینی خۆیان دەخۆنەوە و لێبوردە و لێخۆش بەرن بەرامبەر خەراپەی خەڵك، وەبەڕاستی خودا چاکەکارانی خۆش دەوەێت بەڕاستی ڕەوشت‌وئاکاری پێغەمبەروﷺ یارو هاوڕێکانی بەو جۆرە بوو. ئێمەش لەخودا دەخوازین کەیارمەتیو سەر فێرازمان بکات‌و بتوانین پەیڕەوی لەڕەوشت‌و ژیانی ئەوانداوەربگرین وبتوانین لەسەرڕێگاو ڕێبازی ئەواندا بڕۆین‌وپەیڕەوی لەکرداروڕەفتارو ڕەوشتی ئەواندا بکەین.

## لێیگەڕێ ئەوە بە پەشیمانییەوە بۆلامان هاتووە

## دعه، فإنه قد جاءنا تائبا

دەگێڕنەوە: کاتێ (بوجەیری کوڕی زوهەیرؓ)باوەڕی بە پێغەمبەرﷺ هێناو موسڵمان بوو. کەعبی برای زۆر توورەبوو.نامەیەکی بۆ نووسی و زۆری سەرزەنشت کرد لەسەر موسڵمان بوونەکەی: بوجەیر ڕۆیشتەلای پێغەمبەر و هەواڵی برایەکەی پێڕاگەیاند. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هەر کەسێ گەیشتە کەعب بیکوژێت. بوجەیریش نامەیەکی بۆکەعبی برای نوسیەوەوئەوهەواڵەی پێغەمبەری ﷺ پێڕاگەیاند، کە پێغەمبەرﷺخوێنەکەی بەخۆڕایی داوە بەهەر کەسێك بتکوژێ . ئینجا هەر کارێکت هەیە خێراوەرە بۆ لای پێغەمبەرﷺ، چونکە هەرکەسێ داوای پەشیمانی لێ بکات لێی دەبوورێ و داواکەی وەردەگریێو، هیچ پرسیارێکی لەکار و کرداری پێش موسڵمانبوونی لێناکرێ.لەدوای ئەوەی کە کەعب نامەکەی بەدەستگەیش. هەڵات‌و ڕۆیشت بۆناو گەل‌و هۆزەکەی بۆ ئەوەی داڵدەی بدەن‌و

بیشارنەوە: بەڵام کەسیان داڵدەیان نەدا ، بۆیە زۆر غەمبارو نائومێد بوو، بەزەیی زۆری بە خۆی داهاتەوەو، ترسی زۆری کەوتە دڵیەوە، هەستاو بەرەو مەدینە کەوتە ڕێگا، لەپێشەوە ڕۆیشتە لای حەزرەتی عەلی کوڕی ئەبی تالب‌ﷺ، ئەویش لەگەڵ خۆی بردی بۆ مزگەوت‌و، پێی گوت: ئەوە پێغەمبەرەﷺ هەستە بڕۆ بۆلای وداوای لێبوردن‌و سەلامەتی و، دڵنیایی لێبکەو، وەڵامەکەشت ببیستەوە.کەعب هەستاو ڕۆیشتە پێش، بۆبەردەمی پێغەمبەر ﷺدانیشت، دەستی لەناودەستی پێغەمبەرﷺ هاویشت‌و، گوتی: یارەسول الله ﷺ وا کەعبی کوڕی زوهەیر هاتۆتە لات‌وداوای لێبوردن‌وچاو پۆشیت لێدەکات‌و، گەڕاوەتەوەو موسڵمان بووە، ئایاتۆ، تۆبەو پەشیمانیەکەی لێوەردەگری، کەبچم لەگەڵ خۆم دابیهێنم بۆلات؟ پێغەمبەرﷺفەرمووی: بەڵێ لێی وەر دەگرم. ئینجا کەعب گوتی: بە خودامن کەعبی کوڕی زوهەیرم. پێغەمبەرﷺفەرمووی: ئەوەی کە فەرمووی؟ لەو کاتەدا پیاوێکی ئەنصاری لەوێداپشمی گوتی: ئەی پێغەمبەری خودالێم گەڕێ‌و فەرمانمپێبدە، ئەودووژمنی خودایە دەکوژم: پێغەمبەرﷺفەرمووی:نالێی گەڕێ چونکە ئەوە بە تۆ بەو پەشیمانیەوە گەڕاوەتەوە بۆلامان.لەدواییداکەعب دەستی کرد بەشعرو هەڵبەستە ناودارەکانی بە ناوی(بانت سعاد)کە زۆرمەدحی پێغەمبەری تێدا دەکات‌وپێی هەڵدەڵێت‌وباسی ترس‌وسامی پێغەمبەر دەکات و هەواڵی ترساندن بەدوو زمانان‌و بەدگومانی گەلەکەی بڵاودەکردەوە، هەتا ئەوەی گەیشتە ئەوەی کە گوتی: ﴿ إن الرسول لنور يستضاء به وصارم من سيوف الله مسلول.﴾

واتە: بەڕاستی پێغەمبەرﷺ نوورە و دونیای پێ ڕووناك دەبێتەوە شیری بڕن دەوتیژبووی خودایە. پێغەمبەرﷺ عەبایەکەی دانا و بەرە و لای کەعبی هەڵداو عەفوی کردو لێی خۆشبوو.

## لێبوردن لەکاتی دەسەڵات

## العفو عند المقدره

دەگێڕنەوە: جارێك سێ گەنجی نەوجەوان پیاوێکیان لەبەر دادگایی پێشەوا عومەرﷺ ڕاگرتبوو، داوایان دەکرد ئەو پیاوە باوکمانی کوشتوە.کابرادانی بە

تاوانەكەیدا هێنا كە بەڵێ ڕاستە كوشتومە:بەڵام پێویستم بەیارمەتی سێ ڕۆژ مۆڵەتە بۆ ئەوەی هێندێك ماڵی شاراوەم هەیە، كەس نازانێ لەكوێم شاردۆتەوە بڕۆم شوێنەكەی بە منداڵەكانم بڵێم‌و، پێیان ئاشنابكەم.بۆ ئەو مەبەستە (ئەبوزەری غەفاریؓ)ی بووبە كەفیل‌و، بارمتەی ئەوكابرایە، تادەڕواودەگەڕێتەوە، بەڵام لە دوای سێ ڕۆژەكە كابرا دیارنەبوو، بۆیە خەریك بوون تۆڵەی ئەوپیاوە لە ئەبوزەڕ بكەنەوە، كەبۆتە بارمتەی، ئینجالەكاتی ئامادەبوونی كوشتنی ئەبوزەڕ، ئەوپیاوە گەڕایەوەو ئامادەبوو:بە جل‌و بەرگێكی تۆزو خۆڵاوی‌و، هیلاك و ماندووبوونەوە. پێشەوا عومەرؓ پرسیاری لێكرد.چۆنی بوو لەوكاتە تۆ گەڕایەوە، كەدەت زانی دەت كوژین‌و، توانای ڕاكردنیشت هەبوو؟ كابرا گوتی: لەوەترسام بڵێن پیاوانی بردنەسەری پەیمان و بەڵێن نەماون. پێشەوا عومەرؓئەمجار، بە ئەبوزەڕی فەرموو:ئەتۆچۆن بویە كەفیل‌وبارمتەی ئەو پیاوە، لەكاتێكدا كەنەت دەناسی؟ ئەبووزەڕ ؓفەرمووی:دەترسام بڵێن: پیاوی خاوەن هیمەت‌و ڕێزو كەڕەم نەماون. لە دواییدا هەمووكوڕانی باوك كوژراوەكەش كابای بكوژیان بەخشی‌و عەفوویان كرد.گوتیان: بۆئەوەی دەیبەخشین هەتانەڵێن پیاوانی بەخشندە، لەكاتی تواناو دەسەڵاتیان نەماون.

## ئەوە بۆچی پێغەمبەرێكە؟

## لأی نبی هذا

دەگێڕنەوە: كۆمەڵێك لەلای پێغەمبەرﷺ دانیشتبوون. كاتێك چاومانكەوت پێغەمبەر ﷺ پێدەكەنی بەجۆرێك ددانەكانی بەدەركەوت. عومەری كوڕی خەتابؓ فەرمووی: دایكم وباوكم بە فیدات بێت بەچی پێكەنی؟ پێغەمبەرﷺفەرمووی: دوو پیاو لەبەر دەستی بەتو انای پەروەردگار لەسەرچۆكدانیشتن، یەكیان گوتی: ئەی پەروەردگار تۆڵەم بۆ لەو پیاوە وەربگرەوە ستەمی لێكردووم: خودای بەدەسەڵات و بەتوانابە زۆردارەكەی فەرموو:مافی ئەو پیاوەچی لەلاتە بیدەوە.كابرا گوتی:ئەی پەروەردگارم خۆمن هیچ چاكەم نەماوە چی بدەمەوە؟خودای بەبەزەی و میهرەبان بەكابرای داواكاری فەرموو: باشە چیدەكەی لەگەڵ ئەو برایەت، خۆ هیچ

چاکەیەکی نەماوەتا حەقەکەت بداتەوە؟ کابرا گوتی:ئەی پەروەردگارم بالەباتی حەقەکەم گوناهو تاوانە کانم هەڵبگریْ. لەوکاتەدا پێغەمبەرﷺ وازی لە پێکەنین هێناو، دەستی کرد بە گریانوچاوەکانی پڕ لە فرمێسك بوون.دوایی فەرمووی: ئەو داواو فەرمانانە بۆ ڕۆژێکی زۆرگەورەومەزنە.کە هەموو تاوان بارێك ناچارە گوناهو تاوانی ستەم لێکراوەکانی بۆخۆی هەڵبگریْ. ئینجا لەدوای ئەو کێبەرکێیە: خوداداوای لە داواکارەکە کردکە ئێستا سەرهەڵبڕە بۆ ئاسمانو تەماشا بکەبزانە چیدەبینی.کابراسەری بەرزدەکاتەوە، سەرسام دەبێت. دەڵێ ئەی پەروەردگارم ئەوە چییە من دەیبینم، شارو تەلار و باڵەخانەی وام چاو پێکەوتووە، خشتەکانو بیناسازیەکەی لە زێڕو لەزیودروست کراوە ئەوە بۆچی پێغەمبەرێکت دروستکردووە. یان بۆچی پیاوچاكوشەهیدێکت ئامادەکردووە؟خودای بەبەزەیی دەفەرمویْ: ئەوە بۆ ئەو کەسانەیە کە مافوحەقیان بدات.کابرا گوتی: خودای بەتەوانا کێ بێ بتوانێ حەقومافی ئەو قەسر و باڵەخانانە بدات؟ خودا فەرمووی: زۆر ئاسانە و تۆش دەتوانی مافیان بدەی.کابرا بەسەر سامیەوە گوتی: خودایە چۆن دەتوانم نرخو مافی ئەوقەسرانە بدەموبەچی؟ خودافەرمووی: بەتەنها لێ بووردنت لەوهاوەڵو ڕەفیقەت. خودائەوباڵەخانو قەسرانەت پێدەبەخشیْ.ئەویش دەڵێ خودایە ئەوە بەڕاستی لێی خۆش بووم.ئینجا پێغەمبەری ﷺ خودا فەرمووی: ئەی ئادە میزادەکان لەخودا بترسێنو، کرداری باشە بکەن لەنێوانی خۆتاندا لێبوردە وئاشتی خوازو میهرەبان بن چونکە بەڕاستی خودا ئاشتی و ئاشتەوایی لە نێوانی باوەڕداراندا دەکات.

## جوانی و ڕازاوەیی لێبوردەیی

## محاسن العفو

دەگێڕنەوە (مەسعەبی کوڕی زوبەیرﷺ)پیاوێکی لە هاوڕێیانی موختاری کوڕی ئەبا عبیدە گرت و فەرمانیدا لە ملی بدەنو بیکوژن: کابرا گوتی:ئەی پێشەوابەڕاستی کارێکی زۆردزێوو ناشیرینە لە ڕۆژی دوایی کەخۆم بەو باڵا جوانەتەوە بهاڵێنم و بڵێم ئەی خودای بەرزوبەتەواناپرسیارلەموصعەب بکە

لەبەرچی منی كوشت؟پێشەوا (مەسعەب)فەرمانی دەركرد بەری بدەن كابرا گوتی: ئەی پێشەوامادام تۆژیانت پێبە خشیمە وە بەڵام، وابكە ژیانێكی خۆشیم هەبێت.پێشەواش فەرمووی(١٠٠٠٠٠) صدهەزار درهەمی بدەنێ. ئینجا كابرا گوتی: دایكم و باوكم بەفیدات بێت، بەڕاستی شاهیدی دەدەم كە نیوەی ئەو بەخشیشە بۆكوڕی قەیس بێت.ئینجائەوپارچە هەڵبەستەی گوت:

إنما مصعب شهاب من. اللهتجلت عن وجهه الظلماء.

واتە: بەڕاستی موسعەب ئەستێرەی كڵپەدار و درەوشاوەیە ئەو گەورایەتی وریزەی لە خوداوەیە كەتاریكیو شەوەزەنگی پێلاچوو.ئینجا مەصعەب‌ﷺ دەستی كردبە پێكە نینو گوتی:بەڕاستی تۆ بەزەییت پێداهاتەوە و تۆ دەستی پیاوەتی و یارمەتیت تێدایە. بۆیە پێشەوا فەرمانیدا(١٠٠٠٠٠)صەد هەزار درهەمەكەی بداتێ بەبێ نوقسانیو (٥٠٠٠٠) پەنجا هەزاردرهەمیش بدات بە كوڕی قەیس.

## ئەوانەی ڕقو تووڕەیی خۆیان دەخۆنەوە
## والكاظمين الغيظ

هەر لەو ڕووداوانەیە كە دەگێڕنەوە هاڕونە ڕەشیدﷺفەرمانی بە بەندەیەك كرد ئاوی بۆ بهێنێ دەزنوێژێك هەڵدەگرێ ئەوپێش خزمەتەش بەخێرایی ڕاپەڕی و ڕۆیشتو هاتەوەو قاپەكەی لەدەستی بەربۆوەو شكا پێشەوا لەو كارە تووڕەبوو ویستی لێی بداتو تۆڵەی لێبستێنێ: بەندەكە گوتی ئەی پێشەوا لێم ببوورە.هەر وەكو خودا دەفەرموێ: {والكاظميت الغيظ} هاڕوون گوتی:ئەوا توڕەبوونەكەم خواردەوە كابرا گوتی: {والعافين عن الناس}پێشەوا گوتی: ئەوا بەخشیمی. كابرا گوتی{والله يحب المحسنين} پێشەوا گوتی : ئەوا لەبەر خودا عەفو ئازادم كردی.

# ئەوە سەر بەستوئازادە لەبەر ڕەزای خودا

# هو حر لوجه الله

دەگێڕنەوە:جارێك (ئەبومەسعودی بەدری)چەند قامچیەكی لە بەندەكەی خۆی دەدات: ئەو لێدانە كاریگەریەكی زۆری دەبێت لەسەر ئەو بەندەیەو، زۆر هاواری دەكردو لە خەڵك دەپاڕایەوە كە بەهاواریەوە بێن بەڵام كەس بەهاواریەوە نەدەهات، هەتا لێی دەدا ئێشی زۆر تر پێدەگەیشتو، هاواری زۆرتردەكرد.هەتا وەختێك گوێی لەدەنگێك بوو لەدوورەوە هاواری دەكردو، دەیفەرموو:ئەی ئەبوو مەسعود ئاگاداربە؟ ئەبو مەسعود گوێی لە دەنگەكە بوو، بەڵام لەبەرتوڕەیی وقینی خۆی نەی دەزانی ئەو دەنگە لە كوێوە یەوبۆكێیە!! تەنها ئەوەی دەزانی كە جار بەجار دەنگەكە نزیكتردەبۆوە.كاتێ بەتەواوی هەستی نزیك بوونەوەی دەنگەكەی كرد.ئەبو مەسعود ئاوڕێكی دایەوە ڕاچەنی وسەیری كرد پێغەمبەری خودایە ، ترس و سامێكی زۆری كەوتەدڵیەوەو قەمچیەكەی لەدەستی كەوتە خوارو، بۆ خۆشی بە پێوە ڕاوەستابوو، زۆر بە شەر مەزاریەوە سەری نەوی كردبوو. پێغەمبەرفەرمووی: ئەی ئەبو مەسعود: ئاگاداربەو بزانە خودای بەدەسەڵات زۆر بە توانا ترو بەهێزترە لەتۆ. ئینجا كەتۆ دەسەڵاتی خۆت بەسەر ئەو بەندەیەدا دەنوێنی: ئاگاداربە خوداش دەسەڵاتی لەسەر تۆ دەنوێنێ. ئەبو مەسعود زۆربە شەرمەوە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا واڵە كەفارەتی تاوانی ئەوزۆرداریەم ئەوائەوبەندەیەم لەپێناوی خودا ئازاد كرد.پێغەمبەر فەرمووی: بە ڕاستی ئەبو مەسعود ئەگەر ئەوەت نەكردبایە، خودابە ئاگر دەیسوتاندی.

# دانی پێدا دەهێنم ئەوانە هەموویان ئازادن

# أشهد أنهم كلهم أحرار

دەگێڕنەوە: كابرایەك هاتە خزمەتی پێغەمبەرو، لەبەدەمیدا دانیشت و گوتی : ئەی پێغەمبەری خودا من دووبەندەم هەیە: بەڵام درۆو، ناپاكیو، نافەرمانیم لەگەڵدا دەكەن، منیش جنێوو، قسەیان پێدەڵێمو، جار بەجار لێشیان دەدەم:

لەسەر ئەوكارانەی كە ئەوان دەیكەن، ئایا ئەو كارانەی كەمن لەگەڵیاندا دەكەم چۆنە؟ پێغەمبەریش ﷺ لە وەڵامیدا فەرمووی: لە ڕۆژی دوایی: لێپرسینەوەو حسابی هەموو ئەو ناپاكی و درۆكردن‌و نافەرما نانیەی تۆیان لێدەكرێ‌و، سزاوئازاری تۆش بۆئەوان، ئەگەر بەگوێرەی تاوانەكانی ئەوان بوو. ئەوە هیچ لەسەر تۆش‌و ئەوانیش نیە، چونكە تۆڵەت لێ كردوونەوە. بەلآم ئەگەر سزایەكەی تۆ بۆئەوان زیاتربوو، ئەوە تۆڵەی ئەوسزایەت لێدەكرێتەوە بە ئەندازەی زیادە سزایەكەی لەگەڵتدا كردوون؟ ئینجائەوكابرایە لەوكاتەدا پشتی چەمایەوەو، كەوت و هاواری دەكرد و دەگریا، پێغەمبەر ﷺ بەكابرای فەرموو: ئەی برا ئەو ئایەتەت نەخوێندۆتەوە كە خودا دەفەرموێ: {وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ۖ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا ۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَـٰسِبِينَ}الانبیاء/٤٧

واتە: بەڕاستی ئێمە لە ڕۆژی دوایی تەرازووی عەدالەت‌و داد پەروەری دادەنێین هیچ كەسێك زوڵم‌و ستەمەی لێناكرێت‌و كەمترین‌و وردیلە (زەڕە) لەچاكەو خەراپە كە ئەنجامی دابێت بۆی ئامادە دەكرێ‌و دەیهێنینەوە مەیدان، ئینجا ئەوەندە بەسە بۆ ئێمە كەبەو جۆرە لە ئینسانەكان دەپرسینەوە. ئینجا كابرا گوتی:ئەی پێغەمبەری ﷺ خودا هەر چەند سەیر دەكەم هیچ شتێك نەوناوەدا لەجودا بوونەومان بە باشتر نابینم بۆیە بەشاهید بن، ئەوانە هەموویان لەپێناوی ڕەزای خودا ئازادن.

## عبداللەی كوڕی مەسعودو لێبوردەیی

## عبدالله بن مسعود و عفوه

دەگێڕنەوە: ڕۆژێك (عبدالله ی كوڕی مەسعود ﷺ)بۆ كڕینی هێندێك كاری پێویستی ماڵەوەیان ڕۆیشتە بازار:بەلآم ئەو چەند درهەم و پارەی كە پێی بوولێیان دزی.خەڵك‌و جەماوەرێكی زۆردەستیان كرد بە گەڕان‌و، پرسیار كردن بۆ دۆزینەوەی دزەكە. بەلآم (عبداللەی كوڕی مەسعود ﷺ)ڕێگەی لێگرتن‌و، داوای لێكردن كەواز لەدزەكە بهێنن‌و ، لێی گەڕێن. ئینجا دەستی بەرزكردەوە بۆ ئاسمان و فەرمووی: ئەی پەروەردگارم تۆ زۆر باش دەزانی ئەوانەی كە پارەكەیان

لێدزیوم، ئەگەر لەبەر پێویستیان بێت‌و نەداربن. خودایە بەرەكەتیان بۆ تێبخەی: وە خودایە هەروەك و بۆ خۆشتدەزانی ئەگەر ئەو كەسە هەر بەو كارەدزیە ڕاهاتووە و كردوویەتیە پیشەی هەمیشەیی:خودایە بیكەیە ئاخری كۆتایی دزی‌و تاوانكاری لەژیانیدا.

## خودابۆخۆی چاكتردەزانیٚ چۆن بەرنامەكەی بلاٚودەكاتەوە

## اللهٌ اعلم حيث يجعل رسالته

دەگێڕنەوە (عومەری كوڕی خەتابﷺ)پرسیاری لە كابرایەك كرد: تۆڕە و شتت چۆنە؟ كابرا لەوەلاٚمدا گوتی:بەخودا من زۆرحەزو ئارەزوم لە شەڕ و ئاژاوەیەو، ڕقم لەحەق‌و ڕاستیەو، شاهیدی بەناڕەوا دەدەم بەبیٚ ئەوەی ئاگام لە هیچ بێت‌و دیبێتم. عومەر ﷺفەرمانیدا بیبەن بەندی بكەن. لەدواییدا پێشەوا عەلی كوڕی ئەبو تالیب ﷺ فەرمووی: ئەی عومەر ئەوكابرایە قسەكانی زۆر ڕاستە بۆ بەندی دەكەی! بیگێڕەوە با نەڕواتە بەندیخانە. پێشەوا عومەریشﷺ فەرمووی: عەلی چۆن ڕاست دەكات؟ عەلیﷺ فەرمووی: ئەو كابرایە ماڵ‌و سامانی دونیاو، منداڵ‌و نەوەی زۆرخۆش دەوێت. هەروەك‌و خوداش لەوبارەوە دەفەرمویٚ:{وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَأَوْلَٰدُكُمْ فِتْنَةٌ وَأَنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥٓ أَجْرٌ عَظِيمٌ }الانفال/٢٨واتە: زۆرباش بزانن ئادەمیزادەكان كەبەڕاستی ماڵ‌و سامان‌و منداڵتان بۆ تاقیكردنەوەیە كارێكی وابكەن بتوانن لەوتاقی كردنەوە دەربچن وەخودای گەورەش جەزاو پاداشتی زۆری لەلایە بۆ ئەوانەی كە نایەڵن ماڵ‌و سامانیان ببێتە كۆسپ لە ڕێگای خەبات‌و تێكۆشانیان. وەڕقی لە مردن دەبێتەوە كە بەڕاستی حەق‌و تەواوە، وەشاهیدیش دەدا كە محمد پێغەمبەرو نێردراوی خودایە: بەلاٚم پێغەمبەریشی نەدیووە.ئینجا عومەر ﷺفەرمانیدا ئەوكابرایە بەربدەن‌وداوای لێبوردنیشی لێكردو، فەرمووی:بەڕاستی خودا دەزانیٚ چۆن بەرنامەكەی بلاٚودەكاتەوە.

# تۆبەندەو پێغەمبەری خودای

# أنت مولى الله ورسوله

بەندەیەکی جەوان هاتە خزمەت پێغەمبەروﷺ، ناڕەزایی زۆری دەربڕی لەدەستی گەورەو لێپرسراوەکەی، لەبەرئەوەی لێی دەداوئازاری پێدەگەیەنیٚو، ئێستاش ئەوە تە کەپومی بریندارکردووە. لەدوای ئەوە گەورە و لێپرسراوەکەی داواکرا، ئەویش بە بەڵگەوە ڕوونی کردەوە، کە ئەو بەندەیە گوناه و تاوانی کردوە، بۆیە منیش لێم داوەو تۆڵەم لێستاندوەتە وە. پێغەمبەریشﷺ ڕووی کردە بەندەکەو فەرمووی: بڕۆ تۆ ئازادی.! ئەوبەندەیە کەوتە واقیعێکی سەرگەردانی و سەرسامی. ئینجا گوتی: ئەی پێغەمبەریﷺ خودا کیٚ سەردارو گەورەی منە؟ پێغەمبەریشﷺ فەرمووی:خودا و پێغەمبەری خوداﷺ. بەوجۆرە پێغەمبەر ی خوداﷺسەرپەرشتیاری ئەوبەندەی دەکرد هەتا لە ژیاندا مابوو.لە دوای پێغەمبەریش ﷺ سەرپەرشتیاری ئەبوبکرﷺبوو، لەدوای ئەویش عومەری کوڕی خەتاب ﷺ.

# بەزەیی و میهرەبانی

# الرحمة

{لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ }التوبة/١٢٨ واتە:بەڕاستی ئەی ئادەمیزادەکان ئێوە پێغەمبەرێکتان ﷺبۆ ڕەوانە کراوە کەیەکێکە لە خۆتان هەرگیز حەز ناکات توشی هیچ شتێك ببن وە زۆر بە پەرۆشو خەمتانەوە یەو حەزناکات توشی هیچ ناخۆشیەك ببن وە بۆ باوەڕدارانیش زۆر دڵسۆزو میهرەبانە. {وَمَآ أَرْسَلْنَـٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَـٰلَمِينَ }الانبیاء/١٠٧ واتە: ئێمە پێغەمبەرمانﷺ ڕەوانە نەکردووە تەنها بە میهرەبانی و دڵسۆزی بۆ هەموو ئادەمیزادوو بوونەوەر.

وە لەڕەوانبێژی و، بەزەیی و نەرمو نیانی قورئاندایە کە هەموو سوڕەتێکی قورئان بە(بسم الله الرحمن الرحیم) دەست پێدەکات تەنها سوڕەتی تەوبە نەبێت. خودای گەورە دووناوی زۆر پیرۆز و گەورەی لەناوە جوانەکانی خۆی هەڵبژاردووەو، کردویەتیە یەکەم نیشانە و هێمای پەیوەندی لەگەڵ بەندەکانیدابۆڕێزو گەورەیی و

بەخشیش بەرامبەریان کە ئەوەش وەك و هێمایەکی بەزەیی و میهرەبانی کە هەموو بوونەوەرێکی گرتۆتەوە و هیچ شتێکی لێبێبەش نەکردووە. هەروەك و علم و زانیاری وزانستی هەموو دوونیاو بوو نەوەری دەورەداوە و تەنانەت ووردیلەو زەڕەشی گرتۆتەوە. هەر لەبەر ئەوەشە کە لەدوعاو نزای فریشتەکانی هەڵگری تەختی خوداوەدورو بەریدا هاتووەکە دەفەرموون:﴿ ربنا وسعت كل شيء رحمة وعلما فاغفر للذين تابوا واتبعوا سبيلك وقهم عذاب الجحيم﴾ واتە: ئەی پەروەردگارم بەزەیی وسۆزو زانست و زانیاری تۆ هەموو دونیاو بوونەوەری گرتۆتەوە خودایە لەو کەسانە ببوورە کە تۆبە دەکەن و دەگەڕێنەوە بۆ لای سۆزو بەزەیی خۆت و بەشوێنی ڕێباز و بەرنامەکەتدا دەڕۆن. وەلە ئازاروسزای ئاگری دۆزەخ بیان پارێزە.بەزەیی و میهرەبانی ڕەها، نیشانەی تەواوی ڕەهایە، بە ئەندازەی بەش وتەواناى ئادەمیزاد، ئینجابەڕاستی پێغەمبەرانؑ بە سۆزترین و میهرەبان ترین ئادەمیزادن. وە پێغەمبەرمانﷺ کە دوایینی پێغەمبەرانە گەورەترین بەشی لەڕەوشتی بەرزی پێدراوە وەك و خودا لەبارەیەوە دەفەرمویّ:{لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ}التوبة/١٢٨ واتای ئەوئایەتەمان لە پێشەوەکرد. وە هیچ گومانی تێدا نیە ئەگەر ئەو سۆز و بەزەیی و دڵ نەرمی و لەسەرەخۆیی و ڕوناك و فراوانیەی پێغەمبەری خودا ﷺنەبوایە ئەو هەموو شوێنکەوتوانەی لە دوور و نزیك لە دەورەی کۆنە دەبوونەوە.وەك و خودا دەفەرموێ: {فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ }العمران/١٥٩واتە: بەهۆی ئەو بەزەیی و میهرەبانی و دڵ نەرمی خۆت بوو کە ئەو خەڵکەت لەدەورە کۆدەبۆوە، ئەگەر دڵ ڕەق و توڕەوبیّ بەزەیی بوایەی ئەوخەڵکە دەورەیان چۆڵدەکردی و بەلاتەوە نەدەمانەوە.

جێگەی سەرسوڕمان نیەکە ڕەوانەکردنی پێغەمبەری خوداﷺبەزەیی و سۆزە بۆ تەواوی بوونەوەر.هەر لەبەر ئەوەیەکە ئاینی سەربەرزی ئیسلام خۆشەویستی و پێکەوەژیانی بەزەیی وسۆزی تەواوی بەرامبەر ئادەمیزادەکان کردۆتە ڕەمزو نیشانەی ڕاستی ئیمان و باوەڕی ئینسان.ئادەمیزادی موسڵمان ڕێزو

خۆشەویستی تەواوی بۆ هەمووبەرەی ئادەمیزاد هەیەو بەسۆزو دڵسۆزە بۆیان و هەردەم هەوڵدەدا بۆ كەمكردنەوەی ئازارو ناخۆشیەكانیان. هەروەك‌و پێغەمبەرﷺ دەفەرمویٚ:﴿ لن تۆمنوا حتى ترحموا. قالوا يارسول الله كلنا رحيم قال:إنهاليست رحمه أحدكم صاحبه ولكنها رحمه عامه﴾ لە پێشودا كەسانێك هەبوو بەزەییو سۆزیان بۆ كەسی نزیك‌و خزمی خۆیان هەبوو: وە بەدەگمەنیش هێندێك جارلەگەڵ كەسانی دۆست‌وناسیاویان ئەو خۆشەویستیە یان دردەبڕی، بەڵام هەرگیز ئەو خۆشەویستیە پەیوەندی بەخەڵكانی نامۆو ئاوارەوە نەبوو، وە بەرامبەریان بەژیانێكی تاڵ‌و ناخۆش و دوور لە پەیوەندی خۆشەویستی دەبردە سەر.وەك‌و ئەوەی كەهیچ پێویستیەكان لەگەڵ یەكدا نیە بەڵام كە ئیسلام هات هەمووئەوشتەلاوەكیانەی بەلاوەناو فەرمانیدا كە پێویستە ئینسان نەرم‌و نیان‌و ڕوخۆش‌و بە بەزەیی و سۆزداربیٚ بەرامبەری خزم و دۆست‌و ناسیارونەناسیاودا. لە خزمەتی هەمووكەسێك دابیٚ‌وهەچی هانای بۆبهات بەدەنگیەوە بڕوات، هەروەك‌و پێغەمبەرﷺ دەفەرمویٚ:﴿ من لايرحم الناس لايرحمه الله﴾ لە ژیاندا دەبینی زۆرجارئینسان پێویستی بە سۆز و خۆشەویستی یارمەتی تەواوی هەیە لە كەسانی ترەوە، وەك‌و هەتیو بێوەژن و منداڵ. وەلە بنەچەو بنەوانی پێویستی هەڵوێستی ئینسانە ڕەفتاروسۆزی لەگەڵ ئەوانەی كەخزمەتی دەكەن‌و لە گەڵیاندا دەژیەن ڕێزیان لێبگرن. وە تەنانەت دینی سەربەرزی ئیسلام پێویستی كردووە كە دەبێت لەگەڵ ئاژەڵ‌و گیاندارانیش بەزەیی و سۆز و خۆشەویستی بەكار بهێنیٚ، هەروەك‌و لەوبارەوە پێغەمبەر دەفەرمویٚ: ﴿ دخلت إمرأة النارفى هرة ربطتها فلم تطعمها ولم تدعها تأكل من خشاش الارض﴾ لەخودای گەورەداوادەكەم كەبەزەیی سۆزی تەواومان بەسەر دابڕژێنیٚ. وەبمان كاتە باشترین شوێن كەوتەی پێغەمبەریﷺ بەسۆزو بەزەیی. وە ئێستاش كەمێك لە چیرۆك و بەسەرهاتی بەزەیی و سۆز كە لە دەوروكاتی پێغەمبەروﷺ یارەكانی ڕوویداوە. ئومێدە واریشم كە بۆ ئێمەش ببێتە پەندو ئامۆژگاری.

## میهرەبانی پێغەمبەری خودا بەرامبەر بە ئاژەڵان

## رحمة الرسول بالبهائم

جارێکیان پێغەمبەری خوداﷺ ڕۆیشتە ناو باغی ماڵە ئەنساریەك، حوشترێکی لێبوو: کەچاوی بە پێغەمبەرﷺکەوت هار و هاژبوو. ڕووی لە پێغەمبەرﷺ کردوو چاوەکانی فرمێسکیان لێدەباری: پێغەمبەرﷺ بەلایەوە ڕۆیشتو فرمێسکەکانی بۆسڕی. حوشترەکە بێدەنگ بوو، پێغەمبەر ﷺپرسیاری خاوەنەکەی کرد: کە گەنجێکی ئەنساری بوو. پێغەمبەر ﷺفەرمووی: بۆلە خودا ناترسیو، بەزەییت بەو ئاژەڵەدا نایەتەوە. کە خودا تۆی کردووە بەخاوەنی ئەوئاژەڵە، هاتۆتەلاموسکالای ئەوەدەکات کەتۆ برسیو تسنو هیلاکی دەکەی.

## میهرەبانی پێغەمبەر بۆ هاوسەرەکانی

## رحمة الرسول بأزواجه

پێغەمبەری خوداﷺ بە شێوەیەکی زۆر جوان پارێزگاری لە هەست و سۆزی بەڕێز (سەفیەی کچی حەی کوڕی ئەختەب)ی هاوسەری دەگرت: کە لە هۆزی یەهودی جولەکەی بەنی نەزیر بوو. جارێك کێشەیەك لە نێوانی صەفییە و هەردوو هاوسەری بەڕێزی پێغەمبەردا، ﷺ حەزرەتی عائیشە و ، حەفصە ڕویدا. عائیشە بە صفیەی گوت ئێمە لەلای پێغەمبەرﷺ لە تۆ بەڕێزترین. صەفیەش ئەو قسەیەی بە پێغەمبەرﷺ ڕاگەیاند: پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو: بۆچی تۆ پێت نەگوتن چۆن ئێوە لە من بەڕێز ترن. کە هاوسەرەکەم پێغەمبەری ﷺ خودایەو، باوکم هارونەو ، مامیشم موسایە. هەروەكو دەگێڕنەوە لەبەر بەزەیی هاتنەوەی بە صفیە دوومانگ لەسەریەك لە زەینەبەی دایکی موسڵمانان دووركەوتەوە بۆ سزادان و تەربیەتی زەینەبەی، کە تەنها لەسەر ئەوەی جارێك بە صفیەی گوتبووجولەکە.

# بەڕاستی لاشەت مافیان بەسەرتەوە هەیە

# ان لجسمك عليك حقا

دەگێڕنەوە ڕۆژێك پێغەمبەریﷺ خودا لە دانیشتنێكی لای عائیشەدا سەیری كرد ئافرەتێكی لە لادانیشتوە بەرگێكی شڕۆڵ و دڕاوی لەبەردایەو، لە ڕوخساری جوان و شیرینیدا، دڵ تەنگی و بێزاری پێوە دیاربوو. دیمەنێكی زۆر دزێو و ناشیرین. بۆیە پرسیاری ئەو دڵتەنگی و ناهەمواریيەی لێدەكەن، بۆ ئەوەی ڕاستی مەبەست و ڕووداوەكە بزانن. كە ئەوئافرەتە واتازە لە تەمەنی ژیانی خۆشی و خۆش گوزەرانی و ئاسودەییدایەو بەو جۆرە نائومێدیە بەدیار دەكەوێ. ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ: بەڕێزان من هاوسەرەكەم (عبداللەی كوڕی عەمری كوڕی عاصﷺ)ە بەردەوام بە ڕۆژ بەڕۆژووە و، شەوانەش هەر خەریكی شەونوێژە و، ژیانی بەردەوامی لە عیبادەت و خودا پەرستیدا بەسەردەبات و ، ئاگای لە هیچ شتێكی تر نییە. ئینجا كاتێ پێغەمبەرگەیشتە لای عبدالله ئامۆژگاری تەواوی كردوو، پێی فەرموو:ئەی عبدالله وا هەواڵم پێگەیشتووە كە تۆ بەردەوام بە ڕۆژ بەڕۆژووی و، بەشەویش هەر خەریكی شەونوێژی ! نابێت بەوجۆرە ڕەفتارت هەبێت چونكە گیان و ئەندامەكانی لەشت مافیان بەسەر تەوە هەیە، چاوەكانت مافیان بەسەر تەوە هەیە، وە هاوسەرەكەشت مافی بەسەرتەوە یە، ڕۆژو بگرە و بیشی شكێنە. ئینجا ئەو ئافرەتە لە دوای ئەو ئامۆژگاریانەی پێغەمبەرﷺ بۆ هاوسەرەكەی، كەمتەرخەمی نەدەكرد بۆ هاتنی بۆلای حەزرەتی عائیشە بەڵام، بەشێوەیەكی جیاواز لە جارانی پێشوو، ئەمجارە بەڕووخسارێكی ڕووناك و گەشاوەو بۆن خۆشو، جوانو، ڕازاوەو، لەنجەولارو، دڵ ئاسودە بەئاینی چاوپۆشی و لێبوردەیی و زیاتر پەیوەندبوون بە ئاینەوە.

# باوكێكم دیت باشتر لە باوکی خۆم

# لقد رأيت أبا خيرامن أبي

ڕۆژێك لە ڕۆژەکانی جەژنی پیرۆزی ڕەمەزان پێغەمبەری خودا ﷺ بە شوێنێك دا ڕۆیشت منداڵان یاریان دەکرد و زۆریش دڵخۆش و شادمان بوون: لەوکاتەدا چاوی بە منداڵێك کەوت لە گۆشەو کەنارێکی دوور لە منداڵەکان بە تۆزاویو خۆڵاوی دەگریا، پێغەمبەرﷺ ڕۆیشتەلای و پێیفەرموو: ئەی جەوان بۆچی دەگریەی؟ منداڵەکە هعاتە وەڵام و گوتی: ئەی مامە لە من گەڕێ بابەدەردی خۆمەوە بناڵێنم: من منداڵێکم باوکم لەگەڵ پێغەمبەری ﷺ خودا لە جەنگێکدا شەهید کرا. بۆیە لەم ڕۆژی جەژن و خۆشیەدا من باوکم نەماوە وەك و ئەومنداڵانە خۆشی و شادیم بخاتە دڵەوە و شادمانم بکات. پێغەمبەر ﷺ بە بەزەیی وسۆزەوە بە منداڵەکەی فەرموو:پێت خۆشە من پێغەمبەری ﷺ خودا ببمە باوکتو، فاتمە خوشکت بێتو، عائیشەش دایکت بێت؟ منداڵەکە گوتی: بم بەخشە ئەی پێغەمبەری ﷺ خودا. ئینجا پێغەمبەرﷺ دەستی ئەو منداڵەی گرت و، بەرەو ماڵەوەی هێنایەوە، خواردنیان دایە و تێریان کرد و، جل و بەرگێکی جەژنانەیان لەبەرکردوو، پارەی جەژنانەی منداڵ نەیان دایەو، پێغەمبەرﷺ زۆر بە میهرەبانیەوە فەرمووی: کوڕم ئێستا برۆ لەگەڵ براو هاوڕێ منداڵەکانت یاری بکە. کاتێ منداڵەکانی دەورو بەری سەیریان کرد. ئەو منداڵە بەشێوەیەکی جوان و گەش و، بەرگێکی نوێی ڕازاوە هاتۆتەوە ناویان، گوتیان: توخودا پێمان بڵێ ، بەچی وادڵت خۆشەو، ئەو بەرگەجوانە نوێیەت لەکوێ هێناوە، خۆ ئەتۆ تۆزێك پێشی ئێستا لەناو خۆڵ و خاکدا دەگریای. منداڵەکە گوتی:پێشی ئێستا باوکم نەما بوو بەڵام، ئێستا باوکێکی باشترم لە باوکی خۆم و، دایکێکی باشتر لە دایکی خۆمم دیتەوە.؟

# ئەتۆمان تەنها بەسۆز و میهرەبانی بۆ هەموو عالەم ڕەوانەکردووە
# وما أرسلناك إلا رحمة للعالمين

پێغەمبەری خوداﷺ چەندین ئازاری جۆراو جۆری لە هۆزو گەلەکەی پێگەیشت: ئەگەر پێغەمبەرﷺ لە خودای داوا بکردبایە هەموویانی لەناودەبرد. وە چەندین جاریش هەل و دەرفەتی بۆ ڕێکەوتوە بەڵام ، ئەوکارەی نەکردووە بۆئەوەی ببێتە پێشڕەوی ئەوانەی دوای خۆی و، پەیڕەو لە ئەوبکەن. وە بە پێچەوانەشەوە لە بەرامبەری خەراپەی ئەوان پاداشت و چاکەی لەگەڵیاندا دەکرد و. بەرامبەری سزایان چاو پۆشی لێدەکردن. هەروەك و لەوبارەوە حەزرەتی عائیشە دەفەرموێ: بە پێغەمبەرم ﷺگوت: ئەی پێغەمبەری ﷺ خودا هیچ ڕۆژێکی ناخۆشت وەك و ڕۆژی (ئوحود) بەسەر هاتووە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی عائیشە بەڕاستی ئەوەندەم ئازار و ناخۆشی لە هۆز و گەلەکەم پێگەیشتووە، ناخۆش ترینیان کە توشم هاتووە لە ڕۆژی عەقەبە بوو: کە چومەلای (لیل کوری عبدکلال)و باسی پێغەمبەرایەتیﷺ خۆمم بۆکرد. هیچ وەڵامی وای نەدامەوە کە بۆخۆم دەمویست. دوایی بە غەم و پەژارەیەکمی زۆرەوە کە بەتەواوی لە ڕووخسارمدا بەدی دەکرا بەڕێگەدا دەڕۆیشتم هیچ ئاگام لە خۆم نەبوو، کاتێ سەرم هەڵبڕی و بەئاگا هاتمەوەهەستم کرد، وا گەیشتومەتە نزیك(سەعالیب)و لە پانتایەکی زۆرفراوان دابووم. سێبەرێکم بەسەر داهات کە سەرم هەڵ بڕی حەزرەتی جبرائیل بوو بانگی لێکردم و فەرمووی: بەڕاستی ئەی محمد ﷺ خودای بە بەزەیی گوێی لە گوتەی گەلەکەت بوو کە چۆن بەرە و ڕووت بوونەوە. ئێستاش خودای بە بەزەیی فریشتەی فەرمان ڕەوای کێوەکانی بۆ ناردووی هەر فەرمانێکیان پێ بکەی ئامادەن. ئینجا فریشتەی کێوەکان بانگکی لێکردم و فەرمووی: ئەی محمد ﷺ هەر فەرمانێك بە ئێمە دەسپێری ئامادەین بۆ بە جێ هێنانی؟ ئەگەر حەز دەکەی ئەو دوو کێوە بەسەر ئەو خەڵکەدا لە یەك دەدەین و وێران و لە ناویان دەبەین. پێغەمبەر ﷺ لە وەڵامدا فەرمووی: نا من هیوادارم لە خودای میهرەبان کە لە نەوەی ئەوەانەگەل و هۆزێك بێنە کایەوە کە بە تەنها خودا بپەرستن و شەریك و هاوەڵی بۆ بریار نەدەن.

# ئەوە چیدەڵێی ئەی عومەر
# و ما یدریك یاعمر؟

کاتێ بە کۆی دەنگی موسڵمانان بڕیاریان دابەرەو ئازاد کردنی مەکە بکەونە ڕێگا:( حاتبی کوڕی ئەبی بەلتەعە) نامەیەکی بە نهێنی نوسی بۆ قوڕەیشیەکانی مەککە، هەواڵی نهێنی کۆبونەوەی پێغەمبەرو موسڵمانانی تێدانوسیبوو. دوایی نامەکەی دایە دەستی ئافرەتێك و، ئەویش لە ناو زولفوکەزیەکانیدا شاردیەوە و، بەرە و مەککە بەڕێکەوت. خودای گەورە ئەو هەواڵەی بە پێغەمبەری ﷺ خودای ڕاگەیاند و ئاگاداری کردەوە. پێغەمبەری خوداﷺ بەدوای عەلی کوڕی ئەبو تالیب و، زوبەیری کوڕی عەوامدا نارد و، پێی فەرموون: بڕۆن بەدوای ئافرەتێکدا نامەیەکی لە حاتەبی کوڕی بەلتەعەوە پێیە و هەموو نهێنی کۆبوونەوە و خۆ ئامادەکردنی ئێمەی تێدایە، بۆ ئاگادارکردنەوەی قوڕەیشیەکان لە هەڵوێست و خۆ ئامادەکردنی ئێمە بۆ سەریان ئەوانیش ڕۆیشتن لە نیوەی ڕێگا بە ئافرەتەکە گەیشتن و بەماندووبونێکی زۆرەوە هەتا نامەکەیان لە ناو زولفەکانیدا دۆزیەوە و لێیانوەرگرتەوە و گەڕانەوە.دوایی پێغەمبەرﷺ بانگی حابیی کردوو فەرمووی: ئەی حاتەب ئەو کارەت بۆچی کرد و لە پێناویی چیدا؟ حاتەب گوتی: سوێند بە خودا باوەڕم بە خودا و پێغەمبەری خودا ﷺهەیە و، هیچ لەودینە پەشیمان نەبوومەوە و نەگۆڕاوم: بەڵام ئەمن هاوسەرو و منداڵ و خانەوادەکەم هەموویان لە مەککەن، نەخزمێکم هەیە و نەدۆستێکی باش وەك و موسڵمانەکانی تر ئینجا ویستم بەو نامەیە وابکەم متمانەیەك بۆ هاوسەر و منداڵەکانم دروست بکەم لە ناو قوڕەیشیەکان. حەزرەتی عومەر فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا ئەوە بۆتە دووڕوو منافق ڕێگەم پێ بدە با بیکوژم.پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەوە تۆدەڵێی چی ئەی عومەر لە خودا دەخوازم کە ئەوە بەهاوڕێیانی بەدر لە ڕۆژی بەدر گەیشتبێ. ئینجا فەرمووی: چیتان ئارەزولێیە بیکەن چونکە من لە ئەهلی بەدر خۆش بووم.

# میهرەبانی پێغەمبەر بۆ گەلەکەی

# رحمة الرسول فی أمته

**عبدالله ی کوڕی عومەر‌ﷺ دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: پێغەمبەری خودا ﷺ ئەو ئایەتەی سورەتی ئیبراهیمی خوێندەوە**{رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ ۖ فَمَن تَبِعَنِي فَإِنَّهُۥ مِنِّي ۖ وَمَنْ عَصَانِي فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ }إبراهيم/٣٦ **واتە: حەزرەتی ئیبراهیم‌ﷺ فەرمووی: خودایە بەڕاستی ئەو بتانە خەڵکانێکی زۆریان گومڕا و سەر لێشێواو کردووە، ئینجا ئەوانەی کە بە شوێن ڕێبازی مندا بڕوات ئەوە بەڕاستی لە پەیڕەوانی منە، وە ئەوانەش کە نافەرمانی و یاخی دەبێ لێم ئەوە خودایە بۆ خۆت زۆر لێخۆش بوو میهرەبانی. وە دوایی ئەو ئایەتەی فەرموو:کە خودای گەورە لە سەرزوبانی حەزرەتی عیسا ﷺ فەرموویەتی:** {إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ ۖ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ }المائدة/١١٨ **واتە: ئەی خودای بە سۆز و بەزەیی ئەگەر ئەوبەندە تاوان بارانەت بەهۆی خەراپە و لادانیان سزا و ئازاریان بدەی خودایە ئەوانە بەندەی خۆتن، وە ئەگەر لێشیان ببوری ئەوەبەڕاستی بۆ خۆت شایانی هەمووشتێکی و زانا و دانای بە هەموو کارێك.**

**دوایی دەستی بەرز کردەوە و فەرمووی:﴿ اللهم أمتی أمتی وبکی﴾ واتە: ئەی پەروەردگارم گەلەکەم گەلەکەمبەگریانێکی بە کوڵیشەوە دەگریا خوداش فەرمووی: ئەی جبرائیل بڕۆ بۆ لای محمد وﷺ پێی بڵێ خودا ئاگاداری تەواوی کارەکانتە و، پێی بڵێ خودا خۆی و گەلەکەی ڕازی دەکات و بە هیچ جۆرێك لە بیری ناکەین.**

# میهرەبانی پێغەمبەری خوداﷺ بە کۆیلەکاندا

## رحمة الرسول بالعبيد

ئەوکاتە سەلمانی فارسی ﷛ کۆیلەی پیاوێکی هۆزی جولەکەی بەنی قورەیزە بوو. کاتێ یەکەم جار چاوی بە پێغەمبەری خودا ﷺ کەوت باوەڕی هێنا وموسڵمان بوو: ئینجا بەو بۆنەوە لێپرسراوەکەی کە جولەکە بوو، هەڵسوکەوتی زۆر ناشیرین و خەراپ بوو لەگەڵ سەلماندا. ئەویش هەواڵی ئەو ڕەفتارە ناشیرینانەی بە پێغەمبەرﷺ گەیاند: پێغەمبەر یش ﷺ بە سەلمانی فەرموو: ئەی سەلمان داوای خۆکڕینەوە (مکاتبە) لە گەورەکەت بکە، لێپرسراوەکەشی لەگەڵیدا ڕیك کەوت لە سەرئەوەی کە (٣٠٠) سێ سەد قۆڵتی دارخورمای بۆ لێبدات و نەمامەکانیش بنێژێ و، (٤٠) چل ئۆقیەشی بداتێ لەسەر ئەوە ڕێك کەوتن. ئینجا پێغەمبەری خوداﷺ بە یارەکانی فەرموو: یارمە تی ئەو برایەتان بدەن لەسەر ئەوکارەی. ئەوانیش هەرکەس بەگوێرەی خۆی یارمە تیان دا پیاوی وا هەبوو( ٣٠)سی نەمامی دارخورمای باشی لەسەر خۆی دادەنا. وە پیاوی وابو بیست نەمام و ئیوا هەبوو پانزە و ، ئیوا هەبوو دەنەمام و، بەو جۆرە هەرکەس بەگوێرەی تەواناى خۆی هەتا هەموو(٣٠٠) نەمامەکانیان بۆ تەواو کرد. ئینجا ئەوکاتە پێغەمبەرﷺ بە سەلمانی فەرموو: بڕۆ قۆڵتەکان هەڵکەنە و کە تەواوبوو وەرەوە بۆلام بامنیش بۆ خۆم بێم و لەگەڵت گڵیان پێدا بکەم. ئینجا بە یارمەتی هاوڕێکانی هەموو قۆڵتەکانیان هەڵکەند و، هەواڵیان بە پێغەمبەرﷺ گەیاند ئەویش لەگەڵ یاندا ڕۆیشت وسەلمان نەمامەکانی لە پێغەمبەر ﷺ نزیك دەکردەوە و دەی دایە دەستی و، پێغەمبەریشﷺ لە قۆڵتەکەی دەهاویشت و گڵی بەسەردا دەکرد و ڕێکی دەخست. سەلمان دەفەرموێ: سوێند بە خودا هەر هەموو دار خورمایەکان سەوز بوون و، یەکیان وشك نەبوو.بەو جۆرە دارخورمایەکانم لەسەر شان لاچوو، بەڵام ماڵەکە لە سەرم مابوو بیدەم. لە دواییدا پێغەمبەرﷺ بە ئەندازەی هێلکەیەك زێڕ لە هێندێك کارگەکاندا هێنایی و فەرمووی: ئەو سەلمانەی کە خۆی کڕیبۆوە بۆم

بانگ بکەن لە کوێیە؟ منیش کەچوم پێغەمبەر ﷺ زێڕەکەی دامێ و، فەرمووی: بڕۆ ئەوحەقەی لەسەر تە بیدەوە. سەلمان ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ، دوایی من ئەوماڵە لە کوێ بهێنم و بیدەمەوە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بڕۆ ئەوحەقەی لەسەرتە بیدەوە خودا بۆت دەداتەوە. منیش ڕۆیشتم و کێشامان، سوێند بە خودا تەواوی چل ئوقیەکەی تەواوکرد و، منیش بە تەواوی بە سەردار و لێپرسراوەکەم بەخشی و، ئازاد بووم.

## بەڕاستی خودا بێ نیازە لە ئازاردانی گیانت

## إن اللّه لغنی عن تعذیب نفسك

دەگێڕنەوە: کاتێك کە پێغەمبەری ﷺ خودا برایەتی خستە نێوانی موهاجر و ئەنصارەکان. (سەلمان)ﷺ بەبەر (ئەبودەرداء) کەوت، ئەویش ڕۆیشتە لای و سەیری کرد. هاوسەرەکەی لە بەرگێکی پیسی دڕاو ناشیرین دابوو. سەلمان فەرمووی: خوشکم ئەوە بۆچی وا پیس و پۆخڵ و ناشیرینت دەبینم: ئەویش گوتی:برام بۆکێ خۆم جوان و پاك ڕابگرم. هاوسەرەکەم هیچ ئارەزوی لە ژن نیەو، بەردەوام بە ڕۆژ بەڕۆژووە و، بە شەویش هەر خەریکی شەونوێژ و عیبادەتە، منیش لە خۆڕازاندنەوە بێتاقەتم. لەوکاتی ووت و وێژو قسەکردنەدا بوون (ئەبودرداءﷺ) هاتەوە ماڵ و بە هاوسەرەکەی گوت: ئەوە میوانی پێغەمبەریﷺ خودایە و خواردن و شتی باشی بۆ ئامادەبکە. دوای ئەوەی نان ئامادە کرا ئەبودەرداءﷺ فەرمووی : ئەی سەلمانﷺ فەرموو نان بخۆ چونکە من بە ڕۆژوم. سەلمان ﷺ سوێندی خوارد کە وەڵامی نەداتەوە و بە قسەی نەکات هەتا ئەویش نانی لە گەڵدا نەخوات، بە ناچاری ڕۆژوەکەی شکاندوونانی خوارد.کاتێ شەوهات و کاتی خەوتن هات ئەبو دەرداء ﷺ گوتی: سەلمان تۆ بخەوە منیش خەریکی شەونوێژ و خواپەرستی دەبم. بەڵام سەلمان ﷺ هەوڵێکی زۆری لەگەڵ ئەبو دەرداء ﷺدا کە ئەویش بڕواتە سەرجێگای خەوی و، لای هاوسەرەکەی و بخەوێت. سەلمانﷺ زۆر سوور بوو لەسەر داوا لێکردنەکەی ئەبو دەرداء یش بەناچاری

ڕۆیشتە سەرجێگای نوستنی و لای هاوسەرەکەی. دوای کەسێیەکی شەو ڕۆیشت سەلمان ﷺ ئەبو دەردائی لە خەو هەستاند بۆ شەو نوێژ ئینجا، بۆ نوێژی بەیانی کە ڕۆیشتنە مزگەوت ئەبودەرداء ﷺ ڕۆیشتە لای پێغەمبەرو ﷺ، زۆر لۆمە و سەر زەنشتی سەلمانی کرد کە ڕۆژوی ڕۆژی پێشکاندوە و ڕێگەی تەواوی شەویشی لێگرتووە بۆ شەونوێژ. پێغەمبەر ﷺ بەڕووی بەخشندە و چاوپۆشیەوە سەیری ئەبو دەردائی کرد و فەرمووی: ئەی ئەبو دەرداء ﷺ بەڕاستی چاوپۆشی و بەزەی و میهرە بانی پەروەردگار بۆ ئەوە زۆرە و، ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی ئەبا دەرداء تۆ باش بزانە حەق و فەرمانی خودات لە سەرە و، ئەندامەکانی لەشت حەقیان بەسەرتەوە هەیە و ، هاوسەر و خێزانەکەشت حەق و مافیان بەسەرتە وە هەیە، وە پێویستە حەق و مافی هەموو خاوەن حەقێك بدەی و بپارێزی.

## من لێت مارە دەبڕم

## أنا أ زوجك

جارێك (میقدادی کوڕی ئەسوەد ﷺ) کە یەکێك لە دەوڵەمەندانی هۆزی قوڕەیش بوو لەگەڵ (عبدالرحمنی کوڕی عەوف ﷺ) دانیشتبوو. عبدالرحمن ﷺ فەرمووی: ئەی میقداد بۆ چی ژن ناهێنی؟ میقدادیش ﷺ گوتی: دەتۆ کچەکەی خۆتم لێمارە ببڕە. عبدالرحمان ﷺ یش توڕە بوو دەستی کرد بە قسەی ناشیرین و خەراپ، میقداد ڕۆیشتە لای پێغەمبە رو ﷺ نارەزایی سەر شێتانەی عبدالرحمنی لە لاکرد. پێغەمبەری خودا ﷺ زۆر دڵ نەوازی میقدادی دایەوە، هەتاهێنایەوە سەرخۆی و فەرمووی: میقداد من کچی مامم (زەباعەی کچی زوبەیری کوڕی عبدالمتلیب)ت لێمارە دەبڕم، لە دوای قایل بوونی هەموو لایەك لێی مارە بڕی.

# بەزەیی خودای گەورە بە بەندەكانی

# رحمة الله بعباده

جارێكیان پێغەمبەری خوداﷺ لە دەشت وچۆڵیەكدا دانیشتبوو لەگەڵ هاوڕێكانی. كابرا یەك هاتە لایان و بەرگێكی لەبەردابوو: وە شتێكیشی لە دەستی دابوو لەناو بەرگەكە یدا لوولی دابوو. ڕۆیشتە لای پێغەمبەر وﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ لەوڕێگایەوە هاتم و چاوم بە تۆ كەوت و بۆ لای بەڕێزتان لامدا. لە ڕێگای لادانم بەلای دارێكی چڕ و پڕدا هاتم گوێم لە دەنگ و جریوەی بێچوی باڵندەبوو، منیش چوم و دەرم هێنان و هەڵم گرتن. دوایی دایكەكەیان هات و چاوی بە بێچوەكانی كەوت بە دەستمەوەیە بەسەرسەرمدا دەهات و دەچوومنیش بێچوەكانیم پیشاندا، دایكەكەیان خۆی بەسەر سەری بێچوەكانی دادا و، منیش دایكیشیانم گرت و، لەگەڵ بێچوەكانی لە گۆشەیەكی بەرگ و پۆشاكەكەم پێچایەوە و هێنامن، ئەوەش ئەو دایك و بێچوانەیە كە پێمە. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: دایان بنێ. منیش لەبەردەمیانم دانا و، پەردەكەم لەسەر لابردن، دایكە كەیان لەوكاتەشدا لە بەر بێچوەكانی نەدەڕۆیشت و، بەجێی نەدەهێشتن. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: تو خودا ئێوە لە دڵسۆزی ئەم دایكە بۆ بەچكەكانی سەرسام نابن؟ ئەوانیش گوتیان: بەڕاستی جێگەی سەرسامی و سەرسوڕمانە. ئینجا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: سوێند بەوكەسەی كە منی بەحەق و ڕاستی ناردووە، خودای گەورە و بە دەسەڵات زۆر میهرەبان و بەبەزەیی ترە لە دایكی ئەو بێچوانە بۆ بێچوەكانی. لە دواییدا پێغەمبەرﷺ فەرمووی : هەستە ئەو بێچوانە بە دایكە كەیانەوە لە كوێت هێناون بیان بەرەوە بۆ ئەو شوێنەی لێت هێناوە. كابراش ڕۆیشت و بردنیەوە ئەو شوێنەی كە هێنابوونی.

## لەم ڕۆ بە دواوە لەسەر براكەم مەگریەن

## لاتبكوا على أخي بعد اليوم

عبداللەی كوڕی جەعفەری كوڕی ئەبو تالیب ﵁ دەفەرموێ: لەدوای سێ ڕۆژ تێپەڕین بەسەر مردنی باوكم پێغەمبەر ﷺ هات بۆلامان و، فەرمووی: لەم ڕۆ بەدواوە لەسەر برایەكەم مەگریەن. ئێستاش بڕۆن منداڵ و كوڕی برایەكەم بۆ بانگ بكەن. ئێمەش بۆمان بردن. سەر و قژیان زۆر هاتبوو، ئاڵۆز و تێك هاڵاو بوون. وەك و بێچو وابوو. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بڕۆن سەر تاشێكم بۆ بهێنن. لە دوای هێنانی سەری هەموومانی تاشی لە دواییدا پێغەمبەر ﷺ یاری لە گەڵدا دەكردین ودەیفەرموو: بەڕاستی محمد شێوەی وەك و ئەبو تالیبی مامم وایە و، عبداللەش شێوەی دیمەن و سروشتی وەك و من وایە. لە دواییدا دەستی گرتم و بەرزی كردەوە و فەرمووی: خودایە ئەوەمان بە باشتر و چاكتر لە دوای جەعفەر لە ناو خانەوادەدا بۆ بهێڵەوە وە پیرۆزی تەواویش بە عبدالله ببەخشی. پێغەمبەر ﷺ سێ جار ئەوەی دووبارەكردەوە بەڕاستی ئەوەش شێوەیەكی پرشەنگدارە لە شێوازی بەزەیی و میهرەبانی لە گیانی درەوشاوەی پێغەمبەردا ﷺ.

## بەزەیی بە هەموو خاوەن گیانلەبەرێك شایانی پاداشت و جەزایە

## في كل ذات كبد حرى اجر

جارێكیان كابرایەك بە ڕێگایەك دا دەڕۆیشت، تینوایەتیەكی زۆر تینی بۆ هێنا گەیشتە بیراوێك، كابرا ڕۆیشتە ناو بیرەكە و ئاوی خواردەوە و هاتە دەرەوە. سەیری كرد سەگێك لەسەر دیواری بیرەكە ڕاوەستاوە و لەبەر گەرما و تینویەتی زمانی دەر هێناوە و گڵی دەخوارد. كابرا گوتی: بە خودا ئەو سەگە وەك و من تینوی بووە، بۆ یە ڕۆیشتەوە بۆ ناو بیرەكە و، پێڵاوەكانی پڕكرد لە ئاوو بەددانی گرتی و سەر كەوتەوە سەر بیرەكە و، ئاوەكەی لەبەر دەمی سەگەكەدانا و تێر ئاوی كرد ، كابراش سوپاس گوزاری خودای میهرەبانی كردو و. خوداش لەو كابرایە خۆش بوو، بە هۆی ئەو میهرەبانی و سوپاس گوزارییەی. هاوڕێكانی پێغەمبەر ﷺ گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ بۆچی ئێمە لە بەزەییماندا بۆ ئاژەڵانیش خودا پاداشتمان دەداتەوە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەزەیی بە هەموو خاوەن گیان لەبەرێكدا شایانی پاداشت و جەزایە.

# تۆش منداڵەكانت ماچ دەكەی ئەی پێشەوای موسڵمانان
# أتقبل أولادك ياأميرالمؤمنين

ڕۆژێك عومەری كوڕی خەتاب ﷺ لە ناو منداڵ و خانەوادەكەیدا بوو منداڵەكانی لەسەر باوەشی بوو ماچی دەكردن. لەو كاتەشدا یەكێك لە كار بە دەست و بەرپرسانی وڵاتێكی لە لابوو. گوتی: ئەی پێشەوا تۆش منداڵەكانت ماچ دەكەی؟ پێشەواعومەریش ﷺ فەرمووی: بەڵێ ماچیان دەكەم كار بەدەستەكەش گوتی: بەخودا ئەی پێشەوا ئەمن (١٠) دە منداڵم هەیە هەتا ئێستا یەكێكیانم ماچ نەكردووە، وە هەركاتێك كە دەڕۆمەوە بۆ ماڵە وە هیچ منداڵێك لەو ناوەدا نامێنێ و، هیچ هەست و دەنگێك لە ماڵی مندا نابیستێ، پێشەوا عومەر ﷺ فەرمووی: بەڕاستی شتێكی سامناك و ترسناكە كە خودا سۆز و بەزەیی لە دڵ و لاشەت دەركردووە و، ئێمەش كردوومانی بە لێپرسراو؟ بۆیە هەر لەوكاتەدا پێشەوا عومەر ﷺ فەرمانی لە سەركار لادانی ئەو كار بەدەستەی دا و فەرمووی: ئەگەر ئەتۆ بەزەییت بە خێزان و منداڵەكانتدا نەیەتەوە، چۆن سۆز و بەزەییت بە ژێر دەستە و گەلەكەتدا دێتەوە.! دیارە نەخێر.

# چاكەو جوامێری ألإحسان، ألكرم

{ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَيَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡبَغۡيِۚ يَعِظُكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ }النحل/٩٠ واتای ئەو ئایەتەمان لە باسی دادگەری كردووە. چاكە هێما و نیشانەی گیانێكی بەخشندە و چاو تێرییە. وە نیشانەی خو ڕەوەشتی بەسۆز و بەزەییە و سروشتێكی تایبەتی نەرم و نیانە لە لایەن خودای دڵسۆز و بەبەزە یی و ئاگادار بە هەمووشتێك. وە چاكە سروشتێكە لە لایەن خودای بەبەزەیی و ئاگادار بە هەموو شتێك، وە چاكەشتی خەراپە و ناڕێكی لادەبات و ڕێگای گەورەیی و میهرەبانی دەگرێتەبەر بۆ نەهێشتنی كاری دزێوی و ناشیرینی و، فرمێسكی كەساسی و داماوان دەسڕێتەوە، وە وا لە ئادەمیزا دەكان دەكات كە بەژیانێكی برایانە و خۆشەویستانە ژیانێكی بێئێرەیی و بە بێ دووژمنكارانە و بە بێ قین و ڕق و دڵ پیسی لە یەكتر ببەنە سەر و خۆش و

بەختەوەر بژین، وە بەڕاستی ئسلام لە زۆربەی ئایەتەكانی قوڕئان و فەرموودە بە ڕێزەكانی پێغەمبەرمانﷺ دا خواز و هاندەری ئادەمیزادەكانن بۆ چاكە و چاكەخوازی وە بەرامبەری كردووە لەگەڵ فەرمانی ڕاستی بە معروف چاكە و ڕێك خستنی نێوانی ئادەمیزادەكان، هەروەك و خودا دەفەرموێ:{ لَّا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَاهُمْ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلَاحٍ بَيْنَ النَّاسِ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِ اللَّهِ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ]النساء/١١٤واتە: لەو هەموو قسە و گوتە و چرپە نهێنیانەی كە ئێوە دەیكەن هیچ خێر و چاكەیەك بەدی ناكرێ لێیان و، خێری تێدانیە، تەنها ئەوشتەی كە فەرمان بە چاكە و بەخشیش و چاك سازی و ڕێكخستن نەبێ لە نێوانی خەڵكاندا ئینجا هەر كەسێك ئەو كارانە بكات و مەبەستی ڕەزابوونی خودا بێت ئەوە بەڕاستی خودای گەورە لە دوا ڕۆژدا پاداشتی زۆرگەورە و بێ سنوری دەداتەوە. وە تەنانەت خودای گەورە بەخشینی ماڵ بۆ هەژاران و نەدارانی لە بەرز ترین پلەو نیشانەی موسڵمان داناوە: هەروەك و خودا دەفەرموێ: { إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ. الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ. أُولَٰئِكَ هُمُ الْمُؤْمِنُونَ حَقًّا ۚ }الانفال/٢-٤ واتە: ئەی محمد ﷺ لە مەودوا پرسیارت لێدەكەن لەبارەی دەست كەوت و داهاتی شەڕ ئەتۆ پێیان بڵێ هەموو دەست كەوتەكانی شەر بۆ خودا و پێغەمبەریﷺ خودان و هەر ئەوانیش بڕیاری تەواوی لەسەر دەدەن، كەوایە ئێوە لە خودا بترسێن و خۆپارێزی بكەن ، وە لە نێوانی خۆتاندا چاك سازی بكەن و، مەهێڵن نێوانتان لەسەر ماڵی دونیا تێك بچێت ، فەرمانی خوداو پێغەمبەری خوداﷺ بە جێ بهێنن ئەگەر بەڕاستی باوەڕدارن. وە بەتەواوی باوەڕداری ڕاستە قینەش ئەوانەن: كاتێ ناوی خودایان لە لاهێندرا دڵیان دەلەرزێت و سامی لێدەنیشێ، وە كاتێك ئایەتەكانی خودایان بەسەردا خوێندرایەوە بیروباوەڕ و بڕوایان زۆرتر دەبێت و بەتەواوی لە هەموو كارێكیاندا پشت بە خوای بە دەسەڵات دەبەستن، وە ئەوانەی كە بەتەواوی نوێژەكانیان دەكەن و لەو بەشە ڕۆزیەی كە خودا پێی بەخشیون ئەوانیش دەی بەخشن و دەیدەنە هەژاران، بەڕاستی ئەوانە باوەڕداری ڕاستە قینەن.

وە پێغەمبەری ﷺسەروەریشمان هانمان دەدات بۆ چاكەو دەفەرموێ: خێر كردن هەرچەند زۆر كەم بێت با بە ئەندازەی نیو دەنكمە خورماش بێت لە ئاگر دەت پارێزێ، بەڕاستی ئەوەش گومانی تێدا نیە كە هاندەرێكی زۆری موسڵمانانە كە بەچاكەكردنێكی زۆركەم و بێ ئەرزش ئەو چاكەو خۆپارێزیەی هەبێت دەبێ ئادەمیزاد ئەوەبكاتە بەرهەمێكی زۆری كۆكردنەوەی چاكەی هەروەك و پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿إتقو النار ولو بشق تمره﴾ وە دووبارە لە فەرموودەیەكی تردا دەفەرموێ: ﴿ الصدقة تطفىء الخطیئة كما یطفىءالماء النار﴾ وە بەڕاستی هەر ئەو هاندانە بوو بوومایەی خێر كردن و بەخشینی موسڵمانان لە سەردەمی فەرمان ڕەوای موسڵمانان، وە دەبێ ئەوەش زۆرباش بزانین هەرخێ و چاكەیەك كەمنەت بەسەر چاكەكاردا بكات و لێی بڵێتەوە و ئازاری دڵو دەرونی كابرای خێرپێكراو بكات ، ئەو خێەلە كابرای خێركەر وەرناگیرێ وە ئەوانەی كە لێرە بەدواوە دێت هێندێك لە نمونە جوان و بەپێزانەیە كە لە ژیانی چاكترین دروست كراوی ئەو بوونەوەرە سەروەر و پێشەوامان حەزرەتی محمدﷺ لەگەڵ یارەكانیدا باس دەكەین ڕوویداوە.

## من هیچم لە لانیە بەڵام بڕۆ بیكڕە نرخەكەی لەسەر خۆم

## ماعندی شیء و لكن إبتع علیَ

پێغەمبەرﷺ باشترین ئادەمیزاد بووە بۆ چاكەو بەخشین: جارێكیان خاتو (خەدیجەی كچی خوەیلد) نەوەت هەزار درهەمی بۆ پێغەمبەریﷺ خودا نارد. پێغەمبەریش ﷺ ئەو پارەیەی لەسەر حەسیرێك داناو: دەستی كرد بەدا بەش كردنی، وە هەرچی داوای بكردبایە پێی دەبەخشی و، هیچ كەسێكی بێبەش نەدەكرد. هەتا هەموو پارەكەی دابەش كرد. لە دوای تەواو بوونی نەوەد هەزار درهەمەكە، كابرایەك هاتوو داوای پارەی كرد و، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: بەڕاستی هەموو پارەكە دابەش كراوە و هیچم لەلا نەماوە: بەڵام ئارەزووت لە چییە بڕۆ بیكڕە و پارەكەشی لەسەر خۆم ، ئەگەر بووم حەقەكەی دەدەم. پێشەوا عومەرﷺ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ خۆ خودا داوای شتێكت لێناكات كە توانات نەبێت. پێغەمبەرﷺ ئەو قسەی عومەری زۆر پێناخۆش بوو. لە دوای

ئەوە پیاوێکی ئەنصاری گوتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ هەرچی ئارەزووت لێیە ببەخشە و لە هەژاری و نەبوونی مەترسە. پێغەمبەر ﷺ بەو قسەیە زۆر دڵخۆش بوو پێکەنی و فەرمووی: ئەی عومەرؓ ئەتۆش ئەوهات فەرمان بکردبایە.

## بەڕاستی ئەوکراسە جوانە

## ما أحسن هذه البردة

دەگێڕنەوە: ئافرەتێك هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ کراسێکی جوانی پەراوێز و دامێن چنرا وی پێبوو گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەو کراسە بۆ خۆم بە جوانترین شێوە دووریمەو، پەراوێزەکانیم چنیوە و، بۆ تۆم هێناوە لەبەری بکەی. پێغەمبەریشﷺ زۆر ئارەزووی لێبوو: چونکە کراسەکەی بەری شڕو دڕاوبوو. پێغەمبەرﷺ بە خۆش حاڵیە وە کراسەکەی لێوەرگرت و، لەبەری کردوو ڕۆیشتە ناویارەکانی. یەکێك لە هاوڕێیانی بە سیلەی چاو سەیری دەکردوو سەرنجی بۆ لای کراسەکە ڕاکێشابوو، گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ بەڕاستی ئەو کراسە زۆر جوانە پۆشیوتە پێغەمبەریشﷺ فەرمووی بەڕاستی جوانە، لە دوای ئەوەی کە ڕۆیشتەوە بۆ ماڵەوە کراسەکەی دانا و پێچا یەوە و، لەناو شتێکی داناو بۆ ئەو هاوڕێیەی ڕەوانە کرد.

## خودایە لە عوسمان ڕازییە

## أللهم أرض عن عثمان

ڕۆژێك پێغەمبەرﷺ هانی موسڵمانانی دەدا بۆ یارمەتی دان و خۆئامادەکردنی سوپای سەغلەتی. پێشەوا عوسمانؓ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ سەد حوشتر بەزین و بن زین و، ڕێشمە و هەموو شتێکەوە لەسەر من بێت. دوای ماوەیەك پێغەمبەرﷺ دووبارە داوای کۆمەك و یارمەتی کردەوە.دووبارە پێشەوا عوسمان فەرمووی: سەد حوشتری تریش بەزین و بن زین و ڕێشمە و هەموو شتێکەوە لەسەر من بێت. لە دوای ئەوەی کە پێغەمبەرﷺ لەسەر دوانگەی مینبەرەکەی هاتە خوارو ، هەر باسی یارمەتی و کۆمەکی دەکرد.؟ پێشەوا

عوسمانﷺ بۆ جاری سێهەم فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ سەد حوشتری تر بەزین و بن زین و ڕێشمە وهەموو شتێکەوە لەسەر من بێت. پێغەمبەرﷺ بە شێوەیەکی زۆر سەرسوڕهێن ڕووی لە عوسمان کردوو فەرمووی: بەڕاستی لە دوای ئەو کارەی عوسمان لێرە بەدواوە هیچی لەسەر نییە. ئینجاپێغەمبەرﷺ دوعا و نزای بۆ عوسمان کردوو فەرمووی:﴿ اللهم أرض عـن عـثمان فإنی عـنه راض﴾ واتە: خودایە لە عوسمان قایل و ڕازی بە ، بەڕاستی من لێی قایل و ڕازیم .

# پەلەکردن لە چاکە

# ألمسارعة فی الخیر

ڕۆژێکیان: پێشەوا عومەرﷺ بۆ یارمەتی دانی ئافرەتێکی پیر ڕۆیشت: ئافرەتەکە گوتی: بەخودا هەر ئێستا لە پێشی تۆدا یەکێکی تر لە لام بوو یارمەتی دامو هەموو شتێکی بۆ کردم. ئەو کارەش چەندین جار دووبارە بۆتەوە. هەرچەند جاری کە پێشەوا عومەر ﷺ پێش برکێی دەکرد بۆ خزمەت و یارمەتی ئەو ئافرەتە پیرە بێکەسە، بەڵام ئافرەتەکە پێی دەگوت: بەخودا براکەم پێویستم بە یارمەتی نییە چونکە پێشی تۆ هاتوون و یارمەتیان داوم. بۆ ئەو مەبەستە پێشەوا عومەرﷺ لە شوێنێکەوە خۆی پەنهان دا بزانێ ئەوکەسەی کە یارمەتی ئەو ئافرەتە دەدات کێیە؟ کاتێك پیاوێك زۆر بە نهێنی و چار شێوێکەوە هات و ڕۆیشتە ژوورەوە و هەموو کارەکانی بۆ ئەو ئافرەتە کردوو گەڕایەوە. پێشەوا عومەرﷺ بەدوایدا ڕۆیشت و چارشێوەکەی لەسەر سەری لادا سەیر دەکات ئەو پیاوە پێشەوا ئەبوبکری صدیقەﷺ. پێشەوا عومەرﷺ فەرمووی: واللەی دەمزانی هیچ کەسێك بۆ ئەو خێرە پێشم ناکەویٚ تەنها تۆنەبی ئەبوبکرﷺ.

# لە پێناوی خودا تۆ ئازادی

# أنت حر لوجه الله

ڕۆژێك: پێشەوا ئەبوبکرﷺ لە کاتی تین و گەرما و تیشکی ڕۆژ بەشوێنێك دا دەڕۆیشت کە لەو شوێنەدا بیلالی حەبەشیﷺ ئازار و سزا دەدرا. بیلالیش بەندەی ئومەیەی کوڕی خەڵەف بوو کە پێشەوا ئەبوبکرﷺ چاوی بەو وێنە دزێو ناشیرینە کەوت، کە بەڕاستی تەواوی ڕوخساری مرۆڤایەتی شەرمی لێدەکردوو بەزەیی پێدا دەهاتەوە. ئەبوبکر ﷺ فەرمووی: ئەی ئومەیە ئەوە تۆ لە سزای خودا ناترسی کە ئەو بەندە هەژار و بێدەسەڵاتە بەهەمە شێوەی جۆراو جۆر سزا و ئازاری دەدەی؟ ئومەیە گوتی: بەڕاستی ئەوە ئێوەن کە بەو جۆرە نەریت و ڕەوشتان پیس و خەراپ کردووە دەهەر بۆ خۆشتان ئازادی بکەن، چۆنی ئازاد دەکەن. ئەبوبکرﷺ فەرمووی: ئەی ئومەیە من بەندەیەکی ڕەش پێستی زۆر ئازاو چاپوکم هەیە و بێباوەڕە وەك و خۆت بابیان گۆڕینەوە. ئومەیە گوتی: ڕازیم بائەوە بۆتۆبێ. بەوجۆرە هەردووکیان قایل بوون و، بە یەکتریان گۆڕیەوە و، ئینجا ئەبوبکر ﷺ بە بیلالی فەرموو: ئەی بیلال تۆ لە ئێستاوە لە پێناو قایل و ڕەزابوونی خودا ئازادو و سەر بەستی.

# بەتەنها ئاوم لەلایە

# ماعندي إلاماء

ڕۆژێك کابرایەك :هاتە خزمەتی پێغەمەروﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ بەڕاستی زۆرهیلاك و ماندو و برسیمە : پێغەمبەر ﷺ ناردی بۆلای یەك بەیەکی هاوسەرەکانی بزانێ چیان هەیە بۆ خواردن و تێر کردنی ئەو پیاوە: بەڵام هاوسەرەکانی هەرچی دەچونەلای دەیان گوت سوێند بەو کەسەی کە تۆی کردووە بە پێغەمبەر ﷺ تەنها لە ئاو زیاتر هیچی کەمان نیە. ئینجا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: کێ هەیە ئەمشەو میوانداری ئەو پیاوەبکات بەرمیهرەبانی خودا بکەوێت؟ یەکێك لە پیاوانی ئەنصار فەرمووی: من میوان داری دەکەم ئەی پێغەمبەری خوداﷺ. کابرای لەگەڵ خۆیدا بردەوە بۆ ماڵ و بە هاوسەرەکەی گوت: چیمان هەیە؟ هاوسەرەکەی گوتی: بەخودا بەس خواردنی منداڵە کەمان هەیە. کابرا بە

هاوسەرەکەی گوت: منداڵەکەی بەشتێکەوە خەریك بکەو، کاتێ وەختی خواردن هات منداڵەکە بخەوێنە و، وەختی ئامادەبوونی خواردنەکەش چرایە کە بکوژێنەوە بۆ ئەوەی میوانەکە شەرم نەکا و وابزانێ منیش خواردنی لەگەڵدا دەخۆم، هەردوکیان لەسەر سفرەی نان خواردن دانیشتن و میوانەکە تێری خواردوو. بۆ خۆشیان بەسکی برسی شەویان بەڕێ کرد. کاتی بەیانی لە دوای نوێژ پێغەمبەر ﷺ بە کابرای ئەنصاری فەرموو: بەڕاستی خودای گەورە زۆر لەوکارەی ئێوە بەرامبەر میوانەکەتان کردتان ڕازی و سەرسامبوو.

## برۆ ئەو زرێیەی بە بارمتە لەلا دابنێ: إذهب بدرعي وأرهنة عندة

بەڵێ بەڕاستی پێغەمبەری ﷺ خودا چاکترین شێوەی ڕەسەنایەتی بناغە داڕێژی بوو لە گوفتار و، ڕەفتارو، چاکە و میوانداری. هەروەك و خودا خۆی لە بارەیەوە دەفەرموێ:{لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُواْ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْأَخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا} الاحزاب/ ٢١ واتە: بەڕاستی لە هەڵسوکەوت و ڕەوشتەکانی پێغەمبەردا ﷺ شتی زۆرجوان و ڕێك و پێك هەیە هەتا ئێوەش چاوی لێبکەن و بە شوێنیدا بڕۆن بە تایبەتیش ئەوانەی کە ڕەزامەندی خودا و سەرفیرازی ڕۆژی دواییان دەوێت و زۆر زیکر و یادی خودا دەکەن.

ڕافیعی پێش خزمەتی ماڵی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: جارێك پێغەمبەرﷺ میوانی هات هەرچی شتی خواردن بێت لە ماڵیاندا نەبوو فەرمووی: ڕافع برۆ ماڵی فلانە جولەکە هێندێ ئارد بە قەرز بێنە هەتا مانگی ڕەجەب دەیدەمەوە، جولەکەکە گوتی: بەخوا هیچی نادەمێ تابارمتە (رهن)ێکم لەلا دانەنێ: منیش گەڕامەوە بۆلای پێغەمبەر وﷺ هەواڵەکەم پێدا. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سوێند بەخودا ئەمن دەست پاك و ئەمینم لە ئاسمان و لە زەمین ئەگەر قەرزی لەگەڵ بکردبام دەم دایەوە. بەڵام برۆ ئەو زرێیە لە لای بکە بە بارمتە.

## هەرکاتێ پیاوی بەخشندە و خانەدان هاتنەلاتان ڕێزیان بگرن

## إذا أتاكم كريم قوم فأكرموه

ڕۆژێك پێغەمبەرﷺ ڕۆیشتە یەكێك لە ماڵەكانی: هاوڕێكانیشی لە گەڵیدا ڕۆیشتنە ژورێ بە شێوەیەك ژوورەكە زۆرتەنگ بوو، دوایی جەریری كوڕی عبداللەی بە جەلیﷺ هاتە ژوورەوە كە پیاوێكی خانەدان و بەڕێز بوو لە ناو هۆزەكەی و چاكە خواز و بە خشێنەر بوو هەرگیز داوای كەسی پشت گوێ نەدەخست: بەلاّم هیچ جێگەیەكی بە دەست نەكەوت كە لێی دابنیشێ، بۆیە ناچار لەلای دەرگایەكە دانیشت پێغەمبەرﷺ عەبا و پۆشاكەكەی دایە دەستی فەرمووی: ئەی جەریر لەسەر ئەوە دابنیشە، جەریریش وەری گرت و لەسەر سەروچاوی داینا و ماچی كردو دەستی كرد بە گریان و عەبایەكەی دایەوە دەستی پێغەمبەرﷺ و گوتی: بەخوا من ئەو توانایەم نییە لەسەر بەرگ و پۆشاكی تۆ دابنیشم. خودا پایە و ڕێزت بەرزتر و گەورەتر بكات، وەك و ڕێزت لە من گرتووە. ئینجا پێغەمبەرﷺ سەیری ڕاست وچەپی خۆی كردوو فەرمووی: هەركاتێ پیاوی خانەدان و خاوەن ڕێز و بەخشێنەر هاتەلاتان ڕێزی لێبنێن و حورمەتی بگرن.

## دایكم داوای كراسێكت لێدەكات بۆ خۆدا پۆشین

## إن أمي تستكسيك درعا

جارێكیان پێغەمبەری خودا ﷺ لە جێگەیەك دانیشتبوو منداڵێك هاتە لای و گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ دایكم هیچ پۆشاكی نیە و داوای كرد كە بەڕێزت پۆشاكێكی بداتێ خۆی پێدابپۆشێ: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: لە سەعات ئەوەندە تا سەعاتی ئەوەندە بۆمان دەردەكەوێ و دوای وەرەوە بۆ لامان.منداڵەكەش گەڕایەوە بۆلای دایكی و فەرمایشت و قسەكەی پێغەمبەریﷺ بە دایكی گوت: ئەویش بە منداڵەكەی گوت: بڕۆ بە پێغەمبەر ﷺ بڵێ دایكم داوای كراسەكەی بەری خۆت دەكات: پێغەمبەرﷺ ڕۆیشتەوە بۆ ماڵ و كراسە كەی بەری دانا و دایە دەستی منداڵەكە و بۆ خۆشی بەڕوتی مایەوە و لە ماڵەوە دانی شت، نوێژ بوو بیلال ﷺ بانگی نوێژی فەرموو: موسڵمانانیش چاوەڕوانی پێغەمبەر ﷺ بوون بێت بۆ نوێژ، بەلاّم لەوكاتەدا كە هیچی لەبەر دانەبوو نەڕۆیشت و دواكەوت.

## خودا لە بەلاّ و ئازاری ئەو ڕۆژە بتان پارێزێ
## وقاهم الله شر ذالك اليوم

دەگێڕنەوە (حەسەن و، حوسەین‌ﷺ) نەخۆش بوون و پێغەمبەری خودا ﷺ لەگەڵ ئەبوبكر و عومەرداﷺ ڕۆیشتنە دیدەنی و هەواڵ پرسینی. پێشەوا عومەرﷺ فەرمووی: ئەی عەلی ئەگەر لەباتی كوڕەكانت شتێكت لەسەر خۆت بە پێویست (نەزر) بكردبایە خودا شیفای هەردووك كوڕەكانتی دەدا عەلی ﷺ فەرمووی: سێ ڕۆژ بە سوپاس گوزاری بە ڕۆژ و دەبم. فاتمەش گوتی : منیش سێ ڕۆژ بە ڕۆژو دەبم حەسەن و حوسەینیشﷺ گوتیان: ئێمەش سێ ڕۆژ بە ڕۆژودەبین. (فزەی) قەرەواش و پێش خزمەتیان گوتی: منیش سێ ڕۆژ بە ڕۆژو دەبم. خودای بە بەزەیش شیفای بۆ هەردوكیان نارد و چاك بوونەوە ئینجا بۆ بەیانی هەموویان بە ڕۆژو و بوون و هیچ خواردنێكیشیان نەبوو، پێشەوا عەلی ﷺ ڕۆیشتە ماڵە دراوسێ جولەكەكەیان بەناوی (شەمعون) كە كاری خوری شەی و پەرەكردن بوو. فەرمووی: شەمعون دەتوانی هێندێك خوری مەڕم بدەیە بۆ ئەوەی فاتمەی كچی محمدﷺ بۆت پەڕەبكات و بیرێسێ بە ئەندازەی كێشانەی سێ كۆتك جۆ؟ شەمعون گوتی بەڵێ ڕازیم. ئەوەی پێویستی بوو دایە دەستی پێشەوا عەلیشﷺ خوری و جۆیەكەی هێنایەوە و دایە دەستی فاتمە و ئەویش ڕازی بوو خوریە كەی چنی و. ڕوبەیەك یان بڵێین كۆتكێك لەو جۆیەی هەڵگرت هاڕیان و كردیانە ئارد و ، دوای تێكیان شێلا و كردیانە هەویر و، كردیان بە نان و، پێنج كولێرەیان لێدروست كرد. هەریەكەی كولێرەیەك عەلی ﷺ نوێژی مغریبی لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ كردوو، گەڕایە وە بۆماڵ سفرەیان ڕاخست و ، لە دەورەی سفرە هەموویان دانیشتن، عەلیﷺ ویستی یەكەم پارچەی كولێرە لێبكاتەوە و بیخوات ، هەژارێك لەسەر دەرگا ڕاوەستا و گووتی: السلام عليكم ورحمه الله وبركاته. ئەی خانەوادەی ماڵی پێغەمبەرﷺ من هەژارێكی موسڵمانانم و، برسیمە و داوای خواردنتان لێدەكەم، شتێكم لەو خواردنەی خۆتان پێبدەن، خودای گەورەش لە سفرە و خوانی بەهەشتێ بێبەشتان نەكات. پێشەوا عەلی ﷺ ئەو پارچەكولێرەی كە لە كولێرەكەی

پچڕاندبوو داینایەوە سەر سفرەکەی و، ئاماژەی بۆ فاتمە کرد، کە ئەوەی لەسەر سفرەکە دایە بیبات بۆ ئەو هەژارە، بۆ خۆشیان بەبێ خۆراك و برسیایەتی مانەوە و، بۆ بەیانیش بەبێ خواردن تەنها بە ئاو بە ڕۆژو بوون. بۆ بەیانیش بەشێك لە و جۆیەی کەمابوویان کردیانە ئاردوو شێلایان و کردیانە هەویر و پێنج کولێرەی کەیان لێ برژاند هەریەکەیان کولێرەیەك ئەو ڕۆژەش قەدەری خودا واهات کەعەلی﷛ نوێژی مەغریبی لە دوای پێغەمبەر﷑ کردوو گەڕایەوە بۆ ماڵ و، چونە سەر سفرەی خواردن هەروەك و ڕۆژی پێشو هەتیوێکی هەژاری موسڵمانان هات و، گوتی: السلام علیکم ئەی خانەوادەی ماڵی پێغەمبەر﷑ من هەتیوێکی بێکەس و هەژارم لەوخواردنەی خۆتانم پێبدەن کە بۆ خۆتان دەی خۆن خودا لە خواردن و خۆراکی بەهەشتان پێ ببەخشێ. دووبارە عەلی﷛ ئاماژەی بۆ فاتمەکرد کە ئەو خواردنەی سەر سفرەکەی پێ بدات: ئەویش بە فەرمانی عەلی﷛ خواردنەکەی دایە ئەو هەژارە هەتیوە و، بۆ خۆشیان ئەو شەوە بەبێ خواردن و خۆراك مانەوە تەنها ئاو نەبێت. ئینجا بۆ بەیانیش بۆ ڕۆژی سێیەم هەر بە ڕۆژو بوون بەسکی برسی و بێخواردن هەر بەو شێوەی پێشو ئەو بەشە جۆیەی کۆتایی کەمابوو بە شێوەی ڕۆژانی پێش و جۆیەکەیان هاڕی و کردیانە ئارد و دوایی شێلایان و کردیان بە هەویر وپێنج کولێرەی سورەوەکراوەی جوانیان لێدروست کرد و، بە شێوەی ڕۆژانی پێشو قەدەری خودا واهات لە دوای نوێژ و گەڕانەوەی بەرە و ماڵ و دوای سفرە ڕاخستن و دانیشتنیان بۆ خواردن و دەست بۆ بردنیان، ئەم جارە دیلێکی موسڵمانان هاتە سەر دەرگا و گوتی: السلام علیکم ئەی خانەوادەی پێغەمبەری ﷺ خودا من دیلی دەستی بێباوەڕانم و هیچ خواردنێکیشیان پێنەداوم داواتان لێدەکەم کە لەو خواردنەی خۆتانم پێ ببەخشن خودا لە خواردن و خۆراکی بەهەشتتان پێ ببەخشێ. پێشەوا عەلیش ﷺ پاروەکەی دانایەوە و ئاماژەی بە فاتمەکرد کە هەستێت و ئەو خواردنە بەو کەسە ببەخشێ ئەویش بە هەمان شێوەی پێشو خواردنەکەی بەو دیلە بەخشی و بۆ خۆشیان بە بێ خواردن مانەوە. لە دوای ئەوە پێشەوا عەلی و ﷺ هەردووك کوڕەکەی لە دوای نەخۆشی و سێ ڕۆژ

بە پۆڵو بوون بەڕەنگ و ڕوخسارێکی زەرد و سیس بووی زۆر برسی ڕۆیشتن بۆ ماڵی پێغەمبەری خوداﷺ کە پێغەمبەر چاوی پێکەوتن فەرمووی: ئەی باوکی حەسەن بەڕاستی ئەو بارودۆخەی ئێوە زۆر بێتاقەتم دەکات، وەرن با بڕۆین بۆلای فاتمە هەموویان ڕۆیشتن بۆلای فاتمە کە سەیریان کردوا لە میحرابەکەی پێغەمبەرداﷺ دانیشتوە و خۆی بەسەر سکیدا هێناوە و چاوەکانیشی کز و داماو دانەواندوە لەبەر برسیەتی پێغەمبەرﷺ کە چاوی پێی کەوت ڕاستی کردەوە و باوەشی پێداکرد و فەرمووی: ئەی هاوار بۆ خانەوادەی پێغەمبەرﷺ وا خەریکە لەبرسان دەمرن. بەڵام هێشتا پێغەمبەرﷺ قسەکەی تەواو نەکرد بوو : کە خودای گەورە حەزرەتی جبرائیلی‍ﷺ ڕاستگۆ و پەیام نێری ناردەلایان و سوڕەتی (الإنسان) بۆ هێنا کە بەڕاستی لەو ئایەتەدا خودای گەورە زۆر سوپاس و ستایشی خانەوادەی پێغەمبەریﷺ کردووە کە دەفەرموێ : {يُوفُونَ بِٱلنَّذۡرِ وَيَخَافُونَ يَوۡمٗا كَانَ شَرُّهُۥ مُسۡتَطِيرٗا. وَيُطۡعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ مِسۡكِينٗا وَيَتِيمٗا وَأَسِيرًا. إِنَّمَا نُطۡعِمُكُمۡ لِوَجۡهِ ٱللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمۡ جَزَآءٗ وَلَا شُكُورًا. إِنَّا نَخَافُ مِن رَّبِّنَا يَوۡمًا عَبُوسٗا قَمۡطَرِيرٗا. فَوَقَىٰهُمُ ٱللَّهُ شَرَّ ذَٰلِكَ ٱلۡيَوۡمِ وَلَقَّىٰهُمۡ نَضۡرَةٗ وَسُرُورٗا. وَجَزَىٰهُم بِمَا صَبَرُواْ جَنَّةٗ وَحَرِيرٗا }الانسان/٧-١٢ واتە: بەڕاستی ئەو کەسانە سەرفیراز و بەختەوەرن کە شتێکان نەزر کردیان بەڵێنێکیاندا بە ئەنجامی دەگەیەنن و پێچەوانە ناجوڵێنەوە، وە لەو ڕۆژە ناخۆش و دژوارەی ڕۆژی دوایی دەترسێن. وە خواردن و خۆراك هەرچەند خۆشەویست بێت لە لایان دەیبەخشن بە هەوژار و نەدار و هەتیوو دیلەکان.وەدەڵێن ئێمە ئەو خواردن و خۆراکانەتان پێدەدەین تەنها لە پێناو ڕەزابوونی خودا بەبێ داوا و پاداشت و سوپاسێك بەسەرتانەوە، چونکە بەڕاستی ئێمە لە ڕۆژێکی سامناك و ڕەش و تاریك دەترسێین، ئینجا هەرکەسێ وابکات ئەوە خودا لە شەڕ و ناخۆشی ئەو ڕۆژە دەی پارێزێ و ڕووسوری و شادمانی پێ دەبەخشێ و پاداشتی تەواوی ئەو سەبر و خۆڕاگریەی بەهەشتی خۆش و شادمانی و، ئاوریشمی نەرم و نایابی پێدەدات.

# ملوانكەیەك برسیەكی تێر و، ڕووتێكی پۆشتە و، هەژارێكی دەوڵەمەند كرد

# عقد أشبع جائعا، وكسى عريانا، وأغنى فقيرا

جارێكیان پێغەمبەری خودا ﷺ لە دوای نوێژی بەكۆمەڵی: بەرەو ڕووگەی قیبلە دانیشت و یارەكانیشی بە دەورەیەوە كۆڕیان بەستبوو دانیشتبوون: كابرایەك لە كۆچەریانی عەرەب زۆر پیری بێ هێز و لاواز هات و، وەك و هەواڵێكی پێ بێت پێغەمبەرﷺ ڕووی تێكرد: كابرای پیرە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ من بەڕاستی برسیمە و تێرم بكە، لاشەم ڕووتە و پۆشتەم بكە، هەژارم و دەوڵەمندم بكە. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: من هیچ شتێكم لە لانیە بیدەم بە تۆ، بەڵام ئەوەی كە شارەزای خەڵكی دەكات بۆ چاكە لە پاداشتدا وەك و بكەرەكە وایە. ئەی بیلالﷺ لەگەڵی برۆ بۆ لای ئەوكەسەی كە خودا و پێغەمبەری خودای ﷺ خۆش دەوێ و، خودا و پێغەمبەری ﷺخوداش خۆشیان دەوێ. بڕۆنە ماڵی فاتمە لە دەرگاوە ڕاوەستن و سەلامی لێبكەن كابرا لەگەڵ بیلال ڕۆیشت و لە دەرگاوە زۆر بەهێز گوتی: السلام علیك ئەی خانەوادەی پێغەمبەری خوداﷺ، ئەی شوێنی جیاوازی پێغەمبەران و، شوێنی دابەزینی جبرائیلی ﷺ ئەمین و: هێنانە خوارەوەی قورئانی پیرۆز. فاتمە فەرمووی: ئەتۆ كێی ئەی برام ؟ پیرە پیاوەكە گوتی: من لە هۆزی عەرەبم و لە جێگەیەكی دوورەوە هاتووم و ، هانام بۆ باوكت هێناوە. ئینجائەی كچی محمد من لاشەم ڕووتە و زۆر برسیمە، یارمەتیم بدە ڕەحمەتی خوات لێبێت. وە هەر بەهەمان شێوەش فاتمە و، عەلی وﷺ، پێغەمبەری خوداﷺ لە ماوەی سێ ڕۆژی ڕابردوودا هیچ خواردنێكیان نەخواردبوو پێغەمبەریشﷺ ئاگاداری تەواوی ئەو ڕووداوەبوو. فاتمە پەلاماری پێستی بەرانێكی دەباغ كراوی لە ماڵدا هەبوو كە كوڕەكانی حەسن و حوسێنی لەسەر دەنوستن، فەرمووی: براكەم ئەو پێستە بگرە بۆ خۆت و ئەگەر فرسەتێكم بۆ بڕەخسێ بۆ زۆرتر ئەوە زۆرتر و باشترت پێدەدەم. كابرا گوتی: ئەی كچی پێغەمبەرمن داوای خواردنم لێكردی چی لەوپێستە ڕەقە بكەم؟ فاتمە تەنها لە ملوانكەیەك زیاتر هیچی تری شك نەبرد. بۆیە ملوانكەكەی لە ملی دانا و دایە دەستی كابرا و فەرمووی: بڕۆ بیفرۆشە و خواردن و شتی پێ

بكڕە و منیش لە خودا دەپاڕێمەوە كە خودا پاداشتی باشترم لە باتی ئەوە بداتەوە. ئەو پیاوە ملوانكەكەی لە فاتمە وەرگرت و گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ بۆ مزگەوت كە هەر لە ناو یارەكانی دانیشت بوو. كابرا گوتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ فاتمەی كچت ئەو خەناوكەی پێ بەخشیم و فەرمووی: بیفرۆشە و پێویستیەكانی خۆتی پێ بەجێ بهێنە و، منیش لەخودا دەخوازم كە زۆرباشتر و چاكترم لەوە بۆ بگۆڕێتەوە. پێغەمبەرﷺ دەستی كرد بەگریان: عەماری كوڕی یاسرﷺ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ ڕێگەم پێدەدەی ئەو خەناوكەی لێ بكڕم؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵێ بیكڕە ئەی عەمار. بەڕاستی هەركەسێ یارمەتی تۆش بدات بۆ كڕینی ئەو ملوانكەیە خودا هەموویان لە سزای ئاگر ڕزگاریان دەكات و ئازاریان نادا.! عەمارﷺ بە كابرای گوت: ئەوخەناوكە بە چەند دەفرۆشی؟ ئەویش گوتی: بە جەمێك خواردنی باش بە گۆشتەوە بۆ ئەوەی برسیەتی خۆمی پێ بەجێ بهێنم و، كراسێكی باشی یەمەنی كە بۆ نوێژەكانم خۆمی پێدا بپۆشم و، لەگەڵ دینارێكیش بۆ ئەوەی بتوانم پێی بگەڕێمەوە ناو خانەوادەكەم. عەمار ئەو بەشە دەست كەوتەی كە لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ بە دەستی گەیشتبوو هەمووی فرۆشت و هیچی بۆ نەمایەوە. ئینجا بە كابرای عەرەبی گوت: لە باتی ئەوخەناوكە (٢٠) بیست دینار و (٢٠٠) دووسەد درهەم بۆ تۆ، لەگەڵ كراسێكی یەمەنی و، وڵاغێكی باشی سواریش بۆ تۆ پێی بگەڕێیەوە بۆماڵەوە و، جەمێكی خواردنی خۆش و نایاب لە نانی گەنم و گۆشت. كابرای عەرەبەكە گوتی: بەڕاستی پیاوی بەخشندە و بەڕێزی، عەمار لەگەڵ كابرا ڕۆیشت و هەرچی پەیمانی بە كابرای عەرەبی دابوو بۆی بەجێ هێنا و، كابرا گەڕایەوە لای پێغەمبەری خوداﷺ و پرسیاری لێكرد برام تێر و پۆشتە بووی؟ ئەویش گوتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوداﷺ بە دایك و باوكمەوە بە فیداتبم دەوڵەمەندیش بووم. ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەتۆش پاداشت و سوپاسی فاتمە بكە بۆ ئەو كارەی لەگەڵ تۆیدا كرد. كابرا گوتی: ﴿ اللهم إنك إله ماإستحدثناك، ولاإله لنا نعبدهٔسواك وأنت فى كل حين. اللهم أعط فاطمة مالا عين رأت ولا أذن سمعت ولاخطرعلى

قلب بشر﴾ پێغەمبەری ﷺ خوداش لەسەر دوعاکەی ئەو کابرایە دەی فەرموو ئامین:
ئینجا پێغەمبەر ﷺ ڕووی لە هاوڕێکانی کردوو فەرمووی: بەڕاستی هەر لە دونیادا خودا ئەوشتانەی بە فاتمە بەخشیوە: من باوکی فاتمەم هیچ کەسێکم لەو بوونەوەرە وەك و من نییە، وە عەلی هاوسەریەتی و ئەگەر عەلیش نەبایە کەس نەدەبووە هاوکوف و وێنە بۆ فاتمە، وە خودا دوو کوڕی پێبەخشیوە کە لە هەموو بوونەوەردا کەسانی گەنج و گەورەی گەنجانن و نەوەی پێغەمبەرانن و، گەورە و سەروەری دانیشتوی بەهەشتیانن. کاتێ پێغەمبەر ﷺ ئەو قسانەی دەفەرموو: میقدادی کوڕی عەمرو، عەمارو، سەلمان ﷺ لە دەورەی دانیشتبوون. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لەوەش زیاترتان بۆ بڵێم: ئەوانیش گوتیان: بەڵێ بۆمان بفەرموو: ئەویش فەرمووی: جبرائیل ﷺ هاتەلام فەرمووی: کاتێ کە فاتمە گیانی دەردەچێ و دەشاردرێتەوە پرسیاری لێدەکرێ: لێی دەپرسن خودات کێیە؟ دەفەرموێ: خودام اللە یە. دوایی پرسیاری لێدەکرێ پێغەمبەرت کێیە؟ ئەویش لەوەڵامدا دەفەرموێ: باوکمە. ئاگاداربن گەورەیی فاتمەتان بۆباس دەکەم: خودای گەورە فەرمانی بە کۆمەڵێك لە فریشتەکانی کردووە کە پارێزگاری لە فاتمە بکەن لەلای پێشەوە و، لەلای دوایەوە و، لە لای ڕاستیەوە و، لە لای چەپیەوە، ئەو فریشتانەی لەگەڵدایە لە ژیانی دونیا و، لە دوای مردن لەناو گۆڕدا، بەردەوام زۆر سەڵاوات وڕەحمەت دەنێرن بۆ سەر خۆی و باوکی و، هاوسەرەکەی و، کوڕەکانیشی، ئینجا هەر کەسێ لە دوای مردنم سەردانیم بکات: وەك و لە ژیانم داسەردانی کردبم ئەوهایە. وە هەر کەسێکیش سەردانی فاتمە بکات وەك و سەردانی منی کردبێت ئەوهایە. ئینجا لە دوای ئەوە عەمار ﷺ ملوانکەکەی هێنایە دەر و بە میسك بۆن خۆشی کردو و لەناو کراسێکی یەمانی لول داو، بەندەیەکی بەناوی سەهم هەبوو کە بەشێك بوو لەو بەشە سەهمەی کە لە ڕووداوی خەیبەر بەدەستی گەیشتبوو. بانگی کردوو خەناوکەکەی دایە دەست و پێی گوت: بڕۆ ئەو شتە بدەبە دەستی پێغەمبەرو ﷺ بۆ خۆشت بۆ ئەوبە. ئەو بەندەیەش ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەرو ﷺ فەرمانی عەماری بە پێغەمبەر ﷺ ڕاگەیاند. پێغەمبەریش فەرمووی:

برۆ بۆ لای فاتمە و ئەو خەناوكەی بدەیە و، بۆ خۆشت بۆ ئەوبە. ئەوبەندەیە بە خوناوكەوە ڕۆیشتە لای فاتمە و فەرمانەكەی پێغەمبەری ﷺ پێڕاگەیاند، فاتمەش خەناوكەكەی وەرگرت و، بەندە كەشی ئازادكرد. ئینجا لە دوای ئەوە بەندەكە دەستی كرد بە پێكەنین: فاتمە فەرمووی: ئەی لاو بۆچی پێدەكەنی؟ ئەویش گوتی: بە بەرەكەت و گەورەیی ئەوخەناوكە پێدەكەنم. برسیەكی تێركردوو، ڕووتێكی پۆشتەكردوو، هەژارێكی دەوڵەمەند كردوو، بەندەیەكی ئازادكرد و، خەناوكەكەش ڕۆیشتەوە بۆلای خاوەنەكەی .

## بەوام (قرض) داومەتە پەروەردگارم

## أقرضته ربی عزوجل

دەگێڕنەوە لە (عبداللەی كوڕی مەسعود ﷺ) فەرموویەتی: كاتێ ئەو ئایەتە هاتەخوار. كە خودا دەفەرموێ:{مَّن ذَا ٱلَّذِی یُقۡرِضُ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنًا فَیُضَـٰعِفَهُۥ لَهُۥۤ أَضۡعَافًا كَثِیرَةً ۚ وَٱللَّهُ یَقۡبِضُ وَیَبۡصُۜطُ وَإِلَیۡهِ تُرۡجَعُونَ }البقرة/٢٤٥ واتە: چ كەسێك هەیە وام (قرض) بە خودا بدات بە قەرزێكی چاك بەبێ پاداشت و سەرمایەی زیادە و منەت كردنیش بەسەر كەسدا ئینجا خوداش بەو هۆیەوە چەند قات خێر و بەرەكەتی بۆ زیاد دەكات و پاداشتی بێ سنور و نەبڕاوەی دەداتەوە، بەڕاستی خودای گەورەش ڕزق و ڕۆزی دەگرێتەوە و زۆر و فراوانی دەكات، وە ئێمەش حەتمەن دەگەڕێینەوە بۆ لای ئەو پەروەردگارە.

(ئەبودەحداحی ئەنصاری ﷺ)گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، خودای بە توانا و بە دەسەلات وام (قرض)ی لە ئێمەدەوێت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ، (دەحداح) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، ئەو باغەی كە هۆی ژیانی خانەوادەی، دەحداح و، دایكی دەحداحەو (٦٠٠) شەش صەد دارخورمای تێدایە، بۆ خودا بە قەرزمدا. لە دوای ئەوە باوكی دەحداح هاتەوە ماڵ و لە دوورەوە بانگی دایكی دەحداحی كردووگوتی: ئەی دایكی دەحداح: ئەویش گوتی: لە خزمەتتدام؟ پێی گوت: لەو باخە برۆ دەرێ چونكە ماڵی ئێمە نیە بە قەرز داومە بە خودا.

# ناگەنە چاکەی تەواو هەتا ئەوەی خۆشتان دەوێ نەیبەخشن

# لن تنالوا البر حتى تنفقوا مما تحبون

دەگێڕنەوە: باوکی تەلحەﷺ لە هەموو پیاوە ئەنصاریەکان دەوڵەمەندتر و زۆرترین ماڵی هەبوو: خۆشەویست ترین سەروەت و ماڵی باخی( بیرحاء) بوو کە کەوتبووە پێشەوەی مزگەوتی پێغەمبەرﷺ لە مەدینە، ئاوێکی زۆر سازگارو خۆشی تێدابوو. زۆرجار پێغەمبەر ﷺ دەڕۆیشتە ناو ئەو باخەوە و، ئاوی دەخواردەوە و، پشووی دەدا. کاتێ ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە کە دەفەرموێ: {لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ ۚ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِن شَىْءٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ }ال عمران/٩٢

واتە: ئێوە ئادەمیزادەکان هەرگیز ناگەنە چاکە و چاکەکاری تەواو هەتا ئەو شتەی کە زۆر خۆشتان دەوێ نەی بەخشن، وە هەرشتێکیش کە ئێوە دەی بەخشن خودای گەورە پێی ئاگادار و زانایە.

ئەبوتەلحە ﷺ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا خودای گەورە ئەو ئایەتەی فەمووە: منیش خۆشەویست ترین شتی ژیانی ئەو دونیایەم ئەو باخەی (بیرحایە) ئەوا منیش لە پێناوی خودادا بەخشیم ، بە ئومێدی ئەوەی کە خێر و پاداشتی ئەو باخچەم لە لای خودا دەست بکەوێتەوە. ئینجائەی پێغەمبەری خوداﷺ تۆ چۆنی بە باش دەزانی لە پێناوی خوادا بەکاری بهێنە. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئای لەو خۆشیی و بەرەکەتە، بەڕاستی ماڵێکی بەخێر و بەرەکەتە، بەڕاستی ماڵێکی بە بەرەکەتە. من وای بە باش دەزانم کە لەسەر نزیك ترین خزم و خانەوادەی هەژاری خۆت دابەشی بکەی. ئەبوتەلحەش فەرمووی: یارسول الله ﷺ چۆنی پێت باشە وای لێبکە: ئینجا ئەو باخچە خۆشەیان بەسەر خزموکوڕەکانی مامی دابەشیان کرد.

## بەندەكانی خودا بە سروشت وا ڕاهاتون

## عودت عبادالله‌عادە

دەگێڕنەوە: عبداللەی كوڕی جەعفەر ﷺ ڕەوشتی وابوو هەركەسێك داوای هەر چیەكی بكردبایە نائومێد و بێبەشی نەدەكرد. بەڕاستی زۆر بەخشندە و سەخی بوو. تەنانەت زۆر لە هاوڕێیانی لە سەرئەودەست بڵاوییەی لۆمە و سەرزەنشتیان دەكرد. لە وەڵام یاندا دەیفەرموو: برام خودا ئادەمیزادەكانی هەریەكەی بە جۆرێك دروست كردووە و، ڕەوشت و ئاكاری منیش بەو جۆرە، كە پێویستە ببەخشم و بەندەكانی تریش پێیان ببەخشرێ. ئینجا من لەوە دەترسێم كەواز لەو ڕەوشتی بەخشینەبهێنم كە خودا لەگەڵی كردووم، لێم بگرێتەوە و پێم نەبەخشێ.

دەگێڕنەوە كە (لەیسی كوڕی سەعد ﷺ) هەموو ڕۆژێك سامانەكەی (١٠٠٠) هەزار دینار زیادی دەكرد و هەرگیز نەدەگەیشتە ئەندازەی زەكات چونكە نەیدەهێشت ئەو ماڵە ئەوەندە بمێنێتەوە بگاتە ئەندازەی زەكات و، ساڵی بەسەردا بێتەوە: بەڵكو بەردەوام دەیبە خشی و دەیكرە چاكە و لە پێناوی خودادا دەی بەخشی. كە ڕۆژ دەبۆوە قسەی نەدەكرد هەتا خێری بە (٣٦٠) سێسەد و شەست هەژار نەكردبایە ڕۆژێكیان ئافرەتێك داوای كەمێك هەنگوینی لێكرد ئەویش فەرمانیدا جەوەندەیەك هەنگوینی بدەنێ گوتیان: ئەی پێشەوا خۆ ئەوەندەشی نەدەیە ئەو ئافرەتە قاناعەتی هەیە و دڵی تێر دەبێت. ئەویش فەرمووی: ئەو ئافرەتە بە ئەندازەی پێویستی خۆی داوای كردوە. ئێمەش بە ئەندازەی ئەو نیعمەت و بەخشینەی كە خودا لەگەڵمانی كردووە پێی دەبەخشین.

## خودا لەباتی یەك درهەم دە درهەمی پێبەخشیوم

## ان الله أعطانی بكل درهم عشرة

دەگێڕنەوە لە سەردەمی خەلافەتی پێشەوا ئەبوبكر ﷺ نەبوونی و گرانیەكی گەورە ڕووی كردەوڵاتی مەدینە: ئادەمیزادەكان زۆر پەرێشان و تەنگەتا و بوون و، ڕۆیشتن بۆ لای پێشەوا ئەبوبكر و ﷺ گوتیان: ئەی جێنشینی پێغەمبەری

خوداﷻ، ئەوا دەبینین خودای گەورە بارانی لێگرتوینەوە و باران نابارێت و، زەویش هیچ شتێك شین ناكات و ناڕوێت و، وا هەست دەكەین ئادەمیزادەكان بەرە و هیلاك و نەمانی بڕۆن: چیمان بۆ دەكەی چیبكەین باشە؟ پێشەوا فەرمووی: بڕۆنەوە بۆ ماڵەكانتان و ئارام بگرن و، هیوادارم لە خودای گەورە كە توشی نا ئارامی و ناخۆشیتان نەكات. چاوەڕوانی میهرەبانی خودابن كە دەرووی خێرمان لێبكاتەوە. ئادەمیزادەكان لەو ناخۆشی و تەنگەتاویانە بیریان دەكردەوە هەتا ئێوارە هەواڵێك بڵاوبۆوە كە كاروانێكی (١٠٠٠) هەزار حوشتری گەنم و، ڕۆن و، مێوژ و، جۆرا و جۆری خۆراك، ئی(عوسمانی كوڕی عەفانﷺ) لە ڕێگەیە و خەریكە لە شامەوە بگاتە جێ: ئادەمیزادەكان بەو هەواڵە زۆر دڵخۆش بوون هەمویان هاتنەدەر و چاوەڕوانیان دەكرد: كاتێ كاروانەكە گەیشتە جێ‌و بارگە و بارخانەیان خست و عوسمانﷺ ڕۆیشتە ماڵەوە بۆ پشودان. هەرچی بازرگان و فرۆشیارەكانی مەدینە بە هەلیان زانی و ڕۆیشتن بۆ ماڵی عوسمان و گوتیان ئەی عوسمان ئێمە هاتوین ئەو بارگەو بارخانەمان پێ بفرۆشە كە بەڕاستی ئادەمیزادەكان زۆر پێویستیان پێیە. عوسمان فەرمووی: زۆر باشە بەلام پێم بڵێن لەوكاتی پێویستیەدا چەندەم خێردەدەنێ؟ ئەوانیش گوتیان: لە باتی هەر درهەمێك دوو درهەمت دەدەینێ :عوسمان فەرمووی: زیاتریان داومێ. ئەوانیش گوتیان: لەباتی هەر درهەمێك چوار درهەمت دەدەینێ. عوسمانیش فەرمووی: لەوە زیاتریان داومێ. بازرگانەكان گوتیان: لەباتی هەر درهەمێك پێنج درهەمت دەدەینێ. عوسمان فەرمووی: زۆر زیاتریان لەوە داومێ. بازرگانەكان بە جارێك ڕوویان لە عوسمان كردوو گوتیان: ئەی عوسمان خۆ هەرچی بازرگان و فرۆشیاری مەدینە هەیە هەموویان لێرەن: كێیە ئەوەی كە زیاتری پێت داوە؟ پێشەوا عوسمانﷺ فەرمووی: فرۆشتومە بە خودا لەباتی هەر درهەمێك دەدرهەمی پێداوم، ئێوە زیاترم دەدەنێ لەو ئەندازەیە؟ بازرگانەكانیش گوتیان: بە خودا ئێمە ناتوانین زیاتر بدەین. ئینجا عوسمان فەرمووی: ئێوە دەكەم بە شاهید لەسەر خودا كە ئەو باروبارخانەی كە هێناومە هەمووی خێر و سەدەقەبێ، بۆ هەژار و نەدارانی موسڵمانان لە پێناوی ڕەزابونی خودا.

# پاداشتی چاكەكاران بە فیڕۆ نادات

# لانضيع أجرالمحسنين

دەگێڕنەوە: (عبداللهیکوڕی مبارەك) جارێكیان كۆمەڵێك لە زانایان كە(١٠) دە نەفەربوون: بوونە میوانی. بەڵام هەرچی خواردن بێت نەی بوو. تەنهایەك ئەسپ ولاّغی سواری هەبووكە بۆ جیهاد و، بۆ حەج پێی دەڕۆیشت: وە بە ناچاری ئەو ولاّغەی سەربڕی و میوانەكانی پێ بەڕێكرد. لە دواییدا هاوسەرەكەی پێی گوت: ئەی عبدالله تۆ لە هەموو سەروەتی دونیا تەنها ئەو ولاّغەت هەبوو بۆ سەرت بڕی؟ عبدالله زۆر ناڕەحەت بوو بەو قسەیە: دوایی لە ماڵەوەگەڕا هەرچی تێیدا بو بە ئەندازەی بەشی مارەییەكەی، كۆی كردەوە و دایە دەستی خێزانەكەی و تەلاّقیدا و، فەرمووی: ئافرەتێك لە ژیانی هاوسەریمدا حەزبە میوانان نەكات لەگەڵ ژیانی مندا ناگونجێت. ئینجا لە دوای چەند ڕۆژێك كابرایەك هاتە لای عبدالله و پێی گوت: ئەی پێشەوامن كچێكم هەیە ماوەیەكە دایكی مردووە. ئینجا بەو بۆنەیەوە زۆر ناڕەحەتە و غەموو پەژارە و ناشكوری زۆر دەردەبڕێ و هەرچی جل و بەگی ماڵەوەهەیە تێكی وەردەدا و دەیان دڕێنێ. بۆیە پێم خۆشە كە بێتە كۆڕی دانیشتنی تۆ و ئامۆژگاری بكەی و دڵی بدەیەوە بەو ئارام بگرێ و دڵنەرم ببێت و، بەوجۆرە ڕەفتار نەكات. ئینجا هەر بۆ یەكەم جاری ئامادەبوونی ئەو ئافرەتە لە كۆڕ و ئامۆژگاری عبداللەدا، كە لەسەر دوانگەی مینبەر دانیشت و، ناوەڕۆكی باسی ئامۆژگاریەكەی لە بارەی دڵدانەوە و ئارام گری منداڵ و گەنجان لە بارەی مردن و نەمانی دایك و خۆشەویستیان بوو. هەر كە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە ئەو ئافرەتە، گوتی: ئەی بابەگیان بەڕاستی من زۆر نەزان و بەدبەخت بووم كە بەو جۆرە ڕەفتارم دەكرد لە ئێستاوە تۆبە بێت و جارێكی تر كاری وا نافەرمانی نەكەم: بەڵام باوكەگیان من شتێكم لە تۆ دەوێت، ئەگەر بەقسەم بكەی؟ باوكی گوتی كچم من تەنها تۆم هەیە و هەرچی بفەرمووی: بۆت بەدی دەهێنم كارەكەت بڵێ؟ ئەویش گوتی: بابەگیان چەند جارێك فەرمووتە كە گەنج و لاوان داخوازێت دەكەن كە خاوەنی ماڵ و سامانی زۆری ئەو دونیایەن: تكات لێدەكەم توخودا

باوکە بەماڵ و سامانی دونیام مەدە و لە پێناوی پایەی دونیا بەشووم مەدە. یا بە ماڵی دونیا هەڵنەفریوێم و دواڕۆژم نەدۆڕێنم. بەڵکو بمدە پیاوێکی موسڵمانی خواپەرست وەك و پێشەوا عبدالله و شێوەی ئەوەبێت چونکە ئەگەر ئێمە دونیامان هەبێت ئەوە ئەو دینی هەیە. دوای ئەوە باوکی ڕۆیشت و لە عبداللەی ﷺ مارەبڕی و، ماڵ و سامانێکی زۆریشی لەگەڵدا نارد و، دە وڵاغی ڕەسەنی سوارچاکی لەگەڵ کچەکەیدا بۆ عبدالله نارد بۆ ئەوەی لە ڕێگای خوادا جیهادی پێبکات. ئینجا عبدالله ﷺ دەفەرموێ: شەوێك لە خەومدا پێیان گوتم ئەی عبدالله ئەگەر چی لەبەر خاتری ئێمە هاوسەرێکی پیرت تەڵاقدا: ئێمە کچێکی لاوی جوانمان پێبەخشی. وە ئەگەر چی تۆ وڵاخ و ئەسپێکت لە پێناوی ئێمە سەربڕی: ئێمە دە ئەسپی ڕەسەنی باشمان پێ بەخشی و تۆڵەمان بۆ کردییەوە بۆ ئەوەی باش بزانی کە چاکە لە لای ئێمە یەك بە دەیە و بەڕاستی ئێمە پاداشتی چاکان بزر ناکەین. وە هەر کەسێ ئیشی لەگەڵدا کردبین: زەرەر ناکات و پاداشتی دەدەینەوە.

## پاداشتێکی باش

## جزاء الكريم

دەگێڕنەوە: (مسلمی کوڕی وەلیدیﷺ) شاعر، باس دەکات دەڵێ: لە شوێنێکی چۆڵگەی لای خانوەکەم دانیشتبووم: پیاوێکی ناسیاو بەلامدا تێپەڕی: منیش بەرەولای ڕۆیشتم و سەلام و هەواڵ پرسینم لێکردو داوای میواندارێم لێکرد و ڕۆیشتینەوە بۆ ماڵ: بەڵام بە خەردا لە ماڵەوەماندا تەنانەت نیوەی درهەمێکیشم پێنەبوو: تەنها ئەوەی کە گومانم دەبرد هەمبوو یەك جووت (خوف) گۆریە بوو، دامە دەستی منداڵێکم و ناردم بۆ لای دۆستێکم بۆی فرۆشتم بە (٩) نۆ درهەم هێندێك نان و گۆشتی پێکری و گەڕایەوە: کاتی دانیشتنمان لەسەر سفرەی نان خواردن، لە دەرگادراو منیش بەرەولای دەرگا ڕۆیشتم و دەرگام کردەوە: کابرایەك بوو گوتی: تۆ(موسلیمی کوڕی وەلیدی؟) گوتم بەڵێ: داوای بەشداریم کرد بۆ خواردن، نامەیەکی دەرهێنا لە لایەن پێشەوا (زەیدی کوڕی مەزیدﷺ) کە نوسرابوو ئەوا ئێمە (١٠٠٠٠) دە هەزار درهەممان بۆ ناردی کە خۆت ئامادەبکەی

و بۆ لامان بێیت. کابرام بانگ کردە ژوورەوە و خوارد نەکەشمان زیاتر کرد و سەوزە و میوەشمان زیاد کرد. لە دوای نان خواردن هێندێك لەو پارەیەم بە میوانەکەم بەخشی کە ئەویش بۆماڵەوە دیاری وشتێکیان بۆ بکریٚ. لە دواییدا بەرەولای زەید ڕۆیشتین لە (ڕوقەی) لەوکاتەدا لە حەمام بوو. لە دوای تەواو بوون ڕێگەی پێداین و ڕۆیشتینە ژوورەوە، سەر و ڕیشی بە شانە دادەهێنا. سەلاممان لێی کرد: زۆر بە گەرمی و جوانی وەڵامی داینەوە و گوتی:(موسلم) بۆچی وازت لێمان هێناوە؟ منیش گوتم: هۆی دەسەڵاتیتە: هەڵبەستێکم لە مەدح کردنی دانا بوو. ئینجا گوتی: دەزانی بۆچی بانگم کردووی؟ منیش گوتم: نەخێر نازانم.گوتی: لەو چەند شەوانە لە لای ڕەشید بووم، باسی ئەو هەڵبەستانەمان دەکرد: فەرمووی: (زەید)کێیە ئەو هەڵبەست و شیعرانەی بەرامبەرت نوسیوە؟

سل الخليفةسيفامن بنى مضر. يمضى فتحترق الاجسام والهاما

كا لدهرلا ينثنى عمايهم بـه قد اوسـع النلس انعاما وارغا ما

واتە: پێشەوا شیری لە هۆزی بەنی نەزیر لە کالان هێنایەدەر و، ڕۆیشت کە لاشە و ماڵ و حاڵیان بسوتێنیٚ هەروەك و ڕۆژگار هەرگیز دەست لەوشتە هەڵناگریٚ کە مەبەستیەتی ، بەڕاستی بەخشیش زۆر زۆرە بۆ خەڵکان لەگەڵ زۆر لیٚ کردنیشیان. منیش گوتم: بە خوا ئەی پێشەوای موسڵمانان نازانم. ئەویش گوتی:سبحان الله تۆ شتی وا دەڵێیت و ناش زانی کیٚ گوتویەتی؟ دوایی پرسیارم کرد گوتیان: ئەوە (مسلم ی کوڕی وەلیدﷺ) گوتویەتی: منیش بۆیە بە دوای تۆم دانارد هەستە بابڕۆین بۆ لای ڕەشید ﷺ پێشەوای موسڵمانان. کاتیٚ گەیشتنە لای ڕەشید و، لە دوای مۆڵەت و ڕێگە پێدانیان و، سەلام و دانیشتن و، بەخێر هێنان.هەڵبەستێك کە شیاوی ڕەشید ﷺ بێت بۆم گوت: ئەویش لە پاداشتیدا فەرمانیدا (٢٠٠٠٠٠) دوو سەد هەزار درهەمی بە خەڵات پیٚ بەخشیم. هەر لەو کاتەدا (زەید)یش فەرمانیدا (١٩٠٠٠٠) سەدو نەوەت هەزار درهەمی پیٚ بەخشیم و گوتی: نابێت من خەڵات و بەخشینەکەم بگاتە خەڵاتی پێشەوا.بەڕاستی ئەو ئەندازە خەڵاتە هەرچەند زۆر و بیٚ ئەندازە بێت.بە بۆنەی پاداشت و خەڵاتی کابرایەك بوو، کە

خوف و گۆریەكەی فرۆشت بۆ ڕێزلێنانی میوانەكەی.با بە ئەندازە یەكی كەمیش بێت، خودای گەورەش بەو هۆیەوە ماڵێكی زۆری پێ بەخشی.بەڕاستی گەورەیی و میهرەبانی خودای بەخشێنەر زۆر نزیكە بەرامبەر چاكەكاران.

## چاكە لەگەڵ دایك و باوك

## برالوالدين

{ ۞ وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنٗا }النساء/٣٦

واتە: بەڕاستی پەروەردگارتان بپەرستن و عیبادەتی بۆ بكەن و، هەرگیز شەریك و هاوەڵی بۆ بڕیار مەدەن و، بەرامبەر دایك و باوكتان بە ئەمەك و گوێڕایەڵ و باش بن. بەڕاستی شتێكی بەڵگە نەویستە كە دایك و باوك هەردووكیان هۆكارن بۆ بەدی هێنان و پەیدابوونی منداڵەكانیان: وە دایك و باوك هەموو خۆشی و خۆش بەختی خۆیان لە پێناوی خۆشی منداڵەكانیان دا بەخت دەكەن و، چەندین ئێشو ئازاری ناسۆر لە پێناوی خۆشبەختی منداڵكانیان دەچێژن وە هەموو تواناى خۆیان بەخت دەكەن و هیچكات بە فیڕۆنادە و خۆیان هیلاك و ماندوو دەكەن بۆ بەختەوەری و پێگەیاندنی منداڵەكانیان بۆیە خوداش لە بارەیانەوە دەفەرموێ:۞ وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنٗا }النساء/٣٦ واتای ئەو ئایەتەمان لە پێشەوەكرد.

وە ئەگەر سەیر بكەین خودای گەورەتەواوی بەندایەتی بۆ خودای گەورە لەو چەند شتەدا كۆكردۆتەوە: ڕاستی و تەواوی لە پەیمان بردنەسەر و، قایل و ڕازی بوون بەوشتەی كە هەیە و ، ئارام و خۆڕاگری لەسەر ئەو شتەی لە دەستت دەچێت و پارێز گاری لە سنور و نێوانەی كە بۆت دیاری كراوە و، چاكەی بەردەوام و تەواو بەرامبەر بە دایك و باوك.وەوە سەردارۆ و پێشەوا و بەدیهێنەرمان ئامۆژگاریان كردووین كە لەگەڵ دایك و باوكان ڕەفتار و ڕەوشت جوان بین بۆ ئەوەی لە دونیادا سەر بەرز و لە دواڕۆژیشدا ڕزگار و سەر كەوت و بین و لەژێر سێبەر و عەرشی

خودا حیسابمان بكەن لەگەڵ پیاوچاكاندا.وە خودای گەورە ئەو ئینسانەی كە دایك و باوكی ئازار دەدات دەیان ترسێنێ و هەڕەشەیان لێدەكات. كە بەڕاستی ئەوە بەڵاو كارە ساتێكی زۆر گەورەیە: بەتایبەتی كە دایك و باوك لەسەر ئازار و سزای منداڵەكانیان ئارامگر و خۆڕاگرن.تەنانەت خودای گەورە كار و كردەوەی ئەو كەسانەی كە ئازاری دایك و باوكیان دەكەن بەفیڕۆ دەدات و ڕەشدەكاتەوە و ئەگەر خاوەنی هەموو هێز وسامانی دونیا بێت مادام لەگەڵ دایك و باوكی كردار و هەڵوێستی باشی نییە هەموو هێزو سامانەكەی هیچ ناهێنێ.وە ئەوڕۆڵانەی لە فەرمانی چاكەی باوك و دایكیاندان ئەوە لە ژێر پارێزگاری و ڕەزابونی خوداداان و سەركەوتون.

پێشەوا (مەئمونﷺ) دەفەرموێت: هیچ كەسێكم نەدیتوە لە ژیاندا وەك و (فەزلی كوڕی یەحیاﷺ) بەرامبەر بە باوكی باش بێت. تەنانەت یەحیا هەرگیز بە ئاوی سارد دەست نوێژی نەدەگرت لە كاتێكدا كە دیل بوو لە بەندیخانە: لە شەوێكی زۆرسەرمادا دیل ودەرگاوان نەیان هێشت دار بباتە ژووری بەندییەكە ئاو گەرم بكات: كاتێ كە یەحیاﷺ ڕۆیشتە سەر جێگای خەوتن. فەزلی كوڕی هەستا قاپێكی مسی ئاوگەرم كردنی هێنا، بۆی هەیە حەوجۆش بێت : كە وەك و مەسینەی ئێستا وابوو بەڵام لە مس دروست كرابوو: پڕی كرد لە ئاوو، بردیە نزیك چرایەكەی شەویان و هەتا بەیانی بە پێوە ڕاوەستا و ئەو قاپەی بە دەستەوە بوو بۆ ئەوەی تۆزێك گەرم ببێت بەڕاسی فەزڵ بەو جۆرە كردارانەی بەرامبەر بە باوكی: خودای گەورە سەربەرز وسەرفیرازی كرد. وە هەر كەسێكیش بەرامبەر دایك و باوكی كرداری باش بكات، وەیان خەراپە بكات خودا جەزا و پاداشی بەرامنبەر چاكەیان دەداتەوە و بەرامبەر سزا و ئازاریشیان تۆڵەیان لێ دەستێنێ. ئەوەش چەند بەسەر هات و چیرۆكێكن كە ئەو بارودۆخە دەسەلمێنێ.

# بگەڕێوە بۆ لای دایك و باوكت

# إرجع إلی والدیك

كابرایەك هاتەلای پێغەمبەرﷺ كە پەیمانی لێوەربگرێ لە گەڵیدا بڕوات بۆ جەنگ و جیهاد لە پێناوی ڕەزابوونی خودا بۆ ئەو مەبەستە ئەو پیاوە زۆر دڵخۆش و شادمان بوو بەهۆی ئەوەی كە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ دەڕوات بۆ جیهاد كاتێ گەیشتە لای پێغەمبەرﷺ: ئەو پێغەمبەرەیﷺ كە ئاگاداری زۆرشتی نهێنی و نادیاریە، بۆیە پێغەمبەرﷺ پرسیاری لێكرد ئایا دایك و باوكت ماوە؟ كابرا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ هەردووكیان ماون و لە ژیاندان. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بڕۆكرداری چاكە لەگەڵ دایكت و باوكتدا بكە: ئەویش گەڕایەوە بۆ لای دایك و باوكی، ئەو دایك و باوەكە بە گەڕانەوەی كوڕەكەیان زۆر شادمان بوون ودڵیان گەشایەوە لە كاتێك هەرچی ڕووناكی و شادی هەبێت تێیاندا نەمابوو ئەو فرمێسكانەی كە لە دوور كەوتنەوەی كوڕەكەیان دەیان ڕشت سڕیانەوە و وشك بوون.ئەلێرەدا دڵسۆزی و میهرەبانی پێغەمبەری ﷺ خودامان بۆ دەردەكەوێ، لەوكاتەی كە پێغەمبەرﷺ ئاواتە خوازی زیاتری جەنگاوەرێك بوو ئەو كابرایە پێغەمبەریﷺ نەوروژاند و، نەی ویست لەوكاتەشدا سۆز و میهرەبانی فەرامۆش بكات و یەكێك لە جەنگاوەرانی خۆی زیاتر بكات :دانایی خۆی فەرامۆش نەكرد، بەڵكو فەرمووی :برا ڕێز و خزمەتی دایك و باوك كە كەسی تریان نەبێت جیهاد و تێكۆشانە، حەجە، عەمرەیە ، ئەگەر پێغەمبەر ﷺ بیویستبایە تەنها لە كاتی زۆر پێویستیشدا خەڵكان بۆ بەرژەوەندی بەكاربهێنێ ئەوا زۆر بە ئاسانی پێغەمبەرﷺ دەی توانی ئەو كابرایە لە دایك و باوكی دوور بخاتەوە و بەرە و مەیدانی جەنگی دەبرد: بەڵام پێغەمبەرﷺ لەو كاتی پێویستیەشدا ڕێز و خزمەت و خۆشەویستی و خۆش بەختی دایك و باوكی بە بەرزتر و گەورە تر داناوە بەسەر جەنگاوەر و تێكۆشاندا.

## لە دونیادا هاوڕێ و خزمەتگوزارێکی باش بە بۆدایك و باوكت
## وصاحبهما فی الدنیا معروفا/اللقمان/١٥

دەگێڕنەوە لە كات و وادەی حەجدا مەصعەبی كوڕی عەمیر﷛) بە سەركردایەتی (٧٠) حەفتا موسڵمانی مەدینە ڕۆیشتن بۆ خزمەتی پێغەمبەرﷺ كە هەموویان لە پەیمانی عەقەبەی دووەم ئامادەبوون هەر لەگەڵ گەیشتنی بۆ مەككە ڕۆیشتە خزمەتی پێغەمبەرﷺ كارەكەی پێشنیار و ئاراستەی پێغەمبەری خوداﷺ كرو چۆنیەتی ئیسلام و موسڵمانانی مەدینە. هەواڵ گەیش بەدایكی مەسعەب كە هاتۆتە مەككە و بەڵام لە پێشی هەموو كەسێك نەهاتوە بۆ لای ئەو بۆیە دایكی زۆر بە نائارامیەوە سەرزەنشتی زۆری كردوو، یەكێكی لەباتی خۆی نارد بۆلای كوڕەكەی كە بۆچی لە پێشەوە نەهاتوە بۆلای. مەصعەب گوتی: من بە باشم نەزانیوە كە لە پێشی پێغەمبەری ﷺخوداوە بڕۆم بۆلای هیچ كەسێك، ئینجا لە دوای تەواوبوونی زیارەت و كارەكانی لە لای پێغەمبەرﷺ ڕۆیشت بۆ لای دایكی، ئەویش پێی گوت: ئەی مەصعەب ﷛ ئەوەی كەتۆ لە سەری ئەو هەڵگەڕانەوەیە لە دین؟ مەصعەب ﷛ گوتی: دایەگیان من بەڕاستی چومە سەر دین و بەرنامەی خوا و پێغەمبەری خوداﷺ: دایكی گوتی: ئای ڕۆڵەكەم چەند جارێك داد و هاوارم لەبەر كردی جارێك لە حەبەشە و، دووەم جاریش لە مەدینەدا؟ مەصعەب ﷛ گوتی: دایەگیان من لاریم نییە لەوەی كە تۆ بەرامبەرمت كردووە : بەڵام تۆ بزانە من لە بەرئاین و ڕێبازێك كە گرتومە ڕام كردووە لەبەر ئازار و سزای ئێوە. لەو كاتەشدا دایكی ویستی وەك و جارانی پێشو بیگرێ و بەندی بكات، ئەویش گوتی بەخوا هەر كەسێك دەست درێژی بكاتە سەرم دەیكوژم. كاتێ دایكی مەصعەب زانی كە ئەم جارەیان بەڕاستی و بە غیرەتەوە قسەدەكات نەی وێرا دەست درێژی بكەنە سەر دەستی كرد بەگریان. مەصعەب ﷛ گوتی: دایەگیان من چومە سەر دین و ئاینێك، كە فەرمان دەدات بە چاكە و دڵسۆزی بەرامبەر بەدایك و باوكیان و ڕەوشت و ڕەفتاریان دڵسۆزانە بێت: بەڵام بۆ كاری خەراپە و كوفر بە قسەیان نەكەین، ئەی دایكی بەڕێزم بەڕاستی من بۆ تۆ ئامۆژگاری كارێكی زۆر دڵسۆزم،

واز لەو ئاینە پوچ وسەر لێشێواویەی لە سەری دووربکەوە : وەشاهیدی بدە( ان لاإله إلا الله وأن محمدا رسو ل الله) كە بەڕاستی ئەوەبنەمای ڕاستی و بەختەوەر ییە و هۆی ڕازی و قایل بوونی خودا و چاكترین كاری باشی دونیا و دواڕۆژە بەڵام دایكی لەبەر ئەندازە بە دەری نەزانی خۆپەرستی نەی ویست ئامۆژگاریەكانی كوڕەكەی وەربگرێ: بۆیە لەبەر قین و دڵڕەقی لە موسڵمانان لەگەڵ كافرو هاوبەش پەیداكەراندا ڕۆیشتە بەرەكانی جەنگی بەدر و ئوحود .

## خۆشەویست و دڵسۆزی دایك

## حنان الام

إبن القیم ﷺدەگێڕێتەوە: لە دەوەرەی جاهیلیدا منداڵێك باوكی دەمرێت مامەكەی منداڵەكە دەباتەلای خۆی و بەخێوی دەكات هەتا گەورەدەبێت ودەبێ بە پیاو: ئینجا لەوكاتەی كە پەیامی پێغەمبەری خوداﷺی پێدەگات ئەو گەنجە بە مامی دەڵێت: ئەی مامە دەمەوێت بڕۆم بۆلای پێغەمبەر.ﷺ مامی پێی دەڵێت سوێند بەخودا ئەگەر بڕۆی بۆ لای محمدﷺ هەرچی لەبەرت دایە لێت دەستێنمەوە و ڕووتت دەكەمەوە و هیچت نادەمێ و، تەنانەت ئەو بەرگەی لە بەریشتدایە لێت دەستێنمەوە. ئەو گەنجەش لەوەڵامیدا دەڵێ ئەی مامە هەرچیت لە دەست دێت بیكە بەدڵنیاییەوە من دەڕۆم بۆلای پێغەمبەرﷺ: مامی هەمووشتێكی لێساندەوە تەنانەت بەرگەكەشی لە بەرداڕنیو ڕووتی كردەوەوەك و ئەوكاتەی كە لە دایك دەبێت: دایكی ئەو كوڕە كە زانی كوڕەكەی سوورە لەسەر ئەوەی بڕاوات بۆلای محمدﷺ كە چاوی بەوجۆرە بەكوڕەكەی كەوت سۆزی دایكایەتی بۆ جولاّ و ڕۆیشت جاجمێكی خەت داری درێژی هێنا و كردیە دووپارچە و پارچەیەكی بە كوڕەكەی داخۆی پێداپۆشی و، ئینجابەرە و لای پێغەمبەرﷺ ڕێگای گرتەبەر كە لەوكاتەدا پێغەمبەرﷺ لە جەنگ و جیهاد دابوو. ئەویش ڕۆیشتە بەرەی جەنگ و لەگەڵ سوپای پێغەمبەری خوداﷺ جەنگا هەتا شەهید بوو:ئینجا لە دوای ئەوە بەناوی ( ذی البجادین) ناوی دەركرد واتە خاوەنی دوو پارچەكە .

# تۆ ئازارت داوە پێشی ئەوەی ئازارت بدات

# عققته قبل ان يعقك

دەگێڕنەوە كابرایەك ڕۆیشتە خزمەتی پێشەوای موسڵمانان عومەری كوڕی خەتاب ﷺ سكاڵای لە دەستی كوڕەكەی كردو و گوتی ئەو كوڕەم زۆر ئازارم دەدات: پێشەوا فەرمووی: كوڕە تۆ لە خودا ناترسی ئازاری باوكت دەدەوی؟ كوڕەكە گوتی : ئەی پێشەوا منداڵ حەق و مافی لەسەر باوكی هەیە؟ پێشەوا فەرمووی: پێویستە كە لە دایكی بوو ناوێكی خۆشی لێبنێت و، فێری خوێندنەوە و نوسینی بكات. كوڕەكەش گوتی: واللەی ئەی پێشەوا باوكم دایكێكی باش و دڵسۆزی بۆ هەڵ نەبژاردوم ، جاریەكی كڕیوە و منی لێبووم، وە ناوێكی خۆشیشی لێ نەناوم: ناوم (جعلا، جعرانا) بە مانای قالۆچە وە یەك ئایەت و، هیچ شتێكیشی فێر نەكردووم.پێشەوا عومەرﷺ سەیری كابرای كردوو فەرمووی: توخودا تۆ دەڵێی كوڕەكەم ئازارم دەدا؟ ئەتۆ ئەوت ئازارداوە پێشی ئەوەی ئەتۆ ئازاربدات. هەستە لێرەبڕۆ!!

# ئەتۆ بەخۆت وماڵەكەشت ئی باوكتی

# أنت ومالك لابيك

دەگێڕنەوە ڕۆژێك گەنجێك ڕۆیشتە لای پێغەمبەری خوداﷺوسكاڵای لەدەستی باوكی كرد گوتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺباوكم زوڵمم لێدەكاو ماڵم لێدەستێنێ: پێغەمبەرﷺ داوای ئامادەبوونی باوكی كرد:كاتێ باوكی هات پیاوێكی پیری بێ هێز و توانای خۆی بەسەرگۆچان‌وداردەستەكەیدا خستبوو: پێغەمبەرﷺپرسیاری لێكرد.كابرا گوتی:ئەی پێغەمبەری خوداﷺلەكاتێك كە ئەو كوڕەم لاوازوبێ هێز بوو: منیش بەهێزو بەتوانا بووم. وە ئەو هەژار و نەدار بوو: منیش زەنگین ودەوڵەمەندبووم: ئەوكاتەلە هیچ شتێكدا ئەو كوڕەم نەگێڕاوەتەوە لە ماڵەكەمدا.بەڵام ئەمڕۆ ئەو بەهێز و بەتواناو، زەنگین‌و دەوڵەمەندە: بەڵام ئەمن فەقیر و هەژارو، بێهێز و بێتوانام. ئەویش سپڵە وبەدبەختەو ڕژدی‌و چاوچنۆكیم پێوە دەكات‌و، ماڵم لێدەگرێتەوەوهیچم ناداتێ.پێغەمبەرﷺدەستی كردبەگریان‌و، فەرمووی: بەڕاستی هەربەردووداروشتێك گوێی لەو شتە بێت حەتمەن دەگریا. ئینجا پێغەمبەرﷺ بەكوڕەكەی فەرموو: ئەی برا تۆش و ماڵەكەشت هەمووی ئی باوكتە.

## چاكەی پێغەمبەر ﷺ بەرامبەر بەدایكی

## بر الرسول ﷺ بوالدته

ڕۆژێك پێغەمبەرﷺ ڕۆیشت بۆ سەردانو زیارەتی گۆڕستان و كۆمەڵێكیشی لە یارەكانی لەگەڵدا بوو:هەتا گەیشتنە سەر گۆڕستان.فەرمانی پێكردین هەموومان دانیشتین، پێغەمبەریش ﷺ بەسەر گۆڕەكاندا تێدەپەڕیو، شۆقاوی دەهاویشت هەتا گەیشتە سەر گۆڕێكو، دانیشتو دەستی كرد بە پاڕانەوە، زۆرپاڕایەوە، لەدواییدا دەنگی بەگریا نەوە بەرزكردەوەو، ئێمەش هەموومان لەبەر گریانی پێغەمبەر دەستمان كرد بەگریان :دوایی ڕووی لە هاوڕێكانی كرد.پێشەوا عومەرﷺ فەرمووی: ئەی پێغەمبەریﷺ خودا بۆچی گریای ئێمەش لەبەر گریانی تۆ هەموومان زۆر پەرێشان و ترسمان لێنیشتو گریاین؟ پێغەمبەریشﷺ دەستی پێشەوا عومەری گرت و ڕووی سوڕاندو بەرەولای هاوڕێكانی ڕۆیشتو، فەرمووی: گریانی من ئێوەی ترساند؟ ئەوانیش گوتیان بەڵی ترساین. پێغەمبەر ﷺ سێجار ئەو قسەی دووبارەكردەوە. ئینجا فەرمووی: ئەو گۆڕەی كە لەسەری دەپاڕامەوە ئەوە گۆڕی دایكم ئامینەی كچی وەهەب بوو: داوام لەخودا كرد ڕێگەی زیارەت ودیدەنی گۆڕەكەی پێدام.

## هەركەسێ هاوسەرەكەی بەڕێزتر بزانێ لەسەردایكی

## من آثر إمرأته على والدته

دەگێڕنەوە: عەلقەمە ﷺ كە لە چاكترین پیاوە باشەكان بوو لە سەردەمی پێغەمبەرداﷺ كاتێ نەخۆشبوو لەدوا ساتەكانی ژیانیدا نزیكی گیانەڵابوو: دەیتوانی هەموو قسەیەك بكات تەنهانەی دەتوانی كەلیمەی شاهادەت بەدەمیدا بێت لەكاتی گوتنی ئەو وشەیە زوبانی دەگیرا و بۆی دەرنەدەبڕدرا لەبەر ئەوە ڕۆیشتنە لای پێغەمبەری خوداﷺو، بەپێغەمبەریان ڕاگەیاند كە عەلقەمەچی بەسەر هاتووە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: دایكو باوكی لەژیاندا ماون ؟گوتیان:ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ باوكی مردووەودایكی ماوەو لە سەرپێیەكانی بەچاكی

ناڕوات: پێغەمبەرﷺ ئاماژەی بۆ بیلال و عەمارﷺ کرد: فەرمووی: بڕۆن بۆلای دایکی عەلقەمەو پێی بڵێن ئەگەر توانای هاتنی هەیە با بۆلامان بێت: ئەگەر ناتوانیٚ من دەڕۆم بۆ لای. ئەوانیش ڕۆیشتن و هەواڵەکەیان بەدایکی عەلقەمە ڕاگەیاند ئەویش گوتی: بەدایك و باوکمەوە بەفیدای بین دەبیٚ هەربۆخۆم بێم بۆلای پێغەمبەرﷺ ئەو ئافرەتە بەو حاڵی شلە پەتیەوە وەك و هیچ نەخۆش نەبێت و هەستاو ڕۆیشت بۆ خزموت پێغەمبەروﷺ پرسیاری لیٚ کردئەی دایکی عەلقەمە بارودۆخی عەلقەمە دەزانی چۆنە؟دایکیشی گوتی: عەلقەمە زۆر باشە نوێژ دەکات و ڕۆژو دەگرێت و لەماڵی دەستکەوتی جەنگی پێنجیەکی دەدرێتیٚ. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەدی بارودۆخی نێوانی خۆت و ئەوچۆنە؟ دایکی گوتی: بەخوا ئەی پێغەمبەری خوداﷺ من لایی تورەم و ڕقم لیی هەستاوە. پێغەمبەرﷺ فەرمووی لەبەرچی لیی تورەی؟ دایکی گوتی: بە خودا ئەی پێغەمبەری خوداﷺ عەلقەمە هاوسەرەکەی زۆر بەگەورە ترو بەڕێز تردادەنیٚ لەسەرمن. ئینجا پێغەمبەرﷺ ویستی هەستی خۆشەویستی دایکایەتی بۆڕۆڵەکانیان لەدڵیدا بجولێنیٚ و لەکوڕەکەی ببوریٚ و لەسزاو ئاگری دۆزەخ ڕزگاری ببیٚ. بۆیە پێغەمبەرﷺ داوای لە بیلال و عەمارﷺ کرد کەبڕۆن کۆڵێك دار بهێنن. دایکی عەلقەمە گوتی: دارت بۆ چییە ئەی پێغەمبەری خوداﷺ؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بۆئەوەی عەلقەمەی هەر لە دوونیادا پیٚ بسوتێنم لەپێشی ئەوەی لەڕۆژی دواییدا بیسوتێنن. دایکی گوتی: توخودا دەتەوێت ڕۆڵە و پارچەی جگەرم لەبەر چاوی مندا بسوتێنی. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵیٚ بەڕاستی یان دەبیٚ ئەتۆلیی ببوری و بیبەخشی یان ئێستا لەناوئاگردەیسوتێنم.ئەم جاردایکی عەلقەمە لەناخی دڵیەوەبەگیانێکی تەواولێبوردوانەوە هاواری کردو گوتی: ئەی خودای بەبەزەیی لە ئاسمانەکان و، ئەی پێغەمبەری خوداﷺ لەسەر زەوی وئەی ئەوانەی کەهەمووتان لێرەئامادەن دەتانکەم بەشاهید، کەمن لە عەلقەمەی کوڕم خۆش بووم.ئینجالەدوای ئەوە پێغەمبەرﷺبەبیلال و عەماریﷺ فەرموو:ئێستا بڕۆن بۆلای عەلقەمەو گوێی لێبگرن بزانن دان بەوشەی شەهادەت دا دە هێنیٚ چونکە وا هەست دەکریٚ کە دایکی عەلقەمە ئەو لێخۆش بوونەی تەنها بەزووبان

بێت و لە ناخیەوە نەبێت. کاتێ کە بیلال و عەمار گەیشتنە لای عەلقەمە لە کۆتا هەناسەی دوای ژیانی بوو شەهادەتی دەهێنا. ئینجا لەدوای شۆردن و کفن کردنی: پێغەمبەرﷺلەگەڵ تەرمەکەی ڕۆیشتە سەرگۆڕستان و، لەسەرکەناری گۆڕەکەی ڕاوەستا و فەرمووی: ئەی ئادەمیزا دەکان بزانن هەر کەسێ هاوسەرەکەی بە بەڕێز و گەورەتر لە دایکی سەیر بکات و بە زیاتر لە ئەندازەی دایکایە تی ڕێزی لێنەگرێ و لێی تووڕەبێت. ئەوەبزانن تورەیی و نەفرینی خودای لەسەرە هەتا ڕۆژی دوایی.

## ئەوە گەورەترین سەرپێچیکاری ئادەمیزادەکانە بەرامبەر بەدایکی

## هذا أعق الناس

پێشەوا ئەسمەعی‌ﷺ دەفەرموێ: کابرایەکمی عەرەب قسەی بۆکردم: گوتی: کاتێکی زۆرم تەرخان کرد بۆ گەڕان بە دوای سەرپێچی کارترین ئادەمیزاد بەرامبەر دایک و باوکی بەو شێوەیە سەرقاڵی گەڕان بوو لە کۆچە و کۆڵانەکاندا وەختێك گەیشتمە پیرێکی بەساڵدا چوو پەتێکی لە ئەستۆیدا بوو دۆلکەیەکی زۆر قورس وگرانی پێوەبو ڕای دەکێشالەکاتی قرچەو بەتین ترین گەرمای نیوەڕۆ، کەحوشتر توانا و هێزی هەڵگرتنی ئەو دۆلکەی نەبوو. ئینجا لەدوای ئەو پیرە پیاوە گەنجێکی بەتوانای بەدواوە بوو بەقامچیەکی بەهێز لێشی دەداو هەموو پشتی پیاوەپیرەکەش بەولێدان پەتە بریندار وزامدار کردبوو. منیش پێم گوت: کوڕە تۆ لەخودا ناترسی و شەرم ناکەی بەرامبەر ئەو پیاوە پیرە وادەکەی سەرەڕای ئەو دۆلکەش لێشی دەدەی؟ ئەو گەنجەش گوتی سەرەڕای ئەو هەموو ئازاردانەشی ئەوە باوکمە. منیش گوتم: خودا پاداشتی خێرت نەداتەوە لەگەڵ ئەوکارەی لەگەڵیدا دەکەی. ئەو گەنجەش گوتی: برام وامەڵێ وبێدەنگ بە چونکە ئەوباوکەی من لەگەڵ باوکی خۆیدا ئەوهای کردووە باوکی ئەویش لەگەڵ باپیری داوای کردوە هەر کەسەو جەزای خۆی وەر دەگرێتەوە: منیش گوتم: بەڕاستی ئەوەسەرپێچی کارترینی ئادەمیزادە بەرامبەر دایك و باوکی .

## ئازادی بیروڕا :حريه الرأى

## ان افضل الجهاد كلمة حق عـند سلطان جائر

لەدیمەن‌و ڕواڵەتی ئیسلام بۆ خودی كەسایەتی ئینسان زامن‌و دەستەبەری تەواوی ئازادی بیروڕایەكە بەشێكە لە بەشەكانی ئازادی‌و سەربەستی.ئەوەش لە هەرە بەهاترین‌و بە نرخترین ستون و كۆڵەكەی گرینگی ئاینی سەربەستی ئیسلامی پێوە دیارو ڕاوەستاوە.دینی سەربەرزی ئیسلام لە ڕاپۆرت و بڕیارنامەی ئازادی بیرو ڕادا دوو تێڕوانینی باشی هەیە.

یەكەم: ئازادی بیروڕای كردەوەبەحەقێكی زامنی دەستە بەركراوبۆ هەموو ئەو كەسانەی كە دروستە بیروڕای تایبەتی باوەڕپێكراویان هەبێت.

دووەم: فەرمان دەكات بە فەرمانێكی بنەبڕ و كۆتایی، بەدەرخستنی بیروڕای تایبەت لەو گیروگرفتە ئاڵۆزانەی كەدین‌و كۆمەڵە ئیسلامیەكانی پێتاوان باردەكرێ، بۆ ئەوەی ئادەمیزادەكان لەو فێڵ‌و پیلانانە ئاگادار بكرێنەوە، بۆ ئەوەی خۆپارێزی بكەن لەو مەترسیانەی كە بەرەوڕووی كۆمەڵگایەكەیان دەبێتەوە. یان دەربڕینی ڕێباز و ئاڕایەك بۆئەوەی كۆمەڵگای ئادەمیزاد بۆ بەدی هێنانی ژیانێكی ئارام گری‌و ئاسایش و خۆش بەختی بیگرنە بەروە پێویستە بیرێكی چاپوك‌و نەترس بۆپێك هێنانی كارێكی تەواو بۆ چاوەدێری ڕووداوە گەڕۆكەكان كەلەبەرژەوەندی كۆمەڵدابێت ئازاو خۆڕاگرانە بوەستی بەرامبەر هەموو ڕووداوێكی دژبە ئاشتی‌و تەندروستی. هەر لەبەر ئەوەشە كەپێغەمبەری ﷺ سەروەرمان هانی ئەو ئازادی‌و سەربەستیەی داوە كە دەفەرموێ:

﴿ من راى منكم منكرا فليغيره بيده فإن لم يستطع فبلسانه فإن لم يستطع فبقلبه وذالك اضعف الايمان﴾ وە هەر بەو جۆرەش پێشەوا عومەرﷺ فەرموویەتی خۆش بەختی گیان‌و ئاسودەیی ژیان كاتێك بەدەست دێت كە گەنج‌و لاوەكانی وڵات سەربەستی‌وئازادی بیرو ڕایان هەبێت‌و بایەخ بەحەق‌و مافیان بدەن و بە تەنگەوە بن بۆ بەدیهێنانی ڕایەكەیان بەئاشكراو پەنهانی. وە هەر یاساو فەرمانێكی ڕاستی دەرچوو بەرەو ڕووی بڕۆن‌وبە جێی بهێنن. ئینجا خودای بەبەزەیی سۆزوبەزەیی

خۆی بڕژێنێ بەسەرئەوکاربەدەستوفەرمان ڕەوایانەی کەتەواو کاروپێویستی خۆیان دەزانن‌و، پێویستی سەرشانی خۆیان بەدی دەهێنن. وەدوو بارە خودای گەورە بەزەیی‌و سۆزی خۆی بڕژێنی بەسەر ئەو کۆڕو کۆمەڵانەی باوەڕی ڕاستیان بەخودا هێناوەو وە بە تەنگەوەن بۆبەدی هێنانی ئامانج و فەرمانەکانی. وەخودای گەورە ئەو ئاینەی سەربەرزو پارێزراو کرد بۆ بەدیهێنان‌و گەیاندنی هەدەف‌و ئامانجەکانی. وە خودای گەورە موسڵمانانی پێشووی سەربەرزکردلەژیان دا بە خۆڕاگری‌و مانەوە یان وەك‌و گەلێك کە شانازیان بە ئاینەکەیانەوە دەکرد. وەسەر بەرزو سەرفیرازی کردن بەهۆی خۆڕاگری لەسەر ئاین‌و بەرنامەکەیان، وە ڕێزی تەواوی بۆ بەرەی ئادەمیزاد نارد بەهۆی ئاینەوە.

## ئافرەتێك ڕاستی پێکاو عومەر هەڵەی کرد

## أصابت إمرأة وأخطأ عمر

جارێکیان حەزرەتی عومەرﷺبیرو ڕای خۆی لەناو جەماوەرێکی زۆردا لەمزگەوت دەربڕی‌و بڵاوی کردەوە، کە هیچ کەسێك لە ئافرەتانی موسڵمان بۆی نیە کەمارەیی زیاترلە کچەکانی پێغەمبەرﷺ وەربگرێت. بۆیەدەنگی ناڕەزایی لەناو ئاپۆرەی جەماوەر لە مزگەوت بڵاوبۆوە: پێشەوا عومەر ﷺهەموویانی بێدەنگ کرد. بەڵام ئافرەتێك دەنگی بەرزکردەوەو تەواوی جەماوەری مزگەوتی خرۆشاند و هەمووی بێدەنگ کردن‌و بە بەڵگەی تەواو بەپێشەوا عومەری ﷺ سەلماند کە لەو پێشنیارەی عومەرﷺ کردوویەتی هەڵەیە. هیچ کەسێك بۆی نەبوو قسەکە بەو ئافرەتە ببڕیٚ‌و بڵی تۆ ئافرەتی‌و بۆت نیە لەو بارەوە ڕەخنە لە پێشەوای موسڵمانان بگری و بێدەنگ ببە.بە پێچەوانە وە پێشەوا عومەرﷺتەواو گوێی ڕاگرتبوو هەتا بە تەواوی ئەو ئافرەتە لە قسەو پێشنیارەکەی بۆوە. کاتێ عومەرﷺ بۆی دەرکەوت کەقسەی ئەو ئافرەتە ڕاستەوعومەرﷺ هەڵەی کردووە.پێشەوا عومەرﷺ هەر خێرا ڕۆیشتە سەر مینبەرو زۆر بەڕاشکاوی‌و داد پەروەرانە فەرمووی: خەڵکینە بەڕاستی ئاگاداربن من لەو بارۆەوە هەڵەم کردوو ئەو ئافرەتە پێکای‌و ڕاستی گوت: ئینجا ئەگەر ئێمەش دەمانەوێ ئەو بنچینە و بناغەیە

دەقاودەق لەژیانماندا بچەسپێنین ئەوە زۆرباشە.بەڵام ئەگەر نەتوانین حەق‌و ڕاستیەکان بە کار بە دەست‌و لێپرسراوان بڵێین:دەبێ زۆرباش بزانین کە هیچ هەستی چاکەمان تێدا نەماوە. لەلایەکی تریشەوە، ئەگەر کاربەدەست و لێ پرسراوان ڕەخنەو پێشنیار و ڕاستیەکانمان لێوەرنەگرن، ئەوە بەڕاستی ئەوانیش هیچ خێرو چاکەیان تێدا نەماوە. دەبێ ئەوەش زۆرباش بزانین ئەوکۆمەڵ‌و جەماوەرە ڕزگاریان نابێت هەتا بەو جۆرە ڕەفتار نەکەن.

## ئەتۆ بڵێ‌و ئێمە گوێ دەگرین

## إذن قل، نسمع

دەگێڕنەوە جارێکیان سەلمانی فارسیؓ کەیەکێك لە عەوامی موسڵمانانە لەوتاری هەینیدا عومەری کوڕی خەتابؓ بەرامبەر ئەو هەموو جەماوەرەی موسڵمانان ڕادەگرێت و ڕەخنەی لێدەگرێت و پرسیاری لێدەکات و هیچ کەسێکیش لەو هەموو جەماوەرو کاربەدەست‌و لێپرسراوانە بۆی نیە پێی بڵێ ئەتۆ چی ڕەخنە لەپێشەوا بگری! لەبرئەوەی چونکەڕاستیەك کە شارەزایی تێدایە ڕوونی دەکاتەوەو، بەئەرکی سەرشانی خۆی دەزانێ لەبەر ڕەزابوونی خودادەری ببڕێ. نەوەك‌و ئێمە لەزۆر شتدا خەریکە دڵمان دەتۆقێ ناوێرین هیچ بڵێین‌و دەی شارینەوە. ئەوڕەخنە گرتنەی سەلمانؓ لەکاتێکدا بوو سوپای موسڵمانان لە جەنگی فارسدا سەرکەوتوو بوون‌و ماڵ‌و دەستکەوتی باشیان هێنابوو: ڕۆژی هەینی کەعومەرؓ ڕۆیشتە سەردوانگەی مینبەرەکەی و لەسەر بڵندگۆی مزگەوت فەرمووی: ئەی موسڵمانان گوێ بگرن‌و لە فەرماندابن: لەو کاتەدا سەلمان هەستایە سەرپێ و گوتی بەخوا عومەرؓ نەگوێت لێدەگرین‌و نە لە فەرمانیشت دادەبین. عومەریشؓ زۆر لەسەرە خۆو بەهێمنی فەرمووی : لەبەرچی گوێم لێناگرن؟ سەلمان گوتی: ئەی عومەر ؓئەو قوماش‌و بەرگەی ماڵی دەست کەوتی کە بۆمان هاتووە تۆ هەر یەکەی پارچەیەکت پێداوین، بەڵام کە سەیر دەکەم تۆ دوو پارچەت لەو قوماشە لەبەردایە؟ عومەرؓهەر لەسەر دوانگەی مینبەرەکە سەیری عبدالله ی کوڕی دەکات‌و دەڵێ: عبدالله هەستە تۆپێی بڵێ، عبداللەی

كوڕی عومەر ﷺهەڵدەستیٚ و دەڵیٚ: بەخوا پارچەكیان لەو قوماشە ئیمن بوو.چونكە پارچە قوماشەكەی باوكم كەلەبەری كرد زۆر كورت بوو. منیش پارچەكەی خۆم دایە. ئینجا لەوكاتەدا سەلمانﷺ گوتی: مادام وایە قسەبكە گوێت لێدەگرین .

## چاو نەترسی لەڕاستیدا

## الجرأه فی الحق

جارێكیان(عومەری كوڕی خەتابﷺ)كە بووە جێنشین وپێشەوای موسڵمانان و، لێپر سراوی تەواوی ئادەمیزادەكان: لەسەر دوانگەی مزگەوت لەوتارەكەیدا فەرمووی (من رأی منكم منی إعوجاجا فلیقومه) واتە: هەر كەسێك لە ئێوە خەراپەو نارێكیەكی لە ئێمە دیت باڕاستمان بكاتەوە. كابرایەك لە ناوەڕاستی ئاپۆرەی جەماوەردا هەستایە سەرپێ و شیری لەكالان هێنایە دەر و هاواری كرد: كە هەموو جەماوەرەكەی سەرسام كردبوو كەئەودەنگە چیبوو: كە گوێیان ڕاگرت. كابراكە گوتی: ئەی عومەرﷺ سوێند بە خودائەگەرلاری و نارێكیەكت تێدا بدینین بەوشیرە ڕاستت دەكینەوە. لەوكاتەدا پێشەوا عومەرﷺ زۆركەیف خۆشبوو فەرمووی: سوپاس بۆئەو خودایە كە لە نەوەو هۆزی پێغەمبەرﷺ داپیاوی وا هەیە كە لە كاتی لاریدا عومەر بەشیر ڕاست دەكاتەوە.

## ئەوكەسە كێیەبەدڵنیاییەوە بەدەوری كەعبەدا دەسوڕێتەوە

## من الذی یطوف آمنا

دەگێڕنەوە سعدی كوڕی موعازﷺبۆ بەجێهێنانی عەمرە ڕۆیشتە مەككە یەكەمین جار ڕۆیشتە لای دۆست و هاوڕێیەكەی ئومەیەی كوڕی خەلەف، چونكە ئومەیەش هەر چەندجاری كە دەڕۆیشتە شام بۆ بازرگانی لەمەدینە لەلای سەعد لای دەداودەمایە وە.بەڵام ئومەیەدڵی زۆرنیگەران بوو چونكە موسڵمان بوونی سەعد ڕۆیشتنی سەعد بۆ سوڕانەوەی بەدەورەی كەعبەو(طواف)كردن جێگەی تەنگی و دڵەڕاوكەیەكی زۆر ترسناك و بەهێزبوو، لەبەرڕوودانی كارەسات وناخۆشی لە نێوانی سەعدو بێباوە ڕانی مەككە.بۆیە ئومەیە بۆ ئەو مەبەستە داوای لە سەعد

كرد كە نەڕوات بۆتەوافی كەعبە هەتاكاتی گەرمای نیوەڕۆ چونكە لەو كاتەدا خەڵك لەبەر گەرمالەدەرەوەنابن و كەس ئاگاداری تەوافەكەت نابێ هەتا كارەساتت بۆدروست بكەن. بەڵام لەوكاتی گەرماو چۆڵیەدا كە سەعد ڕۆیشتە تەواف و دەستی پێكرد: ئەبوجەهل بۆلای بەیت ڕۆیشت و سەیری كرد یەكێك بەدەورەی بەیتدا دەسوڕێتەوە.بۆیە هاواری كردوو گوتی:ئەوە كێیە بە سەربەستی و دڵنیاییەوە بەدەورەی بەیتدا دەسووڕێتەوە؟ سەعد یش زۆر بەسەر بەستانە گوتی: ئەوەمنم سەعد.ئەبوجەهل گوتی:ئێوە محمدو هاوڕێكانیتان لە مەدینە جێكردۆتەوەو، هاوكاریان دەكەن ودەیان حەوێننەوەو، لێرەش بەسەربەستیەوە بەدەورەی بەیتدا دەسوڕێیەوە؟ سەعد ﷺبەدڵنیا ییەوە گوتی :بەڵێ چۆنی دەڵێی وایە. هەراو كێشەیان لێبەرز بۆوەو سەعد بەسەر ئەبوجەهلدا نەڕاندی و، لەو كاتەدا ئومەیەی دۆستی سەعدﷺڕووی لەسەعد كردو و گوتی:ئەی سەعد بەسەر ئەبو حەكەمدا دەنگ بەرزنەكەیەوە ، ئەوە گەورەو سەروەری ئەو دۆڵ و شیوەن. ئینجا سەعد كەزانی دۆستەكەشی لەسەر ئەبوجەهل دەكاتەوە ، پێیگوت: ئەی ئومەیە زۆرباش بزانە بەخوداوازم لێ نەهێنن بۆ ئەوەی تەوافەكەم تەواو نەكەم. ئەو ڕێگایەت لێ دەگرم كە بۆ بازرگانی پێیدا دەڕۆی بۆشام.

## ئەی دوژمنی خودا بەهۆی ئەوەی كردت ڕزگارت نابێ

## لن تلفت بمافعلت يا عدوالله

ڕۆژێك ئەبوجەهل بە شوێنێكدا ڕۆیشت كۆمەڵێك خەڵك كۆببوونەوە لە دەورەی پیاوێكی لاوازی گچكەو ورد: كەسەیری كردئەوە عبداللەی كوڕی مەسعودە ﷺبە دەنگە ناسك و خۆشەكەی ئەو ئایەتە قورئانییەی دەخوێند كەخودا دەفەرموێ:

وَعِبَادُ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمۡشُونَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ هَوۡنٗا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلۡجَٰهِلُونَ قَالُواْ سَلَٰمٗا

} الفرقان/٦٣واتە: بەندە ڕاستەقینەكانی خودا ئەوا نەنكە بەسەر زەویدا دەڕۆن زۆر بەهێدی و نەرمی دەڕۆن و، هەر كاتێكیش نەفام و ناحەزانی ئیسلام قسەیان پێ بڵێن ئەوان بەقسەی جوان و ڕێك وەڵامیان دەدەنەوە.

ئەبو جەهل کاتێ گوێی لەو قسانە بوو ئاگری غەزەبی هاتە جۆش‌ودادەرەست‌و کەوانێکی بەهەموهێزی لە سەری دەدات‌و سەری دەیشکێنێ‌و پێی دەڵێ ئەی قوڕت بەسەر کوڕی مەسعود، ئەی کوڕی دایکی بەندە ئێستاش وازلە هاوپەیمان‌و بەندەکانمان ناهێنی‌و بەدڕەوشت‌و خەراپیان دەکەی؟ وەمن وا هەست دەکەم کەتۆ واز لەوکارەت ناهێنی هەتا سزاو ئازارێکی زۆربە هێزت نەدەم.عبداللەی کوڕی مەسعود﷛ لەبۆسەیە کی خۆمەڵاس داندا بەدەروونێکی زۆر شپرزە و پەشۆکاوی، بە ئازایەتیەکی بێ وێنەوە وەک‌و بروسکە هەتا هێزی تێدابوو مستە کوڵەیەکی لەسینگی ئەبوجەهل داو شەقازلەیەکیشی لە ڕوخساری دا.ئەبوجەهل هاواری کرد سوێندبێت ئەی گێژی شوانەوێڵە هەرگیزلەدەستم ڕزگارت نابێت.کوڕی مەسعودیش فەرمووی: سوێندبە خودا تۆش لەدەستم ڕزگارت نابێ بەهۆی ئەوکردەوەت ئەی دووژمنی خودا.بەوجۆرە ڕۆژگار هات و تێپەڕی ئەبوجەهل دوژمن‌ونەیارەکەی خۆی چاو پێنە کەوتەوە هەتاڕۆژی(بەدر)ئەوڕۆژە عبداللەی کوڕی مەسعود﷛ ڕۆیشت بەناو کوژراوو بریندارەکانی مەیدانی جەنگ دا دەگەڕا لەپڕدا چاوی بە لاشەی ئەبوجەهل کەوت کەهێشتاگیانی دەرنەچووبوو ڕۆیشتە لای‌و قاچە باریکەکانی لەسەر سینگی داناو گوتی : ئەی دوژمنی خودا ، خودا سوک‌و ڕیسواو شەرمەزاری نەکردی!؟ لەوکاتەدا ئەبوجەهل گوتی: ئەوە تۆی ئەی شوانەوێڵەی ئاژەڵی؟ بەڕاستی گەیشتمە دۆخێکی زۆر قورس‌و ناخۆش‌و گران عبدالله فەرمووی: ئەی دوژمنی خودا بەهۆی ئەو هەمو و دووژمنایەتی‌و شەڕەنگێزیەت بەرامبەر موسڵمانان خودا ئاواسوک‌و شەرمەزارت دەکات. ئێستا بچێژە سزاو ئازاری دونیا. وەسزاو ئازاری ڕۆژی دوایی زۆر گەورە ترو بەهێزترە، کە بەزنجیر و تۆق کراوی بەئاگری بەتین و تەوژم ئازارت دەدەن. ئینجا لەدوای ئەو گوفتوگۆیە عبدالله شیرەکەی بەسەر سەری داهێناو تەواوی کرد.

# سیخوڕی مەکەن

# ولا تجسسوا

دەگێڕنەوە:پێشەوا (عومەری کوڕی خەتابﷺ)شەوێکی درەنگ وتاریك بەناو کۆڵانەکانی مەدینە دەسوڕایەوە بۆ ئاگاداربوونی حاڵی دانیشتوانەکەی: لەماڵێکدا چاوی بە تروسکاییو ڕووناکیەك کەوت. ڕۆیشتە پێشەوەو لەسەر دەرگا هەڵوێستەیەکی کردو سەیری کرد لە ژوورەوەبەندەیەکی ڕەش لەگەڵ کۆمەڵێك لە هاوڕێیانی سفرەی ڕازاندۆتەوەو عەرەق دەخۆنەوە.عومەرﷺ ویستی بڕواتە ژوور لە دەرگاوە بەڵام دەرگای بۆ نەکرایەوە. بەسەر دیوارەکەدا سەرکەوت و ڕۆیشتە سەر بانو لەوێشەوە بۆیان ڕۆیشتە خوارەوە کەچاویان بەعومەر کەوت دەرگایان کردەوەو هەڵاتن، بەڵام بەندە ڕەشەکەی گرت: بەندەکە هاواری کرد ئەی پێشەوا بەڕاستی من هەڵەیەکی زۆر گەورەم کردووە پەشیمانم و تۆبەم لێوەربگرەو لێم ببورە. بەڵام عومەرﷺ فەرمووی: من دەمەوێ لەسەر ئەو تاوانەت داری حەدت لێبدەم. بەندەکە گوتی: ئەی پێشەوا ئەمن ئەوشەویەك تاوانم کردووە: بەڵام تۆ سێ تاوانت کردووە. یەکەم: خودا دەفەرموێ:{ وَلَا تَجَسَّسُوا }الحجرات/١٢ واتە: سیخوڕی و چاودێری بەسەر خەڵکدا مەکەن بەڵام تۆ سیخوڕیت بەسەرمانەوە کردوە.

دووەم: خودا دەفەرموێ: { وَأْتُوا الْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَابِهَا }البقرە/١٨٩ واتە:کەڕۆیشتیەماڵێك لەدەرگاوە بڕۆنە ژوور.بەڵام تۆلە سەربانەوە هاتیە ژوورو لەدەرگاوە نەهاتی.{لَا تَدْخُلُوا بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّىٰ تَسْتَأْنِسُوا وَتُسَلِّمُوا عَلَىٰ أَهْلِهَا }النور/٢٧ واتە: بەغەیری ماڵەکانی خۆتان مەڕۆنە هیچ ماڵێك هەتاڕێگە تان پێنەدەنو سەلامیشیان لێبکەن ئینجا بڕۆنە ژوور بەڵام تۆ هاتیە ژوور بەبێ ڕێگە پێدانو سەلام کردن. ئەوتاوانەی من لەبری تاوانەکانی خۆت ببەخشە. منیش پەشیمانم و هەرگیز جارێکی تر ناگەڕێمەوە سەر ئەوتاوانە. عومەرﷺ قسەکەی زۆر پێ جوانو لەجێگەی خۆی بوو تۆبەی لێوەرگرتو لێی خۆش بوو.

## بانگەوازی ڕێبازی خودا بەكارامەیی بكە

## أدع إلى سبيل ربك بالحكمه

جارێكیان یەكێك لەخوداپەرستان ڕۆیشتەلای پێشەوای موسڵمانان (هاڕونە ڕەشیدﷺ ) وگوتی: ئەی پێشەوا ئەگەر گوێم لێبگری ئامۆژگاریەكی زۆر گرنگت دەكەم؟ كە زۆر بەسودە بۆ تۆ. لەوەڵامدا گوتی: وەری ناگرمو قبوڵم نییە.كابراگوتی: زۆرسەیرە تۆ پێشەوای موسڵمانان بیتودژی ئامۆژگاری و یادكردنەوەی خودابیت؟ پێشەوا فەرمووی: نا نەخێر من دژی ئامۆژگاری نیم بەڵام خودا زۆر لە تۆ باشتر و چاكتری ناردوە بۆ ئامۆژگاری كە حەزرەتی محمد ﷺپێغەمبەری خودایە بۆ سەر گەلێك كەزۆرلەمن خەراپترو شەڕەنگێز تربوون، كە گەلی قوڕەیش بوون. بەڵام ، لەگەڵ ئەوەشدا خودا بە پێغەمبەرﷺی فەرموو: ﴿ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِ ﴾النحل/١٢٥ واتە: بانگەوازی ڕێبازی خودا بكەن زۆر بەدانایی و كارامەیی.

## من زیندوو بم و كەم بكات

## أو ينقص وأنا حي

دەگێڕنەوە(ئەباڕەجایﷺ)بەصری چاوی بەڕووداوێكی دڵ بزوێن كەوت لەدوای جەنگی هەڵگەڕاوەكان:كەكۆمەڵێكی باوەڕ لاوازی كەم ئەزموون، یاخیوسەر كەشیان لەیەكێك لە پایە بنەڕەتیەكانی ئیسلام كە(زەكات) بوو كرد. لەو بارەوە پێشەوا ئەبو بكر تێنو هێزو فشاری زۆری بۆهاتو، ئەویش شێر ئازایانە توانی بەرامبەری ئەو هەموو زۆریو تەنگەتاویانە خۆی ڕابگرێتو بەرامبەریان بووە ستێتەوە. ئەبو ڕەجا دەفەرموێ: ڕۆیشتمە شاری مەدینە چاوم بە كۆڕو جەماوەرێكی زۆر كەوت لە شوێنێك كۆببوونەوە لەناویانداچاوم بەكابرایەك كەوت سەری یەكێكی ماچ دەكردودەی گووت: بەقوربانو فیدات بم بەخوا ئەگەرتۆنەبای ئێمە نابووتو ڕیسوا دەبوو ینو، دەفەوتاین. منیش پرسیاری ئەو دووپیاوەم كرد ئەوانە كێن؟ گوتیان: ئەوە عومەرەﷺ سەری ئەبوبكر ماچ دەكات. كەلەدوای

هەوڵێكی زۆر ناچاربوو كە شەر لەگەڵ هەڵگەڕاوەكانی نەدانی زەكات بكات. پێشەوا ئەبوبكر ﷺدەنگی بەرز كردەوەو بە هەمووخەڵكانی سەلماند فەرمووی: ( والله لو منعونی عقال بعیر كانوا یؤدونه لرسول اللهﷺ لحاربتهم علیه) واتە: سوێند بەخوا ئەگەر بەرهەڵستی یەكدەست بەندی حوشتری بكەن كەكاتی خۆی داوتانە بەپێغەمبەر ﷺ ، ئەمڕۆ لەسەر ئەوە شەڕتان لەگەڵ دەكەم. لەدوای ئەوە ڕووی بەلای عومەردا ﷺسووڕاند، كە وەك و سەرسوڕمان و دەنگێكی كپ واقی وڕما بوو لەبیر كردنەوەیەكی زۆرقوڵدانوقم ببوو.وەكوداواكارێی وەرگرتنە وەی مافێكی تەواوهاواری لێكردوو.فەرمووی:ئەی كوڕی خەتاب، من هیواو ئومێدی یارمەتی وپشت گیریم پێت بوو. بەلام وا بە بەزیوو تێكشكاوی دەت بینم: كە لەكاتی بێباوەڕو نەزانیتدا بەتین و بەهێزبوویو، لە دەووری موسڵمانیشتدا بەڕو خاوو بەزیو دیاری؟ باش بزانن پەیام و نیگا كۆتایی پێهاتووەو، ئاینی ئیسلام تەواو بەپایان گەیشتووە. بەلام ئێستا كەمن لە ژیاندابم و ئەودین وئاینە ڕوو لەكەمبوون و ناتەواوی بكات هەرگیز شتی وانیەونابێت.

## من زۆر باشترم لەتۆ

## بل أنا خیر منك

دەگێڕنەوە (عەمری كوڕی تەفیل و، زەید هاتن بۆلای پێغەمبەرﷺو داوایان كردكە بەشێك لە بەروبوومی مەدینەیان بۆ دیاری بكرێ و بیان دەنێ. لەو كاتەدا (ئەسیدی كوڕی حەزیرﷺ) لەوێ بوو نێزەو ڕمبەكەی دەرهێناو بەسەری هەردووكیانی داداو پێی گوتن: هەستن لێرە بڕۆن.ئەی ڕێوی فێڵبازینە.(عامر گوتی: ئەتۆ كێی؟ وەلامی دایەوە من ئەسیدی كوڕی حەزیرم. عامر گوتی:حەزیری كە تائیب؟ گوتی:بەڵێ ئەوم.عامر گوتی : بەڕاستی باوكت لە تۆ باشتر بوو:بەلام ئەسید گوتی: من لەتۆش و لە باوكیشم باشترم. چونكە باوكم لەسەر بێباوەڕی مردوو منیش موسڵمانم.

# واباشە عومەر ببیستێ

# ألاولى أن يسمع منها عمر

دەگێڕنەوە ڕۆژێك پێشەوا عومەرﷺ دەگریاودەی فەرموو:سوێند بەخودا ئەگەر بەرهەڵستو بێ ئاگابیم لە حوشترێكی گەڕی لاوازو، قاچ بریندارو، تیمارو چارەسەری نەكەم دەترسێم لە ڕۆژی دوایی لەبارەیەوە پرسیارم لێدەكرێ.؟ ڕۆژێك پێشەوا عومەرﷺ لەگەڵ هاوڕێیەكیدا دەڕۆیشت. ئافرەتێك بانگی لێدەكاتو، عومەریشﷺ ڕادەوەستێ هەتا ئافرەتەكە دەگات. پێی دەڵێ: ئەی (عومە) هەتا دوێنێ (عومەرۆكە) بووی. ئەمڕو بوی بە( عومەر). تەنها دوێنێ عومەر بوویی‌و ئەمڕۆ بووی بە پێشەوای موسڵمانان. ئینجا لەخودا بترسە لەسەر ئەوكارەی كە فەرمانت پێ سپێردراوە. عومەرﷺ كە گوێی لەو ئافرەتە بوو دەستی كرد بەگریان. هاوڕێیەكەی پێشەوا عومەر ﷺ بە ئافرەتەكەی گوت: خوشكم لەسەرە خۆبەو، بەسەو، وازبێنە وا عومەرت بەگریان خست. عومەرﷺ بەهاوڕێكەی فەرموو:برام وازی لێبێنە ئەوە(خەولەی كچی حەكیمە)كەخودای گەورەگوێی بۆ گرتووەو، لە قورئاندا باسی كردووە كەدەفەرموێ: {قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَـٰدِلُكَ فِى زَوْجِهَا وَتَشْتَكِىٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَآ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ}المجادلة/١ واتە: بەڕاستی ئەی محمد ﷺخودای گەورە گوێی لە گفتوگۆی ئەو ئافرەتە بوو كە لەگەڵ تۆدا گفتو گۆی دەكرد بەرامبەر بە هاوسەرەكەی‌و سكاڵای ناڕازی بەرامبەر خوادەكات بەڕاستی خودا بیسەرو بینایە.بۆیە زۆر پێویسترە كە عومەرﷺ گوێی لێبگرێت.

# چاكەتان لێ بەدی ناكرێ كەئەوە نەڵێن

# لاخير فيكم إن لم تقولوها

دەگێڕنەوە جارێكیان پێشەوا عومەرﷺوتاری دەخوێندەوەو ئامۆژگاری خەڵكی دەكرد كابرایەكی موسڵمان.ڕووبەڕووی بۆوە و گوتی:ئەی عومەرﷺلە خودا بترسە. هێندێك لە ئامادەبوانی كۆڕەكە گوتیان: كوڕە تۆ چۆن بەرامبەر پێشەوای

موسڵمانان وادەڵێی؟ پێشەواش فەرمووی: لێیگەڕێن باوابڵێ:بە ڕاستی باشترین ئامۆژگاری كردم. چونكە ئێوە هیچ چاكەیەكتان تێدانابینم كە بەو جۆرە ڕەفتار نەكەن‌و: ئێمەی پێشەواش هیچ چاكەیەكمان لێبەدی ناكرێت كە ئەو ئامۆژگاریانەتان لێوەر نەگرین.

## ئەوەی لێتان بەدەركەوت بیكەن

## إفعلوا مابدالكم

دەگێڕنەوە لەدوای مردن و كۆچ كردنی(صلاح الدین ئەیوبی) شوێنكەوتوان‌و جێنشینەكانی ئیسلام دووبەرەكی و جیاوازیەكی زۆركەووتە ناویانەوە. بەو هۆیە شەوە كۆمەڵی بێباوەڕانی جولەكەی سەلیبی كاتەكەیان بۆخۆیان بە هەل قۆزتەوەو، بووە مایەی بەهێزبوون و توانایان. تەنانەت كێبەركێ‌و(صراع)سەری كێشا بۆ نێوەانی دەسەڵات دارانی براو خۆشەویستاندا، وەك و سلتان (صالح إسماعل) دەسەڵات داری شام، لەگەڵ برایەكی دینی سڵتان (نەجمەدین ئەیوب) دەسەڵات داری میصر. سوڵتانی شام صالح اسماعیل بووەهاوپەیمانی جولەكەی سەلیبی‌و، (بیت المقدس‌و، تەبریەو، عەسقەلان)ی دایەوپەیمانی هێندێك لەوڵاتی میصریشی پێدا ئەگەر بەشداری پیلانی لەناو چون‌و نەمانی دەسەڵات داری میصری لەگەڵدابكات كەبرای دینی خۆی بوو(نەجم الدین ئەیوب) لەلایەكی تریشەوە (صالح إسماعیل) ڕێگای بە جولەكەی سەلیبیدا كە بەسەر بەست‌و ئازایانە بێنە ناو دیمەشقەوە و هەڵسوكەوت بكەن‌و چەك‌و تەقەمەنیش بكڕن‌و هیچ شتێك ڕێگەیان پێنەگرێ. لەو سەردەم‌و كاتەشدا ( عزالدین عبدالسلام) دادوەر و وتاربێژی مزگەوتی ئەمەوی لە دیمەشق بوو. لە وتاری هەینیدا هێرش و هەڵمەتێكی هەڕەشەی بەهێزی كردە سەر سولتان صالح‌و، تەنانەت دوعاكردن بۆ سلتانیشی بڕی‌و، لەو ڕۆژە بەدواوە دەرس‌و وتارو ئامۆژگاریەكانی هەر هەمووی هێرشكردنە سەر سوڵتان‌و پێوەندیەكانی و. هاندانی خەڵكی لەسەر جیهادو تێكۆشان‌و كوشتنی خاچ پەرستان بوو.وەچەك‌و سیلاح فرۆشتنی بەحەڕام و ناڕەوادا نا بەرامبەر خاچ‌و سەلیبیەكان و. وە هەر یارمەتی و كۆمەكیەك كە

دەربارەیـان بکرێـت. خیانــەت و ســتەمکاریو ناپاکییــە. ســوڵتانیش لــەوکارو هەڵوێستەی (عز الدين)دادوەرو وتار بێژ تورە بوو لەماڵەوە دیلو دەست بەسەری کردوو، دەرسودەوورووتاری لێقەدەغەکردو، تەنانەت عیلاقەو پەیوەندیشی لەگەڵ جەماوەردا نەهێشت. بەو بۆنـەوە (عزالدين)لەساڵی(٦٣٨)ی کۆچی: دیمەشقی بەجێهێشتو بەرە و میـصر ڕۆیـشت بۆئـەوەی بتـوانێ لـەوێ هـەوڵو تێکۆشانی خـۆی درێژەپێبدا. بـەڵام دانیـشتوانی شـام خۆپیـشاندان و ڕاپـەڕین یـان بـەدژی سوڵتان کرد لەبەر ڕۆیشتنی عزالدين لەبەر ئەوە سلتان بە ناچاری هێندێك لەدار و دەستەو پێوەندو، وەزیرێکی نارد بۆ ئەوەی بیگێڕنەوە. لەڕێگا لە (نابلس) توشی هـاتنو زۆر داوایـان لێکـرد کـە بگەڕێتـەوە بۆسـەر کـار و فەرمانـەکانی پێـشوی بـەزیادەوە بـۆ شـام. بەتـەنها لـەلای سـوڵتان داوای لێبـوردن بکـاتو دەسـتی مـاچ بکات. وە هیچ شتێکی ناڕێکی لەنێوانیاندا نامێنێت (عزالدين) فەرمووی: سوێند بـە خـودا ئـەی فـەقیر مـن ڕازی نـیم کەسـوڵتان دەسـتم مـاچ بکـات چـۆن ڕازی دەبم دەستی ماچ بکەم. نـا هـەرگیز شتی وانابێت:وە زۆر باشیش بزانن ئێـوە لـە بیرو خـەیاڵێك دان و منـیش لەبیروخـەیاڵێك. سـوپاس بـۆ خـودا کـەمنی پاراسـتووەو یارمەتی داوم بۆئەو شـتەی کەئێوە پێـی موبتەلاوسـەر گـەردان بوون. لەدوای وتـو وێژێکی زۆر لەو بارەوە وەزیر گوتی:من لەلایەن سوڵتانەوە فەرمانم پێکراوە ئەگەر لەگەڵم نەگەڕێیەوە ڕێگات پێنادەم بڕۆیو دیلت دەکەم. عزالدین فەرمووی: چیت لەدەست دێت بیکـەمن ڕازی نـیم بـەهیچ جـۆرێکی ئێـوە بگەڕێمـەوە.عزالـدین یـان لـەنابلس بەنــدکرد و لــەناو بەندەکـەی داماوەیــەکی زۆرمایــەوە هــەتا ســوپای میصرهاتو ڕزگاریان کرد.دوای بەرەو قاهیرەی میصر ڕۆیشت بۆ ئەوەی درێژە بەهەوڵو تێکۆشاندی دژ بەخاچەکان بدات.

## باوكو باپیرا نمان بەوشێوە بووە

## إنا وجدنا آباءنا على أمة

جارێکیان عزالدین ی کوڕی عبدالسلام‌ﷺ ڕۆیشتە لای سولتان( ئەشرەف موسی کوڕی مەلیك‌ﷺ)ی دادگەر لە ڕۆژی جەژندا سەیری کرد بەوپەڕی گەورە و دڵخۆش

و شکۆدار ییە وە، سەرکردە و لێپرسراوانی دێنە لای و لەبەردەمیدا کڕنۆشی بۆ دەبەن‌و، ئەویش بەعادەت‌و ڕەوشتی جارانی پێی دەڵێت ئەی کوڕی ئەیوب چیدەکەیت‌و بەڵگەی چیت هەیە لەڕۆژی دوایی کەپێت دەڵێن، ئایائێمە سەردار و کاربەدەستانی میصرمان بۆ ژێردەستەوڕام نەکردی، بەڵام شتی سەرخۆش و بێهۆشی دەفرۆشی؟ سڵتان گوتی: برایان ئەو شتەڕووی داوە؟ لەوەڵامدا گوتیان بەڵێ:لە مەیخانەو، مەستەخانەی فلانە شوێنە شتی مەستبوون‌و، چەندین کاری خەراپە و نا فەرمانی تێدا ئەنجام دەدرێ‌و، ئەتۆش لەخۆشترین شوێنی ئەو ولاتە سەرمەستی ڕابواردنی؟ سڵتان گوتی:بەخوا گەورەم ئەوە لەئیش‌و کارەکانی من نیە بەڵك و ئەو کارە لە دەوری دەسەڵاتی باوکم دایە. عزالدینی پیاوباش فەرمووی: بەڕاستی تۆش یەکێکی لەو کەسانەی کەدەڵێن: بەخوا چی بکەین باوکم‌و باپیرانیشمان لەو سەر ڕێباز و کارەبوون. سڵتانیش هەر خێرا فەرمانیدا ئەو باڕ و مەیخانانە بەگشتی دابخرێن. لە دواییدا پرسیارلە شێخ عزالدین کراچۆن تۆ توانیت لەناو ئەو زۆرە ئاپۆرەی خەڵك‌و ڕۆژی جەژنە بەئاشکرا بەرامبەر بە سڵتان بەوجۆرە قسەبکەی‌و نەترسای؟ ئەویش فەرمووی: ڕۆڵەم من ترس‌وسامی خودام هێنایە بەرچاوم، سڵتانم لەلا شتێکی سوك‌و بێ بایەخ بوو.ئینجا سوڵتانیش لەدوای ئەوکارە بڕای، بڕای جارێکی تر هەرگیز بەلای ئەوکارە نامەرد و ناڕەوایانەدا نەڕۆیشت‌و لەسەر کاری باش بەردەوام بوو تەنانەت لەدوای مردنی عزالدینیش کاری بێشەرمی وا ڕووی نەدایەوە.

## جیهان ئامۆژگارییە

## الدنیا النصیحة

دەگێڕنەوە سولەیمانی کوڕی عبدالملك ﷺلەدوای بەجێهێنانی واجباتی حەج ڕۆیشتە زیارەت‌ودیدەنی شاری مەدینەی پێغەمبەری خوداﷺ: بەدوای ئەبو حازمی ئەعرەجی دا نارد:کاتێ ئەویش هات بۆلای، پێی گوت: ئەی ئەبا حازم ئامۆژگاریەکمان بکە. ئەویش فەرمووی: ئەی پێشەوای موسڵمانان پێویستە زۆرباش ئاگاداری ئەوەبیت ئەو فەرمان ڕەواییەی کەجێنشینیە ئێستا کەوتۆتە

دەستی تۆ: هیچ كەسێك بەبێ مردن و لەناوچونی ئەوەی پێشی خۆت نەیگەیشتۆتێ: باش بزانە تۆش بەردەوام نابیت لەسەر ئەو كارەو یەكێكی تریش لە دوای تۆ دێت. لەدوای ئەوە فەرمووی: ئەی پێشەوای موسڵمانان ( نزه ربك فى عظمتهعن ان يراك حيث نهاك او يفقدك حيث امرك) لە دواییدا سلێمان فەرمووی: ئەی ئەبوحازم بۆچی نایەی بۆلامانوسەر دانمان ناكەی؟ ئەبو حازم فەرمووی: ئەی سلێمان چیدەكەی بەهاتنم بۆلات، چونكە ئەگەر لێت نزیك ببمەوە، ئەوە توشی ئاژاوەو لەدین لادانم دەكەی: وەئەگەر لێشت دووربكەومەوە ئەوە زەلیل و ڕیسوامان دەكەی، وەهیچ شتێكی واشم لەلانیە كە لە بەرژەوەندیم دابێتو لێت بترسێم. وە هیچ شتیشم لەلای تۆ نیە تاكو هیوا و ئومێدم پێت بێت بۆ بەدەست هێنانی ئەوشتە. پێشەوا فەرمووی:ئەباحازم پێویستیەكانتم بۆبڵێ تاكوبۆت بە جێبهێنم. ئەبوحازم فەرمووی: بەخودا پێویستیەكانم لەلای كەسێكی زۆر بە تواناتر لە تۆ داواكردووە. ئەگەر پێیبەخشیم وەری دەگرمو، ئەگەر پێینەدام و بەرهەڵستی لێ كردم ئەوە ڕازیوقایل دەبم. خودای بەتەواناش دەفەرموێ {نَحۡنُ قَسَمۡنَا بَيۡنَهُم مَّعِيشَتَهُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا }زخرف/٣٢واتە: بەڕاستی ئێمەین كەڕزقو ڕۆزیمان لە نێوان ئادەمیزادەكاندا دابەشكردووە. ئایا كێ دەتوانێ لەو بەش و دیاری كراوەی خودای گەورە بۆ بەندەكانی بۆی زیاد بكات یان لێی كەم بكاتەوە؟ لەو كاتەدا سلێمانی كوڕی عبدالملكؓ دەستی كرد بە گریانێكی زۆربەهێز.

## لەخودا بترسێ لەیەزید دەت پارێزێ

## خف الله في يزيد

دەگێڕنەوە كوڕی هەبیرەی دادوەرؓو بڕیار دەری فەرمانڕەوای حەسەنی بەصری بوو: نامەیەكیان لەلای (یەزیدی كوڕی عبدالملیك)ؓەوە بۆ هاتبوو فەرمانی بە شتێكی پێچەوانەی فەرمانی خودا كردبوو .بۆیە گوتی: ئەگەر فەرمانەكەی یەزید بەجێبهێنم، ئەوا لەسزای خودا دەترسێمو توشی ئازاروسزا ببم.وە ئەگەر فەرمانە كەی خودا بەجێبهێنم ئەوادووبارەلەخوێنی خۆمو سزای یەزید دەترسێم. حەسەنی بەسریش ؓ فەرمووی: ئەی

كوڕی هەبیر لەبەر یەزید لە خودا بترسە و لەبەر خوداش لە یەزید مەترسە چونكە ترسی خودا لە یەزید دەت پارێزێ، بەلاَم ترسی یەزید لە سزای خودا رزگارت ناكات. هیچ كارو كرداو فەرمان بەری نییەلەبەر خەڵكی كاری تاوان كاری بەرامبەر خودا بكەی. سەیر بكە بزانە یەزید چی بۆ نوسیوی ، ئەگەر لەگەڵ فەرمانو بەرنامەكەی خودا هاوتاو یەكبوو: ئەوە زۆر باشە و بەجێگەی بهێنەوە ئەگەر پێچەوانەی فەرمانی خودا بوو ئەوە فەرمانەكەی خودا بە جێ بهێنەو گوێمەدە فەرمانەكەی یەزید چونكە فەرمانی خودا سەر چاوەی هەموو فەرمانە دەسەلاَت دارەكانی دونیایە. لەوكاتەدا كوڕی هەبیرە دەستی بەسەر شانی حەسەن داناو فەرمووی: بەخودا ئەو شێخە ڕاستی پێ گوتم.

## گوێگرە بەلاَم هەرچی بیستت كاری پێمەكە

## تسمع ولاتعمل بما تسمع

دەگێڕنەوە: ڕۆژێك پێشەوا مەنصور ﷺسەردانی زاناو دانای بەناوبانگ (ئەبوعەمری كوڕی عبدالرحمنی ئەوزاعیﷺ)كرد پێشەوا مەنصور ﷺ فەرمووی: ئەی ئەباعەمر لەبەرچی تۆ سەردانمان ناكەی من زۆر حەز دەكەم كە بێیە لامانو سوود لەڕێزو زانینو زانیارییەكەت وەر بگرم. ئەوزاعی خێرا وەلاَمی دایەوەو فەرمووی:گوێ بگرەلەوەی كە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: كەسێك لەپێناوی خودا ئامۆژگاریەكم پێ بگەیەنێ: ئەوە بەڕاستی سۆزو بەزەیی خودایە پێشكەوتوە ، ئەگەر وەری بگرێ ئەوە سوپاسو شوكری خودات بە ئەنجام گەیاندووە: ئەگەر وەریشی نەگری، ئەوە بەڵگەیەكە لەسەرت لەلایەن خوداوە بۆ گوناهـ و تاوان زۆریتو خودا لێڕەنجانت. وەهەر كەسێك ڕاستیەكی پێگەیشت، ئەویش پێی قایلو ڕازیبوو: ئەوە خوداش لێی ڕازییە. بەلاَم هەر كەسێكیش بەوڕاستیە دڵ گرانو ناڕازی بووئەوەخوداش لێی ناڕازیو دڵگرانە. وە هەر كەسێك لەڕاستیەكان بێزارو دڵ گران بێت. ئەوە خوداش لێی بێزارو دڵ گرانە خودا بمان پارێزێ لەهەموو كردارێكی بەدو خەراپ هەروەكو خودا دەفەرموێت :{هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُشۡرِكُونَ}الصف/٩

واتە:خودا ئەو خودایەیە کە پێغەمبەرەکەی ﷺبە هیدایەتو ڕێنمونی ڕەوانە کردووە بەدینو ئاینێکی ڕاست ودروست بۆئەوەی بەسەر هەموو ڕێبازو ئاین و بەرنامەکانی تر سەربەرزو سەرکەوتووی بکات، هەرچەند کافرو هاوەڵ پەیدا کەران پێیان ناخۆش بێت ئینجا ئەو شتانە بەنەزانوهیچ سەیرمەکە ئەی پێشەوا؟پێشەوا فەرمووی: نەزانیو بێ ئاگایی چۆنە؟ ئەوزاعی زاناودانای خوداپەرست فەرمووی: لە هەموو شتێکدا گوێ بیست بە بەڵام، هەرچی بیستت ڕەفتاری پێمەکە.

## کڕنۆش بەتەنها بۆ خودا دەبەم

## لا نسجد إلا لله

ئەگەر سەیری باوەڕداران‌و پیاو چاکانی پێشین بکەین: باوەڕەکەیان ئەوەندە ڕاستو بە هێز بووەکە تەنها لە خودا نەبێ لە کەسی تر نەترساون‌و سەری کڕنۆش‌و نەوازشیان تەنها بۆخودا نەوی کردوە، پادشاو سەرۆک‌و سەردارانیان بەلاوە شتێکی ئاسایی بووە، زەرق و باق و بریقەی ئەم دونیایە نەیگۆڕیون‌و خیانەت و، ناپاکیان نەکردووە بۆ سامانی ئەم دونیایە، چونکە چاویان تێر و باوەڕیان پتەو بووەو، زێڕو گەوهەر و سامانی دونیایان زۆرلەلا بێنرخ بووە ئەوەش جێگەی سەر بەرزیو ڕێزە لەوبارەوە دەگێڕنەوە ئەبوموسی دەفەرموێ: ڕۆیشتین بۆلای نەجاشی پادشای حەبەشە لەناو کۆڕ و کۆمەڵەکەی دانیشتبوو: عەمری کوڕی عاص‌ ﷺ لەلای ڕاستیو، عەمارە لەلای چەپیو، گەورەو کار بە دەستەکانی قسیسیش لە پێشەوە لەبەردەمی دانیشتبوون، عەمری کوڕی عاص‌و ﷺ عەمارە بە نەجاشیان گوت: ئەو کۆمەڵە کە دێن بۆ ئێرە کڕنۆش بۆ هیچ پادشاو دەسەڵات دارێك نابەن. دوای ئەوەی کە ئەوکۆمەڵە گەیشتنە لای پادشا قەشەومالمەکان خێرا داوایان لەموسڵمانەکان کرد کە کڕنۆش بۆ پادشابەن بەڵام(جەعفەری ئەبو تالیب ﷺ ) هەر خێرا وەڵامی دایەوەو، بە هەموو غیرتو چاو نەترسی و باوەڕی پتەوی فەرمووی: ئێم کڕنۆش بەتەنها بۆ خودای بەرزو تەوانا دەبەین کە گەورەییو دەسەڵاتو تەوانا هەر بۆ ئەوە و بەس .

# لەناو هەموویان دەنگ بەوەیان بدەن

# لاصوتن بها بين ظهرانيهم

دەگێڕنەوە (ئەبوزەڕی غەفاری‌ﷺ)لە كاتی نەفامی‌و بێباوەڕیدا پیاوێكی ئازاو بە هێزو چاونەترس بووە، جەردەو ڕێگر و تالآن چی بووە، ترس‌و سامی لە هیچ شتێكم نەبووە، بەتەنها ڕوبەڕووی كاروانی و ناحەز و قەرزاران وەستاوە، ئەوەی پێیانبووە لێیانی سەندووەوبەرگ‌و لیباسی لێیان كردۆتەوەوبەبێ ترس لەهیچ كەسێك گەڕاوەتەوە بۆدواوە. ئینجا كاتێ لەیەكەم چركە ساتی گوێ بیستی هەواڵی بانگەوازی نهێنی (سر) ی پێغەمبەری ﷺخودا بوو ڕۆیشتە خزمەت پێغەمبەری خوداﷺداوای لێكرد كە بەرنامەی ئیسلامی پێڕا بگەیەنێ، پێغەمبەری خوداﷺ داوایەكەی لێوەرگرت و موسڵمان بوو. ئینجا لەدوای ئەوە داوای لە پێغەمبەریﷺ خودا كردكەڕێگەی بدا بڕواتەوە بۆ ناو خانەوادەكەی و هەواڵی موسڵمان بونیانیان پێڕابگەیەنێ و خۆشیان لە دانیشتوانی مەككە بپارێزێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:من لێت دەترسێم ئازارت بدەن. بەڵام ئەبو زەر گوتی: سوێند بەخودا لە بەر چاوی هەموویان دەنگ بەرز دەكەمەوە بەموسڵمان بوونم. ئەبوزەڕ ﷺڕۆیشت هەتا گەیشتە مزگەوتی حەڕام ناوبیت. بە هەموو دەنگی بەرزی فەرمووی: (اشهد انلا إله إلا الله. واشهد أن محمدا رسول الله) خەڵكەكە هەمووی بەجارێك پەلاماریان داودەستیان كرد بەلێدانی ئەوەندەیان لێدا خستیان سەر زەوی‌و دەنگی تێدا نەماوهەر لێیان دەدائەگەر(عباسی كوڕی عبدالمتلیبﷺ ) نەبایە كەڕای كردەسەر لاشەكەی‌و پارێز گاری لێكردونەی هێشت زیاتر لێی بدەن دەنا دەیان كوشت عەباس گوتی: ئەی هاوار بۆ ئێوە جەماوەری قوڕەیش نازانن ئەوە لەهۆزی (غەفارە) لەڕێگای شامەو كڕین‌و بازرگانیشتان لەو ڕێگەیەوە دەڕوات ئەگەر بیكوژن ئەوڕێگەتان لێدەگیری؟ ئینجالەدوای ماوەیەك كەهۆشی هاتەوە دووبارە هاواری كردوشادەی هێنایەوە ئەوانیش بۆجاری دووەم پەلاماریان دایەوە و لێیاندایەوە ئەمجارەش هەر عەباس پارێزگاری لێكردو نەیهێشت زیاتری لێبدەن. بەو جۆرە باوەڕی ئەبوزەر باوەڕێكی پتەووڕاست‌و بەهێز بوو. چەندین سزا و ئازاری بەتین‌و ئێش لەپێناوی ئاگاداركرنەوە و گەشە پێدانی باوەڕەكەی بەلایەوە سوك‌و بێ نرخ بوو.

# بەڕاستی خودا لەکەمین دایە

# إن ربك لبالمرصاد

**ئەبو جەعفەری مەنصور ﷺبەدوای مالیکی کوڕی ئەنەس‌و، کوڕی تاوسی داﷺ نارد کاتیٚ هاتن‌و گەیشتنەلای سەیریان کرد ئەبو جەعفەر لەسەر چەند فەڕشێکی لەسەر یەك ڕاخراونایاب دانیشتبوو.لەژێر پێیەکانیشیەوە فەڕشێکی نەرمی پێستینی لیٚ ڕاخرا بوو. لەلای پێشەوەشی پیاوکوژ و خوێنڕێژێکی (جلاد) بەشیرەوە ڕاوەستابوو. بۆلێدانی ئەستۆی تاوان باران.ئەبو جەعفەرﷺ ئاماژەی بۆ کردن کەدابنیشن، ماوەیەکی زۆر تیٚ یانەوە ڕاماو، سەیری دەکردن و هیچ قسەی نەکرد. دوایی ڕوی لە کوڕی تاوس کردوو، گوتی: باسی بەسەرهاتی باوکتم بۆ بکە؟ کوڕی تاوس گوتی:لە باوکم بیستوە دەیفەرموو: پێغەمبەری خودا ﷺفەرموویەتی:**﴿ إن أشد الناس عذابايوم القيامة رجل أشركه الله فى حكمة فأدخل عليه الجورفى عدلة ﴾ **واتە: بەهێزترین سزاو ئازار لە ڕۆژی دوایی کابرایەکە خودا دەکاتە شەریك‌و هاوبەشی لەفەرمان ڕەوایيداولەباتی ڕاستی دادگەری، زوڵم‌و ستەم لە کارەکانیدا دەکات. لەوکاتەدا مالیك دەفەرمویٚ : بەخودا لەترسان من بەرگ‌و پۆشاکەکەی خۆم خڕکردەوە نەوەك بەخوێنی کوڕی تاوس پیس ببن. چونکە گوتم: ئەبو جەعفەر بەو قسە ڕقی هەستاوەو هەر لەوشوێنە بە پیاو کوژەکەی دەیکوژیٚ. بەڵام ماوەیەك ئەبو جەعفەر سەری داخست‌و دوایی سەری بەرزکردەوە بۆ لای کوڕی تاوس‌و گوتی: ئامۆژگاریەکی ترم بکە کوڕی تاوس گوتی:گوێت لەو ئایەتەنەبوەو کەخودا دەفەرمویٚ:**{أَلَمۡ تَرَ كَيۡفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ. إِرَمَ ذَاتِ ٱلۡعِمَادِ. ٱلَّتِي لَمۡ يُخۡلَقۡ مِثۡلُهَا فِي ٱلۡبِلَٰدِ. وَثَمُودَ ٱلَّذِينَ جَابُواْ ٱلصَّخۡرَ وَفِرۡعَوۡنَ.بِٱلۡوَادِ ذِي ٱلۡأَوۡتَادِ. ٱلَّذِينَ طَغَوۡاْ فِي ٱلۡبِلَٰدِ. فَأَكۡثَرُواْ فِيهَا ٱلۡفَسَادَ. فَصَبَّ عَلَيۡهِمۡ رَبُّكَ سَوۡطَ عَذَابٍ إِنَّ رَبَّكَ لَبِٱلۡمِرۡصَادِ }الفجر/٦-١٤ **واتە: ئەی محمدﷺ تۆ نەت زانی خودای بەدەسەڵات چی بەخاوەن فیلەکان کرد. ئەدی سەری لیٚ نەشێواندن و هەموو پیلان‌و نەخشەکەیانی پوچ کردەوە؟ کۆمەڵ کۆمەڵ تەیرو باڵندەی دەناردنە سەریان هەتا بەبەردی بچوکی**

سورەوە كراو بەرد بارانیان كردن وایان لێكردن ناو سكیان بۆش‌و خاڵی كردن وەك‌و گەنم و پوشی ناو خوراویان لێهات.

مالیك دەڵێ من پۆشاكەكانم كۆكردەوە لە ترسی پیس بوون بەخوێنی كوڕی تاوس دوای ئەوە ئەبوجەعفەر ماوەیەك بەسەر سوڕمانەوە سەری داخست. لەدواییدا بەكوڕی تاوسی گوت: ئەو قەڵەم‌و دەفتەرەم بدەیە كوڕی تاوس لێی نزیك كردەوە بەڵام نەیدایە دەستی: ئەبوجەعفەر ﷺگوتی: ئەوە بۆ ئەو قەڵەم‌و دەفتەرەت نەدامە دەست؟ كوڕی تاوس گوتی: بەخوا لەوە ترسام نەوەك‌و شتێكی خەراپی پێ بنوسی‌و منیش هاوبەشی گوناهو تاوانەكەی تۆبم ئەبوجەعفەرﷺ گوتی:ئەی كوڕی تاوس هەستە بۆخۆت لەباتی من بینوسە. كوڕی تاوس گوتی: من ئەوەم لەتۆ نەدەویست. مالیك فەرمووی:لەدوای ئەو ڕوداوە وام هەست نەدەكرد جارێكی تر كوڕی تاوس جێگەی متمانەو ڕێز بێت لەلای ئەبو جەعفەر.

## پوختەیەك وردەباس

## قبسات

**قال الله تعالى:**{ نُّورٌ عَلَىٰ نُورٍ ۗ يَهْدِي ٱللَّهُ لِنُورِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَٰلَ لِلنَّاسِ ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ}النور/٣٥ واتە: بەڕاستی ڕووناكی قورئان ڕوناكیە لەسەر ڕووناكی وە خوداش هیدایەت‌و ڕێنمونی ئەو كەسانە دەكات كە خۆی حەزو ئارەزووی لێبێت. وەخودای گەورە چەندین وێنەو نمونە بۆ خەڵكی دەهێنێتەوە بۆ ئەوەی خەڵك تێ بگەن، وە بەڕاستی خودا بە هەموو شتێك زاناو دانایە.

## باس كردنی یەكێك لەدوای خۆی

## في الغيبة

دەگێڕنەوە ڕۆژێك (داودی تائیﷺ)بە جێگەیەك دادەڕوات كە بە تەواوی چاوی دەكاتەوە و دەنوارێت لەهۆش خۆی دەچێت‌وەدەكەوێتە سەرزەوی دوایی هەڵی دەگرنەوەو دەیبەنەوە بۆماڵەوە: لەدوای چاكبوونەوەی پرسیاری لێدەكرێ بۆچی وات لێهات؟ گوتی بەخوا جارێك لەپاشەملە لەو جێگەیە باسی كەسێكم كرد بوو كە

گەیشتمەوە بەو جێگەیە بە بیرم كەوتەوە: گوتم ئەگەر ئەو كابرایە لە ڕۆژی دوایی لەلای خودای گەورە سكاڵای لێكردم وەڵامم چیدەبێت. لەو بیرو خەیاڵانەدا بووم‌و بێهۆشكەوتم. ئای خۆزگەم دەم زانی ئەو ڕەوشت و نەریتانە ئێستا لە كوێ دەست دەكەون‌و، ئەو خۆپارێزی و لەخودا ترسانە بەو ئەندازە گەورەییە لە كوێ بەدیدەكرێ؟ بەڵام بەڕاستی بەو ئەندازە ترس‌و بیم‌و، ڕێز و شكۆو، جوامێرییە هەرگیز بەدیناكرێ.داودی تائی بە پێچەوانەی ئادەمیزادە كان بەو جۆرە بەردەوام لە ترس‌و بیمێكی تەواو ڕۆچو بوو: هەتا گەڕایەوە لای خوداو گیانی دەرچوو. كە بەهۆی ئەو ترسانەی لە خودا هەردەم ئارام‌و ئۆقرەی نەبوو. حافیزی ئەبونەعیم لە سەنەدەكەیدا دەگێڕێتەوە دەفەرموێ:داودی تائی نەخۆشیەكی بەتینی توشهات هۆكارو توشبوونی ئەو نەخۆشیەش بەهۆی ئایەتێك لەقورئانی پیرۆزدا بوو كە لەباسی ئاگری دۆزەخ بوو بەچەندان جار ئەو ئایەتەی دووبارەو دووبارە دەكردەوە لە شەوەكاندا هەتا تەواو نەخۆش كەوت‌و بەو نەخۆشیەشەوە گیانی دەرچوو.

## ئەبوبكر هەرگیز لەدوای مردنی پێغەمبەریش نافەرمانی نەكردووە

## عدم مخالفه ابی بكرللرسول حتی بعد وفاته

كاتێ پێغەمبەری خودا ﷺلە حەجی ماڵ ئاوایی گەڕایەوە: فەرمانی بە ئامادەبوونی سوپایەكی زۆر گەورە كرد بە سەركردایەتی ئوسامەی كوڕی زەید: لە كاتێكدا كەلەناو ئەو سوپایەدا ئەو هەموو سەركردە لێهاتوو ئازایانەی وەك و ئەبوبەكری صدیق‌و، عومەر ی كوڕی خەتاب‌و، ئەبو عوبەیدەی كوڕی جەڕاح‌و، سەعدی كوڕی ئەبی وەقاص‌و‌ﷺ، تەواوی كۆچ كردوانی پێشوشی تێدابوو. فەرمانی بە ئوسامەكرد بەو سوپا گەورەیە وە بڕوات بۆ سنوری (بلقاء) و (الداروم) لەخاكی فەلەستین لەنزیكی (مۆتە) لەو شوێنە ی كەباوكی لێی شەهید بووبوو. كە لەو شوێنەوە پەلاماری دوژمنی خوداو دوژمنی خۆشیان بدەن‌و، بڕۆنە سەریان. ئینجا بە نەخشە داڕێژێكی كارامەو بیرێكی تەواو، ئازایانەو، سەر لەدوژمن تێك بدەن‌و، لەكاتی بەیانی غافڵ گیرانە لێیان بدەن‌و گورزی ئاگرینیان لێ بەكاربهێنن و بیانكوژن پێشی ئەوەی گەنج و لاویان ئاگادار بكرێنەوە لەدوای سەركەوتن

بەسەریاندا هەر خێرا لەو شوێنە زۆر نەمێننەوەو بەدەست کەوتی ماڵی جەنگ‌و سەرکەوتن بگەڕێنەوە. بەڵام بەداخەوە پێغەمبەری خودا ﷺنەخۆش کەوت‌وئامادەبوونی ئەو سوپایە بەدرەنگ کەوت‌و، لەناو هێندێك لەیارەکانی پێغەمبەری خودا ﷺکەیەکێك لەوان پێشەواعومەرﷺبووناڕازی بوون بەسەر کردایەتی فەرمانڕەوای ئوسامە کە تەمەنێکی لەوانی تریچوك ترەو هونەری (فنون)ی جەنگ نازانێ، ئەوهەواڵە سەر پێچکاریە گەیشتەوە بە پێغەمبەری خوداﷺ. پێغەمبەر نەخۆش بوو سەری پێچابوو: بەو نەخۆشیەوە هاتەدەرو ڕۆیشتە سەر مینبەرەکەی‌و، فەرمووی: بیستومە کە هێندێکتان لە فەرمانەکەی من سەرپێچیتان کردووە بەوەی کە بۆچی ئوسامە فەرمان ڕەوای سوپابێت. سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە وەك‌و چۆن ئێستا لە فەرمانڕەوایی ئوسامەدا ناڕەزایی دەر دەبڕن : بەهەمان شێوە لەفەرمان ڕەوایی باوکیشیدا هەمان کێشەو ناڕازیتان بەکار هێنا بەڵام سوێند بەخودا باوکی باشترین پاڵەوان‌وسەرکردەو، هونەرزانی شەڕبوو. وە هەر بەهەمان شێوە ئوسامەش تەواو لێهاتو گونجاوە. ئینجا لەدوای ئامادەبوونی سوپابەسەرکردایەتی ئوسامە لەمەدینە بەرێکەوت تاگەیشتنە (جرف) کە بەئەندازەی سێ میل لە باکور(شمال)ی مەدینەوە دووربوو. هەواڵی بەتین بوونی نەخۆشی پێغەمبەرﷺلەناو سوپادا بڵاوبۆوە.بەو بۆنەوە سوپا کۆکرایەوە و بارگەیان خست. ئوسامەﷺ بەچەند نەفەرێکەوەگەڕانەوەبۆمەدینە بۆلای پێغەمبەری خودا ﷺ کەلەماڵی حەزرەتی عائیشە ڕاکشابوو.کەچاوی بەو دیمەنە سەرسامەی پێغەمبەرﷺ کەوت زوبانی بەستراوە و قسەی بۆناکرێ زۆر بێتاقەت و بێئارام بوو.پێغەمبەرﷺ کەتوانای قسە کردنی نەبوو دەستەکانی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان‌و، دوایی لەسەر سەری ئوسامەی دانا کە ئاماژەی نزاو پاڕانەوە بوو بۆ ئوسامە. ئینجا بۆ ڕۆژی دووەم پێغەمبەر ﷺتەندروستی تۆزێك باش بوو کەبووە مایەی دڵخۆشی موسڵمانان.دوای ئەوە ئوسامە فەرمانی بەڕێکەوتنی سوپایەکەی بەرەو شام پێدراو گەڕایەوە بۆ ناو سوپاو، ئامادەکاری بەسوپا ڕاگەیاند بۆ ڕۆیشتن، بەڵام بەداخەوە باش بوونی تەندروستی پێغەمبەرﷺتەنها

پێشكەوتەی كۆچ كردن بوو. بۆیە لەدوای بەڕێكەوتنی سوپای موسڵمانان چەند چركەیەك ژیاودوایی گیانە پاكەكەی گەیشتەلای پەروەردگاری مەزن. ئەو هەواڵەش زۆر بە خێرایی گەیشتە ناو موسڵمانان. بەو بۆنەیەوە زۆر شڵەژان و سەرسام و توانایان نەما. تەنانەت پێشەوا عومەر ﷺهەر باوەڕی بەو هەواڵە نەبوو. تەنانەت ئەوكەسانەی كەدەیان ویست عومەر ﷺلەو ڕووداوە ڕاستەقینە ئاگادار بكەنەوە بێسود بوو. هەرگیز باوەڕی نەدەكرد كە پێغەمبەر ﷺبمرێت؟ بەڵام ئەبو بكری صدیقﷺ كاتێ ئەو هەواڵەی پێگەیشت ڕۆیشتو چاوی بە تەرمو لاشەكەی كەوت: دڵنیا بوو لەوەی كە پێغەمبەرﷺمردووە ڕۆیشتە مزگەوت بۆ ناو ئاپۆرەی جەماوەرو فەرمووی: هەركەسێ محمدی دەپەرست بەڕاستی محمد مرد. وە هەر كەسێكیش خودا دەپەرستێ ئەوە بەڕاستی خودا زیندووە و نامرێ. ئینجا ئەو ئایەتەی خوێندەوە كە خودا دەفەرموێ:{وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّـٰكِرِينَ}ال عمران/١٤٤ واتە: ئادەمیزادەكان تێبگەن كە محمدﷺ پێغەمبەرێكە هەروەكو پێغەمبەرانی پێشی خۆی، ئایا ئەگەر پێغەمبەرﷺ بمرێ یان بكوژرێ ئێوە پەشیمانو پاشگەز دەبنەوە لە ئاینەكەتان. زۆرباش بزانن هەر كەسێك پاش گەزبێتو هەڵگەڕێتەوە بەڕاستی هەر گیز زەرەر بە خودا ناگات وە خودای گەورەش بەتەواوی پاداشتی شوكرو سوپاسی سوپاس گوزاراندەداتەوە.

پێشەوا عومەرﷺفەرمووی: بەخودا دەڵێی یەكەم جارە ئەو ئایەتە دەبیستم دوایی كەزانی بەڕاستی پێغەمبەرﷺ مردووە توانای ڕاوەستانی نەماوكەوتە سەر زەوی. ئینجا لەدوای ئەوەی كە هەواڵی كۆچی دوایی پێغەمبەرﷺ گەیشتە ئوسامە. فەرمانی بە هەموو سوپایەكەیدا بەڕێگەی خۆیاندا بگەڕێنەوە بۆ مەدینە لەدوای گەیشتنەوە یان ئوسامەﷺ ڕۆیشت ئاڵایەكەی لەبەردەرگای ماڵی عائیشە چەقاند. چاوەڕوانی ئەوە بوو كە لە دوای پێغەمبەری خودا ﷺكێ دەبێتە جێنشینو فەرمان دەردەكات. دیارە لەدوای ئەوە پەیمانی جێنشینی پێغەمبەرﷺبە پێشەوا ئەبوبكر

سپێردرا. وە یەكەمین فەرمانێك كە لەپێشەوا ئەبوبەكرەوە﷜دەرچوو. ناردن‌و بەڕێكردنی ئەو سوپایە بوو بەفەرمان ڕەوایی ئوسامە. بەڵام سوپایەكە دەردەكەوت كە زۆر دڵخۆش نەبن بە ئوسامە. بۆیە ئوسامەش ڕۆیشتە لای عومەری كوڕی خەتاب﷜، كە بڕواتە لای پێشەوا ئەبوبكرو سكاڵای گەڕانەوەی خۆی و سوپای بۆ بكات چونكە ئەوسوپایەی كە لەگەڵ ئوسامەدا دەڕوات تەنها وەك و لاشەیەكی بێگیان وەهان.زۆردەترسێ بەو جۆرە دووژمنان بەسەرمان دا سەر كەون‌و بێشوێنمان بكەن. وە ئەنصارەكانیش بە عومەریان گوت: ئەگەر پێشەوا ئەبوبكر ﷜ هەر لەسەر ڕەوانەكردنی ئەو سوپایە سوور بوو. با سەركردەیەكی باشترو بە تەمەن ترمان لەگەڵدا بنێرێ. ئینجا كاتێ عومەر ﷜ئەوهەواڵەی بە ئەبوبكر ڕاگەیاند: ئەبو بەكر﷜ زۆر تووەڕە بوو. فەرمووی: سوێند بە خودا ئەگەر زۆرباش بزانم سەگ‌و گورگ لەو ڕێگەیە تێكم دەشكێنن: فەرمانێك كە پێغەمبەری خودا ﷺ دەری كردبێت نای گێڕمەوەدواوە؟ دوایی عومەر ﷜هەواڵی گوتەی ئەنصاریەكانی بە ئەبوبكر گوت: ئەبو بكر فەرمووی: ئەی عومەر﷜ دایكت ڕۆڵە ڕۆت بۆ بكات، شتێك كە پێغەمبەری خودا ﷺپێكی هێنابێ تۆ دەتەوێ من لای بدەم‌و تێكی بدەم؟ لەدوای ئەوە عومەر ﷜گەڕایەوە بۆ لای سوپاوهەواڵی وەڵامەكەیانی پێدا پێی گوتن:ئەی دایكتان ڕۆڵە ڕۆتان بۆبكات بەڕاستی ئێوە منتان لەلای ئەبوبكر شەرمەزارو بەد بەخت كرد. بەو جۆرە پێشەوا ئەبوبكر فەرمانەكەی پێغەمبەری ﷺخودای بەڕاست‌و ڕەوان بە جێ هێناو. سەرپێچی‌و لاری خەڵكی نەبوەمایەی هەڵوەشاندنەوەی فەرمانی پێغەمبەرﷺ.وە هەر بەهەمان شێوە ئەبوبەكر لە ژیان‌و تەمەنی جێنشینیدا نەبوەمایەی پێچەوانەی هیچ فەرمانێكی پێغەمبەر.ﷺبەوجۆرە ئەو سوپایە بە فەرمان ڕەوایی ئوسامە﷜ ئامادەی ڕۆیشتن بوو. لەوكاتەدا پێشەوا ئەبوبكر﷜ بەپێیان بەرەولای مەیدانی سوپا ڕۆیشت بۆ بەڕێكردنیان لەناوەڕاستی سوپا ڕاوەستابوو. ئوسامەش بە سواری ولاغ‌و خۆ ئامادەكردندا، فەرمووی : ئەی جێنشینی پێغەمبەری خوداﷺ ئێمە شەرم دەكەین تۆ بە پێیان‌و ئێمەش بەسواری ، یان، تۆش سواربە ، یان ئێمەش دادەبەزین. ئەبو بكر ﷜فەرمووی: سوێند بە

خودا نەمن سوار دەبمی، نە ئێوەش دا دەبەزن بامنیش ساتێك قاچەکانم لەپێناوی خودادا خۆڵاوی ببێت. چونکە بەڕاستی جەنگاوەران بەهەر شۆقاوێك کەدەیهاون حەوت سەد چاکەیان بۆ دەنوسریٚو، حەوت سەد پلەیان بۆ بەرز دەبێتەوەو، حەوت سەد تاوانیان لیٚ ڕەش دەبێتەوە. ئینجا ئەبوبەکر ﷺبۆ ڕێزلێنان لە ئوسامە ﷺداوای مۆڵەتی مانەوەی عومەری ﷺکرد کە لە مەدینە بمێنێتەوە بۆ ڕاوێژکاری پرس و ڕا لەگەڵیدا: ئوسامەش ﷺ زۆر بە خۆش حاڵیەوە داوایەکەی پێشەوا ئەبوبەکری ﷺ قبولٚ کرد. لەدوای بەڕێکەوتنی سوپای موسڵمانان بیست ڕۆژ تێنەپەڕی بوو. کە پەلامارو هێرشکرایە سەر شاری (بلقاء)ولەو پەلامارەشدا ئوسامە ﷺسەلماندی کە بەڕاستی سەرکردەیەکی بە تواناو لێهاتووە و سەرکەوتنێکی زۆر گەورەی بەدیهێناو، گیانی ئازایی‌و خۆنەویستی لە ناو موسڵماناندا بەرز کردەوە.

## زرنگی‌و بلیمەتی ڕافع کوڕی عەمیری تائی

## عبقرية رافع بن عمير الطائی

دەگێڕنەوە کاتێك داوا لە(خالیدی کوڕی وەلیدﷺ)کرا بە سوپاوە بەرە و شام بۆ بەرەنگاری سوپای ڕۆم بڕوات. کەبەڕاستی هەڵوێستێکی پڕ مەترسی بوو.خالید ویستی ڕێگایەکی کورت هەڵبژێریٚ زوو بیگاتیٚ. بۆ ئەو مەبەستە لە شارەزایانی ڕێگایان پرسی، گوتیان: دوو ڕێگا بەرە و شام دەڕوات، یەکیان: دوور و سەلامەت و دڵنیایت، دووەمیان: نزیك‌و پڕ مەترسی وزەحمەتە. خالید فەرمووی: ڕێگەی دووەم: کە پڕ مەترسیە هەڵی بژارد بۆ ئەوەی زوو بگاتیٚ. بۆ شارەزای ڕێگا (ڕافیعی کوڕی عەمیری تائیﷺ) لەگەڵ خۆیدا برد. عەمیر گوتی: ئەی خالید تۆ ناتوانی بەو ڕێگایەدا بەوڵاغی سواری‌و ، ماڵی دەست کەوتی غەنیمەت بڕۆی، سوێندبەخودا بەتەنها تاکەسواری ناتوانی بەو ڕێگەیەدا بڕۆی. چونکە لە ڕێگای پێنج شەوڕۆیشتن توشی هیچ ئاوێك نابیت.خالیدی کوڕی وەلید ﷺ فەرمووی: حەتمەن پێویستەبەو ڕێگایەدا بڕۆین بۆ ئەوەی زوو بگەینیٚ: ئینجا تۆ پێم بڵیٚ فەرمانت بە چییە؟! ڕافع گوتی:مادام هەر بەو ڕێگەیەدا بڕۆین پێویستە ئاوێکی

زۆر لەگەڵ خۆیدا هەڵبگرێ هەتا تەنانەت ئەوەی كەدەتوانی گوێچكەی حوشترەكەشی پڕبكات لە ئاو باپڕی بكات، چونكە ڕێگایەكە ڕێگایەكی سەخت و لەناوبەرە. تەنها بۆ ئەوانەی كە خودا بیانپارێزێ.خالید بۆ ماوەی پێنج ڕۆژبە و هەموو ناخۆشی وسەختیە ڕێگای چۆڵو بیابانیان بڕی. لەهەر شوێنێك بارگەیان دەخستو نانو خواردنیان دەخوارد. لە دواییدا هێندێك لەو حوشترانەی كەپێیان بوو سەریان دەبڕینو ورگیان هەڵدەدڕیو، خەزانەی ئاوەكەیان دەردەهێناو وڵاغەكانی تریان پێ ئاودەدا، بەو جۆرە هەتا گەیشتنە ئەو شوێنە دیاری كراوەی كەبۆیان دیاری كرابوو.

## ئێمە بە هانای گاڵتە پێكراوانەوە دەچین

## إنا كفيناك المستهزئين

جارێكیان ئەبوجەهلی كوڕی هشام حوشترێكی لەكابرایەكی دەشتەكی كڕیو پارەكەی لەكاتی خۆی نەدایە.كابرا زۆر تەنگەتاو ببوو. تواناو هێزی چاوەڕوانی تێدا نەمابوو. بۆ مەبەستی حەقەكەی ڕۆیشتە یانەی قوڕەیشیەكانو، هاوارو هانای بۆ هەموویان برد كە ئەو حەق و مافەی بۆ وەربگرنەوە. ئەوانیش بۆگاڵتە پێكردنی ئاماژەیان بۆ پێغەمبەرﷺ كردكە ئەو مافەی بۆ وەربگرێتەوە كە لەو كاتەدا پێغەمبەر ﷺلە مزگەوت نوێژی دەكرد گوتیان: بڕۆ ئەو پیاوە دەتوانێ مافەكەت بۆ وەر بگرێتەوە. ئەو كابرایەش پێغەمبەری نەدەناسی و نەیدەزانی ئەوە كێیەو چی كەسە؟. ڕۆیشتە لای و داواكاریەكەی پێگوت: پێغەمبەرﷺ هەر خێرا لەگەڵ كابرادا ڕۆیشت بۆماڵی ئەبوجەهلو لەدەرگایدا: كەئەبوجەهل زانی پێغەمبەرە و لەدەرگا دەدا هەر خێرا بەدڵە ڕاوكەو ترسەوەڕەنگی گۆڕا بوو هاتەدەر. پێغەمبەر ﷺفەرمووی:لەبەرچی حەقی ئەو پیاوە نادە یەوە بیدەوە ؟. ئەبوجەهل بەبێ ڕاوەستان خێراحەقەكەی دایەوە. بێباوەڕەكانی قوڕەیش كەبۆ گاڵتە جاڕی هاتبوونە بەرامبەری، لەو هەڵوێستە شكست خواردو، شەرمەزاریەیان سەریان سوڕماو، بە شتێكی نەنگو خەراپیان ژمارد. پێیان گوت: ئەوە بۆ بەو جۆرە لاواز و بێ هێزبووی بەرامبەرمحمد. ئەبوجەهل گوتی: هاوار و بەدبەختی بۆ

ئێوە، سوێند بە خودا هەر كە لە دەرگایدا و گوێم لەدەنگی بوو، هەموو گیانم هاتە لەرزەو، ترسم لێ نیشت، كەهاتمە دەرەوە بۆلای چاومكەوت بە نێرە حوشترێكی گەورە كە لە ژیانمدا شتی وامنەدیتبوو كە زۆر بەسامەوە كەڵپەكانی داپچڕی بوو ئەگەر سەر پێچیم بكردبایە لەناوی دەبردم‌ودەی خواردم.

## چیرۆكی موسڵمان بوونی عومەری كوڕی خەتاب

## قصة إسلام عمر بن الخطاب

دەگێڕنەوە ڕۆژێك كۆمەڵێك لەیارو یاوەرانی پێغەمبەر، ﷺنزیكەی(٤٠) چل كەس لە پیاو ئافرەت كەحەمزەو، ئەبوبەكری صدیق‌و، علی كوڕی ئەبی تالب، یان لەگەڵدا بوو لەماڵێك لەنزیكی كێوی سەفا دانیشتبوون و كۆبوونەوەیان بوو: لە كاتێكدا قوڕەیشیەكان خەلأتێكی زۆریان دیاری كردبوو، بۆئەوكەسەی دەتوانێ محمد بكوژێت. عومەری كوڕی خەتابیش بە شێوەیەكی زۆردزێ‌و، سەرسامی ودڕندانە شیری لە خۆی دەبەستێت‌و بەرەولای سەفادەكەوێتە ڕێ. لە ڕێگا توشی(نەعیمی كوڕی عبدالله )دەبێت كە سەیردەكات واعومەرئاگری دووژمن كاری لە چاوی دەبارێت پێی دەڵێ: ها عومەر بەو شێوە بۆ كوێ دەڕۆی؟ عومەریش دەڵێ، بەخوا بۆ لای ئەو موحەمەدە بەدبەخت و ناهەموارە دەڕۆم، كە هەموو ئیشوكارەكانی قوڕەیشی تێك داوەو، ئاواتەكانیانی پەرش و بڵاوكردووەو، ئاین و ڕێبازەكانیانی بەشەرمەزاری‌و دواكەوتەیی داناوەو، جنێو قسەی ناشیرین بە خوایەكانیان دەڵێت.ئێستا دەڕۆم دەیكوژم.! نەعیم گوتی:ئەی عومەربەڕاستی تۆ زۆر بێ ئاگای‌و، خۆت هەڵ فریواندووە:بۆ تۆ وادەزانی بەوئاسانیە دەتوانی محمد بكوژی و كۆتایی دێت، بەخوداهۆزی عبدالمناف ناهێڵن سەعاتێكیش لەو سەر زەویە بژیەی، لاچۆ بڕۆ واز لە محمد بهێنە؟ بۆچی تۆ ناڕۆیە ناو خانەوادە و كەسەكانی خۆت‌و، كاری ئەوان بەجێ بهێنە ئیشت بە محمد چییە؟ عومەر گوتی: ئەوە تۆ دەڵێی چی، كام خانەوادەم‌و، چی بووە؟ نەعیم گوتی: سوێندبە خودا فاتمەی كچی خەتابی خوشكت و زاوایەكەت، سەعیدی كوڕی زەیدی كوڕی عەمری مامت. موسڵمان بوون‌و لەگەڵ محمددان بڕۆ تۆ ئاگات لەوانە بێت. كە

عومەر گوێی لەو قسەیە بوو زۆر بەتوڕەییەوە گەڕایەوە بۆلای ماڵی خوشكی، كە لەو كاتەدا (خەبابی كوڕی ئەڕەتت) لەلایان بوو پەڕەیەكی لە قوڕئان كە سوڕەتی (طـه)ی تێدابوو بۆیانی دەخوێندەوە لەو كاتە عومەر گوێی لە قوڕئان خوێندنەكەی بوو زۆر بەڕقەوە لەدەرگایدا ئەوانیش زانیان كە ئەوە عومەرە لەترسان خەباب خۆی پەنهاندا و فاتمە پەڕە قورئانەكەی لێوەرگرت و، شاردیەوە، عومەر كە ڕۆیشتە ژوورەوە گوتی: ئەوسەروەری‌ودەنگە چی بووكە بیستم؟ فاتمە گوتی:من هیچم نەبیستوە چی ڕوویداوە؟ عومەر گوتی: بەخوا من گوێم لێ بوو شتێكتان دەخوێندەوە: وەمن وام خەبەر زانیووە كە ئێوە بەدوای ئاینی محمد كەوتوون. ئەمجار زۆر بە ڕقەوە سەیری سەعیدی كرد و بەرۆكی گرت و پێی گوت: خێراكە ڕاستیم پێ بڵێ، چی ڕوویداوە ؟ فاتمە بۆلای عومەر ڕۆیشت كەلە سەعیدی هاوسەری دووری بخاتەوە. بەڵام عومەر سوڕایەوەو، هەتا هێزی تێدا بوو شەقازلەیەكی لە فاتمەدا ڕوخساری دەم و چاوی و گوێچكەی بەخوێندا هات و ئازارو تینێكی زۆری بۆهات.لەدوای ئەوەی كە فاتمەو سەعید ئەوكارو ڕوو داوەیان دیت هەردوكیان بەیەك دەنگ گوتیان: عومەر ئێمە باوەڕمان بەخوداو پێغەمبەری خودا ﷺهێناوەو موسڵمان بووین! ئینجا ئەتۆ هەرچیت پێدەكرێ بیكەو درێخی مەكە؟عومەریش كاتێ بەوشێوە فاتمەی خوشكی چاو پێكەوت كە هەموو گیانی بووە بە خوێن و زۆریش بە ئازارە: زۆر لەكارەكەی پەشیمان بۆوەو، بە خوشكەكەی گوت: ئەو پەڕەی كەدەتان خوێندەوە گوێم لێی بوو پێشی ئێستا بیدەن بەمن بابیدنم ، بزانم ئەوەچییە كەمحمد هێناویەتی؟ چونكە عومەر بۆخۆی خوێندەوار بوو، بەڵام خوشكی گوتی:بە خوا عومەر ناوێرین ئەو پەرەیەت وا بە ئاسانی بدەینێ؟ عومەرسوێندی بۆخواردن كەمەترسیتان نەبێ و، لە دوای خوێندنەوەی دەتان دەمەوە.كاتێ كەزانیان عومەر زۆر هێمنی‌ونەرمی دەنوێنێ و ئومێدی موسڵمان بوونی لێدەكرێ. خوشكی گوتی:ئەی برام ئەوپەڕە قورئانە نابێ هیچ كەسێك بەپیسی دەستی لێبدات تۆش بێباوەڕو پیسی: بڕۆ پێشەكی خۆت بشۆو وەرەوە دەت دەینێ. لەدوای ئەوەی كە عومەر ڕۆیشت خۆی شوشت و

هاتەوە پەڕە قورئانەکەیان دایەو، ئەویش زۆرجوان بەوردی خوێندیەوە، دوایی گوتی: بەخودا گوتەیەکی زۆر جوانوبەرێزە. وە زۆر سەیرەکە هۆزی قوڕەیش لەو ووتە جوانو، شیرینانە ڕادەکەنو نایانەوێ گوێیان لێی بێت؟ ئەی هاوار بۆ هۆزی قوڕەیش بەڕاستی هەژارونەزانن. کاتێ خەباب ﷺ لەحەشارگەکەی خۆیدا گوێی لەو گوتانەی عومەر بوو هاتەدەرو، بەرەو لای عومەر ڕۆیشت و فەرمووی: ئەی عومەر لەخودا دەخوازم کە تۆ بە بەر ئەو دوعاو نزایەی پێغەمبەر کە دوێنێ کردی کەخۆم گوێم لێی بوو بەربکەوی کە دەیفەرموو: خودایە یارمەتی دەرێکی باش بۆ ئەودینە بنێری: بەموسڵمان بوونی یەکێك لەو دوو عومەرانە: عومەری کوڕی هوشام ، کە ئەبو جەهلە، یان عومەری کوڕی خەتاب. ئینجا ئێستا واتۆ دەبینم پێش خەریت کردووە بۆ موسڵمان بوون. الله الله لەو بەرەکەتە.لەوکاتەدا عومەر گوتی: ئەی خەباب وەرە ڕێگەم پێنیشانبدە بۆ لای پێغەمبەر تا موسڵمان ببم.خەباب گوتی: پێغەمبەر والەماڵی ئەرقەمە لەنزیك کێوی سەفا. عومەر زۆر بە هەڵەداوانەوە شیرەکەی هەڵگرتەوەو بەرەو ماڵی ئەرقەم کەوتەڕێو لە دەرگایدا یەکێك لە یارەکانی لە کونی دەرگاکەوە سەیری کرد وا عومەر بە خۆیو شیری بڕندەی لە سەر دەرگا ڕاوەستاوە. زۆر بەترسو دڵەڕاوکەوە گەڕایەوە لای پێغەمبەروﷺ هەواڵەکەی پێڕاگەیاند.حەمزەی کوڕی عبدالملب فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا ڕێگەی پێ بدە با بێتە ژوورەوە ئەگەر نیەتی باش بوو، ئەوە زۆرباشە وەئەگەر نیەتی شەڕوخەراپەی هەبوو، ئەوە هەرلێرە بە شیرەکەی خۆی دەیکوژین. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بابێتە ژوور دەرگایان بۆکردەوەوهاتە ژوورەوە، پێغەمبەر ﷺبۆ لای ڕۆیشت و بەرۆکی کراسەکەی گرتو زۆر بە توندی لەدەستی ئاڵاندو فەرمووی:ئەی کوڕی خەتاب بۆچی هاتووی؟سوێند بەخودا ئەگەر بۆ شەڕ هاتووی، لێرە ڕزگاریت نابێ هەتا توشی کارەساتێکی گەورەت بەسەردێ.عومەر گوتی: بەخوا ئەی پێغەمبەری خودا بۆیە هاتووم موسڵمان ببمو، باوەڕ بە خوداو پێغەمبەرەکەی بهێنم.پێغەمبەرﷺ (الله اکبر)ێکی زۆر بەهێزی کرد، کە هەموو خانەوادەویارو یاوەرانی پێغەمبەرتێگەیشتن کە عومەر موسڵمان بووە.لەدوای

چەند گوفتوگۆیەكی زۆر عومەرﷺ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا تۆ ئەو پەیام و بەرنامەیەت بەنهێنی هێناوەیان بەئاشكرایی؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی:بە ئاشكرایی. عومەرﷺ فەرمووی: ئەدی بۆچی بە نهێنی كار بكەین؟ عومەر لەگەڵ پێغەمبەر و هاوڕێكانیدا هەسات و بەرە و كەعبە ڕۆیشتن: كە زۆربەی دانیشتوانی قوڕەیش لەلای كەعبە بوون، عومەر بە هەرچی هێزو تینی هەبوو هاواری كرد ئەی كۆمەڵانی قوڕەیش هەركەسێ دەیەوێ دایكی ڕۆڵە ڕۆی بۆ بكاتو، سینگی بۆ بكوتێ و، منداڵەكانی هەتیو بكەونو، هاو سەرەكەی بێوەژن ببێت، بابۆم بێتە ئەودیوی دۆڵوشیوە.باش بزانن من موسڵمان بووم (اشهدان لا إله إلا الله واشهد ان محمدا عبده ورسوله).

# چیرۆكی بەسەر هاتی بوختانو درۆ
# قصة حديث الإفك

نەریتو ڕەوشتی پێغەمبەرﷺ وابو هەركاتێك كە بۆ سەفەر و گەشتێك دەڕۆیشت تیرو پشكی لە نێوانی هاوسەرەكانیدا دەكردو هەركەسێ بەربكەوتبایە ئەوەی لەگەڵ خۆیدا دەبرد بۆ گەشتەكەی. ئینجا لە جەنگی بەنی (مصطلق)دا هەروەكو نەریتوڕەوشتی پێشوی ، تیرو پشكی لە نێوانی هاوسەرەكانیدا كرد: خاتو عائیشەی هاوسەری بەركەوتو ، ئەویش سواری كەژاوەكەی بووهەڵیان گرتو لەگەڵ پێغەمبەر و سوپادا كەوتە ڕێگا. ئینجا لەدوای تەواوبوونی كارو پێویستیەكانی بەرەو مەدینە كەوتنەوەڕێگاو گەڕانەوە لە شوێنێك پێغەمبەر و یارانی دابەزین، بۆپشودان چەند شەوێك مانەوەلەدوای ئەوە بانگیان ڕا هێشت كە سوپا ئامادەبێو دەڕۆین، لەو كاتەدا حەزرەتی عائیشەچووە سەراو كاری پێویستی: لەدوای تەواو بوونی هاتەوە ناو كەژاوەكەی، بەڵام پێشی سەرخستنی كەژاوەكەی ملوانكەیەكی زۆر بەنرخ و نایابی هەبوولە شێوەی (زوفار) كە بە ناوی شارێكەوە بوو لە صەنعا لەملی دا نەمابووبەبیری كەوتەوە كە لە شوێنی بەجێهێنانی سەراوی لێی بەجێماوە بۆیە خێرادابەزیو ڕۆیشتەوە شوێنی سەراویەكەی ملوانكەكەی بێنێتەوە. دەڵێ: تاریك بوو دەستم لە زەویدا گێڕا هەتا

دۆزیمەوە سوپایەکەش هەر یەکەی خەریکی خۆ ئامادەکردنو سواربوون بوون.ئەو کۆمەڵەی کەلەگەڵ کەژاوەکەی مندابوون وایان زانیبوو لەناو کەژاوەکەمدام هەر خێرا کەژاوەکەیان بارکربوو قائیمیان کربوو، بەڕێکەوتبوونو ڕۆیشتبوون.کاتێ عائیشە خاتوون گەڕابۆوە شوێنی کەژاوەکەی کەسی لێنەمابوو ڕۆیشتبوون. ئینجا لێرەدا حەزرەتی عائیشە بۆ خۆی بۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: هەر لەو شوێنی کەژاوەکەی خۆمدانیشتمو کراسێکی پانو پۆڕم لەبەردابوو خۆم جوان داپۆشی و پاڵم لێی دایەوە گوتم لەدوای ئەوەی کەزانیان من لەناو کەژاوە کەدانیم حەتمەن بۆ لام دەگەڕێنەوە.سوێند بە خودا لە دوای ماوەیەکی کەم (سەفوانی کوڕی معتەلی سەلەمی) کەئەویش لەکاروان بە جێمابووبۆ چەند ئیشو کارێکی خۆی، کاتی ڕۆیشتنی کەسەیر دەکات تارمایەکی ڕەش بەدی دەکات دێت بۆ لای ئەو تارماییە بزانێ چییە؟ کاتێ سەرم هەڵبڕی لەسەرسەرمەوە ڕاوەستابوو ئەوکاتە حیجاب واجب نەکرابوو. کەچاوی بەمن کەوت گوتی(إنا لله وإنا إليه راجعون) لەوکاتەدا ئەو ئافرەتانەی کەلەگەڵ گەشتو گوزاردا دەڕۆیشتن پێیان دەگوتن (ظعينة) ئەویش هاواری لێکردمو گوتی: ئەی ظعینە ی پێغەمبەری خودا ڕەحمەتت لێبێ چیدەکەی تۆ بۆ بە جێماوی؟ منیش زۆر تەواو خۆم لە بەرگەکەم پێچابۆوەو هیچ قسەم نەکرد. لەسەر حوشترەکەی دابەزیو لێم دوور کەوتەوەو گوتی: سواربە منیش سەرکەوتمە سەر حوشترەکەو، ئینجا لێم هاتە پێشەوەو ڕێشمەی حوشترەکەی گرتو ، بەخێرایی ڕای کێشاڕۆیشتین بۆ ئەوەی زوو بگەینەوە ناو سوپا، کە گەیشتینەوە کاتی بەیانی بووتازە خەریکی بارگە خستنو پشودان بوون. هێندێك لە خەڵکی نادوورست و دووژمن کارو درۆزن بازەکان، کەدەبینن وا عائیشە لەگەڵ کابرایەکی تردا سواربووەو حوشترەکەی بۆ ڕادەکێشێ‌و، لەسواری کەژاوەکەی خۆیدا نییە. هەر کەسەیان بەئارەزووی خۆی قسەیەك دەکەنو، هەموو سوپا دەشڵە ژێ‌!نن‌ودەنگی نارەزایی بلاو دەبێتەوە. بەڵام سوێند بەخودامن هۆشو ئاگام لە هیچ نەبووەو بەهیچیشم نەزانیوە. لە دوای ئەوەی کەلەوێش بارگەمان بارکردەوەو ڕۆیشتینەوە ناو شاری مەدینە. زۆری نەبرد من نەخۆشیەکی

زۆر سەختو بەئازارم توشهات. ناحەزانو دووڕووەكانی مەدینە ئەو هەواڵە درۆیینەیان لەناو سوپاو لەناو شاردا بڵاو كردبۆوە، بە جۆرێك كەتەنانەت پێغەمبەری خوداودایكو باوكیشم ئاگادار كرابوونەوە، بە تەنها حەزرەتی عائیشە ئەو هەواڵەی نەزانی بوو، كەس پێینەگوتبوو: بەڵام هەر لە خۆمەوە شتێكم لە پێغەمبەردا هەست پێدەكرد، لە پێشوودا كە نەخۆش دەبووم پێغەمبەر هەست و سۆز و خۆشەویستی بە لامەوە زۆر زیاتربوو، ئەوجارەیان ئەو هەموو سۆزەی پێشوی لێ بەدی نەدەكرا، دایكم هەر دەم لەلام بوو هیچی پێنەدەگوتم.پێغەمبەرﷺ لەوكاتەدا هاتەلامو تەنها ئەوەندەی فەرموو: نەخۆشەكەتان چۆنە؟! هیچی تری نەفەرموو:منیش لەدوای ئەوەی كە پێغەمبەرﷺسۆزو خۆشەویستی بەلامەوە كەم بوو پێم گوت ئەی پێغەمبەری خودا من زۆر نەخۆشم حەز دەكەم لەو ماوەی نە خۆشیەمدا بڕۆمەوە بۆلای دایكم، پێغەمبەریش ﷺفەرمووی: منیش پێم باشە بڕۆوە. منیش ڕۆیشتمەوە بۆ ماڵی باوكم. بەڵام سوێند بەخودا هەتا ئەوكاتەش ئەو هەواڵە درۆ و بوختان كەرەم هیچ نەبیستبوو كەدونیای پڕ كردبوو. لەدوای (٢٩) بیست و نۆ ڕۆژ نەخۆشیەكەم تۆزێ سوك بوو.دەفەرموێ: نەریتو باوی عەرەب وابوو لەماڵەوە سەرا و حەشارگەی دەست بەئاومان نەبوو: ئافرەتان شەوانە دەڕۆیشتنە دەرەوەی ئاوەدانیو سەراوكاری پێویستی خۆیان بە جێ دەهێنا: دەفەرموێ: شەوێك لەگەڵ دایكی مەستەحی كچی ئەبی ڕەهم، كەدایكی كچی سەخروپوری ئەبوبكرو صدیق بوو، گوتی: بە خودا من لەگەڵت دادێم. لەڕێگا دایكی مەستەح قاچی بەبەرگو لیباسەكانی كەوتو ساتمەی بردو خلیسكاو كەوت و، گوتی:خودایە مەستەح زەلیلو داماوبی مەستەح كونیەی كوڕەكەی بوو دەناناوی خۆی(عەوف)بوو.عائیشەئەو دوعایەی زۆر پێناخۆش دەبێ پێی دەفەرموێ: توخودا تۆ چۆن قسەی ناشین بە پیاوێكی موسڵمانی لە خودا ترسی كۆچ كردوو: كە ئامادەی جەنگی بەدر بووەدەڵێی: دایكی مەستەح دەڵی بۆچی عائیشە تۆ ئەو هەواڵەت نەزانیوە كەچیان پێگوتوی؟ عائیشەش زۆر بە سەر سامیەوە دەڵێ هەواڵی چی وچڕووی داوە؟ دایكی مەستەحیش هەواڵو

ڕووداوەکەی پێڕادەگەیەنێ. عائیشە بەسەرسامی و سەرسوڕمانەوە دەڵێ: چۆن شتی وا بووە؟! بۆیە کارو دەست بەئاوی لەداخان هەر لە بیر دەچێتەوەو، دەڵێسوێند بە خودا کاری سەراوم نەکردو بەگریانەوە گەڕامەوە زۆر لە نەخۆشیەکەم بێتاقەت تربووم خەو خۆراکم نەماوام هەست دەکرد ئەو گریانو هەواڵ جەرگم دەبڕێت. چومەلای دیکم گوتم: ئەوەی کە بۆ ئێوە باسکراوە بۆ منیشی باس بکەن، بەڵام داتیکم هیچی پێ نەگوتم، تەنها گوتی: کچم هیچ غەم مەخۆ، سوێند بەخودا زۆر بەکەمی ڕێك دەکەوێ کە ئافرەتێکی واجوانو شۆخو شەنگ لەلای پیاوێکی بەرزو بەڕێزو هەوێدارو خۆشەویس بێتو، ناوناتۆرەی خەراپ‌ونابە جێی پێوە هەڵنەبەستن‌وئێرەیی‌وحەسودی پێوەنەبەن، بەڵێ بەو جۆرە ڕۆژگاری! تێپەڕیو ئەو بەسەرهاتە درۆیە ببوە بنێشتە شیرنەی سەر زووبانی درۆزن‌و بوختان کاران. هەتا ڕۆژێك پێغەمبەرﷺلەوتاردا لەدوای سوپاس‌و ستایشی خودا فەرمووی: تو خوا خەڵکینە بۆچی ئەوەندە ئازارم دەدەن، سوێند بە خودا ئێوە شتێکی درۆو ناڕاست بەرامبەریان دەکەن سوێند بەو خودا من لەچاکە بەولاوە هیچ خەراپەیەکم لێ نەدیتوە. وەبەرامبەر بە پیاوێکیش قسەکەن لە چاکە بەولاوە لێم نەدیتووەن ڕۆیشتۆتە هیچ ماڵێك لەماڵەکانم تەنها لەگەڵ خۆمدا نەبێت. لەدوای ئەوە پێغەمبەر زۆربێتاقەت دەبێ، بانگی عەلی کوڕی ئەبی تالیب‌و ئوسامەی کوڕی زەید ﷺدەکات‌و ڕاوێژیان پێدەکات لەوبارەوە، ئوسامە دەفەرموێ: بە خودا ئەی پێغەمبەری خودا وازی لێمەهێنە بەخودا ئافرەتێکی زۆرپاکەو هیچمان لێی نەدیتوە. بەڵام عەلی کوڕی ئەبی تالیبﷺ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا چ زۆرە ژن زۆرەو ئەتۆش پیاوێکی بەتواناى و دەتوانی جێگەی ئەوەت بۆ پڕ بکاتەوە. بەڵام ئەی پێغەمبەری خودا تۆ کەنیزەکان بانگ بکەو، پرسیاریان لێبکە ئەوان وەڵامی ڕاستیت دەدەنەوە. پێغەمبەریشﷺ بانگی (بەریرە) دەکات‌و پرسیاری دەربارەی عائیشە لێدەکات حەزرەتی عەلی دەڕواتە لای بەریرەو بە ترس‌و تینێکی توندەوە پێی دەڵێ بەڕاست‌و دروستی وەڵامی پێغەمبەر بدەوە؟ بەریرەش لەوەڵامدا سوێند دەخوات دەڵێ: هەرچی

چاكەنەبیٚ لە عائیشەمان نەدیتووە. وە هەرگیز بیرو گومانی خەراپەو ناڕێكیمان لەو ئافرەتەدا بەدی نەكردووە. تەنها كەمن هەویر دەشێلم لەلای عائیشەدای دەنێم بۆئەوەی جوان بترشیٚ، ئەویش زۆربیٚ موبالاتەو خەوی لێدەكەویٚ و ئاژەڵ دێنەسەری و دەیخۆن. عائیشە لەو بارە ناڕێكو ناخۆشەدا بوو چاوەكانی وشك نەدەبۆوە. دەفەرمویٚ: پێغەمبەر هاتە لام باوكو دایكم لەلام بوون لەگەڵ ئافرەتێكی ئەنصاری كەلەگەڵمدا دەگریا هات دانیشتو فەرمووی: ئەی عائیشە بەڕاستیٚ من لە خەڵكانەوە لە بارەی تۆ شتێكی ئەوهام بیستوە ئەگر تۆش هەڵ خەڵەتاوی و كاری وات كردووە پەشیمان ببەوەو تۆبە بكە خودای گەورە تۆبەی تۆبەكاران وەردەگریٚ، عائیشە فەرمووی:لەوكاتەدا فرمێسكی چاوەكانم وشكبوو دەنگم نەكردو و چاوەڕوانی باوكمو دایكیم بووم كە وەڵامی پێغەمبەر بدەنەوە.بەڵام هیچ قسەیەكیان نەكرد. ئینجا من گوتم: بەخوا زۆر لەوە بچوكترم كەخودای گەورە ئایەتم دەربارە بنێریٚو پاكوپاك داوێنیٚمن دەربڕیٚ چونكە نەگەیشتومە ئەو ڕادەیە كەخودا قورئان بنێرێتە خواروباسم بكاتو موسڵمانان لە ناو نوێژدا بیخوێننەوە، بەڵام هیوادارم لە خودای گەورە كە پێغەمبەر بۆخۆی خەون بدینیٚو لە خەوەكەی دا پاكی منودرۆو بوختانی ئەو بوختان كەرانەی بۆ ڕوون ببێتەوە. ئینجا كاتیٚ كەدایكو باوكم هیچ وەڵامی پێغەمبەریان نەدایەوە.گوتم: بۆچی ئێوە لەباتی من وەڵام نادەنەوە؟ ئوانیش گوتیان:بە خوانازانین چۆنوبەچی وەڵامی بدەینەوە.منیش بەگریانەوەوەڵامم دایەوەو گوتم هیچ وەڵامێكم نییە تەنها فەرموودەكەی یەعقوبی باوكی یوسف‰ نەبێت.كە دەفەرمویٚ:{ فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَٱللَّهُ ٱلْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ }یوسف/١٨ واتە: یەعقوب فەرمووی :ئەوەی كە ئێوە دەیڵێن وانیە بەبراكانی یوسفی فەرموو: بەڵام سەبرو ئارامگرتن كارێكی جوانەو هەر خوداش داوای یارمەتیو كۆمەكی لێدەكرێت لەسەور ئەو باسەی كە ئێوە باسی دەكەن.لەدوای ئەوە سوێند بە خودا هێستا پێغەمبەر هەڵنەستابوو بڕوات. حاڵەتی وەحو نیگای بەسەرداهاتو خۆی داپۆشی. منیش لەوكاتەدا زۆر دڵشادو خۆش بەخت بووم بەو نیگایەو هیچ هاوارێكمم نەكرد چونكە زۆربێتاوان بووم.

بەڵام سوێند بە خودا كەسەیری باوكو دایكم كرد لەداخانا خەریك بوون گیانیان لەدەست بدەن لە ترسی ئەو نیگایە كەنەخواستە قورئان بەخەراپە باسم بكاتو دابەزێت. لەدوای ئەوەی كەپێغەمبەر هۆشی هاتەوە پێدەكەنیو فەرمووی: ئەی عائیشە مزگێنی بێت بەڕاستی خودا بێتاوانی تۆی ئاشكرا كرد. منیش گوتم زۆر سوپاسی خودا دەكەم. دوای ئەوە پێغەمبەر ڕۆیشتە ناو خەڵكەكەو وتارێكی بۆ خوێندنەوە ئەو ئایەتانەی بۆخوێندنەوە كە لەوبارەوە دابەزیبوو كەخودا دەفەرموێ:{إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ ۚ لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَّكُم ۖ بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۚ لِكُلِّ ٱمْرِئٍ مِّنْهُم مَّا ٱكْتَسَبَ مِنَ ٱلْإِثْمِ ۚ وَٱلَّذِى تَوَلَّىٰ كِبْرَهُۥ مِنْهُمْ لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٌ }النور/١١

واتە: بەڕاستی ئەوانەی كەبوختانەكەیان بە حەزرەتی عائیشەوەكرد كۆمەڵێك بوون لەخۆتان بەزاهیری موسڵمان بوون بەڵام لە ڕاستیدا دووڕوو منافق بوون ، بەڵام ئێوە ئەو ڕوو داوە خەراپە بەخەراپ مەزانن چونكە ئەوەبۆئێوە بەخێرو چاكەگەڕا بۆئەوەی موسڵمانان دووڕووەكان بناسنو لێیان جودا ببنەوە وەهەریەكەی لەو تاوانە بەشدار بێت گوناهی لە ئەستۆی خۆیەتی ، وەسەرۆكو گەورەی بوختان كەرەكانیش سزاو ئازاری زۆر گەورەی هەیە.بخاریو مسلم ریوایەتیان كردووە. وەلەزۆربەی سەر چاوەكانیشدا باسی كراوە وەكوابن هشام، البدايه والنهايه، تأريخ الطبرى، زاد المعاد، إبن إسحاق الرحيق المختوم.

# ووتەی جوان

# الكلمة الطيبة

لەعبداللەی كوڕی عومەرەوە ﷺدەگێڕنەوە فەرموویەتی: ئێمە كۆمەڵێك بووین لەخزمەتی پێغەمبەرﷺ دانیشتبووین. فەرمووی: ناوی ئەودارەی كەوەكو پیاوی موسڵمان هەردەم خزمەت گوزارەو، بەسزتانو هاوین ناوەڕێتو هەمووكاتێكیش میوەی جوانو خۆشی پێوەیە پێم بڵێن كامەجۆرەدارەیە؟ منیش وام بە خەیاڵداهات كەداری خورمابێت. ئەبو بكرو عومەر ﷺدانیش تبوونو هیچ دەنگیان نەدەكرد منیش شەرمم كرد لەخزمەتی پێغەمبەروﷺ ئەو بەڕێزانەدا قسەبكەم.

لەدوای ماوەیەك بێدەنگی پێغەمبەر بۆ خۆی وەڵامی دایەوە فەرمووی: ئەوەدار خورمایە، كاتێ هەستاین لەو كۆڕەدا بە حەزرەتی عومەری باوكم گوت:سوێندبە خودا بابە هەر كە پێغەمبەر پرسیارەكەی كرد ئەمن هاتە خەیاڵم كەدار خورمایە باوكم گوتی: بۆچی دەنگت نەكرد. منیش گوتم بەخوا ئێوە هیچ قسەتان نەكردوو منیش شەرمم كرد قسەبكەم عومەر ﷺ فەرمووی:بە خواعبدالله ئەگەرقسەت بكردبایە زۆرزیاتر لەلای پێغەمبەر ﷺ خۆشەویست تردەبووی.

## ئەی پەروەردگار لەبەڵاو شەڕی ئەوەبم پارێزە
## اللهم اكفنية

دەگێڕنەوە(ئەربەدی كوڕی رەبیعەو، عامری كوڕی تەفیل)هاتنە خزمەت پێغەمبەربە نیازێكی خەراپەوە یەكیان گوتی من محمد مەشغول وسەرقاڵ دەكەم بە پرسیارو لێپرسینەوەو ئەتۆش لەوكاتەدا كە ئاگای لە خۆی نیە بیكوژە. عامر هاتە لای پێغەمبەرو ماوەیەك ڕاوەستاو دوایی ڕۆیشت عامر بە ئەربەدی گوت ئەوە بۆچی هیچت نەكردوونەت كوشت؟ ئەربەد گوتی: سوێند بە خودا شتێكی ئەوەندە بەسام و ترسی لەلا ڕاوەستابوو قاچەكانی لەزەوی بوو سەریشی لە ئاسمان ئەگەر یەك تۆزیتر بەو مەبەستە لێی نزیك ببومایەوە تێكی دەشكاندم و لەناوی دەبردم وەك و خوداشلەوبارەوە دەفەرمویٚ: ﴿لَهُۥ مُعَقِّبَٰتٞ مِّنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَمِنۡ خَلۡفِهِۦ يَحۡفَظُونَهُۥ مِنۡ أَمۡرِ ٱللَّهِۗ﴾الرعد/١١ واتە:خودای بەدەسەڵات چەندین فریشتەی بێژماری هەیەكە بەنۆرەوجیاوازبەدوای یەكتردادێن بۆچاودێری ئادەمیزادەكان لەهەمولایەكەوەبەفەرمانی خودا دەیان پارێزن.

ئەو ئەربەدە خودا بە بروسكە لەناوی بردو، عامر گوتی: ئەی محمد بۆ ئێمەبێت خاوەن كوڵكاویو، ئێوەش ورگ زلیوگەورەی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ئێوەخاوەن سەر شۆڕیو داماوین، عامر گوتی: سوێند بێت ئەی محمد ئەوناوەت لێپردەكەم لە ولاغو پیاوواتە: هێزێكی گەورەت بۆ سەر دەهێنم كە پشتی هەڵكردوو ڕۆیشت. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:ئەی خودایە لەشەڕو بەڵای ئەو پیاوە بم پارێزە.خودای گەورە لەدوای ئەوە لولەیەكی غودەی لەمل و ئەستۆی هات وكوشتی.

# لەگەڵ خودابەو لە هیچ مەترسە

# كن مع الله ولاتبالی

جارێكیان كۆمەڵێك لەموسڵمانان ڕۆیشتن بۆلای حەزرەتی عومەرﷺ گوتیان ئەی پێشەوای موسڵمانان ئێمە پێش نوێژێكمان هەیە هەموو كاتێك لەدوای تەواو بوونی نوێژ گۆرانی دەڵێت. پێشەوا عومەرﷺ فەرمووی : ئەو كەسە كێیە؟ بڕۆن بۆم بهێنن. ئەوانیش گوتیان: بەخودا ئەی عومەر دەبێ تۆ لێمان ببوری چونكە ئێمە زۆرمان پێناخۆشە كەبۆخۆمان بڕۆین‌و پێی بڵێین دوایی بەرەوڕومان بكەیتەوە پێمان دەڵێ ئێوە چونەلای عومەر سیخوڕیو جاسوسیتان لەمن كردووە پێشەوا عومەر لەگەڵ ئەو كۆمەڵێك لەیارانی پێغەمبەر ﷺڕۆیشت بۆلای ئەو كابرایەلەمزگەوت كەچاوی بەپێشەوا عومەر كەوت هەستاو پێشوازی لێكرد لەدواییدا كابرا گوتی: ئەی پێشەوا كارت چی بوو چۆنی هاتی بۆ ئێرە؟ ئەگەر كارتان بە ئێمە یە ئەوە زۆر پێویست بو كە ئێمە بێینە خزمەتان: وە ئەگەر بۆكارو پێویستی خۆتە ئەوكاتەش زۆر پێویست بوو كەئێمەكارەكەتمان بۆبكردبایە، عومەرﷺ فەرمووی ماڵ وێرانی بۆتۆ ئێمەوامان هەواڵ پێدراوە كەتۆ كاری زۆر ناڕەواو نارێك دەكەی: كابرا گوتی: ئەی پێشەوای موسڵمانان ئەوكارە نارێكانە وەك‌و چی؟ پێشوافەرمووی: بیستومانەكە لەگەڵ خودا پەرستیەكەت گاڵتە جاڕی‌وڕەفتاری نادوروست ئەنجام دەدەی.كابرا گوتی حاشا للە، كەشتی ناڕەوابكەم تەنها ئامۆژگاریەكە كەهەمووكاتێ گیانمی پێ تەربیەت‌و ئامۆژگاری دەكەم: عومەرﷺ فەرمووی: ئەو ئامۆژگاریە چییەكەڕۆژانە لەدوای نوێژەكان دەیڵێی با منیش بیزانم ئەگەر باش بوو دەست خۆشیت لێدەكەو ئەگەر خەراپیش بوو ئەوەسەرپێچیت لێ دەكەم كەوازی لێبهێنی. كابرا گوتی:

| | |
|---|---|
| وفـــؤا د كلما عاتبتـــــة | فی مدی الهجرانی یبغی تعبی |
| لا ا را ة الـدهـــر الا لاهیـا | فی تمادیـة فقـد بـــرح بـی |
| یاقریـن السوعما هذا الصبا | ففی العمـــر كـذا فی اللعـب |
| ویـــح نفســـی لا اراها ابدا | فی جمیـــل لا ولافـی ادب |
| نفسی لاكنت ولاكان الهوی | راقی المولی وخافی وارهبـی |

بەوجۆرە كردمە شعر:

كـاتیٚ دڵــم كۆچ دە كـــاو لە لام نامێنێتـــــەوە
لاشەی بیٚ هۆش و هەستم گرژدەبیٚو دەتوێتەوە
چـــونكە بەردەوام دە ڕوا لام ئۆقرە نـاگــریٚ دڵم
بــۆیە هەردەم هیلاكـو چاوەڕێی دە سـكیٚ گوڵم
هەمووكات هەوڵ دەدا لەهەرزەكار دوور كــــەویٚ
بۆیە بیٚ هەســتـو بیرەوبەماندوودە ر دەكـــــەویٚ
هەراو هاوارمــــــە تەواو لە خەراپە ی وەگـــێڕم
گـە ر وانەكەم بۆچیمە چۆن دە ست دەكەویٚ خێرم
ئاوا تـە خـــوازم كەوا گیــانم بۆ خێـــــر بێتـــەوە
لە نــاڕەواو خــە راپە دوور بـــــیٚو بگەڕێتـــەوە
تـــــەواو لەخوا بترســــیٚودوور بیٚ لەبـەد كرداری
ڕووخســــاری ئێمە شــــــاد كالەدوارۆژی هەژاری

واتە: هەركاتیٚ گازندەو گلەییم لەدڵەكەم كردبیٚ لەكاتی دیار نەبوونی كۆچی كەهەر دەم پێویستە ئامادەو تەیاربێت بەساڵ لەلام دیار نیەو دەرناكەویٚ تەنها بۆئارەزونزیك بوونەوە نەبیٚ ئەویش بە مەبەستو دەرفەتی بەیەك گەیشتن ئەی هاوڕێی بەدو نەگریس ئەو پەرۆشیو هەرزەكاریە چییە؟لەتەمەنی ژیانتدا هەر لە هیلكیویاریو گاڵتەدای هاواربۆگیانم كە هەرگیز چاوم پێی ناكەوێمەبەستم جوانیو ڕۆخسارو ئەدەبوڕەوشتی گیانم نییەنەلەوانەونەهەواوئارەزوی گیانم نییەچاودێروچاوەڕوانی سەروەرو سەردارم بم لەترسوسامی خودا بترسیٚوبتۆقیٚ.پێشەوای موسڵمانان عومەركە گوێی لەو سرودو گۆرانیە خۆشە گرت بوو زۆرشادمان بوو لەگەڵی دەگوتەوە:

نفسی لاكنت ولاكان الهوی راقبی المولی وخافی وارهبی.

دوای ئەوە پێشەوا ڕووی كردە هەمووئەوانەی كە لە لایدابوون لەچوار دەورەیدا دانیشتبوون فەرمووی: لەسەر ئەو شێوە كیٚ گۆرانی دەڵیٚ با بیڵیٚ.

# لەرادە بەدەری قورئان
# معجزات القرآن

دەگێڕنەوە جارێكیان (وەلیدی كوڕی موغیرە) هاتەلای پێغەمبەری خودا پێغەمبەریش هێندێك قورئانی بەسەردا خوێندەوە وەلید دڵی نەرم بوو موسڵمان ببێت ئەو هەواڵە گەیشتە ئەبو جەهل ئەویش هەر بە خێراو بەپراكردن هات بۆلای وەلیدو پێی گوت: ئەی مامە گەلو هۆزەكەت بڕیاریان داوە كۆبونەوەیەك بكەنو هێندێك سەروەتو سامانت بۆ كۆبكەنەوەمتمانەی تەواوت لێوەربگرن كەنەڕۆیە لای محمدگوێ بۆ گوتەكانی نەگریتو بەر هەڵستی بكەی: وەلید گوتی هۆزی قوڕەیش باش دەزانن كەمن لە هەموویان دەوڵەمەند ترمو ماڵم لە هەموویان زۆرترە. ئەبو جەهل گوتی وەلید بڕۆ قسەیەكی ناشیرین بەمحمد بڵێ با هۆزەكەت بزاننەوە كەتۆ لەگەڵ محمد دانیتو ڕقت لێیەتیو خۆشت ناوێ. وەلید گوتی چیپێ بڵێم سوێند بەخودا هیچ كەسێك وەكو من هۆنراوە نازانێ لەسەر كێشو قافیە بێت یان هۆنراوەی سەربەستو حوڕ هەستو هۆشداری پەری. بەلام سوێند بەخودا محمد هیچ شتێك لەو شتانە ناڵێت هەرگیزبەهۆنراوە ناچێت سوێند بە خودائەوەی كەمحمد دەیڵێ تامو چێژی تێدایەوڕێكو پێكو ڕازاوەیە، بەرزیەكەی میوەیە خواریەكەی بەپیتوباشو بەرینە بەڕاستی ئەوەی ئەوهەردەم سەر كەوتو دەبێتو هەرگیز هیچ شتێك بەسەریدا سەر كەوتو نابێتو ئەوانەی كەبەر هەڵستی دەكەن تێك شكاو نابوت دەبن. ئەبو جەهل گوتی:ئەی وەلید بەڕاستی متمانەو ڕێزت لەناو گەلەكەت شكستی هێناوەوباوەڕت پێناكەن كە موسڵمان نەبووی هەتا قسەی ناشیرین بەمحمد نەڵێی: وەلید گوتی: لێم گەڕێ هەتا بیرێكی لێدەكەمەوە. خودای گەورە ئەو ئایەتەی ناردە خوارەوە كە دەفەرموێ

{إِنَّهُۥ فَكَّرَ وَقَدَّرَ. فَقُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ. ثُمَّ قُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ. ثُمَّ نَظَرَ. ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ. ثُمَّ أَدْبَرَ وَٱسْتَكْبَرَ. فَقَالَ إِنْ هَـٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ يُؤْثَرُ. إِنْ هَـٰذَآ إِلَّا قَوْلُ ٱلْبَشَرِ }المدثر/١٨-٢٥

واتە:وەلیدی كوڕی موغەیرەفكرو بیری كردەوەوبەرنامەو پەیامەكەی هەڵ سەنگاند

بەڵام بە نەزانین. هەی بەكوشت بچیٚ لەگەڵ تێفكرینو هەڵسەنگاندنی، دووبارە بەكوشت بچیٚ لەگەڵ هەڵسەنگاندنی بۆقورئان ئینجالێی وردبۆوەو تەماشای كردنێو چاوانی گرژكردو ڕەش داگیرساوخۆی گیف كردەوەوزۆربەگەورەترلەوەی كەبیری لێدەكردەوە خۆی نیشانداوگوتی: بەڕاستی ئەو قورئانە تەنها سیحرو جادوەو هیچی تر نیەوتەنها قسەی ئینسانە .خودای گەورە پەیمانی پێدا كەبیباتە دۆزەخ هەروەكو دەفەرمویٚ:{سَأُصْلِيهِ سَقَرَ. وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا سَقَرُ. لَا تُبْقِى وَلَا تَذَرُ. لَوَّاحَةٌ لِّلْبَشَرِ. عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ}المدثر/٢٦-٣٠ واتە:ئەوبێویژدانە بەسەریەوەناچێت حەتمەن دەبیٚ بیخەمەناودۆزەخەوە بەڵام تۆ نازانی دۆزەخ چیە؟هیچ ئەندامێكی ئینسان بەساغی ناهێڵێتەوەو وازیشی لیٚ ناهێنیٚو پێستی هەڵدەقرچێنیٚو ڕەشوپیسی دەكات نۆزدەفریشتە سەرپەرشتی ئەوئاگرو دۆزەخە دەكەن.

كاتیٚ وەلید گوێی لەو ئایەتەبووكە ژمارەی فریشتەكانی ئێشك چی ئاگری دۆزەخ (١٩) نۆزدەن بە هۆزو گەلەكەی گوت:بەتەنها دەكەسیان بۆمن دابنێن دەرەقەتیان دێم ئێوەش بەهەمووتان دەرەقەتی نۆ كەس نایەن؟ خودای بەدەسەلات وەلامی‌خۆ بەگەورەزانولەخۆ بایی بوونی وەلیدی دایەوە فەرمووی:

{وَمَا جَعَلْنَآ أَصْحَـٰبَ ٱلنَّارِ إِلَّا مَلَـٰٓئِكَةً ۙ وَمَا جَعَلْنَا عِدَّتَهُمْ إِلَّا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ }المدثر/٣١

واتە:ئێمە كارگوزارانی دۆزەخمان تەنها لە فریشتەكان داناوەوئەوژماریەش كەدەڵێن نۆزدە فریشتەن تەنها بۆ تاقی كردنەوەی بێباوەڕانە.

## گەورەیی قورئانی پیرۆز
## عظمة القرآن الكريم

لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە‌ﷺ دەگێڕنەوە:دەفەرمویٚ:شەوێك ئەسیدی كوڕی حەزیر لە (مربد) ئەوشوێنەی كە خورمای تێدا وشك دەكەنەوە قورئانی دەخوێند. لەوكاتەدا ئەسپەكەی حیلاندی‌وڕاپەڕی.دوای دەستی كردەوە بە قورئان خوێندنو دووبارە ئەسپە كەی ڕاپەڕیەوە.هەربەوجۆرەچەندجارێك ئەسپەكەی ڕادەپەڕی‌و قوڵاغ دەبوو. ئەسید گوتی زۆرلە یەحیای كوڕم ترسام كەلە ئەسپەكەنزیك بوو

پانی بكاتەوە وابەرز دەبۆوە بۆئاسمانو ھەڵدەپەڕی.دوای ڕۆیشتمە لای ئەسپەكەم سەیرم كرد لەسەر سەریەوە وەكو چەترو چرایەكی ڕووناك لەئاسمانەوە بەرزدەبۆوەوزۆر بەجوانی دەدیترا. منیش بەیانی ھەسام ڕۆیشتم بۆلای پێغەمبەر ﷺ گوتم ئەی پێغەمبەری خوداشەو لەشوێنی (مربد) جێگەی خورما وشك كردنەوەكەم قورئانم دەخوێند ولاغەكەم راپەڕی پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بخوێنە منیش خوێنم ئەسپەكەم ڕاپەڕییەوە پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بخوێنە ئەسپەكە ڕاپەڕیەوە چەندجارێك ئەوە سێبارە بۆوە لەبەر یەحیای كوڕم كەلە ئەسپەكەنزیك بوو ترسام پانی بكاتەوە كەچومەلای لەسەرسەرمەوە لە ئاسمان وەكوچەتر شتی ڕووناكونورانیم دەدیت بەرز دەبۆوە بۆ ئاسمان لەبەر چاوم. پێغەمبەرﷺ فەرمووی ئەوە فریشتەو مەلائیكەتن گوێ یان بۆ تۆ ڕادەگرت ئەگەر بەردەوام بووبای لە قورئان خوێندن ھەتا بەیانی خەلك فریشتەكانی بەچاوی خۆیان دەدیتو لێیان بزرنەدەبوو.

## نەدانەوەو دواخستنی وام( قرض ) ستەمە

## مطل الغنی الظلم

دەگێڕنەوە كابرایەك حوشترێكی بە ئەبوجەھل فرۆشت بۆماوەی چەند ڕۆژێك پارەكەی بداتێ چەندڕۆژێك بەسەر كاتی پارەدانەكەش تێپەڕی بەلام ئەبوجەھل پارەكەی نەدابەكابرا.چەندین جاری ترتێپەڕی كابرادەرۆیشتە لای ئەبوجەھلوپارەی نەدەدایە ھەردەستی دەستی پێدەكردو دوای دەخست. ئەوكابرایە ھاواری بۆ خەڵكانێكی زۆربرد بۆوەرگرتنەوەی قەرزەكەی بەلام ھەربێسود بوودوایی كابرا ڕۆیشتە لای پێغەمبەروسكالای نەدانەوەی قەرزەكەی پێكوت:پێغەمبەرﷺ دەستی كابرای گرتو فەرمووی: وەرە لەگەلمدابرۆین بۆماڵی ئەبوجەھل پێغەمبەرﷺبانگی ئەبوجەھلی كردوو فەرمووی:ئەو پیاوە حوشترێكی پێ فرۆشتوویو پارەكەیت نەداوە ، نەدانەوەی قەرز لەكاتی خۆیدا ستەمو تاوانە خێراكە ئێستا پارەكەی بدەوە ئەبوجەھل ھیچ ورتەی لەدەم دەر نەچووڕۆیشتو پارەكەی بۆھێناودایەوە بەبێورتەی دەم جولاندنی. دوایی لێیان پرسی بۆچی ھیچ

قسەت نەكردوو بەفەرمانی محمد پارەكەت دایەوە ئەبوجەهل گوتی: بەخودا ئەوكاتەی كەبانگی كردم هەستم كرد خانوەكە بەسەرمەوەدەلەریەوە ئەگەر خێرا پارەكەم نەدابایەوە خانوەكەم ڕۆدەچوو. بەو بۆنەیەشەوە ئەوكابرایە لەلای پێغەمبەر باوەڕی هێناو موسڵمان بوو.

## گیانی خۆم بە خودا بە خشیوە

## أهب نفسي لله تعالى

دەگێڕنەوە(زوبەیری كوڕی عەوام)ﷺبەفەرمانی پێشەواعومەری كوڕی خەتاب ﷺبەفەرماندەی (١٢٠٠٠)دووانزە هەزارسەربازی موسڵمان بەرەومیصر بەرێكەوت لەكاتێك دا كەسوپای عەمری كوڕی عاصﷺ چواردەورەی قەڵای(بابلیۆنی)گرتبوو بەڵام توانای هێرش كردنیان نەبوو ئەوجەنگە زۆربەدواكەوتوسست بووكەس توانی هێرشی تێدا نەمابوو.بەڵام زووبەیر غیرەتی جوڵاو گوتی من گیانی خۆم بە خودا دەبەخشم‌و ئومێدەوارم كەبەوگیان بەخشینەی من موسڵمانان بتوانن ئەو قەڵایە ڕزگار بكەن. هەستا پەیژەیەكی بەرزو درێژی لەسوچێكی قەڵایەكە قائیم‌و توند كردوفەرمانیدا هەركاتێ سەر كەوتم‌وگوێتان لەدەنگی الله اكبر بووبەیەك دەنگ وەڵام بدەنەوەوبەشوێنم دا وەرن لەدوای ئەوەزوبەیر ڕۆیشت و سەر كەوتە سەر قەڵایەكەو زۆری نەخایاند كە زوبەیر بە شیری دەستیەوە ڕای دەوەشاندودەنگی الله‌اكبری گوێچكەی كاس دەكرد.هەموسەربازو جەنگاوەرانی موسڵمانان بەیەك دەنگ وەڵامیان دایەوەوپەلاماری قەڵایان داویستیان هەمووبەجارێك بەسەر قادرمەكەدا بر ۆن بەڵا عەمەر ڕێگەی پێگرتن‌و نەی هێت بەجرێك سەركەون نەبادا قادرمەكە بشكێت بەڵام دەنگی الله اكبر یان ئەو ناوەی پڕكردبوو سوپای بێباوەڕان واگومانیان بردكە سوپای ئیسلام هەموویان سەركەوتونە سەر قەڵایەكەوكۆتاییانە بۆیە سوپای زۆری بێباوەڕان لەقەڵاهاتنە دەرو هەڵاتن لەوكاتەدا زوبەیرو هاوەڵانی پەلاماری دەرگای قەڵایان داو دەرگایان كردەوەو موسڵمانان بەجارێك ڕژانە ناوئەوقەڵاسەختوبەتینە.بەوجۆرە خودای بەبەزەیی‌و دەسەڵات موسڵمانانی بەسەر ڕۆمەكاندا سەر خست بە سەروەریەكی

زۆرەوە. بەوجۆرە هەڵوێستی جوامێریو نەبەردی زوبەیری كوڕی عەوام بوو بە نیشانەی سەركەوتنی ئەوجەنگەودۆڕانی ڕۆمەكان.ئەوسەركەوتنەش بووە مایەی ڕانی وڵاتی میصرو بووەهێزو بازو پشتیوانی بەهێز بۆ ئیسلام.

## لەگەورەیی فێر بوونی قورئان

## من فضل تعلم القرآن

پێغەمبەری خوداﷺكۆمەڵێك لەموسڵمانانی بانگ كرد كەهەریەكەی خاوەنی چەند هونەروزانیاریەك بوون، وە بەئەندازەیەك قوڕئانیان لەبەربوو:پێی خوێندنەوە، لەدوایی یەكی ترهاتن كەلەهەموویان بەتەمەن تربووپێغەمبەرﷺ فەرمووی: تۆ چی هونەرێكت هەیە؟ كابرا گوتی فلاَنو فلاَنو سوڕەتی بەقەرەشم لەبەرە. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: سوڕەتی بە قەڕەشت لەبەرە ؟كابرا گوتی : بەڵێ لەبەرمە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: زۆر باشە چونكە سوڕەتی بە قەڕەهەموو یاسوبەرنامەی ئاینی تێدایە.وەرە بڕۆنو ئەتۆش پێشەواوسەركردەیان بە. یەكێكیان گوتی:ئەی پێغەمبەری خودا ﷺمن زۆرباش بەئاسانی دەتوانم لەبەری بكەم بەلاَم لەترسی نەتوانینی بەجێ هێنانی فەرمانەكانی سەر پێچی دەكەمولەبەری ناكەم.دوای ئەوە پێغەمبەرﷺ فەرمانی پێكردین قورئان فێر ببینوبخوێنین. چونكە بەڕاستی قوڕئان بۆئەوانەی كە فێری دەبنو دەی خوێنن وەكو كیسەو دەفرێكی گەورە وەهایەكە پڕبێت لە عەترو میسكی خۆشو بۆنەكەشی بۆ هەموولایەك بلاَو ببێتەوە.

## دیاری كردنی خەدیجە خاتوون بۆڕاستی پەیام

## إختبار السيدة خديجةلامين الوحي

خەدیجەی كچی خوەیلیدبە پێغەمبەریﷺ فەرموو: ئایادەتوانی كاتێ هاوڕێكەت (جبرائیل )هات هەواڵم پێبدەی؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی : بەڵێ دەتوانم. لەوكاتەی كە جبڕائیلعليه السلام گەیشت پێغەمبەرﷺ فەرمووی :ئەی خەدیجە ئەوەجبڕائیلە، خەدیجە فەرمووی: هەستە وەرە سەرڕانی چەپەم دابنیشە ؟پێغەمبەرﷺ لەسەر ڕانی چەپەی دانیش. خەدیجە فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ ئێستا جبرائیلی

دەبینی ؟ فەرمووی: بەڵێ دەیبینم. دوایی پێغەمبەری هێنایە لای ڕاستەی‌و فەرمووی: ئێستاش دەیبینی؟پێغەمبەرﷺ فەرمووی:بەڵێ دەیبینم.دوایی لەلایان دانیش ئینجا فەرمووی: ئێستا دەیبینی ؟ فەرمووی: بەڵێ دەیبینم. ئینجا لەدوای ئەوە خەدیجەسەر پۆشەكەی سەری‌و چار شێوەی چاوی لابرد، ئینجا فەرمووی ئەی پێغەمبەری خوداﷺ ئێستا جبرائیلی دەبینی؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی خەدیجە ئێستا نای بینم. ئەمجا خەدیجە زۆربە خۆشحاڵیەوەفەرمووی: ئەی‌محمد مزگێنی بێت بەڕاستی ئەوە فریشتەی خودایەو دوورە لەهەموو شەیتان‌وجنۆكەو خەراپەكاران.

## من بۆئەوە باشم ئەی پێشەوای موسڵمانان

## أنا لهايا أمير المؤمنين

سەروەرمان پێشەوا عومەری كوڕی خەتابﷺهەرگیز لە هەوڵ‌و تێكۆشان سست‌و سارد نەدەبۆوەبۆئەوەی یەكێكی نەترس‌و ئازاو بەباوەڕ بدۆزێتەوە بۆهاوشانی (مسنای كوڕی حارسە)دووسەركردەی لێهات‌وبیان نێریٚ بڕۆن بۆ جەنگی فارسكان زۆرجار عومەر وەرسی‌و بێزاری ڕووی تێدەكرد دەهاتە ئەوبڕوایەی كە بڕیارێك دەر بكات‌و كارێكی وابكات كە ترس‌و سامی فارس لە دڵی موسڵمانان دەر بكات‌و نەیهێڵێ. هەر چەند كەدەیویست یەكێك هەڵ بژێریٚ سەیری دەكرد لەناو چاویدا ترسو ساموبیٚ هێزیەكی پێوە دیاربوو.بۆیە كارەكەی هەڵدەوەشاندەوەو دوای دەخست. بۆیە هەردەم بەیٚ بێزاری‌وماندووبوون هەوڵی دەداوئامۆژگاری دەكردن‌وهانیدەدان، بۆ خۆشەویستی‌و تێكۆشان‌وگیان فیداكاری‌وشەهیدی.وەهەردەم بەگوێچكەیانیدادەچرپاندوو دەیفەرموو: ئێوە وڵاتی حیجاز بەماڵی تایبەتی خۆتانی مەزانن تەنها چەند شتێكی كەم‌و بێسودی نەبێت دەناهەموو تواناودەسەلاتێكمیان پێنەدراوە، بڕۆن هەروەك‌و خودا بڕیاری پێداون بەزەویدا بگەڕێنبۆئەوەی بتان كاتە میرات گرو بۆماوەی دانیشتوانی

پێشو. هەروەك‌و خودا دەفەرموێ:{هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُشۡرِكُونَ }الصف/٩ واتای ئەوئایەتەمان لە پێشەوەکرد.

خودا پەیمانی سەرکەوتنی‌ئاینی خۆی دەگەیەنێ. ئەدی کوا لەکوێن ئەوبەندە باش‌و چاکانە؟ پێشەوا عومەرﷺ هەرخەریکی ئامۆژگاری‌و هاندانی موسڵمانان بووهەتا پیاوێکی موسڵمانی پڕباوەڕی بەهێزئەو چاوەڕوانەو بێدەنگیەی خرۆشاندو هاتە پێشەوەو، ناوەمەیدان (ئەبو عوبەیدەی کوڕی مەسعودی سەقەفیﷺ)نەلەلایەنی هۆزی ئەنسار بوو نەلەهۆزی موهاجرین بوو.زۆر بەسۆزەوە هاواری کردوو فەرمووی:ئەی پێشەوا ئەمن بۆ ئەوکارە زۆرباشم‌و دەگونجێم بۆیەمن هەڵبژێرە بۆ جەنگی دوژمنانت‌و بۆ شەهیدی‌و، هەرکەسێکیش ئارەزوی شەهیدی‌دەکات با بێتەدەرو لەگەڵ مندا بینێرە ئینجالەوکاتەداپێشەوا عومەرهەستاو چاوەکانی پڕبوو لەناو باوەشی خۆشەویستی بە ئەبو عبیدە داگرت‌و ماچی کرد. ئینجا لەدوای ئەوە ئەوجەماوەرە کۆمەڵ کۆمەڵ دەهاتنە پێشەوەوخۆیان پێشکەش دەکرددەیان گوت بەرەو شەهیدی دەڕۆین. پێشەوا عومەرلێپرسراوی سەرکردایەتی بە (ئەبو عبیدەﷺ)سپاردوڕۆیشتن پەیوەندیان بە سوپای موسڵمانان کردلە عیراق بەسەرکردایەتی (موسەنای کوڕی حارسەﷺ)لەدواییدا شەڕێکی بێوێنەکراو لەکۆتاییدا سەرکەوتن بەشی باوەڕداران بوو. ئینجا لەدوای ئەو سەر کەوتنە ئەبو عبیدەپیلانێکی بەدی هێناو بریارێکی سەر کردایەتی دەرکردکە سوپا لە دەریاوە بپەڕنەوەکەژمارەیان نەدەگەیشتە (١٠٠٠٠) دەهەزار جەنگاوەربەڵام ئەو شوێنەی بۆی پەڕینەوە لەدوای پردەوە، شوێنێکی کەم‌و بەر تەسك بوو جێگای سوپای ئیسلامی تێدا نەدەبۆوە. وەنەتوانای هێرشیان هەبوو نەتوانای گەڕانەوەشیان هەبوو لەولاشەوەدووژمنانی فارس مۆڵەتی ئەوەشیان نەداکە سوپای ئیسلام تەواوبپەڕێتەوەبە فیلە زلە زەبەلاحانە کە جەڕەس‌و زەنگوڵەی دەنگ گەورەوهۆش بەریان پێوەبوو، هێرشیان بردنەسەر موسڵمانان، بەو جەڕەس‌وزەنگوڵەدەنگ گەورانەئەسپ‌و وڵاغی موسڵمانەکان ترسیان لێی نیشت‌و هەموویان ڕەوینەوەوهەڵاتن.تیرهاوێژی فارسە کانیش دەستیان کرد بەتیر

بارانی موسڵمانان كۆمەڵێكمی زۆریان لێشەهید بوون‌و شپرزەوپەشۆكان‌و، سەختی‌ودژواریەكی زۆرناڵەبارو، پاشا گەردانیەكی زۆربێوێنە كەوتە ناوڕیزەكانی موسڵمانانەوە. تەنانەت ئەبو عوبیدە لەسەر وڵاغەكەی دابەزی‌وكەوتە پێیان‌و سوپایەكەش هەموویان لەوڵاغەكانیان دابەزین‌و كەوتنە پێیان‌وبەرۆەو سوپای فارس گەڕانەوەدواوەبەرەو ڕووی فارسەكان زڕەی تیروبریسكەی شیرئەوناوەی ڕووناك كردبۆوەلەو شەڕە بێوێنەیەدا(٦٠٠٠) شەش هەزارجەنگاوەری فارس كوژرا بەوهۆیەوە موسڵمانان غیرەتیان بەرز بۆوەوبووە مایەی سەر بەرزی‌وئاسودەیی دڵیان كەبەڕاستی مایەی خۆش بەختی‌وپیرۆزیان بوو. بەڵام بەداخەوەئەو فیلە بە هێزانەیان هێنایە پێشەوەوبە خرتومەكەیان‌و قاچەكانیان پێیان لە موسڵمانان دەناوشەهیدیان دەكردن، كەئەبو عبیدە چاوی بەو حاڵەكەوت هاواری لە موسڵمانان كرد كە خێراكەن بە شیرەكانتان لە ڕەگی ئەستۆی ملیان بدەن هەوڵ بدەن كە سوارەكانی سەریان بخەنە خوارو بیان كوژن. ئەمجارە باوەڕدارەكان هێر شیان بردە سەر فیلەكان‌و سوارەكانیان لەسەر فیلەكان بەردەدایەوە خوارە وە و دەیان كوشتن بەوە جۆرە موسڵمانان ڕێگەی سەر كەوتنیان دۆزیەوە. بەڵام ئەبو عبیدەكەسەیری كردوا فیلێكی زۆر گەورە و توڕەو بەلەسەبە خرتوم‌و لمبۆزەكەی بە چواردەورەی خۆی بەلای ڕاست‌وچەپدا لەموسڵمانانی دەداو پەرتەوازەو تەفرو تونای پێدەكردن. هێرشی كردەسەری‌وبەشیرەكەی لمبۆزەكەی بڕی. بەڵام ئەو فیلەبەجارێك ڕقی هەستاوگێلانەشەپۆلی هەڵچونی دەداوڕووی كردە ئەبو عبیدەو جوتێك لەقەی لێداوخستیە سەر زەوی‌و بەسەریدا ڕۆیشت‌و شەهید بوو. ئەو سەركردەبەڕێزەبەمردنێكی زۆربەرزانە كەمێژووتۆماری كردووەو لەگەڵ تۆمارگەی شەهیدانی سەر بەرزی ئیسلام.

# موعاز تۆ ئەو بەلایەت نایەوە

# إفتأن أنت يامعاذ

دەگێڕنەوەجارێك موعازی کوڕی جەبەل﵁ پێش نوێژی بۆ موسڵمانان دەکرد پیاوێکی بەناوی(حرام)نوێژی بەکۆمەڵی لەگەڵیان دای بەست. بەلام موعاز نوێژەکەی زۆر درێژەی کێشا.حراملەنوێژی بەکۆمەڵ هاتە دەرو، ڕۆیشتو گەڕایەوە بۆ ناوباخە دارخورمایەکەی کەلەپێشودالەناویدابوو ئاوی دەدا.کاتێ موعاز لە نوێژەکەی بۆوە گوتیان ئەی موعاز تۆچی بەرامبەری حەرام دەڵێی:کەڕانەوەستانوێژەکەی تەواوبکات. موعاز گوتی: (حەڕام) دووڕومنافقە چۆن دەبێ وازوو نوێژە کەی ئەوەندە بە سوکی بزانێ بیبڕێت بۆ ئاودانی باخەدارخورمایەکانی؟ (حەرام) کەقسەکەی بیستەوە خێرا ڕۆیشتە لای پێغەمبەری خوداﷺ، موعاز لەلای پێغەمبەر دانیشتبوو. (حەڕام) گوتی ئەی پێغەمبەری خودامن ویستم بچم دار خورمایەکەم ئاو بدەم بەلام کاتی نوێژبوو ڕۆیشتمە مزگەوت بۆئەوەی نوێژی بە کۆمەڵ بکەم بەلام لەبەر ئەوەی نوێژەکەی زۆر درێژکردەوە منیش لەنوێژەکەم دەرچوم بەو بۆنەوەموعازگومانی پێبردم کەمن دووڕو منافقم. پێغەمبەرﷺ ڕووی لە موعاز کردووفەرمووی: ئەی موعازتوشی بەلات کردووە؟ ئەی موعاز تۆتوشی بەلات کردووە؟جارێکی ترنوێژ ئەوەندە درێژمەکەوە سوڕەتی بچوك وەك‌و {سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى }الاعلى/١{وَٱلشَّمْسِ وَضُحَىٰهَا}الشمس/١. وەشێوەی ئەوانە بخوێنە چونکە تۆ بەلابۆکەسێك دەنێری کە لەنوێژ دەردەچن‌و بەوهۆیەشچەوە نایەنەنوێژی بەکۆمەڵ. بەلام ئەگەرنوێژەکان کورت بکەیەوەئەوەئەو بەلاو ناخۆشیانەدروست نابن ،

# شۆخی پێغەمبەر مزگێنییە

# مزاح الرسول بشارة

جارێکیان پێغەمبەرﷺ لەناو بازاڕی مەدینەدا دەڕۆیشت چاویبە (زاهیری کوڕی جزامیﷺ) هاوڕێی کەوت شتی پێویستی بۆماڵەوەدەکڕی ، لەدواوە لێی نزیك بۆوەو باوەشی پێدا گرت بەبێ ئەوەی بیدینێ‌و هەستی پێبکات. هاواری کردوو فەرمووی: کێ ئەو بەندەم لێدەکڕێ؟کەزاهیر ئاوڕی بۆدواوەدایەوە پێغەمبەربوو دەستی کرد بە پێکەنین‌وگوتی :بەخوا ئەی پێغەمبەری خودا بازار کزیە کەس پارەی بەمن نادا؟ پێغەمبەریش ﷺفەرمووی: نازاهیر وانیە خودا حەز بكات لەلای خوداخێرو پاداشتی باشت هەیە.

# والله پرسیار لەو نیعمەتەی ئەمڕۆ دەکرێ

# لتسألن عن نعيم هذا اليوم

ڕۆژێك لەکاتی گەرما پێغەمبەرﷺلەماڵ ڕۆیشتەدەربەرەومزگەوت. لەڕێگا چاوی بە ئەبوبکرو عومەرﷺ کەوت ئەوانیش لەماڵ هاتبوونەدەر پێغەمبەرﷺفەرمووی: پێم بڵێن ئێوە بۆچی بەوگەرمایەو لەوکاتەدا لەماڵ هاتوونەدەر؟ ئەوانیش گوتیان بەخوا یاڕسول الله ﷺبرسیەتی دەری کردووین.پێغەمبەرﷺفەرمووی: دەبەخوا منیش برسیەتی لەماڵ دەری کردووم. ئینجا هەر سێکیان بەیەکەوە ڕۆیشتنە لای ئەبو هەیسەمی کوڕی تەیهان)کەلەهۆزی ئەنصاری بوو، خودا ماڵ‌و سامانی باشی پێدابوو فەرمانیدا خێرا مەڕێکیان سەربڕی‌ونانی جۆی گەرمیان دروست کردو، ئاوێکی دێمکەی سارديان بۆهێنان‌وخواردنیان بۆئامادەکردن‌وتێریان خوارد ئینجا پێغەمبەرﷺ فەرمووی:بەخوا پرسیاری ئەو نیعمەتەی ئەمڕۆمان لێدەکرێ وەك‌و خودا دەفەرموێ{ثُمَّ لَتُسْـَٔلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ }التكاثر/٨ واتە بەراستی لەمەوداپرسیاری ئەونازو نیعمتەتان لێدەکرێ

# هاوڕێ كوێرەكەت هات

# صاحبك الاعمى قد جائك

دەگێڕنەوە رەبیعی كوڕی خەیسەمە ﷺزۆرهاتوچۆی عبداللەی كوڕی مەسعودی ﷺدەكردهەركات كەدەگەیشتەلای عبدالله پێی دەگوت مزگێنی بۆئەوەی كە ئارام گرو خۆڕا گرو، لەترسی خوادەترسیٚو، یادی خوداو نوێژەكانی دەكات. سوێند بە خودا ئەگەر پێغەمبەر بت بینیٚ زۆر كەیف خۆش دەبێت. ڕەبیع ماوەی بیست ساڵ هاتو چۆی عبداللەی كوڕی مەسعودیﷺ دەكرد.لەوماوەدوورو درێژەدا كاركەرو خزمەت چی عبداللەی كوڕی مەسعود نەی زانی كەرەبیع چاوەكانی ساغە ، هەروەی دەزانی كوێرە چونكە هەرگیز چاوەكانی بۆ نامەحرەم هەڵ نەهێناوەو هەر بەسیلەی چاویش لەئەرزی ڕوانیوە. هەرلەبەر ئەوەشە هەركاتیٚ دەهاتو لەدەرگەی دەداو ئەو كارەكەرەش كەدەڕۆیشت دەرگا بكاتەوە كەدەی زانی ڕەبیعە بە عبداللەی دەگوت ئەوا هاوڕیٚ كوێرەكەت هات ، عبداللەی كوڕی مەسعودیشﷺ پێدەكەنی و دەی گوت كچیٚ ئەی هاوار ئەوە ڕەبیعە .

# كەسێك لەگەڵ فەرمانی خودا ڕاست بكاتو بەڕاستی بزانیٚ ڕزگاری دەبێت

# من صدق الله نجا

ئەبوهورەیرە ﷺلە پێغەمبەرەوەﷺدەگێڕێتەوە دەفەرمویٚ:سیٚ كەس لەدەشتو بیا بانێك دا بوونە هاوڕیٚو بارانێكی بەهێزیان لێباری ئەوانیش پاڵیان دایە كێوەكەو ڕۆیش تنە ناو ئەشكەوتێكەوە هەتا بارانەكە كۆتایی دێت.لەو چاوەڕوانیەدابوون بەردێكی زۆر گەورەلە كێوەكە هاتە خوارودەرگای ئەشكەوتەكەی گرت ، لەدوای هەوڵدانێكی زۆرهیچ چارێكی بەردەكەیان بۆنەكراو بۆیان لانەچوو، تەواو نا ئومێدوبێهیوا بوون لە ڕزگار بوون لەو ناو ئەشكەوتە. لەدواییدا یەكێكیان گوتی: وەرن با هەر كەسەمان بە هۆی كردارێكی باشو دڵ سۆزانە لە پێناو ڕەزابوونی خودا كردوومانە بۆ ئەوە ی خودا بەزەیی پێمان دابێتەوەو ئەو بەردەمان بۆ لابداو ڕزگارمان ببێت.

یەکیان گوتی:ئەی خودایەتۆ زۆرباش دەزانی کەمن دایكو باوکم هەبوو زۆر خزمەتم دەکردن‌وبەبەزەیی بووم لەگەڵیان لە بەر ڕەزابوونی تۆدا ئێواران خواردنم بەدەستی خۆم پێدەدان.ئێوارەیەك خواردنم بۆبردن هەردوکیان خەویان لێکەوتبوو منیش زۆر بەلامەوە ناخۆش بوولەخەو هەڵیان بستێنم، وەیان بگەڕێمەوە شوێنی خۆم‌و پشو بدەم، بەڵکو لەلایانەوە بە خواردنەوە بە پێوە بەرامبەریان ڕاوەستام هەتا بەیانی لەخەو هەستان، ئینجا خواردنەکەم پێدان‌و ڕۆیشتم. ئەی خودایە ئەگەر ئەوەم تەنهالە بەر ڕەزابوونی تۆدا کردووە، دەرگای خێرمان لیّ بکەیەوەوئەوبەردەمان بۆلابدەی، دەفەرمویّ : بەردەکە لە جێگەی خۆی ترازابە شێوەیەك ڕوناکی لێهاتە ژوورەوە بەلاّم نەدەتواندرا لێی بڕۆیە دەرەوە.

دووەمیشیان گوتی: ئەی خودایە تۆ زۆرباش دەزانیو ئاگاداری کە سەوداسەرو عاشقی ئافرەتێك بووم لەوپێناوە سزاوئازارێکی زۆرم چێشت هەتادەستم پێی گەیشت‌و هیواو ئاواتەکانم هاتەدی.ئینجاخودایەلەوکاتەدا کەهەمووشتێك لەدەستی خۆم دابوو تەنها لەبەر ترسو سامی تۆ وازم لێی هێناو دوور کەوتمەوە. خودایە کەبۆخۆت زۆرباش دەزانی ئەگەر تەنها لەترسی تۆکردوومە بەزەییت پێماندا بێتەوەو لەو تەنگە تاویە ڕزگارمان بکەی. بەفەرمانی خودا بەردەکە تۆزێکی تر لە جێگەی خۆی ترازا بەلاّم هێشتا ئەوەندە لانەچووبوو کە بتوانن بڕۆنە دەرەوە.

سێیەمیان گوتی:خودایە بۆخۆت دەزانی من چەندکرێکارێکم هەبووئیشم پێدەکردن ، ئێوارە حەق‌وکرێی ڕۆژانەم پێدان بەلاّم یەکیان وەری نەگرتبوو ڕۆیشت: منیش پارەی کرێیەکەم بۆبەئاژەڵ‌وحەیوان دا.بە فەرمانی خودائەومالّە خێروبەرەکەتی باشی تێکەوت، بە جۆرێك کە خزمەت کردنیان بەزەحمەت بوو: لەدوای ماوەیەکی زۆر ئەو پیاوە کەهیچی نەمابوو هەژارو نەدار کەوتبوو هاتەوەبۆ پارەی ڕۆژانەکرێکاریەکەی: منیش گوتم:براکەم ئەوهەمووسەروەت‌وسامانەی کەدەیبینی هەمووی بەپارەی ڕۆژانە کەی تۆبەدیهاتووەو ئیتۆیە.ئینجاخودایە ئەگەر ئەوەم تەنها لە پێناوی ڕەزابوونی تۆ کردووە بەزەییت پێمان دابێتەوەولەوبەلاّگەورەمان ڕزگاربکەی‌ودەرگای ئەشکەوتە کەمان بۆ بکەیەوە: بەفەرمانی خودا بەردەکە لە جێگای خۆی تەواو هاتە خوار کەبە تەواوی لێی دەهاتیە دەرەوە.لەوکاتەدا پێغەمبەر فەرمووی:هەرکەس لەگەڵ خودا ڕاست بکات ڕزگاری دەبێت.

# زرێیەکەم لەدەستچوو ئازارێکی زۆریشم بەدیلی پێگەیشت
# ذهبت ادراعی وفجعنی بأسیری

عبدالرحمن ی کوڕی عەوفﷺ دەفەرموێ:ڕۆژی بەدر بەلای ئومەیەی کوری خەلەف دا ڕۆیشتم دەستی کوڕەکەی گرتبوو دەڕۆیشت: منیش چەند زرێیەکم پێبوو لە جەنگی دووژمندا لەدوای سەر کەوتنی موسڵمانان بەسەر دووژمناندا گرتبووم و بەدەستم هێنابوو.کاتێ چاوی بە عبدالرحمن کەوت وپێی گوت: ئەی(عبد عمرو) بەڵام عبدالرحمن وەڵامی نەدایەوەچونکە ئەوناوە ناوی پێشی موسڵمان بوونی بوو: پێی ناخۆش بوو لەدوای موسڵمان بوونی ، کەناوەکەی گۆڕی بە عبدالرحمن، بەوناوی دەوری بێباوەڕی بانگی بکەن. لەدوای ئەوەئەو ووت و وێژە لە نێوانیاندا ڕوویدا. ئومەیە دەی گوت: من (الرحمان)ناناسم بۆیە بانگت دەکەم بە(عبدالاله) لەسەر ئەوناوە ڕێك کەوتن وعبدالرحمن وەڵامی دایەوە.ئومەیە گوتی: (عبدالاله)ئایامالێ دەست کەوتی جەنگت پێیەیان دەتوانی پارێزگاریمان لێ بکەی؟ بەڕاستی من زۆرباشترم بۆتۆ لەو زرێ وتالانیەی کەپێتە عبدالرحمن گوتی: هائەوە زرێکانم فرێدا: ئینجا دەستی ئومەیەو کوڕەکەی گرت و، ئومەیە گوتی :هەرگیز ڕۆژی وەك و ئەمڕۆم نەدیتوەئایا ئێوە ئارەزوپێویستیتان بەشیر نییە؟ واتەمن بەخشیشی حوشتری شیردەر دەدەم بەوکەسەی کەکردومی بەدیل.دوایی ئومەیە بە عبدالرحمن ی گوت عبدالاله ئەوپیاوەی کە سینگ و بەرۆکی خۆی بە ڕیش وتوکی نەعامەپێچابوو کێ بوو؟ عبدالرحمن فەرمووی: ئەوە حەمزەی کوڕی عبدالمتلب بوو. ئومەیە گوتی: ئای ئەوە چی پێکردین؟ عبدالرحمن ئومەیەو کوڕەکەی بەدیلی دەی بردن بۆلای پێغەمبەر.کاتێ بیلال چاوی پێیان کەوت ئاگری گرت وچاوەکانی تاریك بوولەداخان کەئومەیە لەکاتی دەسەڵاتیداچی پێکردووەوچەندی ئازارو سزا داوە بۆئەوەی لەئاینەکەی پەشیمانی بکاتەوە.ڕۆیشتە نزیکی وگوتی:ئەوە سەر چاوەوبنەوانی بێباوەڕیە ئومەیەی کوڕی خەلەف بەخواپزگاریم نابێ ئەگەر پزگار یت ببێ. عبدالرحمن گوتی :ئەوەتۆ بەدیلی من دەڵێی؟ دەزانی کوڕی ڕەشەی تۆ دەڵێی چی؟ بیلال

گوتی:بەخواپزگاریم نابێ کەئومەیە ڕزگاری ببێت.ئینجابیلال بەهەمووهێزی هاواری کردوگوتی:ئەی یارمەتی دەرانی ئاینی خودائەوە سەرچاوەوبنەوانی کوفرەلێرەیە ئومەیەی کوڕی خەڵەفە، بەخودا ڕزگاریم نابێ کە ڕزگار ببیت.موسڵمانان بەجارێك دەورەیان لێیداولێی کۆبوونەوەوعبدالرحمن پارێزگاری لێدەکردبەڵام کاتێ زانی هیچی بۆناکرێ گوتی:ئومەیە خۆت ڕزگاربکە بەخوداهیچم بۆناکرێ. لەوکاتەدا پەلاماریان داوشیرێکیان لە کوڕەکەی داوکەوت:ئومەیە هاوارێ کی زۆربە هێزی کردوبەشیرلێیاندانو، کۆتاییان بەژیانی هەردووکیان هێنا. ئینجا لە دواییدا عبدالرحمن دەیگوت: ڕەحمەتی خودا لە بیلال بێت زرێیەکانی لەدەست دامو، ئازاری زۆری پێگەیاندم بەهۆی دیلەکانم.

## ئەگەر ئارەزودەکەی دیلەکەی بۆ بەر بدەن

## إن رأيتم أن تطلقوا لها أسيرها

کاتێ سوپای قوڕەیش ڕۆیشتە بەدرباوکی عاصی کوڕی ڕەبیع ﷺهاوسەری زەینەبەی کچی پێغەمبەریان لەگەڵ دابوو.کاتێ دانیشتوانی مەککەنوێنەریان نارد بۆ کڕینەوەی دیلەکانیان، زەینەبە خاتونی کچی پێغەمبەریش بۆکڕینەوەی ئەبو عباسی کوڕی ڕەبیع هێندێك ماڵو، ملوانکەیەکی هەبوو کەلەکاتی بەبوك چونیداخەدیجەخاتونی دایکی پێی بەخشی بوو پێغەمبەرﷺ کەچاوی بەو ملوانکە کەوت بەبێ ئەندازە بەزەیی پێدا هاتەوەودەستی کرد بەگریان.دوایی فەرمووی: ئەگەر دەتوانن دیلەکەی بۆ بەربدەنو ماڵەکەشی بۆ بگەڕێننەوە زۆرباشە: ئەوانیش گوتیان: چۆن تۆ حەزدەکەی وادەکەین ئەی پێغەمبەری مەزن.دیلەکەیان بۆ بەرداو ماڵو خەناوکەکەشیان بۆ گێڕایەوە. کاتێ باوکی عاص گەڕایەوە بۆ مەککەماڵو ملوانکەکەی دایەوە زەینەبەوپێی گوت : بڕۆوە بۆمەدینەبۆلای باوکت. چونکەئاینی ئیسلام جیاوازی خستۆتە نێوانی منوتۆ. بەو جۆرە باوکی عاص لە مەککەمایەوەو زەینەبەش لەمەدینە لەلای پێغەمبەرمایەوە.لەدوای ماوەیەکی زۆرباوکی عاص لە بازرگانی لەشامەوە دەگەڕایەوە:توشیان بە کەمینی کۆمەڵە سەربازێکی موەسڵمانان هات هەرچی ماڵی پێیان بوولێیان گیراوبۆخۆشیان

هەڵهاتن‌و، مسڵمانەکان بە خۆیان‌و هەمووده‌ستکەوتەکەیان دەگەڕێنەوە مەدینە.باوکی عاصیش بەشەودزەدەکات‌ودەڕواتە ناومەدینەودەچێتە لای زەینەبەی کچی پێغەمبەرو داوای ڕێگە پێدانی لێدەکات‌و ئەویش ڕێی پێدەداوداوای لێدەکات کەئەو ماڵە گیراوەی بۆ بگەڕێنێتەوە. بۆبەیانی کە پێنەمبەرﷺ ڕۆیشت بۆ مزگەوت لەدوای نوێژدابەستن.زەینەبە لە ژێرساباتی ژنان هاواری کردووگوتی:ئەی خەڵکینە من باوکی عاصم بەکریێ گرتووە بۆ بازرگانی. لەدوای کۆتایی نوێژی پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هاوڕێیان ئەوەی من بیستم ئێوەش بیستان گوتیان بەڵێ بیستمان؟ ئینجا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: سوێندبەخودا ئەمن هیچ شتێکم لەو بارەوە نەبیستوە هەتائەوکاتەی کە گوێم لەودەنگەبووە، کە ئێوەش گوێتان لێی بوو کە موسڵمانان کەمترین کەس لەخۆیان بەکریێ بگرن‌و کەمترین کەسیش بەخشین‌و پاداشتی پێدەدریێ. دوای ئەوە پێغەمبەر ﷺڕۆیشتە ماڵەوەوچووەلای کچەکەی‌و پێی فەرموو:ڕێزی بەرامبەرەکەت بگرەو ، کارێکی دڵسۆزانە نیەبۆتۆچونکە تۆ بۆئەو حەلاڵ‌و ڕەوانی:پێغەمبەر هەمووماڵەکەی بۆگەڕاندەوەو ڕۆیشتەوەبۆمەککە هەرچی حەق‌و مافی خەڵکی لەسەر بوو هەمووی دانەوە لەزۆرو لەکەمی دوایی گوتی:ئەی کۆمەڵانی قوڕەیش کەس ماوە حەق‌ومافی وەرنەگرتبێتەوەو؟گوتیان خوداپاداشتی چاکەت بداتەوە کەس نەماوەوهەموومان حەقمان وەرگرتووە بە تەواوی دوای ئەوە گوتی( اشهد أن لاإلەإلا الله واشهد أن محمدا عبده ورسوله) سوێند بە خوا بۆیە لەمەدینە موسڵمان نەبووم تەنها لەترسی ئەوەی نەڵێن بۆیە موسڵمان بوو بۆ ئەوەی ماڵەکەمان بخوات.ئێستاش کەماڵەکەتانم دایەوەو هیچ حەقێکم لەسەرنەما موسڵمان بووم.ئینجا لەدوای ئەوە ڕۆیشت هەتا گەیشتە خزمەتی پێغەمبەرو ئەویش لەدوای ئەوماوەدووررو درێژەی کە لەیەك دابڕابوون زەینەبەی بۆ گێڕایەوەو بەیەکی گەیاندنەوە.

# هیچ هەشتێكم لەو هەشتە گەورەتر پیرۆزترم نەدیتوە

# مارأیت ثمانیة أعظم بركة منها

دەگێرنەوە جارێكیان پێغەمبەری خودا ﷺهەشت درهەمی پێدەبێت و دەڕواتە بازار لەڕێگاچاوی بە ئافرەتێك كەوت دەگریا. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: كچم بۆچی دەگریەی؟ ئافرەتەكە گوتی: بەخوا لەماڵەوە دوودرهەمیان دامێ بڕۆم لە بازاڕ شت بكڕم بەڵام هەردوودرهەمەكەم لێ بزربووە.پێغەمبەرﷺ دوودرهەمی دایەوڕۆیشتە بازار كراسێكی بە چوار درهەم كڕیولەبەری كردووگەڕایەوە. لەڕێگا چاوی بەكابرایەكی ڕووت كەوت، هاواری دەكردوودەی گوت:هەركەسێ بەرگ‌وپۆشتەم بكات، خودا لەبەرگو پۆشاكی سەوزوجوانی بەهەشت پۆشتەی بكات پێغەمبەرﷺخۆی ڕانەگرت هەرخێرا كراسەكەی داناودای بەوكابرایەو، بۆخۆشی گەڕایەوە بۆ بازاڕ كراسێكی تری كڕی بەدوودرهەمو لەبەری كردو گەڕایەوەشەوداهات لەڕێگا سەیری كرد ئەوئافرەتەی دوودرهەمەكەی داوەتێ هەرلەسەرڕێگایەودەگریاپێغەمبەرﷺفەرمووی كچم چییە بۆ نەڕۆیشتویەوە هەر دەگریەی؟ ئەویش گوتی یارەسول اللهﷺ زۆرلەمێژە لەماڵەوە هاتومە دەر دەترسێم ئازارم بدەن، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: وەرە بەدوام بكەوە هەتا گەیشتەوە ماڵەوەسەیری كردتەنها ئافرەتیان لەماڵەو هیچ پیاویان لەماڵ نیە سەلامی لێیان كرد.ئافرەتەكان تەماشایان كرد پێغەمبەری خودایە دەنگیان نەكرد، پێغەمبەرﷺبۆجاری دووەمو، سێیەم بەبەرزتر سەلامی لێكردنەوە، نەوەك‌و گوێیان لێی نەبێت: ئەوانیش هەموویان بەیەك جار گوتیان: (وعلیك السلام ورحمه الله وبركاته.) پێغەمبەرﷺفەرمووی: ئەوەبۆجاری یەكەم گوێتان لە سەلامەكەم نەبوو وەڵامتان نەدامەوە؟ گوتیان :بەڵێ ئەی پیغەمبەری خودا گوێمان لێی بووبەڵام ویستمان زۆر سەلاممان لێبكەی بۆئەوەی زۆرسودوبەرەكەت وەرگرین بۆخۆمان‌و خانەوادەمان. ئینجا پێغەمبەر ﷺفەرمووی ئەو كارەكەرەتان لەكڕینی شتەكانی بەدرەنگ كەوتووە بۆیەمن هێنامەوەلەگەڵ خۆمدا كە لێی ببورن‌و قسەی پێنەڵێن‌و بەمنی ببەخشن. ئەوانیش گوتیان: ئەوە لەبەر خاتری تۆ لێی خۆش بووین‌و لەبەر

ڕزامەندی خوداش ئازادمان کردوسەربەست بێت. دوای ئەوە پێغەمبەر ﷺگەڕایەوە بۆماڵو فەرمووی: هەرگیز هیچ شتێکم لەو هەشت درهەمە باشترو چاکتر نەدیتووە ئەوەندە گەورەو بەسودوو بەرەکەت بێت :ترسێکمان پێ هیمن‌وهێدی کردەوە، دووڕووتمان پی پۆشتە کردەوە، یەکێکمان پێ سەربەست‌و ئازاد کرد.پێغەمبەر ﷺفەرمووی: هەر موسڵمانێك موسڵمانێکی ڕووت بەرگ‌وپۆشاکی بۆ بکات. ئەوە ئەو ئینسانە لە ژێر پارێزگاری خودا دا دەبێت هەتاپارچەی ئەو بەرگە بمێنێ.

## ئەگەر حسابمان لەگەڵ بکەی حسابت لەگەڵ دەکەین

## إن حاسبني لاحاسبنة

دەگێڕنەوەوجارێکیان پێغەمبەری خوداﷺ بەدەورەی کەعبەدا دەسووڕایەوەو تەوافی دەکرد گوێی لەدەنگی عەرەبێکی دەشتەکی بوودەیگوت یاکریم، پێغەمبەری خوداش لەدوای ئەودەیفەرموو یاکریم عەرەبەکە ڕۆیشتەلای مەقامی ئیسماعیل‌و بەرامبەر بە پلو سکەکەی‌و گوتی: یاکریم پێغەمبەریشﷺ لەدوایەوە فەرمووی: یاکریم عەرەبەکە ئاوڕێکی دوای خۆی دایەوەسەیری کردپیاوێکی بەسام‌و هەیبەت‌و ڕوخسار پاك‌و جوان‌و، بەژن‌و بالاڕێك‌و پێکێك لەدوای ئەو کەچی دەڵێ، دەیلێتەوەکابرای عەرەب نەی دەناسی کەئەوە پێغەمبەرە بۆیە پێی گوت: ئەی پیاوی شۆخ‌و شەنگ‌و، ڕوخسار جوان، گاڵتە بەمن دەکەی؟ سوێند بە خودا ئەگەر لەبەر ئەو بەژن‌و بالاجوانەت نەبێت لەلای پێغەمبەر شکایەتم لێدەکردی: پێغەمبەرﷺ بەوقسەیە پێکەنی‌و فەرمووی:ئەی برام تۆ پێغەمبەری خۆت ناناسیەوە؟عەرەبەکە گوتی: نەخێر نای ناسم. پێغەمبەرﷺفەرمووی: ئەدی چۆن باوەڕت پێی هێناوە؟کابرا گوتی: باوەڕم بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر هێناوەو نەشم دیتووە:وەباوەڕیشم بە ڕاستی بەرنامەوقورئانەکەی هێناوەو، نەم دیوەو نەی گەیشتومێ. پێغەمبەرﷺ فەرمووی:براکەم باش بزانە من پێغەمبەری تۆم‌وتکاکاری ڕۆژی دواییشتم. عەرەبەکە ڕووی لە پێغەمبەر کردوو خەریك بوو دەستی ماچ بکات، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: نا برای عەرەب کاری وا لەگەڵ مندا مەکەن وەك‌و

چۆن گەلانی عەجەمو غەیرە عەرەب لەگەڵ پاشاومەلیکەکانیان دەیکەن. خودا منی نەبۆ گەورایەتی بەسەرتانەوەو نەبۆ زۆرداری ڕەوانی کردووم، بەڵکو خودامنی بەڕاستی بۆ مزگێنی دەرو ترسێنەری ناردووم لەوکاتەدا حەزرەتی جبرائیل ﷺهاتەخوار بۆلای پێغەمبەرو، فەرمووی :ئەی محمد خودا سەلامی خۆشەویستی و ڕێز لێنانت لێدەکات.بەو عەرەبەو، تەواوی ئادەمیزادەکان بڵێ:هەرگیز لە میهرەبانی وسۆزولەسەرە خۆیی ئێمە بایی نەبێت، لە خۆی نەگۆڕێ: چونکە لەسەر کەمترین شتی بچوك و باریك لێی دەپرسینەوە. عەرەبەکە گوتی: بۆچی ئەی پێغەمبەری خوداﷺ، خودا منیش لەیادناکاو لێم دەپرسێتەوە؟ پێغەمبەر ﷺفەرمووی: بەڵێ کەخودا حەز بکات لێت دەپرسێتەوە: عەرەبەکە گوتی: سوێند بە خودا ئەی پێغەمبەر ئەگەر خودا لەمن بپرسێتەوە منیش لە ئەو دەپرسمەوەو، حسابی لەگەڵ دا دەکەم.پێغەمبەرﷺ فەرمووی: تۆ لەسەرچی لەخودا دەپرسیەوە؟ عەرەبەکەگوتی: ئەگەر خودا لەسەر تاوانەکانم لێم بپرسێتەوە، ئەوامنیش لەسەر لێ خۆشبوون لێی دەپرسمەوە. وەئەگەر خودا لەسەرنافەرمانی لێم بپرسێتەوە، ئەوامنیش لەسەرلێبوردنی لێی دەپرسمەوە. وە ئەگەر لەسەرچاو چنۆکی وبەخیلی لێم بپرسێتەوە، ئەوا منیش لەسە بەخشیش و نیعمەتەکانی لێی دەپرسمەوە. لەوکاتەدا پێغەمبەر ﷺدەستی کرد بەگریان بەجۆرێك کە ڕیشی هەموو تەڕبوو. دووبارە حەزرەتی جبرائیل ﷺهاتەوەسەر زەوی بۆلای پێغەمبەرو فەرمووی: ئەی محمد خودای گەورە سەلامت لێدەکات و دەفەرموێ:یامحمدگریانەکەی کەم بکاتەوە چونکە هەڵگرانی عەرش و کورسی خودا هەموو زیکرو یادەکانیان بە موسڵمانانی ئومەتی تۆ دەبەخشن. ئینجابەوبراعەرەبە بڵێ:باموحاسەبەو لێپرسینەوەمان لەگەڵدا نەکا ئێمەش موحاسەبەو لێپرسینەوەی لەگەڵدا ناکەین، وەئەو عەرەبە هاوەڵی تۆدەبێت لە بە هەشتدا.

## لەشتەگرنگیەکانی پێغەمبەردا هاتووەسەر پێچیم لەوە لێنەکردن

## معجزات الرسول، ألم أنهكم عن ذالك

ئیبن ئیسحاق ﷺدەگێڕێتەوەکاتێ پێغەمبەری خوداﷺ بەلای (حجر)دا ڕۆیشت دابەزی سەیری کرد ئەو خەڵکە هەمووی ئاو لەبیرەکە هەڵدەکێشن کاتێ لەوێ ڕۆیشتن پێغەمبەر فەرمووی: ئاوی ئەو بیرە مەخۆنەوەو، دەست نوێژی پێ هەڵ مەگرن‌وئەو هەویرانەی بەو ئاوە شێلاوتانە مەیخۆن‌و بیدەنە وڵاغەکانتان، وە ئەم شەوکەستان بەتەنها لەناو ڕەشماڵەکەتان نەڕواتە دەر حەتمەن هاوڕێکەتان لەگەڵ دابێت. هەموویان فەرمانەکەی پێغەمبەریان بەجێ هێنا تەنها دووکەس نەبێ لە هۆزی ساعدە) کەیەکیان بۆکاری سەراو چووبوو، ئەوی تریشیان بەدوای حوشترەکەیدا چوبوو. ئەو پیاوەی بۆسەر ئاو چوبوو هەر لە شوێنی خۆی بیهۆش کەوتبوو. وە ئەوەی کەبەشوێن حوشترەکەی دا ڕۆیشتبوو:خودای گەورە بە هۆی بایەکی بە هێزەوە فڕێی دابووە کێوی (طه ی) دوایی هەواڵیان بە پێغەمبەر ڕاگەیاند، پێغەمبەرﷺ فەرمووی :ئەدی من سەرپێچیم لێنەکردن بەتەنها نەڕۆنەدەر، ئەوکەسەی کەلەسەرئاو هەناسەی گیرابوو لەهۆشی خۆی چوبوو پێغەمبەر ﷺدوعای بۆ کردوو چاك بۆوەوخودا شیفای بۆنارد، وەئەو کەسەی کە ڕەشەبا فڕێی دابووە کێوی طه ی) ئەوە لەدوای گەڕانەوەیان بۆ مەدینە بەماوەیەك هۆزی (طەی)هێنایانەوە بۆ پێغەمبەری خوداﷺ.

## خودای بەبەزەیی دوعای پێغەمبەری وەرگرت

## إستجابة الله لدعاء رسوله

کاتێ پێغەمبەری خوداﷺ کە بەڕێگای حجر دا دەڕۆیشت‌و تێدەپەڕی بەداوێنی بەر گەکانی ڕووخساروچاوی دا دەپۆشی‌ولەوڵاغەکەی ڕادەخوڕی کە خێراو تیژ بڕوا: وە بەهاوڕێکانی دەفەرموو: مەڕۆنە ئەو ژووروکەلاوانەی زۆردارو ستەم کارەکان، تەنها بەگریان‌و، ترس‌و سامێکی زۆرەوە نەبێت، نەوەکو ئێوەش وەك‌وئەوان توشی سزاو ئازاربن.ئینجاکاتێ کەڕۆژ بۆوە هیچ کەسیان دڵۆپێك

ئاویان پێنەبوو، هاواریان بۆ پێغەمبەری خودابردلەبەربێ ئاوی.پێغەمبەریش ﷺ لەبەرخوداپاڕایەوە هەر لەوكاتەدا خودای بەبەزەیی هەوری ناردوو بارانێكی باش باری، كەهەموو خەڵكەكە تێراو بوو.هەرچی پێشیان بوو پڕیان كرد لەئاو.

## بزربوونی حوشترەكەی پێغەمبەر

## ضیاع ناقة رسول الله

دەگێڕنەوە جارێك پێغەمبەری خودا ﷺ لەگەڵ هاوڕێكانیدا دەڕۆیشتن: حوشترەكەی پێغەمبەربزربوودیارنەماهاوڕێكانی هەوڵی دۆزینەوەیاندابەلام، نەیان دۆزیەوە (عەمارەی كوڕی حەزم) لەلای پێغەمبەری خودابوو: وە (زەیدی كوڕی ئەللەصیتی) قینقاعی كەپیاوێكی دووڕو منافق بوو لەگەڵ كاروانی عەمارەدابوو. لەوكاتەدا كە عەمارە لەلای پێغەمبەری خودابوو، زەیدگوتی:ئەدی محمددەڵێ من پێغەمبەرموهەواڵی ئاسمانەكانمان پێڕادەگەیەنێ:بەلام نازانێ حوشترەكەی لەكوێیە؟ پێغەمبەر ﷺ لەوكاتەی كە عمارەی لەلابووفەرمووی:كەسانێك هەن لەناو كاروانەكەماندا دەڵێن چۆن محمد دەڵێ پێغەمبەری خودایەو هەواڵی ئاسمانەكانمان پێدەڵێ‌و، بەلام نازانێ حوشترەكەی لە كوێیە؟ ئێوەباش بزانن سوێند بە خوداهەرچی خودا پێم نەڵێ من نای زانم، بەلام ئێستا هەواڵی پێدام كە حوشترەكەم لە فلانە دۆڵەدایە، ڕێشمەكەی لەدارێك هالاوەو بەستویەتیەوە بڕۆن بیهێننەوە، لەدوای هێنانەوەی، عەمارەی كوڕی حەزم ڕۆیشتەوە ناوكاروانەكەی فەرمووی:سوێند بە خوداپێش ئێستاشتێكی زۆرسەرسامیم لەپێغەمبەربیست، كەیەكێك لەوناوكاروانەدا قسەیەكی بەو جۆرەی كردووە بێ ئەوەی كە پێغەمبەر لێرە ئامادەبێت.كابرایەك گوتی:بەخوا ئەوە زەید بووپێش ئەوەی كەتۆبێیتەوە، عەمارە بەرۆكی زەیدی گرت‌و، زۆری قسە پێگوت‌و فەرمووی:بۆلای خودا بگەڕێنەوە ئەی بەندەكانی خودا، بەڕاستی شتێكی شەرمەزاری‌ومالّ وێرانییە لەناوكاروانەكەمداكارەساتی واهەبێت‌ومن نەم زانیبێ، لاچۆبڕۆلەناوكاروانی مندانەی دووژمنی خودا، هاوڕێیەتیمان مەكە.

# دەبێ ئەوە ئەبوزەڕ بێت
# كن أباذر

كاتێ پێغەمبەری خوداﷺبەرەو تەبوك بەڕێكەتن زۆرلە موسڵمانان دواكەوتن: یارەكان دەیان گوت:ئەی پێغەمبەری خوداﷺ فلانە كەسەش نەهاتوە.پێغەمبەر ﷺدەیفەرموو لێی گەڕێن وباسی مەكەن.ئەگەرخێرو چاكەی تێدا بێت ئەوەخوداوای لێدەكات بگاتە لای ئێوە، وەئەگەر خێریشی تێدا نەبێ، ئەوە خودا ئێوەی لەدەستی ئەو ڕزگاركردووە، تەنانەت گوتیان:حوشترەكەی ئەبو زەڕیش زۆرسست بوو لەڕۆیشتن و دواكەوتووە. پێغەمبەر ﷺبەرامبەرئەبوزەڕیش بەتایبەتی فەرمووی: لێی گەڕێن ئەگەر خێرو چاكەی هەبێت ئەوەپێتان دەگات و ، وەئەگەر خێریشی تێدا نەبێت ئەوە لەدەستی ڕزگارتان دەبێ. ئەبو زەڕیش لەبەر سستی و تەمبەڵی حوشترەكەی زۆر بێهێزوبێتوانا دەبێت بۆیە لە حوشترەكەی دادەبەزێت وتفاق و شتەكانی بە كۆڵی خۆی دادەدات و ڕێگای دوورو درێژی بەشوێنی پێغەمبەرو موسڵمانان بەپێیان دەبڕێت. پێغەمبەرو سوپای ئیسلام لە شوێنێك دادەبزن وپشو دەدەن. یەكێك لە هاوڕێیانی پێغەمبەرﷺسەیردەكات لەدوورەوە تارماییەك بەدی دەكات بەپێیان دێت، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا وایەكێك لەدووره وە دیارە بە پێیان دێت. پێغەمبەرﷺفەرمووی:دەی ئەوەئەبا زەڕ بێت. كاتێ نزیك بۆوە، یارەكان سەیریان دەكردبۆیان دەركەوت كەئەوە ئەبوزەڕە هاواریان كرد ئەی پێغەمبەری خودا بەڕاستی ئەوە ئەبوزەڕە. پێغەمبەر ﷺفەرمووی :خودا سۆزو میهرەبانی لەگەڵ ئەبو زەڕدا بكات: بەتەنیا دەڕوات و، بەتەنیا دەمرێت و، بەتەنیا زیندوو دەكرێتەوە.

لەعبدالله ی كوڕی مەسعودﷺەوە دەگێڕنەوە ئەو كاتەی كە پێشەوا عوسمان هەواڵی لەدانیشتوانی شامەوە پێدەگات كە ئەبووزەڕ بە بانگەوازەكەی دونیای خرۆشاندووە: عوسمان ﷺئەبوزەر بانگ دەكاتەوە بۆ مەدینە كەلەلای خۆی بمێنێتەوە، بەڵام ئەبوزەڕ دەڵێ هیچ پێویستیم بەدونیای ئێوە نیە، ئینجا لەدوای ووت و وێژێكی زۆر دەڵێ، ئەی پێشەوا من ڕوانی(ڕەبزە)بكە پێشەوا

عوسمانیشﷺ ڕێگەی پێدەداتو بەرەو ڕەبزە دەكەوێتە ڕێگاتەنها خۆیو هاوسەرو بەندەیەكی، ئەبو زەڕ لەڕێگا توشی چارەنوسی ئێشو ئازاری زۆردەبێت، و ئامۆژگاری هاوسەرو پێش خزمەتەكەی دەكات كە ئینسان هەمووومان بۆمردنینو دەمرینو كەسیش ڕزگاری نابیٚو خەموبێزاری ناوێتو ئەگەریش مردم بمشۆنو كفنم بكەنو، لەسەر ڕێگای ڕێبوارانم دابنێنو یەكەمین كاروان كە بێرە دا تێدەپەڕیٚ پێیان بڵێن، ئەوە تەرمی ئەبو زەڕە هاوڕێی پێغەمبەری خودایە، یارمەتیمان بدەن بۆبەخاك سپاردنی. لەدوای ئەوە ئەبو زەڕ گیانی سپارد. وەسیەتەكەیان بەجیٚ هێناولەسەر ڕێگایەك دایاننا لەدوای ماوەیەك كاروانێكی عیراقی بەو ڕێگایەدا تێدەپەڕیٚ كە عبداللەی كوڕی مەسعودیانﷺ تێدابوو.سەیریان كرد تەرمێك لەو شوێنە چۆڵو هۆڵە لەسەر ڕێگاداندراوە، كەخەریك بوو بەژێر پێی وڵاغەكان بكەویٚ. پێش خزمەتەكەیان ڕۆیشتە لای عبداللەو گوتی: ئەوە تەرمی ئەبوزەڕ هاوڕێی پێغەمبەری خودایە یارمەتیمان بدەن بیشارینەوە. عبداللەی كوڕی مەسعودﷺ هاواری كردوو دەستی كرد بە گریانو، فەرمووی: بەڕاستی پێغەمبەری خودا ڕاستی فەرموو: بەتەنیا دەڕواو، بەتەنیادەمریٚو، بەتەنیا زیندو دەكرێتەوە. ئینجا عبدالله و هاوڕێكانی دابەزینو تەرمەكەیان شاردەوە.

## هەركسێك خودا توشی چاكەی بكات لەدین شارەزای دەكات

## من یرید الله به خیرا یفقه في الدین

دەگێڕنەوەپادشای ڕۆم نێردراوێكی بەماڵێكی زۆرەوە ڕەوانەی مەدینەكردو پێی گوت: بڕۆ بۆلای محمد :ئەگەر نەی گەیشتێیە پرسیار لە جێگرەكەی بكە و. سیٚ پرسیاری لێبكە، ئەگەر وەڵامی دایەوە هەمووئەوماڵەی كەپێتە بیدەیە. بەڵام كاتیٚ ئەوكابرایە گەیشتە مەدینە پێغەمبەرﷺ وەفاتی كردبوو.دوایی پرسیاری جێگرەكەی كردوو بردیانە لای ئەبو بكری صدیق.نوێنەرەكە ئەو پرسیارانەی كەپێی گوترابوو كردنی: ئەبوبكر تووڕەبوو لەپرسیارەكانو فەرمووی:هاوار بۆتۆ كوفریشت لەسەر پرسیارە كوفرەكانت زیاد كردوە. لەدواییدا ڕەوانەی لای

عومەری کوڕی خەتابیان کرد. ئەویش بەشێوەی ئەبوبکر بەتووڕەیی وەڵامی دایەوە. ئینجا عبداللەی کوڕی عەباس‌ﷺ گوتی: بەڕاستی ئێوە لەگەڵ ئەوپیاوە باش نەجولانەوە ئەوپیاوە پرسیاری لە ئێوەکردو ، بێ ئەوەی بڵێن ئەووەڵامە نازانین خۆتان لەکابرا تووڕەکرد. ئەبوبکرو عومەر ﷺفەرموویان: تۆ وەڵامەکەیان دەزانی؟ فەرمووی:من نازانم بەڵام ڕەوانەی لای کەسێکی دەکەم کەوەڵامەکەی دەزانێ.عبدالله دەستی کابرای گرت وئەبوبکروعومەریشی لەگەڵدا ڕۆیشتن بۆماڵی عەلی کوڕی ئەبو تالیب وﷺ هەواڵی ئەو پیاوەیان پێدا کەبۆچی هاتووە. عەلی فەرمووی: پرسیارەکانت بکە چین؟. کابرا گوتی: هەواڵم پێبدە بەو شتەی کەخودا نیەتی؟ عەلی ﷺفەرمووی: خودا شەریکی نییە.کابرا گوتی: هەواڵم پێبدەبەو شتەی کەخوداناای زانێت؟عەلی ﷺفەرمووی: ئەوەی کەئێوەدەڵێن عیساکوڕی خودایە ﷺپاک و بێ لەکەیی بۆئەودایە کەنازانێ ئەولادی هەیە.وەك و ئێوە دەڵێن. پرسیاری سێیەم :کابرا گوتی: هەواڵم بدەرێ بەوەی کەلەلای خودا نییە؟ عەلی‌ﷺ فەرمووی:زوڵم و ستەم لەلای خوانیە بۆ بەندەکانی. وەواتای ئەوەی کەخودا نازانێ کەئەولادی هەیە هەروەك و بۆخۆی دەفەرمویٚ{وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِ ۚ قُلْ أَتُنَبِّـُٔونَ ٱللَّهَ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ }یونس/١٨ واته:بەڕاستی بێباوەڕان شتێك دەپەرستن و عیبادەتی بۆدەکەن نەتوانای ئەوەیان هەیە کەزەرەریان پێ بگەیەنن وەنەسودو قازانجیشیان پێبگەیەنن وەبەقسەی پوچی خۆیان دەڵێن، ئەوانە لەدواڕۆژدا دەبنە تکاکارمان لەلای خودا ، ئەی محمد پێیان بڵێ: بەوکافرو بێباوەڕانە ئێوەکەسێ ئاگادار دەکەنەوە بەشتێك کەهەرچی لەو ئاسمان وزەویەدایەخودا نای زانێت؟ پاك و بێگەردی بۆ ئەو خودایە بەرزو بڵندەی کەنەفام وبێباوەڕان بەهاوەڵی خودای دادەنێن، لەدوای ئەوە کابرای نوێنەر گوتی(أشهد أن لاإله إلا ألله.وأشهد أن محمدا رسول الله) باوەڕی هێناو هەموو ئەوماڵەی کەهێنابوی دای بە حەزرەتی عەلی.ﷺ ئەویش هەمووی بە خشی بە حسن و حسین‌ﷺو فەرمووی: ئێوەش بڕۆن بەسەر موسڵمانان دابەشی بکەن.

# لە پەیمانی ڕاستیە
# في الوفاء

دەگێڕنەوە عبداللەی کوڕی جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب ﷛کەنیزەیەکی هەبوو بەناوی (عەمارە)کاتێ کە عبداللەبەنوێنەر ناردیان بۆلای معاویەکەنیزەکەی لەگەڵ خۆی برد. یەزیدی کوڕی مەعاویەڕۆیشتە دیدەنی عبدالله وماوەیەك لەلای مایەوە چاوی بەو کەنیزە کەوت عاشق‌و شەیدای بوو بەڵام لەبەر باوکی نەی درکاندو باسی نەکرد بەو جۆرە ئەو خەیاڵ‌و هەستەی دەر نەبڕی هەتا باوکی معاویە کۆچی دوایی کردو فەرمان ڕەوایی‌و دەسەڵات کەوتە دەستی یەزیدڕۆژێك ڕاوێژی بەچەند کەسێکی متمانەو باوەڕ پێکراوی خۆی کرد لەبارەی ئەو کەنیزەوە، ئەوانیش زۆرباش دەیانزانی کە عبدالله ئەو کەنیزەی خۆش دەوێ‌و ئەگەر داوای لێبکەین هەرگیز نامان داتێ، وەئەگەر بە زۆریش لێی بستێنین نابێ.وەبە فرۆشتنیش نای فرۆشێ بۆئەو مەبەستە سیخوڕو باوەڕ پێکراوەکانی یەزید هەر لە بیرو ڕاوێژ کردن دابوون بۆ بەدەست هێنانی ئاواتی یەزید.هیچ ڕێگە چارەیەکیان نەدۆزیەوە تەنها پیلانێك نەبێت. گوتی بڕۆنپیاوێکی زاناوداناو بیر تیژی دانیشتوی وڵاتی عێراقم بۆ بهێنن کەسەرنج ڕاکێش‌ونەرموو ووتەو وێژەی جوان‌وکارامەو پسپۆڕی ئەو بوارانە بێت. پیاوێکی بەهەمان جۆرو شێوەیان دۆزیەوەوبۆیان هێنا، تۆزێك لەگەڵی دواو قسەی لەگەڵ کرد کەبەڕاستی پیاوێکی کارامەوزاناو زوبان شیرن بوو زۆرباش گونجابوو بۆ ئەوکارە. ئینجا پێی گوت من بۆکارێکی ئاوا کەزۆر پێویستیم پێیەتی بانگم کردووی، ئەگەر ئەوکارەم بۆ بەدی بهێنی ئەوە بەڕاستی لەلای من گەورەترین پلەوپایەی دەسەڵاتت پێدەبەخشم‌وهەمووهیواو ئاواتەکانت بەدی دەهێنم. ئەو پیاوە گوتی: ئەی سەرورم بەڕاستی من عبداللەی کوڕی جەعفەر دەناسم هەرچی لەگەڵیدا بکرێ بێسودە تەنها بە پیلان‌و فێڵ نەبێت: وە ئەوکارەش کەهیچ کەس ناتوانێ بە جێی بگەیەنێ تەنهاکەسێك کەبتوانێ هیوادارم کەمن بیکەم یارمەتیش لەخوداوە.وەمبۆ

كردنی ئەوكارەش پێویستم بەماڵو سەروەتێكی باش هەیە. یەزید گوتی: هەرچی دەتەوێت لەژێر دەستت دایە بۆ بەدەست هێنانی. كابرا وەكو بازرگانێكی كارامەو شارەزاهەرچی شتی جوانو بەكەڵكی وڵاتی شامو، بەرگوپۆشاكی میصریو، هەركەلوپەلێكی باشی بازرگانیوكرینی چەندین كۆیلەو بەندەو ئاژەڵی باشوولاغی سواریو، هەرچی پێویستی بووبەدی هێناو بە بازرگانیەكی گەورەوەبەرەو مەدینە كەوتە ڕێ لەمەدینە لە زەویو پانتایەكی عبدالله كوڕی جەعفەر بارگەی خستو لە تەنیشتی ماڵو خانوی عبدالله خانوشوێنێكی بەكرێ گرت. لەدواییدا پەیوەندی بە عبداللەوە كردوخۆی پێناساندكەمن خەڵكی عیراقموبۆبازرگانی هاتوومو ئارەزووی دراوسێیەتی تۆم هەبوو هەتا شتەكانم دەفرۆشم. عبداللەش وەك پیاوێكی مەزن بەهەموو پیاوانو كاربەدەستانی ڕاگەیاند كەزۆرڕێز لەو میوانە بگرنوكارو باری فرۆشتنیشی بۆ ئاسان بكەن، لەدوای ئەوەی كەبەتەواوی خۆی دامەزراندوجێگەی خۆی كردەوەو لەوناوەدا ناوبانگی دەركرد ڕۆژێك ولاغێكی جوانو ڕەسەنی دیاری كردووجلو بەرگێكی جوانو گران بەهاوخەڵاتێكی نایابی دیاری كردوو.لەگەڵ نامەیەكی زۆرڕازاوە، كەتێیدا نوسی بووی گەورەم بەڕاستی من بازرگانێكی زۆردەوڵەمەندو زەنگینم خودا ماڵێكی زۆری پێبەخشیوم بۆیە زۆرحەز دەكەم بە هۆی خزمایەتیت لەگەڵ پێغەمبەری خودا لێت نزیك ببمەوەو، ئەوخەڵاتە كەموناقابیلیەم لێوەربگری: بەوشێوە نامەكەی لەگەڵ دیاریەكدا ڕەوانەكرد. عبدالله فەرمووی: زۆرباشە دیاریەكەی لێوەربگرن. لەدواییدا بۆنوێژ ڕۆیشتو لەگەڕانەوەی لایدایەماڵی كابرای بازرگان ئەویش ڕێزێكی زۆری لێناو بەپیلیەوە ڕۆیشتو دەستی ماچ كردو، سەیری كردبازرگانێكی بەڕەوشتوئەدەبەووتەو ڕاوێژێكی زۆرجوانونایابی هەیە. عبدالله زۆركەیف خۆش بووبە بازرگانوپیاوێكی وازیرەكو ڕەوان بێژ. بۆیەداوای لێكرد لەگەڵیدابڕواتەوە ماڵو میوانداری قبوڵ بكات بازرگان لەگەڵ عبدالله ڕۆیشتە ماڵو لەدوای نان خواردن كۆڕو دانیشتنی قسەیان لەبارەی

كەنیزە (عەمارەوە) گەرم كرد. كەبەڕاستی باسی جوانی وزیرەكی ولێهاتویی عەمارە وەسف وباسی ناكرێت، كابرای بازرگان لەباسی عەمارەدا گوتی من (١٠٠٠٠) دەهەزار دیناری عیراقی پێدەدەم كەئەو نرخە بۆ ئەوكاتە خەیاڵی بوو. عبدالله بەگاڵتەوە فەرمووی: باشە كابرای عیراق و بازرگان گوتی: واكڕینەكە مان كۆتایی هات و گەڕایەوە بۆماڵ. بۆبەیانی كابرای عیراقی (١٠٠٠٠) دەهەزار دینارەكەی بۆ نارد بەڵام عبدالله پارەكەی وەر نەگرت و بۆی ناردەوە فەرمووی: من گاڵتەم لەگەڵ كردووی، من هەرگیزلەیادم نەبووە كە ئەوە بفرۆشم.! كابرای عێراقی گوتی: گیانم بە فیدات بێ بۆخۆت دەزانی بەڕاستی بێ یان بەگاڵتە كڕین و فرۆشتن دادەمەزرێ و وەك و یەكە. عبدالله فەرمووی: تائێستا نەم زانیوە كە هیچ كەنیزەیەك ئەوەندەبكات بەڵام ئەگەر لەكەسێكی تر بكڕابایە من زۆرترم پێدەدا. بەڵام بەڕاستی من گاڵتەم لەگەڵدا كردووی، بەخوا ئەو كەنیزە بەهەمووسامانی دونیا نافرۆشم لەبەرئەوەی ئەوەندەڕێزو خۆشەویستی بەلای منەوەهەیە. كابرای بازرگانی عیراقی گوتی: ئەگەر چی تۆ گاڵتەت لەگەڵ مندا كردووە من بەڕاستم بووەو نەم زانیوە دڵی تۆ چی تێدایە، ئێستاش من خاوەنی ئەو كەنیزەم و پارەكەشیم بۆناردووی بەهیچ جۆرێك ئەوكەنیزەبۆتوڕەوانیەوبۆوەرگرتنی پارەكەش هیچ چارێكت نییە دەبێوەری بگری، بەڵام عبداللەكەنیزەكەی پێنەدا. كابرای بازرگانی عێراقی ڕۆیشت و دەی گوت: بە خوا بەهیچ جۆرێك من دەست بەرداری ئەو كەنیزەنابم و لەلای پێشەوای موسڵمانان شكایەتت لێدەكەم وسوێندت دەدەم. ئینجا كاتێ عبدالله زانی كە ئەوكابرایەكارەكەی زۆربەگرنگی گرتووە پێی گوت بەڕاستی میوانێكی خەراپی! هەتا ئێستا هیچ كەسێك لەدەرگای نەداوین وكەس نەهاتۆتە لامان لەتۆ پیس ترو خەراپتر. لەدواییدا بەناچاری بەقەهرەمان پێش خزمەتەكەیانی گوت: بڕۆپارەكەی لێوەربگرەو عەمارەی كەنیزەش بەو شێوەی كە شایانی جوانی ئەوبێت لەجل وبەرگ و بۆندا بیڕازێنەوەو باشترین شێوەی جوانی و وڵاغی سواری بۆبەجێ بهێنە بەرێژەی (٣٠٠٠) سێ هەزار دینار ڕازاندیانەوە

دوایی تەسلیم بەپێش خزمەتەکەیان کردووگوتیان: برۆئەو کەنیزە تەسلیم بەکابرای عیراقی بازرگان بکە بەهەمووئەوشتەی کەپێوەیەتی پێی بڵێ ئەوەبۆتۆ لەلایەن ئێمەوە. چونکە ئێوەش لەلایەن خۆتانەوەئەوهەمووسۆزوبەزەییەتان لەگەڵ ئێمە نواند. پیاوە عیراقیەکە کەنیزەکەی وەرگرت وگەڕایەوە، کەلە مەدینە دەر چووبە عمارەی کەنیزەی گوت:من کەهاتووم بۆمەدینە بەمەبەستێکی ئەوها هاتووم تۆم بۆخۆم نیە بەڵکو بۆ یەزیدی کوڕی معاویەمی بۆیەداوات لێدەکەم لەبەرامبەری من خۆداپۆشەو بەشەرم شکۆلەگەڵمدا بجوڵێوەو ڕەفتاربکە چونکە بەڕاستی شەیتان لەناو دڵو دەرونو خوێنی ئادەمیزاد دەگەڕێ، یان ناتوانێ ئینسان بەرامبەری خۆ ڕاگربێت. لەدوای ئەوە ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە وڵاتی شام دیمەشق چاوی کەوت بە خەڵك تەرمی یەزید یان لەسەر شانەوبەرەو گۆڕستانی دەبەنو لەجێگەی یەزید معاویەی کوڕی بە جێنشین داندراوە، لەدوای تێپەڕینی چەند ڕۆژێك زۆر بەهێمنی داوای چونەلای پێشەوای کردوو ڕۆیشتە لای و هەمووبەسەر هاتەکەی بۆ گێڕایەوە معاویەش گوتی:برام با ئەو کەنیزە بۆ خۆت بێت. دوای ئەوە کابرای عیراقی گەڕایەوەو ڕۆیشت بەکەنیزەکەی گوت:ئەی عەمارە من ئەوکاتەی کەلەمەدینە هاتینە دەر هەموو بەسەرهاتم بۆ گێڕایەوە کەتۆ هیچ پەیوەندیت بەمنەوە نیە بەشەرمەوە سەیرم کردووی. بەڵام ئێستا تۆماڵی حەقو ڕەوای منی. بۆیە ئێستاش شاهیدی دەدەم کەمن بە عبداللەی کوڕی جەعفەرت دەبەخشمەوە، بەو مەبەستە لە دیمەش بەرەو مەدینە دەرچوو. دووبارە لە شوێنێکی نزیکی ماڵی عبداللە بارگەی خست: هێندێك لەپیاوانو پێش خزمەتانی عبداللە ڕۆیشتنەلای عبداللە گوتیان: بەڕێز ئەو بازرگانەی کەهەرچی خەراپە هەبووپێی کردین ئێستاش زۆربەبێ شەرمانە گەڕاوەتەوەئێرە. عبداللە فەرمووی:قسەی ناشیرینی پێ مەڵێنو برۆنەلایو زۆر ڕێزی لێبگرن. لەدوای ئەوە کابرانێردراوێکی نارد بۆلای عبداللە گوتی: پێم خۆشە ئەگەر بۆچەند چرکەیەکیش بێت ڕێگەم پێبدا بچمەلای بۆکارێکی تایبەتی خۆم چاوم پێی

بکەویٚو دەگەڕێمەوە عبدالله ڕێگەی پێدا کەبڕواتەلای، کابرای بازرگان ڕۆیشتەلای عبدالله هەمووچیرۆك‌وبەسەرهاتی تەواوی هاتنی پێشووی‌و، ھڕانەوەی دووبارەی بۆ گێڕایەوە.دوایی سوێندی بۆخواردکەتەنها ئەوکاتەی کەهاتمە مەدینە پیلانەکەم ڕێك خست دەم‌وچاوڕوخساری ئەوکەنیزەم دیوە دەنا لەڕێگای ڕۆیشتنم بۆدیمەشق‌و گەڕانەوەم بۆمەدینە ڕوخساری ئەوئافرەتەم نەدیتوەئەوەش کەنیزەکە یە بە بەرگ‌و پۆشاکی خۆیەوە بابێتە ژوورەوە. کاتیٚ خانەوادەو دانیشتوانی ماڵی عبداللەچاویان پێی کەوت هاواریان لیٚ بەرز بۆوە، کەچاوی بە عبدالله کەوت بێهۆش کەوت، عبدالله بە قوڵەن گوچکەکەی دەم‌و چاوی دەسڕیەوەو دەیفەرموو: ئەی خودا ئەوەخەوە یان بێداریە؟ بازرگانە عیراقیەکەش گوتی: ئەی عبدالله بەهۆی ڕێزو دڵسۆزیت خودای گەورە ئەو کەنیزەکەی بەپاکی بۆناردیەوە.

# کۆتـایی پەڕاو
# خاتمة الكتاب

یارحمة نعمت بها أمم الورى　　قد جئت فی الوجود يضاء

أنت الطبيب لكل أدواء الورى　　أنت الرحيم وللنفوس شفاء

بەوجۆرە کردم بەشعر:

ئەی میهرەبانی ســـەرومەری بـوونەوە رت بووژانـدەوە

خۆشیت هێنا نوورو شـادی ڕێگای کوفرت کوژاندەوە

ئەی پزیشکی چاکە خوازی ئەی لابەری زوڵمو سـتەم

بۆ گشت دەردو، وەرمو بەڵاشیفای خۆشی لابە ری تەم

تۆ پێشەواو میهرەبانی ئەی خۆشـەویستو سـەرومرم

بۆمەت هێنا خۆشـیو شـادی بێتۆ هانا بۆ کێ بـە م

بەوەندەلویچو چمکەی لەژیانی پێغەمبەری سەروەرمان کەکۆم کردۆتەوەو ڕێکم خستووە بە ئومێدو هیوای کەڵکو سود مەند بوونیوئامۆژگاری بۆ هەموونەوانەی کەدەیانەوێ پەیڕەوی ڕێبازی پێغەمبەری خودا ﷺبکەن وەبەو هۆیەوەڕەوشتو ئەدەب وەرگرن بەشێوەی ئەدەبوڕەوشتی پێغەمبەروەدەرسوئامۆژگاری لە ڕێبازی خۆشەو یست گەورەو سەروەرمانو هاوەڵەبەڕێزەکان وەربگرێ لەو نەفسو گیانە گەورەیەی کە خۆشەویستی خودای لەسەرووی هەموو خۆشەویستانەوە داناوە وەخۆ بەخت کردنو فیداییبە گیانو ماڵوهەمووشتێکی بەنرخ کرد لەپێناو ی ڕەزامەندیو قایلبوونی پەروەردگاری. ئینجا بەو چمکە کەمە پیرۆزە کۆتایی بە پەڕاوەکەم دەهێنمو هیوام وایە بەو هۆیەوە بەبەر ڕەزابوونو لێبوردنومیهرەبانی خودا بکەوین وەهەروەها هیدایەتو ڕێنمونی ئەو وەچەو نەوەیە بدات بۆ تێڕوانینو تێگەیشتنی ئەو پەڕاوە، بۆ ئەوەی کەمێك کەڵك لەژیانوسودو سەروەری ئەوپێغەمبەرە گەورەیەوەربگرن بۆ ڕێنمونیو شارەزای ڕێبازو ڕەوشتی باشی ئەو ژیانی دونیاییە.

{وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَـٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ }العمران/٨٥

واتە:هەرکەسێك بێگە لە ئیسلام هەر ئاینو بەرنامەیەك بۆخۆی هەڵ بژێریٚ هەرچەند سزاو ئازارو ناخۆشی لەسەر بکێشیٚ بادڵنیا بێت کەلێی وەر ناگیریٚو لەدوا ڕۆژیشدا زەرەرمەندوو ماڵ وێرانە.

منیش لەدواوتەمداسوپاس وستایشی پەروەردگاری بوونەوەردەکەم لەسەر یارمەتیدانی تەواو کردنی ئەوکتێبەولەخودای گەورەش دەخوازم کەببێتە مایەی سودو کەڵك لێوەر گرتنی موسڵمانانو، خەزێنەیەکی پڕلەگەوهەرومرواری بیٚ، بۆدواڕۆژی خۆمو، دایكو، باوکمو، هاوسەرە بەڕێزەکانمو، کوڕوکچە جوانە چاوگەشەکانمو، هەموودۆستو، ئاشنای موسڵمانم، وەداوای لێبووردنیش لەهەموخوێنەرێکی دڵسۆزی خۆشەویست دەکەم، کەلەهەموکەمو کوڕیو ناتەواویەکانم ببوریٚو، بەدڵێکی پاکەوەو، بەپاك نوسی ئاگادارم بکاتەوە، لەبەرخوداو، بەبیٚ تەوانجو گلەیی و، خۆهەڵکێشان.بەو ژمارەموبایلە (٠٧٧٠١٤٣٧١٨٥)داوای خۆش بەختی لەخودا بۆ دەخوازم، دیارە منیش هەرئەوەندەم توانا هەبووەو. هەر خوداش بەبیٚ هەڵەو لەکەیە.خودا لەهەڵەو تاوانی هەموومانم ببوریٚ.

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين. والصلاة والسلام على سيد المرسلين محمد وعلى آله وصحبه أجمعين.

عبدالله حسن سعید/ خەلەکانی

پێش نوێژ ووتارخوێنی مزگەوتی إبن خەلەکان/ لەخەلەکان

٦-٣-٢٠٠٩-زاینی و٩-ربيع الأول-١٤٣٠

سەرچاوەكان


| | |
|---|---|
| فى ظلال القران | سيد قطب |
| التاريخ الكبير | إبن عساكر |
| الاغانى | ابو الفرج الاصفهانى |
| احياء علوم الدين | الامام الغزالى |
| البيان والتبيين | الجاحظ |
| حياة محمد | محمد حسين هيكل |
| اللؤلؤ والمرجان | محمد فؤاد عبدالباقى |
| السيرة الحلبية | |
| سيرة ابن هشام | |
| صحيح مسلم | |
| نهج البلاغة | |
| مجلة منبر الاسلام | |
| المحاسن والمساوىء | ابراهيم بن محمد البيهقى |
| قصص العرب | محمد ابو الفضل ابراهيم ومحمد احمد جاد المولى |
| اللالىء والامثال | الشيخ محمدعلى الانسى |

| بابەت | کلیلی باسەکان ( پێرست ) | لاپەڕە |
|---|---|---|